# الموطأ

للإمام مالك بن أنس إمام دار الهجرة

به‌رگی سێیه‌م

وه‌رگێرانی

د. زانا عیسا عبابکر

پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرمووده




# موطأ الإمام مالك

## بەکوردی

نووسینی: الإمام مالك بن أنس عبدالله الأصبحي

وەرگێڕانــی : د.زانــا عیســا عەبابکر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپـی یەکەم : ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز

٥٩٢ لاپـــــەڕە

٢٤ × ١٧ ســـــم

بابـەت : ئــایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (   )ـی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە










# موطأ الإمام مالك

## بەکوردی




نووسینی

الإمام مالك بن أنس عبدالله الأصبحي

وەرگێڕان

د.زانـا عیسـا عەبابکر



# پەرتووکی

# مامەڵەی قازانجی هاوبەش(١)



---

(١) ـ كِتَابُ الْقِرَاضِ.




## ١- ئەوەی دەربارەی مامەڵەی قازانجی هاوبەش هاتووە[١]

**٢٠٠٧-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ عَبْدُ اللهِ، وَعُبَيْدُ اللهِ، ابْنَا عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵄ فِي جَيْشٍ إِلَى الْعِرَاقِ، فَلَمَّا قَفَلاَ مَرَّا عَلَى أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁، وَهُوَ أَمِيرُ الْبَصْرَةِ، فَرَحَّبَ بِهِمَا وَسَهَّلَ، ثُمَّ قَالَ: لَوْ أَقْدِرُ لَكُمَا عَلَى أَمْرٍ أَنْفَعُكُمَا بِهِ لَفَعَلْتُ، ثُمَّ قَالَ: بَلَى هَاهُنَا مَالٌ مِنْ مَالِ اللهِ، أُرِيدُ أَنْ أَبْعَثَ بِهِ إِلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، فَأُسْلِفُكُمَاهُ، فَتَبْتَاعَانِ بِهِ مَتَاعًا مِنْ مَتَاعِ الْعِرَاقِ، ثُمَّ تَبِيعَانِهِ بِالْمَدِينَةِ، فَتُؤَدِّيَانِ رَأْسَ الْمَالِ إِلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيَكُونُ الرِّبْحُ لَكُمَا، فَقَالاَ: وَدِدْنَا، فَفَعَلَ، وَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنْ يَأْخُذَ مِنْهُمَا الْمَالَ، فَلَمَّا قَدِمَا بَاعَا، فَأُرْبِحَا، فَلَمَّا دَفَعَا ذَلِكَ إِلَى عُمَرَ ﵁، قَالَ: أَكُلُّ الْجَيْشِ أَسْلَفَهُ مِثْلَ مَا أَسْلَفَكُمَا؟ قَالاَ: لاَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁: ابْنَا أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، فَأَسْلَفَكُمَا، أَدِّيَا الْمَالَ وَرِبْحَهُ، فَأَمَّا عَبْدُ اللهِ، فَسَكَتَ، وَأَمَّا عُبَيْدُ اللهِ، فَقَالَ: مَا يَنْبَغِي لَكَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، هَذَا، لَوْ نَقَصَ هَذَا الْمَالُ أَوْ هَلَكَ لَضَمِنَّاهُ؟ فَقَالَ عُمَرُ ﵁: أَدِّيَاهُ، فَسَكَتَ عَبْدُ اللهِ، وَرَاجَعَهُ عُبَيْدُ اللهِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ جُلَسَاءِ عُمَرَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ جَعَلْتَهُ قِرَاضًا؟ فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ جَعَلْتُهُ قِرَاضًا، فَأَخَذَ عُمَرُ رَأْسَ الْمَالِ وَنِصْفَ رِبْحِهِ، وَأَخَذَ عَبْدُ اللهِ، وَعُبَيْدُ اللهِ، ابْنَا عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵄ نِصْفَ رِبْحِ الْمَالِ[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵلا و عوبەیدوڵلا دوو کوڕەکانی عومەری کوڕی خەتتاب ﵄ لەگەڵ سوپاییێکدا دەرچوون بۆ عێراق (بۆ جیهاد)، جا کاتێ گەڕانەوە بەلای ئەبو موسای ئەشعەریدا ﵁ تێ پەڕین کە کاربەدەستی بەصرە بوو، جا ئەبو موسا ﵁ بەخێری هێنان، دواتر گوتی: ئەگەر بمتوانیایە کارێکتان بۆ بکەم سوودتان پێ بگەیەنم ئەوە دەمکرد، دواتر گوتی: بۆنا، لێرە هەندێ سەروەت و ماڵی خوا هەیە دەمەوێ بینێرم بۆ گەورەی باوەڕداران، جا بەقەرز پێتان دەدەم و ئێوەش کاڵای عێراقی پێ بکڕن و دواتر لە مەدینە بیفرۆشن و سەرمایەکە بدەنەوە گەورەی باوەڕداران و قازانجەکەش بۆ خۆتان بێت، ئەوانیش گوتیان: پێمان خۆشە، جا ئەنجامیان دا، ئەبو موساش ﵁ نووسراوی کرد بۆ عومەری کوڕی خەتتاب

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْقِرَاضِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٢٩ في القراض؛ والشافعي: ١٢٤٧، عن مالك به.




ﷺ بەوەی سەرمایەکەیان لێ وەربگرێت، جا کاتێ هاتنەوە مەدینە فرۆشتیان و قازانجیان کرد، جا کاتێ سەرمایەکەیان دا بە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: ئایا ئەبو موسا ﷺ هەمان قەرزی وەك ئێوەی بە گشت سوپاکەش داوە؟ ئەوانیش گوتیان: نەخێر، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: چونکە ئێوە کوڕی عومەری کوڕی خەتتابن بۆیە قەرزی داوە بە ئێوە! دەی سەرمایەکە و قازانجەکە بدەنەوە، جا هەرچی عەبدوڵڵا بوو بێدەنگ بوو، بەڵام عوبەیدوڵا گوتی: بەو شێوەیە نابێت ئەی گەورەی باوەڕداران (نابێ قازانجەکەشمان لێ بستێنی)، (چونکە) ئەگەر سەرمایەکە کەمی بکردایە و زەرەرمان بکردایە یان لەناو چووبایە، ئەوە ئێمە زامن دەبووین؟ (کەواتە قازانجەکە بۆ ئێمەیە)، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بیدەنەوە، جا عەبدوڵڵا دیسان بێدەنگ بوو، عوبەیدوڵاش قسەکەی دووبارە کردەوە، جا پیاوێك لە دانیشتووانی مەجلیسی ئیمامی عومەر گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران (مەگەر باش نییە) ئەگەر بیکەیتە (قیراز) مامەڵەی قازانجی هاوبەش؟ ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئەوە کردم بە مامەڵەی قازانجی هاوبەش، جا ئیمامی عومەر ﷺ سەرمایەکە و نیوەی قازانجەکەی وەرگرت، دوو کوڕەکانی ئیمامی عومەریش عەبدوڵڵا و عوبەیدوڵا نیوەی قازانجەکەیان وەرگرت.

٢٠٠٨- عَنِ الْعَلَاءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ أَعْطَاهُ مَالاً قِرَاضًا، يَعْمَلُ فِيهِ عَلَى أَنَّ الرِّبْحَ بَيْنَهُمَا[1].

واتە: لە عەلائی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە، ئەویش لە باپیریەوە (گوتوویەتی): عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ ماڵ و سەروەتی بەقازانجی هاوبەش داوەتێ، تا کاری پێ بکات لەسەر ئەوەی قازانجەکە بۆ هەردووکیان بێت.

---

(١) ـ حسن.




## ٢- ئەوەی لە قازانجی هاوبەشدا دروستە[١]

**٢٠٠٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَجْهُ الْقِرَاضِ الْمَعْرُوفِ الْجَائِزِ أَنْ يَأْخُذَ الرَّجُلُ الْمَالَ مِنْ صَاحِبِهِ عَلَى أَنْ يَعْمَلَ فِيهِ، وَلاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ، وَنَفَقَةُ الْعَامِلِ فِي الْمَالِ، فِي سَفَرِهِ مِنْ طَعَامِهِ وَكِسْوَتِهِ، وَمَا يُصْلِحُهُ بِالْمَعْرُوفِ، بِقَدْرِ الْمَالِ إِذَا شَخَصَ فِي الْمَالِ، إِذَا كَانَ الْمَالُ يَحْمِلُ ذَلِكَ، فَإِنْ كَانَ مُقِيمًا فِي أَهْلِهِ، فَلاَ نَفَقَةَ لَهُ مِنَ الْمَالِ، وَلاَ كِسْوَةَ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: شێوازی مامەڵەی قازانجی هاوبەشی ناسراوی دروست ئەوەیە: کەسێك ماڵ و سەروەتی هاوڕێکەی وەربگرێت بۆ ئەوەی کاری پێ بکات و زەمانیشی لەسەر نەبێ و مەسرەفی کارکەرەکە (ئەوەی کار بە ماڵەکە دەکات) لەسەر ماڵ و سەروەتەکە بێت لە سەفەرەکەیدا لە خواردن و پۆشاك و ئەوەی دەگونجێ بەگوێرەی نەریتی مامەڵەکە (بێ زیادەڕەوی)، بەگوێرەی ماڵ و سەروەتەکە (لەو حاڵەتەدا) ئەگەر سەفەری بە ماڵەکە کرد (چونکە سەفەر مەسرەفی دەوێ)، (بە مەرجێك) ئەگەر ماڵەکە بەرگەی ئەو مەسرەفەی دەگرت، (بەڵام) ئەگەر لەناو خانەوادە و ناوچەی خۆی دەمایەوە (لەوێ مامەڵەکەی دەکرد)، ئەوە (کارکەرەکە) نە مەسرەف و نە پۆشاکی بۆ نییە لەسەر حیسابی دەستمایەکە.

**٢٠١٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُعِينَ الْمُتَقَارِضَانِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَلَى وَجْهِ الْمَعْرُوفِ، إِذَا صَحَّ ذَلِكَ مِنْهُمَا[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە لەوەی دوو بەژدارەکانی مامەڵەی قازانجی هاوبەش هەر یەکەیان یارمەتی ئەوەی دیکە بدات بەشێوازێکی چاك، ئەگەر بۆ هەردووکیان دروست بێ (واتە ئەگەر بەبێ مەرج ئەو یارمەتییەی یەکدی بدەن).

---

(١) ـ مَا يَجُوزُ فِي الْقِرَاضِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣١ في القراض، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤١ في القراض، عن مالك به.




**٢٠١١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يَشْتَرِيَ رَبُّ الْمَالِ مِمَّنْ قَارَضَهُ بَعْضَ مَا يَشْتَرِي مِنَ السِّلَعِ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ صَحِيحًا عَلَى غَيْرِ شَرْطٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە بەوەی خاوەنی ماڵ و سەروەتەکە کاڵایێك لەو کەسە بکڕێت کە مامەڵەی قازانجی هاوبەشی لەگەڵ دەکات لەو کاڵایەی کڕیویەتی بۆ قازانج، (بە مەرجێك) ئەگەر بەدروستی کارەکە بکات بەبێ مەرج (واتە پەیوەندی بە قازانجەکەوە نەبێت و زەرەر لە قازانجەکە نەدات، بەوەی بەهەرزانی بیبات).

**٢٠١٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ، وَإِلَى غُلاَمٍ لَهُ، مَالاً قِرَاضًا يَعْمَلاَنِ فِيهِ جَمِيعًا، إِنَّ ذَلِكَ جَائِزٌ لاَ بَأْسَ بِهِ، لأَنَّ الرِّبْحَ مَالٌ لِغُلاَمِهِ، لاَ يَكُونُ الرِّبْحُ لِلسَّيِّدِ، حَتَّى يَنْتَزِعَهُ مِنْهُ، وَهُوَ بِمَنْزِلَةِ غَيْرِهِ مِنْ كَسْبِهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵ و سەروەت بۆ قازانجی هاوبەش بداتە کەسێك و کۆیلەکەی خۆی تا بەیەکەوە کاری پێ بکەن، گوتوویەتی: ئەوە دروستە و کێشەی نییە، چونکە قازانجەکە ماڵ و سەروەتە بۆ کۆیلەکەی، قازانجەکە بۆ گەورەکە نییە تا لێی بسەنێتەوە، ئەو وەك کەسی دیکە وایە لە کەسابەتی خۆی.

### ٣- ئەوەی دروست نییە لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[٢]

**٢٠١٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى رَجُلٍ دَيْنٌ، فَسَأَلَهُ أَنْ يُقِرَّهُ عِنْدَهُ قِرَاضًا، إِنَّ ذَلِكَ يُكْرَهُ حَتَّى يَقْبِضَ مَالَهُ، ثُمَّ يُقَارِضُهُ بَعْدُ أَوْ يُمْسِكُ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ مَخَافَةَ أَنْ يَكُونَ أَعْسَرَ بِمَالِهِ، فَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُؤَخِّرَ ذَلِكَ، عَلَى أَنْ يَزِيدَهُ فِيهِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك قەرزی لەسەر کەسێك هەبێ و داوای لێ بکات قەرزەکە لەلای خۆی بهێڵێتەوە بۆ مامەڵەی

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤٢ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا يَجُوزُ فِي الْقِرَاضِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤٩ في القراض، عن مالك به.

قازانجی هاوبەش، ئەوە دروست نییە تا پارەکەی وەردەگرێتەوە، دواتر دوای ئەوە (بۆی هەیە) مامەڵەی قازانجی هاوبەشی لەگەڵ بکات یان بیگرێتەوە (مامەڵەکە نەکات)، ئەوەش لەبەر ترسی ئەوەیە نەوەك نەیبێت پارەکەی بداتەوە بۆیە بیەوێ دوای بخات بۆ ئەوەی (بەهۆی قازانجی هاوبەش) بۆی زیاد بکات (وەك ڕیبا).

٢٠١٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَهَلَكَ بَعْضُهُ، قَبْلَ أَنْ يَعْمَلَ فِيهِ، ثُمَّ عَمِلَ فِيهِ فَرَبِحَ، فَأَرَادَ أَنْ يَجْعَلَ رَأْسَ الْمَالِ بَقِيَّةَ الْمَالِ بَعْدَ الَّذِي هَلَكَ مِنْهُ، قَبْلَ أَنْ يَعْمَلَ فِيهِ، قَالَ مَالِكٌ: لاَ يُقْبَلُ قَوْلُهُ، وَيُجْبَرُ رَأْسُ الْمَالِ مِنْ رِبْحِهِ، ثُمَّ يَقْتَسِمَانِ مَا بَقِيَ بَعْدَ رَأْسِ الْمَالِ عَلَى شَرْطِهِمَا مِنَ الْقِرَاضِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵ و سەروەتێك بۆ قازانجی هاوبەش دەدات بە کەسێك و هەندێك لە سامانەکە لەناو دەچێت بەر لەوەی کاری پێ بکات، دواتر کاری پێ بکات و قازانج بکات، جا بیەوێ ئەو ماڵەی لە کاتی کارکردن مابوویەوە بیکات بە سەرمایەی بابەتەکە دوای لەناوچوونی بەشەکە پێش کارکردنەکە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: قسەی کارکەرەکە وەرناگیرێت و سەرمایەکە بە قازانجەکە پڕ دەکرێتەوە (واتە سەرەتا چەندی پێ داوە دەبێ ئەوەندە بە سەرمایە حیساب بکرێت)، دواتر ئەوەی دوای سەرمایە لە قازانجەکەدا دەمێنێتەوە دابەش دەکرێت بەپێی مەرجی ئەو قازانجەی بۆ یەکدی دایانناوە.

٢٠١٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَصْلُحُ الْقِرَاضُ إِلاَّ فِي الْعَيْنِ مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ، وَلاَ يَكُونُ فِي شَيْءٍ مِنَ الْعُرُوضِ، وَالسِّلَعِ، وَمِنَ الْبُيُوعِ مَا يَجُوزُ إِذَا تَفَاوَتَ أَمْرُهُ، وَتَفَاحَشَ رَدُّهُ، فَأَمَّا الرِّبَا، فَإِنَّهُ لاَ يَكُونُ فِيهِ إِلاَّ الرَّدُّ أَبَدًا، وَلاَ يَجُوزُ مِنْهُ قَلِيلٌ، وَلاَ كَثِيرٌ، وَلاَ يَجُوزُ فِيهِ مَا يَجُوزُ فِي غَيْرِهِ، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٤ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣٧ في القراض، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مامەڵەی قازانجی هاوبەش دروست نییە تەنها بە خودی پارە نەبێت لە زێڕ و زیو، بە کەلوپەل و کاڵا دروست نییە، جا هەندێك لە مامەڵەی ناپەسەند هەیە بەڕێ دەکرێت ئەگەر جیاواز بوو و گەڕاندنەوەی زۆر زەرەربەخش بوو، بەڵام هەرچی ڕیبایە تەنها و تەنها دەبێ بگەڕێندرێتەوە و هەڵبوەشێندرێتەوە و نە کەم و نە زۆری بەڕێ ناکرێت و ڕێگەی پێ نادرێت، ئەوەی لە شتی دیکەدا ڕێگەی پێ دەدرێت لە ڕیبادا ڕێگەی پێ نادرێت، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة، واتە: [ئەگەر تەوبەتان کرد و لە ڕیبا پەشیمان بوونەوە ئەوە تەنها سەرمایەکانتان هی ئێوەیە نە ستەم بکەن و نە ستەمتان لێ دەکرێ]، (کەواتە مامەڵەی قازانجی هاوبەشی ناپەسەند دوای دەستپێکردنی ڕێگەی پێ دەدرێت، تا زەرەری زۆر دروست نەبێت، بەڵام مامەڵەی قازانجی هاوبەشی حەرام بەڕێ ناکرێت و ڕێگەی پێ نادرێت دەگەڕێندرێتەوە و هەڵدەوەشێنرێتەوە وەك ڕیبا).

## ٤- ئەوەی دروستە لە مەرج لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[١]

٢٠١٦- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، وَشَرَطَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ تَشْتَرِيَ بِمَالِي إِلاَّ سِلْعَةَ كَذَا وَكَذَا، أَوْ يَنْهَاهُ أَنْ يَشْتَرِيَ سِلْعَةً بِاسْمِهَا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنِ اشْتَرَطَ عَلَى مَنْ قَارَضَ أَنْ لاَ يَشْتَرِيَ حَيَوَانًا أَوْ سِلْعَةً بِاسْمِهَا، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، وَمَنِ اشْتَرَطَ عَلَى مَنْ قَارَضَ أَنْ لاَ يَشْتَرِيَ إِلاَّ سِلْعَةَ كَذَا وَكَذَا، فَإِنَّ ذَلِكَ مَكْرُوهٌ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ السِّلْعَةُ الَّتِي أَمَرَهُ أَنْ لاَ يَشْتَرِيَ غَيْرَهَا كَثِيرَةً مَوْجُودَةً لاَ تُخْلِفُ فِي شِتَاءٍ وَلاَ صَيْفٍ، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵێك بدات بە کەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و مەرجی لەسەر دابنێ بەوەی نابێ بە ماڵ و سەروەتی من هیچ بکڕی تەنها فڵان کاڵا و فڵان کاڵا نەبێ، یان ڕێگری لێ بکات لە کاڵایێك بە ناوهێنانی کاڵاکە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی:

---

(١) ـ مَا يَجُوزُ مِنَ الشَّرْطِ فِي الْقِرَاضِ.




هەر كەسێك مەرجی دانا لەسەر ئەو كەسەی مامەڵەی قازانجی هاوبەشی لەگەڵ دەكات بەوەی جۆرە ئاژەڵێك یان كاڵایێك نەكڕێت (جا) ناوی شتەكەی بۆ بێنێت، ئەوە كێشە نییە (مەرجەكە قبووڵە، چونكە هێشتا زۆر شت دەمێنێتەوە مامەڵەی پێوە بكرێت)، وە هەر كەسێك مەرج لەسەر ئەو كەسە دابنێت كە مامەڵەی قازانجی هاوبەشی لەگەڵ دەكات بەوەی نابێ هیچ بكڕێت جگە لە فڵان شت و فڵان شت، ئەوە دروست نییە (چونكە بەرتەسكی زۆر دروست دەبێت و تەنها ئەو كاڵایە دەمێنێتەوە بۆ مامەڵەپێوەكردن)، تەنها لەو كاتە نەبێت كە ئەو كاڵایەی فەرمانی پێ كردووە كە نابێ جگە لەو بكڕی زۆر بێت و دەست بكەوێت و لە زستان و هاویندا نەگۆڕێت (هەر پێویست بێت)، ئەوە كێشە نییە (لەو حاڵەتەدا دروستە).

**٢٠١٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، وَاشْتَرَطَ عَلَيْهِ فِيهِ شَيْئًا مِنَ الرِّبْحِ خَالِصًا دُونَ صَاحِبِهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، وَإِنْ كَانَ دِرْهَمًا وَاحِدًا، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ نِصْفَ الرِّبْحِ لَهُ، وَنِصْفَهُ لِصَاحِبِهِ، أَوْ ثُلُثَهُ أَوْ رُبُعَهُ أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرَ، فَإِذَا سَمَّى شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ قَلِيلاً أَوْ كَثِيرًا، فَإِنَّ كُلَّ شَيْءٍ سَمَّى مِنْ ذَلِكَ حَلاَلٌ، وَهُوَ قِرَاضُ الْمُسْلِمِينَ.

قَالَ: وَلَكِنْ إِنِ اشْتَرَطَ أَنَّ لَهُ مِنَ الرِّبْحِ دِرْهَمًا وَاحِدًا فَمَا فَوْقَهُ خَالِصًا لَهُ دُونَ صَاحِبِهِ، وَمَا بَقِيَ مِنَ الرِّبْحِ فَهُوَ بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، وَلَيْسَ عَلَى ذَلِكَ قِرَاضُ الْمُسْلِمِينَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانج و مەرجی قازانجێكی لەسەر دابنێ بەوەی دەبێ بەتەنها بۆ خۆی بێ بەبێ بەرانبەرەكەی (واتە بەبێ ئەو كەسەی كە لەگەڵی بەژدارە لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش)، ئەوە دروست نییە، هەرچەندە یەك درهەمیش بێت، تەنها ئەوە نەبێ ئەگەر مەرج دابنێ نیوەی قازانج بۆ خۆی بێ و نیوە یان سێیەك یان چواریەك یان كەمتر یان زیاتر بۆ بەرانبەرەكەی بێ (ئەوە دروستە، گرنگ ئەوەیە هەردوولا قازانجیان بەر بكەوێ)، جا ئەگەر ناوی ئەندازەیەك لە قازانجی هێنا جا كەم بێ یان زۆر، ئەوە ناوی هەر ئەندازەیەك بێنێ حەڵاڵ و دروستە و بریتییە لە قازانجی هاوبەشی مسوڵمانان.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣٤ في القراض، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵام ئەگەر مەرج دابنێ یەك درهەم و بەسەرەوە لە قازانجەکە بەتەنها بۆ خۆی بێت بەبێ بەرانبەرەکەی و ئەوەیشی کە دوای ئەوە لە قازانجەکە دەمێنێتەوە بە هاوبەشی بۆ هەردووکیان بێت، ئەوە دروست نییە و مامەڵەی قازانجی هاوبەشی مسوڵمانان نییە.

## ٥- ئەوەی دروست نییە لە مەرجدانان لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[١]

**٢٠١٨- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي لِصَاحِبِ الْمَالِ أَنْ يَشْتَرِطَ لِنَفْسِهِ شَيْئًا مِنَ الرِّبْحِ خَالِصًا، دُونَ الْعَامِلِ، وَلاَ يَنْبَغِي لِلْعَامِلِ أَنْ يَشْتَرِطَ لِنَفْسِهِ شَيْئًا مِنَ الرِّبْحِ خَالِصًا، دُونَ صَاحِبِهِ، وَلاَ يَكُونُ مَعَ الْقِرَاضِ بَيْعٌ، وَلاَ كِرَاءٌ، وَلاَ عَمَلٌ، وَلاَ سَلَفٌ، وَلاَ مِرْفَقٌ يَشْتَرِطُهُ أَحَدُهُمَا لِنَفْسِهِ دُونَ صَاحِبِهِ، إِلاَّ أَنْ يُعِينَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ عَلَى غَيْرِ شَرْطٍ، عَلَى وَجْهِ الْمَعْرُوفِ، إِذَا صَحَّ ذَلِكَ مِنْهُمَا، وَلاَ يَنْبَغِي لِلْمُتَقَارِضَيْنِ أَنْ يَشْتَرِطَ أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ زِيَادَةً، مِنْ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ وَلاَ طَعَامٍ، وَلاَ شَيْءٍ مِنَ الأَشْيَاءِ، يَزْدَادُهُ أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ، قَالَ: فَإِنْ دَخَلَ الْقِرَاضَ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ، صَارَ إِجَارَةً، وَلاَ تَصْلُحُ الإِجَارَةُ إِلاَّ بِشَيْءٍ ثَابِتٍ مَعْلُومٍ، وَلاَ يَنْبَغِي لِلَّذِي أَخَذَ الْمَالَ أَنْ يَشْتَرِطَ مَعَ أَخْذِهِ الْمَالَ، أَنْ يُكَافِئَ، وَلاَ يُوَلِّيَ مِنْ سِلْعَتِهِ أَحَدًا، وَلاَ يَتَوَلَّى مِنْهَا شَيْئًا لِنَفْسِهِ، قَالَ: فَإِذَا وَفَرَ الْمَالُ، وَحَصَلَ عَزْلُ رَأْسِ الْمَالِ، ثُمَّ اقْتَسَمَا الرِّبْحَ عَلَى شَرْطِهِمَا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لِلْمَالِ رِبْحٌ، أَوْ دَخَلَتْهُ وَضِيعَةٌ، لَمْ يَلْحَقِ الْعَامِلَ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، لاَ مِمَّا أَنْفَقَ عَلَى نَفْسِهِ، وَلاَ مِنَ الْوَضِيعَةِ، وَذَلِكَ عَلَى رَبِّ الْمَالِ فِي مَالِهِ، وَالْقِرَاضُ جَائِزٌ عَلَى مَا تَرَاضَى عَلَيْهِ رَبُّ الْمَالِ وَالْعَامِلُ، مِنْ نِصْفِ الرِّبْحِ أَوْ ثُلُثِهِ أَوْ رُبُعِهِ أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرَ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ خاوەنی ماڵ و پارەکە هیچ لە قازانجەکە بەتەنها بۆ خۆی بە مەرج بگرێت، بەبێ کارکەرەکە (بەبێ بەژدارییپێکردنی ئەو کەسەی کاری مامەڵەکەی لەگەڵ دەکات لە قازانجەکە)، وە بۆ کارکەرەکەش نییە هیچ لە قازانجەکە بەتەنها بۆ خۆی بە مەرج بگرێت، بەبێ هاوبەشەکەی (بەشێوەیەك هاوبەشەکەی بۆی نەبێت)، وە

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الشَّرْطِ فِي الْقِرَاضِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣٢ في القراض، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵام ئەگەر مەرج دابنێ یەك درهەم و بەسەرەوە لە قازانجەکە بەتەنها بۆ خۆی بێت بەبێ بەرانبەرەکەی و ئەوەیشی کە دوای ئەوە لە قازانجەکە دەمێنێتەوە بە هاوبەشی بۆ هەردووکیان بێت، ئەوە دروست نییە و مامەڵەی قازانجی هاوبەشی مسوڵمانان نییە.

## ٥- ئەوەی دروست نییە لە مەرجدانان لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[١]

٢٠١٨- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي لِصَاحِبِ الْمَالِ أَنْ يَشْتَرِطَ لِنَفْسِهِ شَيْئًا مِنَ الرِّبْحِ خَالِصًا، دُونَ الْعَامِلِ، وَلاَ يَنْبَغِي لِلْعَامِلِ أَنْ يَشْتَرِطَ لِنَفْسِهِ شَيْئًا مِنَ الرِّبْحِ خَالِصًا، دُونَ صَاحِبِهِ، وَلاَ يَكُونُ مَعَ الْقِرَاضِ بَيْعٌ، وَلاَ كِرَاءٌ، وَلاَ عَمَلٌ، وَلاَ سَلَفٌ، وَلاَ مِرْفَقٌ يَشْتَرِطُهُ أَحَدُهُمَا لِنَفْسِهِ دُونَ صَاحِبِهِ، إِلاَّ أَنْ يُعِينَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ عَلَى غَيْرِ شَرْطٍ، عَلَى وَجْهِ الْمَعْرُوفِ، إِذَا صَحَّ ذَلِكَ مِنْهُمَا، وَلاَ يَنْبَغِي لِلْمُتَقَارِضَيْنِ أَنْ يَشْتَرِطَ أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ زِيَادَةً، مِنْ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ وَلاَ طَعَامٍ، وَلاَ شَيْءٍ مِنَ الأَشْيَاءِ، يَزْدَادُهُ أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ، قَالَ: فَإِنْ دَخَلَ الْقِرَاضَ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ، صَارَ إِجَارَةً، وَلاَ تَصْلُحُ الإِجَارَةُ إِلاَّ بِشَيْءٍ ثَابِتٍ مَعْلُومٍ، وَلاَ يَنْبَغِي لِلَّذِي أَخَذَ الْمَالَ أَنْ يَشْتَرِطَ مَعَ أَخْذِهِ الْمَالَ، أَنْ يُكَافِئَ، وَلاَ يُوَلِّيَ مِنْ سِلْعَتِهِ أَحَدًا، وَلاَ يَتَوَلَّى مِنْهَا شَيْئًا لِنَفْسِهِ، قَالَ: فَإِذَا وَفَرَ الْمَالُ، وَحَصَلَ عَزْلُ رَأْسِ الْمَالِ، ثُمَّ اقْتَسَمَا الرِّبْحَ عَلَى شَرْطِهِمَا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لِلْمَالِ رِبْحٌ، أَوْ دَخَلَتْهُ وَضِيعَةٌ، لَمْ يَلْحَقِ الْعَامِلَ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، لاَ مِمَّا أَنْفَقَ عَلَى نَفْسِهِ، وَلاَ مِنَ الْوَضِيعَةِ، وَذَلِكَ عَلَى رَبِّ الْمَالِ فِي مَالِهِ، وَالْقِرَاضُ جَائِزٌ عَلَى مَا تَرَاضَى عَلَيْهِ رَبُّ الْمَالِ وَالْعَامِلُ، مِنْ نِصْفِ الرِّبْحِ أَوْ ثُلُثِهِ أَوْ رُبُعِهِ أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرَ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ خاوەنی ماڵ و پارەکە هیچ لە قازانجەکە بەتەنها بۆ خۆی بە مەرج بگرێت، بەبێ کارکەرەکە (بەبێ بەژداریپێکردنی ئەو کەسەی کاری مامەڵەکەی لەگەڵ دەکات لە قازانجەکە)، وە بۆ کارکەرەکەش نییە هیچ لە قازانجەکە بەتەنها بۆ خۆی بە مەرج بگرێت، بەبێ هاوبەشەکەی (بەشێوەیەك هاوبەشەکەی بۆی نەبێت)، وە

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الشَّرْطِ فِي الْقِرَاضِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣٢ في القراض، عن مالك به.

نابێ لەگەڵ مامەڵەی قازانجی هاوبەش مامەڵە یان کرێ یان کار یان قەرز هەبێت، وە نابێ هیچ یەکێکیان خزمەتگوزارییێك و بەرژەوەندییێك بەتەنها بۆ خۆی بە مەرج بگرێت بەبێ هاوبەشەکەی، تەنها ئەوە نەبێ خۆیان یارمەتی هاوبەشەکەیان بدەن بەبێ مەرج، لەسەر بنەمای چاکەخوازی، ئەگەر لە شتێکی دروست ئەنجامیان دا، وە بۆ هیچ کامێك لە هاوبەشەکان نابێ زیادەیەك لەسەر هاوبەشەکەی بە مەرج بگرێت، نە لە زێڕ و نە لە زیو و نە لە خواردن و نە لە هیچ شتێك لە شتەکان، کە یەکێکیان لەسەر ئەوەی دی زیادی بکات، ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: جا ئەگەر شتێك لەو بابەتە کەوتە ناو مامەڵەی قازانجی هاوبەش، ئەوە دەبێتە کرێ، کرێش دروست نییە تەنها بە شتێکی جێگیر و زانراو و دیاریکراو نەبێت، وە ئەو کەسەش کە ماڵەکەی وەرگرتووە نابێ لەگەڵ وەرگرتنی ماڵەکە مەرج دابنێت بەوەی پاداشت بدرێتەوە (واتە مەرج دابنێت دیارییەکی پێ بدرێت)، وە نابێ کەس بکاتە سەرپەرشتیاری کاڵاکە و نابێ هیچ لە کاڵاکە بۆ خۆی دابنێ، ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەگەر ماڵەکە زیاد بوو و سەرمایەکە جیا کرایەوە ئەوە قازانجەکە لەسەر مەرجی سەرەتای خۆیان دابەش دەکەن، وە ئەگەر ماڵەکە قازانجی نەبوو یان کەمی تێ کەوتبوو، ئەوە هیچ لە کەمییەکە بەر کارکەرەکە ناکەوێ (هیچ لە زەرەرەکە ناخاتە سەر خۆی)، نە لەوەی بۆ خۆی سەرفی کردووە (لە خواردن و پۆشاك)، نە لەوەشی کە کەمی کردووە و زەرەر هەبووە (چونکە کارکەرەکەش کات و ماندووبوونی زەرەر کردووە)، (بەڵکوو) ئەوە لەسەر خاوەن ماڵەکەیە، جا مامەڵەی قازانجی هاوبەش دروستە بەپێی ڕێککەوتنی خاوەن ماڵ و کارکەرەکە لەسەر نیوەی قازانج یان سێیەك یان چواریەك یان کەمتر یان زیاتر (بەپێی ڕێککەوتنی سەرەتا).

**٢٠١٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷬: لاَ يَجُوزُ لِلَّذِي يَأْخُذُ الْمَالَ قِرَاضًا أَنْ يَشْتَرِطَ أَنْ يَعْمَلَ فِيهِ سِنِينَ لاَ يُنْزَعُ مِنْهُ، قَالَ: وَلاَ يَصْلُحُ لِصَاحِبِ الْمَالِ أَنْ يَشْتَرِطَ أَنَّكَ لاَ تَرُدُّهُ إِلَيَّ سِنِينَ، لأَجَلٍ يُسَمِّيَانِهِ، لأَنَّ الْقِرَاضَ لاَ يَكُونُ إِلَى أَجَلٍ، وَلَكِنْ يَدْفَعُ رَبُّ الْمَالِ مَالَهُ إِلَى الَّذِي يَعْمَلُ لَهُ فِيهِ، فَإِنْ بَدَا لأَحَدِهِمَا أَنْ يَتْرُكَ ذَلِكَ، وَالْمَالُ نَاضٌّ لَمْ يَشْتَرِ بِهِ شَيْئًا، تَرَكَهُ، وَأَخَذَ صَاحِبُ الْمَالِ مَالَهُ،





وَإِنْ بَدَا لِرَبِّ الْمَالِ أَنْ يَقْبِضَهُ، بَعْدَ أَنْ يَشْتَرِيَ بِهِ سِلْعَةً، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُ، حَتَّى يُبَاعَ الْمَتَاعُ، وَيَصِيرَ عَيْنًا، فَإِنْ بَدَا لِلْعَامِلِ أَنْ يَرُدَّهُ، وَهُوَ عَرْضٌ، لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ لَهُ، حَتَّى يَبِيعَهُ، فَيَرُدَّهُ عَيْنًا كَمَا أَخَذَهُ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ ئەو کەسە دروست نییە کە ماڵ بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش وەردەگرێ مەرج دابنێ بەوەی دەبێ چەند ساڵێك کاری پێ بکات و لێی نەسەندرێتەوە، گوتوویەتی: وە بۆ خاوەن ماڵەکەش دروست نییە مەرج دابنێت بەوەی بڵێت: تا چەند ساڵی دیکە مەیگەڕێنەوە بۆم، ناوی کاتێك بێنن، چونکە مامەڵەی قازانجی هاوبەش نابێ بۆ کاتێکی دیاریکراو بێت، بەڵکوو خاوەن ماڵەکە ماڵەکەی دەدات بەو کەسەی کاری پێ دەکات، جا ئەگەر یەکێکیان پێی وا بوو باشە وازبێنێ و ماڵەکەش هێشتا پارەی لەسکەدراو بوو هیچی پێ نەکرابوو، ئەوە واز دێنێت (بۆی هەیە) و خاوەن ماڵەکە ماڵەکەی وەردەگرێتەوە، وە ئەگەر خاوەن ماڵ پێی باش بوو ماڵەکەی وەربگرێتەوە دوای ئەوەی کاڵای پێ کڕابوو (پارە نەمابوو ببوو بە کاڵا)، ئەوە بۆی نییە، تاوەکوو کاڵایەکان دەفرۆشرێن و دەبنەوە پارە، وە ئەگەر کارکەرەکە پێی باش بوو ماڵەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە لە کاتێکدا ببوو بە کاڵا، ئەوە بۆی نییە، تاوەکوو دەیفرۆشێت و پارەی بۆ دەگەڕێنێتەوە وەك چۆن پارەی وەرگرتبوو.

**٢٠٢٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَصْلُحُ لِمَنْ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَيْهِ الزَّكَاةَ فِي حِصَّتِهِ مِنَ الرِّبْحِ خَاصَّةً، لأَنَّ رَبَّ الْمَالِ، إِذَا اشْتَرَطَ ذَلِكَ، فَقَدِ اشْتَرَطَ لِنَفْسِهِ فَضْلاً مِنَ الرِّبْحِ ثَابِتًا، فِيمَا سَقَطَ عَنْهُ مِنْ حِصَّةِ الزَّكَاةِ، الَّتِي تُصِيبُهُ مِنْ حِصَّتِهِ، وَلاَ يَجُوزُ لِرَجُلٍ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَى مَنْ قَارَضَهُ، أَنْ لاَ يَشْتَرِيَ إِلاَّ مِنْ فُلاَنٍ، لِرَجُلٍ يُسَمِّيهِ، فَذَلِكَ غَيْرُ جَائِزٍ، لأَنَّهُ يَصِيرُ لَهُ رَسُولاً بِأَجْرٍ لَيْسَ بِمَعْرُوفٍ(٢).

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دروست نییە بۆ کەسێك سەروەتێك بدات بە کەسێك بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش بەوەی لەسەری بە مەرج بگرێ زەکاتی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣٩ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣٥ في القراض، عن مالك به.




سەروەتەکە بەتەنها لە پشکی قازانجی خۆی بدات (ئەوە حەڕامە و دروست نییە)، چونکە ئەگەر خاوەن ماڵ ئەوە بە مەرج دابنێ ئەوە دەکا زیادەیەکی جێگیری بۆ خۆی بە مەرج داناوە لە قازانجەکە، لەوەی لەسەری لادەچێت لە پشکی زەکات کە بەر پشکی خۆی دەکەوێت، وە بۆ کەسێك دروست نییە مەرج لەسەر ئەو کەسە دابنێت کە مامەڵەی قازانجی هاوبەشی لەگەڵ دەکات بەوەی نابێ شتومەك لە کەس بکڕێت تەنها فلان کەس نەبێت، ناوی کەسەکە بێنێت، ئەوە دروست نییە، چونکە بەو شێوەیە کەسەکە (لەبری ئەوەی ببێتە هاوبەش لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش) دەبێتە بەکرێگیراو بە کرێیەکی نادیار (ئەوەش دروست نییە).

**٢٠٢١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَدْفَعُ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، وَيَشْتَرِطُ عَلَى الَّذِي دَفَعَ إِلَيْهِ الْمَالَ الضَّمَانَ، قَالَ: لاَ يَجُوزُ لِصَاحِبِ الْمَالِ أَنْ يَشْتَرِطَ فِي مَالِهِ غَيْرَ مَا وُضِعَ الْقِرَاضُ عَلَيْهِ، وَمَا مَضَى مِنْ سُنَّةِ الْمُسْلِمِينَ فِيهِ، فَإِنْ نَمَا الْمَالُ عَلَى شَرْطِ الضَّمَانِ، كَانَ قَدِ ازْدَادَ فِي حَقِّهِ مِنَ الرِّبْحِ، مِنْ أَجْلِ مَوْضِعِ الضَّمَانِ، وَإِنَّمَا يَقْتَسِمَانِ الرِّبْحَ عَلَى مَا لَوْ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ عَلَى غَيْرِ ضَمَانٍ، وَإِنْ تَلِفَ الْمَالُ لَمْ أَرَ عَلَى الَّذِي أَخَذَهُ ضَمَانًا، لأَنَّ شَرْطَ الضَّمَانِ فِي الْقِرَاضِ بَاطِلٌ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵ و سامانێك دەدات بە کەسێك بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش و مەرجی زەمانەت لەسەر ئەو کەسە دابنێ کە ماڵەکەی پێ داوە، گوتوویەتی: بۆ خاوەن ماڵەکە دروست نییە مەرجێك بۆ ماڵەکەی دابنێ جگە لەو مەرجانەی مامەڵەی قازانجی هاوبەشی لەسەر دامەزراوە و ڕێبازی مسوڵمانانی لەسەر جێگیر بووە، جا ئەگەر ماڵەکە زیاد بوو لەسەر مەرجی زەمانەت، ئەوە دەکا پشکی خۆی زیاد کردووە لە قازانجەکە بەهۆی زەمانەتەکە، جا ئەوان قازانجەکە دابەش دەکەن لەسەر ئەو بنەمایەی ئەگەر بەبێ زەمانەت بیداتێ چۆنە ئاوا دەبێت، وە ئەگەر ماڵەکە بفەوتێ پێم وا نییە ئەو کەسەی ماڵەکەی وەرگرتووە زەمانەتی لەسەر بێ، چونکە مەرجی زەمانەت لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش باتڵ و قبووڵنەکراوە (حیسابی بۆ ناکرێ).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤٤ في القراض، عن مالك به.

٢٠٢٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، وَاشْتَرَطَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَبْتَاعَ بِهِ إِلاَّ نَخْلاً أَوْ دَوَابَّ، لأَجْلِ أَنَّهُ يَطْلُبُ ثَمَرَ النَّخْلِ أَوْ نَسْلَ الدَّوَابِّ، وَيَحْبِسُ رِقَابَهَا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَجُوزُ هَذَا، وَلَيْسَ هَذَا مِنْ سُنَّةِ الْمُسْلِمِينَ فِي الْقِرَاضِ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِيَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبِيعَهُ كَمَا يُبَاعُ غَيْرُهُ مِنَ السِّلَعِ.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵ و سامانێك دەدات بە کەسێك بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش و مەرجی لەسەر دادەنێت بەوەی نابێ هیچی پێ بکرێت تەنها دارخورما یان ئاژەڵ نەبێت، بۆ مەبەستی بەروبوومی دارخورما و بێچووی ئاژەڵ، وە بیەوێ ئەصڵی دارخورما و ئاژەڵەکان نەفرۆشێت و بیانهێڵێتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە دروست نییە و لە ڕێبازی مسوڵمانان نییە لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا، تەنها ئەو کاتە نەبێت بیانکڕێت دواتر بیانفرۆشێت وەك چۆن کاڵای دیکە دەفرۆشرێت.

٢٠٢٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُقَارِضُ عَلَى رَبِّ الْمَالِ غُلاَمًا يُعِينُهُ بِهِ، عَلَى أَنْ يَقُومَ مَعَهُ الْغُلاَمُ فِي الْمَالِ، إِذَا لَمْ يَعْدُ أَنْ يُعِينَهُ فِي الْمَالِ، لاَ يُعِينُهُ فِي غَيْرِهِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە کارکەرەکەی مامەڵەی قازانجی هاوبەش مەرج لەسەر خاوەن سەروەتەکە دابنێ بەوەی دەبێ خزمەتکارێکی بۆ پەیدا بکات یارمەتی بدات، لەسەر ئەوەی خزمەتکارەکە لەگەڵی ئیش و کاری ماڵەکە بەڕێوە ببات (ئەوە دروستە)، (بە مەرجێك) ئەگەر لە یارمەتیدانی سەروەتەکە بەولاوە تێ نەپەڕێت، نابێ یارمەتی بدات لە شتی دیکەی غەیری ماڵ و سەروەتەکە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤٣ في القراض، عن مالك به.




## ٦- مامەڵەی قازانجی هاوبەش لە کاڵادا(١)

**٢٠٢٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يُقَارِضَ أَحَدًا إِلاَّ فِي الْعَيْنِ، وَلاَ تَنْبَغِي الْمُقَارَضَةُ فِي الْعُرُوضِ، لأَنَّ الْمُقَارَضَةَ فِي الْعُرُوضِ إِنَّمَا تَكُونُ عَلَى أَحَدِ وَجْهَيْنِ: إِمَّا أَنْ يَقُولَ لَهُ صَاحِبُ الْعَرْضِ، خُذْ هَذَا الْعَرْضَ فَبِعْهُ، فَمَا خَرَجَ مِنْ ثَمَنِهِ فَاشْتَرِ بِهِ، وَبِعْ عَلَى وَجْهِ الْقِرَاضِ، فَقَدِ اشْتَرَطَ صَاحِبُ الْمَالِ فَضْلاً لِنَفْسِهِ مِنْ بَيْعِ سِلْعَتِهِ، وَمَا يَكْفِيهِ مِنْ مَؤُونَتِهَا، أَوْ يَقُولَ: اشْتَرِ بِهَذِهِ السِّلْعَةِ وَبِعْ، فَإِذَا فَرَغْتَ، فَابْتَعْ لِي مِثْلَ عَرْضِي الَّذِي دَفَعْتُ إِلَيْكَ، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ، فَهُوَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ، وَلَعَلَّ صَاحِبَ الْعَرْضِ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى الْعَامِلِ فِي زَمَنٍ هُوَ فِيهِ نَافِقٌ، كَثِيرُ الثَّمَنِ، ثُمَّ يَرُدَّهُ الْعَامِلُ حِينَ يَرُدُّهُ وَقَدْ رَخُصَ، فَيَشْتَرِيَهُ بِثُلُثِ ثَمَنِهِ، أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ، فَيَكُونُ الْعَامِلُ قَدْ رَبِحَ نِصْفَ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِ الْعَرْضِ، فِي حِصَّتِهِ مِنَ الرِّبْحِ، أَوْ يَأْخُذَ الْعَرْضَ فِي زَمَانٍ ثَمَنُهُ فِيهِ قَلِيلٌ، فَيَعْمَلُ فِيهِ حَتَّى يَكْثُرَ الْمَالُ فِي يَدَيْهِ، ثُمَّ يَغْلُو ذَلِكَ الْعَرْضُ، وَيَرْتَفِعُ ثَمَنُهُ حِينَ يَرُدُّهُ، فَيَشْتَرِيهِ بِكُلِّ مَا فِي يَدَيْهِ، فَيَذْهَبُ عَمَلُهُ وَعِلاَجُهُ بَاطِلاً، فَهَذَا غَرَرٌ لاَ يَصْلُحُ، فَإِنْ جُهِلَ ذَلِكَ حَتَّى يَمْضِيَ، نُظِرَ إِلَى قَدْرِ أَجْرِ الَّذِي دُفِعَ إِلَيْهِ الْقِرَاضُ، فِي بَيْعِهِ إِيَّاهُ، وَعِلاَجِهِ فَيُعْطَاهُ، ثُمَّ يَكُونُ الْمَالُ قِرَاضًا مِنْ يَوْمَ نَضَّ، وَاجْتَمَعَ عَيْنًا، وَيُرَدُّ إِلَى قِرَاضِ مِثْلِهِ(٢).

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ کەس دروست نییە مامەڵەی قازانجی هاوبەش لەگەڵ کەسێك بکات تەنها لە پارەدا نەبێ، مامەڵەی قازانجی هاوبەش لە کاڵا و کەلوپەلدا دروست نییە، چونکە مامەڵەی قازانجی هاوبەش بە دوو شێوە دەکرێ: یان خاوەنی کاڵاکە دەڵێت: ئەو کاڵایە وەربگرە و بیفرۆشە و ئەوەی پەیدا بوو لە پارەکەی کاڵای دیکەی پێ بکڕە و بۆ قازانجی هاوبەش بیفرۆشەوە، ئەوە لەو حاڵەتەدا خاوەنماڵەکە زیادەیەکی بۆ خۆی خستۆتە سەر کارکەرەکە، لە فرۆشتنەوەی کاڵاکەی و مەسرەفی جێبەجێکردنی، یان بڵێت: کڕین و فرۆشتن بەو کاڵایەوە بکە، جا کە تەواو بوویت هەمان کاڵا بۆ من بکڕەوە کە پێم دابوویت، جا ئەگەر شتێك زیاد بوو، ئەوە بۆ هەردووکمان بێت، جا ڕەنگە خاوەن کاڵاکە لە کات و ساتێك کاڵاکە بدات بە کارکەرەکە کە زۆر بەڕەواج بێت و نرخی زۆر بێت، دواتر کە کارکەرەکە دەیگەڕێنێتەوە زۆر هەرزان

---

(١) ـ الْقِرَاضُ فِي الْعُرُوضِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣٦ في القراض، عن مالك به.

بووە و كاڵاكەی بە سێیەك یان كەمتر لە نرخی جاران كڕیبێتەوە، دەكا كاركەرەكە ئەو نیوەی قازانج كردووە كە لە نرخی كاڵاكە كەمی كردووە و كەوتۆتە ناو پشكی قازانجی ئەو، یان كاڵاكە وەربگرێت لە كات و ساتێك نرخی كەم بێت و كاری پێ بكات تاوەكوو ماڵەكە لەژێر دەستی زۆر دەبێت، دواتر ئەو كاڵایە گران دەبێت و نرخی بەرز دەبێتەوە كاتێ دەیەوێ بیگەڕێنێتەوە، جا بە هەموو پارەی ژێر دەستی دەبێ كاڵاكە بكڕێتەوە، دەرەنجام كار و كەسابەتەكەی هەموو بێ هوودە دەڕوا، جا ئەوەی (باسمان كرد گشتیان) مامەڵەی نادیارە و دروست نییە (چونكە بە كاڵا دەستی پێ كردووە و ئەو شتە ناڕەوایانەی دەكەوێتە ناو)، جا ئەگەر نەزانرا (ئەو مامەڵە دروست نییە) تا كارەكە ئەنجام درا، ئەوە سەیری ئەندازەی ئەو پارە دەكرێ كە بۆ مامەڵەكە خەرج كراوە لە فرۆشتن و جێبەجێكردنی، جا ئەو مەسرەفەی دەدرێتەوە، دواتر ماڵەكە دەبێتە ماڵی مامەڵەی قازانجی هاوبەش لەو كاتەی دەبێتە پارە و دەگەڕێندرێتەوە سەر مامەڵەی قازانجی هاوبەشی هاوشێوە (واتە لە پشكی قازانجدا حیسابی مامەڵەیەكی لەو شێوەیە دەكرێ كە بەپێی عادەت بێت، بۆ نموونە لە هاوشێوەی ئەندازەی ئەوان سێیەك بۆ كاركەرەكە بێت ئەوە سێیەكی بۆ دادەندرێت، بەم شێوەیە).

## ٧- كرێ لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[١]

**٢٠٢٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَاشْتَرَى بِهِ مَتَاعًا، فَحَمَلَهُ إِلَى بَلَدِ التِّجَارَةِ، فَبَارَ عَلَيْهِ، وَخَافَ النُّقْصَانَ إِنْ بَاعَهُ، فَتَكَارَى عَلَيْهِ إِلَى بَلَدٍ آخَرَ، فَبَاعَ بِنُقْصَانٍ، فَاغْتَرَقَ الْكِرَاءُ أَصْلَ الْمَالِ كُلَّهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنْ كَانَ فِيمَا بَاعَ وَفَاءٌ لِلْكِرَاءِ، فَسَبِيلُهُ ذَلِكَ، وَإِنْ بَقِيَ مِنَ الْكِرَاءِ شَيْءٌ بَعْدَ أَصْلِ الْمَالِ، كَانَ عَلَى الْعَامِلِ، وَلَمْ يَكُنْ عَلَى رَبِّ الْمَالِ مِنْهُ شَيْءٌ يُتْبَعُ بِهِ، وَذَلِكَ أَنَّ رَبَّ الْمَالِ إِنَّمَا أَمَرَهُ بِالتِّجَارَةِ فِي مَالِهِ، فَلَيْسَ لِلْمُقَارِضِ أَنْ يَتْبَعَهُ بِمَا سِوَى ذَلِكَ مِنَ الْمَالِ، وَلَوْ كَانَ ذَلِكَ يُتْبَعُ بِهِ رَبُّ الْمَالِ، لَكَانَ ذَلِكَ دَيْنًا عَلَيْهِ، مِنْ غَيْرِ الْمَالِ الَّذِي قَارَضَهُ فِيهِ، فَلَيْسَ لِلْمُقَارِضِ أَنْ يَحْمِلَ ذَلِكَ عَلَى رَبِّ الْمَالِ[٢].

---

(١) ـ الْكِرَاءُ فِي الْقِرَاضِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٥ في القراض، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵ و سامانێك دەدات بە کەسێك بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش و ئەویش کاڵایێکی پێ دەکڕێت و باری دەکات و دەیبات بۆ شاری بازرگانی و لەسەری دەمێنێتەوە (جا کاڵاکە نرخ و بەها لەدەست دەدات) و لە زەرەر دەترسێت ئەگەر بیفرۆشێت، بۆیە بەکرێ دەیبات بۆ شارێکی دیکە و بەزەرەر دەیفرۆشێت و کرێیەکە هەموو سەرمایەکە دادەگرێ، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر لەوەی فرۆشتوویەتی بەشی کرێیەکە دەکات ئەوە ڕێگەچارەکەی هەر ئەوەیە (دەبێ گشت پارەکە بدرێتە کرێیەکە)، وە ئەگەر دوای سەرمایەکەش بەشێك لە کرێیەکە هێشتا مابوو بدرێت (واتە زەرەرەکە لە سەرمایەکە زیاتر بوو)، ئەوە لەسەر کارکەرەکەیە و خاوەن سەرمایەکە هیچی دیکەی لەسەر نییە تا لێی وەربگیرێ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە خاوەن ماڵەکە تەنها فەرمانی بە بازرگانیکردن کردووە بە ماڵەکەی، جا بۆ کارکەرەکە نییە پارەی دیکەی لێ وەربگرێ، (چونکە) ئەگەر ئەوە لە خاوەن ماڵەکە وەربگیرێ ئەوە دەبێتە قەرز لەسەری (پارەی دیکەی دەکەوێتە سەر) جگە لەو ماڵەی کارکەرەکە بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش وەریگرتبوو، جا بۆ کارکەرەکە نییە ئەوە بخاتە سەر خاوەن ماڵەکە.

## ٨- سنووربەزاندن لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش[١]

**٢٠٢٦- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَعَمِلَ فِيهِ، فَرَبِحَ، ثُمَّ اشْتَرَى مِنْ رِبْحِ الْمَالِ أَوْ مِنْ جُمْلَتِهِ جَارِيَةً، فَوَطِئَهَا، فَحَمَلَتْ مِنْهُ، ثُمَّ نَقَصَ الْمَالُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، أُخِذَتْ قِيمَةُ الْجَارِيَةِ مِنْ مَالِهِ، فَيُجْبَرُ بِهِ الْمَالُ، فَإِنْ كَانَ فَضْلٌ بَعْدَ وَفَاءِ الْمَالِ، فَهُوَ بَيْنَهُمَا عَلَى الْقِرَاضِ الأَوَّلِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَفَاءٌ، بِيعَتِ الْجَارِيَةُ، حَتَّى يُجْبَرَ الْمَالُ مِنْ ثَمَنِهَا[٢].

---

(١) ـ التَّعَدِّي فِي الْقِرَاضِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٨ في القراض، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵ و سامانێك دەدات بە كەسێك بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش و كەسەكە كاری پێ دەكات و قازانج دەكات، دواتر بە قازانجی ماڵەكە یان لە كۆی ماڵەكە جارییەیەك دەكڕێت و جیماعی لەگەڵ دەكات و حەملی لێ دەبێ، دواتر ماڵەكە كەم دەكات، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر كەسەكە ماڵ و سەروەتی هەبوو ئەوە نرخی جارییەكە لە ماڵەكەی وەردەگیرێت و ماڵی قازانجی هاوبەشی پێ پڕ دەكرێتەوە، جا ئەگەر زیادەیەك مایەوە دوای پڕكردنەوەی ماڵەكە، ئەوە لەنێوانیان دابەش دەكرێت لەسەر بنەمای سەرەتای ڕێككەوتنیان لە قازانجی هاوبەشدا (چونكە جارییەكە بەشێكە لە ماڵی مامەڵەی قازانجی هاوبەش)، وە ئەگەر بەشی پڕبوونەوەكەی نەكرد، ئەوە جارییەكە دەفرۆشرێت تا ماڵەكە بە پارەی جارییەكە پڕ بكرێتەوە.

٢٠٢٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا فَتَعَدَّى، فَاشْتَرَى بِهِ سِلْعَةً، وَزَادَ فِي ثَمَنِهَا مِنْ عِنْدِهِ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: صَاحِبُ الْمَالِ بِالْخِيَارِ، إِنْ بِيعَتِ السِّلْعَةُ بِرِبْحٍ أَوْ وَضِيعَةٍ، أَوْ لَمْ تُبَعْ، إِنْ شَاءَ أَنْ يَأْخُذَ السِّلْعَةَ أَخَذَهَا، وَقَضَاهُ مَا أَسْلَفَهُ فِيهَا، وَإِنْ أَبَى كَانَ الْمُقَارَضُ شَرِيكًا لَهُ بِحِصَّتِهِ مِنَ الثَّمَنِ فِي النَّمَاءِ وَالنُّقْصَانِ، بِحِسَابِ مَا زَادَ الْعَامِلُ فِيهَا مِنْ عِنْدِهِ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و سنوور ببەزێنێت (بەوەی) كاڵایێكی پێ بكڕێت و لەلای خۆیەوە نرخەكەی زیاد بكات (بڵێت بەوەندە كڕیومە كەچی بە كەمتری كڕیبێ)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خاوەنی ماڵەكە سەرپشكە: ئەگەر كاڵاكە بە قازانج فرۆشرابێت یان بە كەمتر یان هەر نەفرۆشرابێت ئەوە خاوەن ماڵەكە ئەگەر ویستی كاڵاكە وەربگرێت ئەوە وەریدەگرێت و ئەوەش وەردەگرێتەوە كە شەریكەكەی لەلایەن خۆیەوە زیادی كردووە، وە ئەگەر ڕازی نەبوو كاڵاكە وەربگرێت ئەوە لە پشكی خۆی شەریكە لەگەڵی لە قازانج و لە زەرەر بەپێی ئەوەی كاركەرەكە لەلایەن خۆیەوە زیادی كردووە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٩ في القراض، عن مالك به.




**٢٠٢٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ أَخَذَ مِنْ رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، ثُمَّ دَفَعَهُ إِلَى رَجُلٍ آخَرَ، فَعَمِلَ فِيهِ قِرَاضًا بِغَيْرِ إِذْنِ صَاحِبِهِ: إِنَّهُ ضَامِنٌ لِلْمَالِ، إِنْ نَقَصَ فَعَلَيْهِ النُّقْصَانُ، وَإِنْ رَبِحَ فَلِصَاحِبِ الْمَالِ شَرْطُهُ مِنَ الرِّبْحِ، ثُمَّ يَكُونُ لِلَّذِي عَمِلَ شَرْطُهُ، بِمَا بَقِيَ مِنَ الْمَالِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵێك لە کەسێك وەربگرێت بۆ قازانجی هاوبەش، دواتر بیدات بە کەسێکی دیکە و کەسەکە کاری پێ بکات بەبێ مۆڵەتی خاوەن سەروەتەکە، گوتوویەتی: ئەو کەسەی سامانەکەی داوە بە کەسێکی دیکە زامنی ماڵ و سەروەتەکەیە (ماڵەکە بفەوتێت دەبێ قەرەبووی بکاتەوە، چونکە بەبێ پرس پێی داوە)، ئەگەر کەم بۆیەوە کەمبوونەکە دەکەوێتە سەر خۆی، وە ئەگەر قازانجی کرد، ئەوە خاوەنی سەروەتەکە چەندی داناوە لە قازانج ئەوەی بۆ هەیە، دواتر ئەو کەسەی کە کەسی دووەمە چەندی بە مەرج گرتووە (لەسەر کارکەرەکەی یەکەم) لە قازانج ئەوە مەرجی خۆی بۆ هەیە لەوەی دەمێنێتەوە لە قازانجی ماڵەکە (دوای قازانجی خاوەن سەروەتەکە).

**٢٠٢٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ تَعَدَّى فَتَسَلَّفَ مِمَّا فِي يَدَيْهِ مِنَ الْقِرَاضِ مَالاً، فَابْتَاعَ بِهِ سِلْعَةً لِنَفْسِهِ، قَالَ مَالِكٌ: إِنْ رَبِحَ فَالرِّبْحُ عَلَى شَرْطِهِمَا فِي الْقِرَاضِ، وَإِنْ نَقَصَ، فَهُوَ ضَامِنٌ لِلنُّقْصَانِ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە سنوور ببەزێنێت و پارە بە قەرز لەو ماڵە ببات کە بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش داندراوە، جا بۆ خۆی کاڵاییەکی پێ بکڕێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر قازانجی کرد، ئەوە قازانجەکە بەپێی مەرجی خۆیان کاڵاکە لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش حیسابە، وە ئەگەر زەرەری کرد و نرخی خۆی نەکردەوە، ئەوە کەسەکە زامنی کەمییەکەیە (دەبێ بە پارەی خۆی پڕی بکاتەوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٠ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦١ في القراض، عن مالك به.

٢٠٣٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَاسْتَسْلَفَ مِنْهُ الْمَدْفُوعُ إِلَيْهِ الْمَالُ مَالاً، وَاشْتَرَى بِهِ سِلْعَةً لِنَفْسِهِ: إِنَّ صَاحِبَ الْمَالِ بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَ شَرِكَهُ فِي السِّلْعَةِ عَلَى قِرَاضِهَا، وَإِنْ شَاءَ خَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا، وَأَخَذَ مِنْهُ رَأْسَ الْمَالِ كُلَّهُ، وَكَذَلِكَ يُفْعَلُ بِكُلِّ مَنْ تَعَدَّى[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش، جا ئەو كەسەی ماڵەكەی پێ دراوە هەندێك لە ماڵەكە بە قەرز بۆ خۆی ببات و كاڵایێكی پێ بكڕێت بۆ خۆی، گوتوویەتی: خاوەنی ماڵەكە سەرپشكە: ئەگەر ویستی لەگەڵی بەژدار دەبێ لە كاڵاكە بە پێی قازانجی هاوبەش، ئەگەر ویستیشی كاڵاكە بۆ ئەو واز لێ دێنێ و تەواوی سەرمایەی خۆی لە كەسەكە وەردەگرێتەوە، جا گشت كەسێك كە لە سنوور دەردەچێت بەم شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت.

## ٩- ئەوەی دروستە لە مەسرەفكردن لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[2]

٢٠٣١- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا: إِنَّهُ إِذَا كَانَ الْمَالُ كَثِيرًا يَحْمِلُ النَّفَقَةَ، فَإِذَا شَخَصَ فِيهِ الْعَامِلُ، فَإِنَّ لَهُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ، وَيَكْتَسِيَ بِالْمَعْرُوفِ مِنْ قَدْرِ الْمَالِ، وَيَسْتَأْجِرَ مِنَ الْمَالِ إِذَا كَانَ كَثِيرًا لاَ يَقْوَى عَلَيْهِ بَعْضَ مَنْ يَكْفِيهِ بَعْضَ مَؤُونَتِهِ، وَمِنَ الأَعْمَالِ أَعْمَالٌ لاَ يَعْمَلُهَا الَّذِي يَأْخُذُ الْمَالَ، وَلَيْسَ مِثْلُهُ يَعْمَلُهَا، مِنْ ذَلِكَ تَقَاضِي الدَّيْنِ، وَنَقْلُ الْمَتَاعِ، وَشَدُّهُ وَأَشْبَاهُ ذَلِكَ، فَلَهُ أَنْ يَسْتَأْجِرَ مِنَ الْمَالِ مَنْ يَكْفِيهِ ذَلِكَ، وَلَيْسَ لِلْمُقَارِضِ أَنْ يَسْتَنْفِقَ مِنَ الْمَالِ، وَلاَ يَكْتَسِيَ مِنْهُ، مَا كَانَ مُقِيمًا فِي أَهْلِهِ، إِنَّمَا يَجُوزُ لَهُ النَّفَقَةُ إِذَا شَخَصَ فِي الْمَالِ، وَكَانَ الْمَالُ يَحْمِلُ النَّفَقَةَ، فَإِنْ كَانَ إِنَّمَا يَتَّجِرُ فِي الْمَالِ فِي الْبَلَدِ الَّذِي هُوَ بِهِ مُقِيمٌ، فَلاَ نَفَقَةَ لَهُ مِنَ الْمَالِ وَلاَ كِسْوَةَ[3].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك دەدات بە كەسێك بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش گوتوویەتی: ئەگەر ماڵەكە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٢ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَجُوزُ مِنَ النَّفَقَةِ فِي الْقِرَاضِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٢ في القراض، عن مالك به.

زۆر بوو مەسرەفی پێ هەڵدەگیرا و بەرگەی مەسرەفی دەگرت، جا ئەگەر كاركەرەكە (بۆ بازرگانی) سەفەری بەماڵەكە كرد (بردی بۆ شوێنێك بۆ فرۆشتن)، ئەوە بۆی هەیە لێی بخوات و خۆی پێ پۆشتە بكات بە شێوازێكی مەعقول و چاك (بەزەمیر و دەرنەچوون لە عادەت)، وە ئەگەر ماڵەكە زۆر بوو بەتەنها خۆی دەرەقەت نەدەهات بۆی هەیە خەڵكانێكی بۆ بەكرێ بگرێت كە بەس بێت بۆ كاروبارەكانی، وە مامەڵەكە هەندێك لە كاروباری تیا بێت (عادەتەن) ئەو كەسەی ماڵ وەردەگرێت ئەو كارە ناكات و ئەوانەی وەكوو ئەویشن خۆیان نایكەن (واتە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو شتانە دروستە مەسرەف لە ماڵەكە بكات و خەڵكی بۆ بەكرێ بگرێ)، هەر لەو شتانە حیسابە: وەرگرتنەوەی قەرز و گواستنەوەی كەلوپەل و پێچانەوەی و هاوشێوەی ئەو شتانە، ئەوە بۆی هەیە لە سەرووەت و ماڵەكە خەڵكانێكی بۆ بەكرێ بگرێ كە بتوانن ئەنجامی بدەن، وە بۆ كاركەرەكە نییە داوا بكات لە ماڵەكەدا مەسرەفی خۆی و پۆشتەی خۆی بكات مادەم لەناو خانەوادە و ناوچەی خۆی بێ، تەنها لەو كاتە مەسرەفكردنی بۆ دروستە لە ماڵ و سەرووەتەكەدا كە سەفەر بە ماڵەكە بكات (لە ناوچە و خانەوادەی خۆی دوور بێ)، ماڵەكەش بەرگەی مەسرەف بگرێت (زۆر بێت)، جا ئەگەر بازرگانی بە ماڵەكە دەكرد لەو شار و ناوچەیەی كە خۆی تێیدا نیشتەجێیە، ئەوە نە نەفەقە و نەپۆشاكی بۆ نییە لە ماڵەكەدا.

**٢٠٣٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَخَرَجَ بِهِ وَبِمَالِ نَفْسِهِ، قَالَ: يَجْعَلُ النَّفَقَةَ مِنَ الْقِرَاضِ، وَمِنْ مَالِهِ عَلَى قَدْرِ حِصَصِ الْمَالِ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش، جا كەسەكە ئەو ماڵە و ماڵی خۆیشی بباتە دەرەوە و كاری پێ بكات بۆ قازانجی هاوبەش، گوتوویەتی: مەسرەفەكە دەخاتە سەر ماڵی قازانجی هاوبەش و سەر ماڵی خۆی بەئەندازەی پشكی ماڵەكان (بۆ نموونە: ئەگەر سێیەك ماڵی خۆی بێت، ئەوە سێیەكی مەسرەفەكە دەخاتە سەر ماڵەكەی و دوو لەسەر سێش دەخاتە سەر ماڵی قازانجی هاوبەش).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٣ في القراض، عن مالك به.




## ١٠- ئەوەی دروست نییە لە مەسرەف لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[١]

**٢٠٣٣- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي رَجُلٍ مَعَهُ مَالٌ قِرَاضٌ فَهُوَ يَسْتَنْفِقُ مِنْهُ، وَيَكْتَسِي: إِنَّهُ لاَ يَهَبُ مِنْهُ شَيْئًا، وَلاَ يُعْطِي مِنْهُ سَائِلاً، وَلاَ غَيْرَهُ، وَلاَ يُكَافِئُ فِيهِ أَحَدًا، فَأَمَّا إِنِ اجْتَمَعَ هُوَ وَقَوْمٌ فَجَاؤُوا بِطَعَامٍ، وَجَاءَ هُوَ بِطَعَامٍ، فَأَرْجُو أَنْ يَكُونَ ذَلِكَ وَاسِعًا، إِذَا لَمْ يَتَعَمَّدْ أَنْ يَتَفَضَّلَ عَلَيْهِمْ، فَإِنْ تَعَمَّدَ ذَلِكَ، أَوْ مَا يُشْبِهُهُ بِغَيْرِ إِذْنِ صَاحِبِ الْمَالِ، فَعَلَيْهِ أَنْ يَتَحَلَّلَ ذَلِكَ مِنْ رَبِّ الْمَالِ، فَإِنْ حَلَّلَهُ ذَلِكَ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ، وَإِنْ أَبَى أَنْ يُحَلِّلَهُ، فَعَلَيْهِ أَنْ يُكَافِئَهُ بِمِثْلِ ذَلِكَ، إِنْ كَانَ ذَلِكَ شَيْئًا لَهُ مُكَافَأَةٌ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی کەسێك کە ماڵی قازانجی هاوبەشی پێ بێت کە بۆی هەبێت بۆ مەسرەفی خۆی لێی سەرف بکات و خۆی پێ پۆشتە بکات، ئەوە بۆی نییە هیچ شتێکی لێ بکاتە دیاری و هیچ بداتە داواکار و دەرۆزەکەر و کەسی دیکە، وە بە ماڵەکە پاداشتی کەس ناداتەوە (ئەگەر کەسێك دیارییەکی بۆ هێنا)، بەڵام ئەگەر کۆ بۆیەوە لەگەڵ خەڵکانێك کە خواردنی خۆیان هێناوە، ئەویش خواردنی هێنا (تا بەیەکەوە بیخۆن)، ئومێدم وایە ئەو بابەتە فراوان بێت و کێشە نەبێت، (بە مەرجێك) ئەگەر بەئەنقەست شتی باشتر و زیاتر لەوان نەهێنێت، جا ئەگەر بەئەنقەست وای کرد (شتی باشتری هێنا) یان شتێکی لەو شێوەیەی کرد بەبێ مۆڵەتی خاوەن ماڵەکە، ئەوە دەبێ گەردەنی خۆی بە خاوەن ماڵەکە ئازاد بکات، جا ئەگەر گەردەنی ئازاد کرد ئەوە کێشە نییە، وە ئەگەر ڕەتی کردەوە گەردنی ئازاد بکات، ئەوە دەبێ شتێکی هاوشێوە بداتەوە خاوەن ماڵەکە، ئەگەر شتەکە هاوشێوەی هەبێت.

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ النَّفَقَةِ فِي الْقِرَاضِ.





## ١١- قەرز لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[1]

**٢٠٣٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا فَاشْتَرَى بِهِ سِلْعَةً، ثُمَّ بَاعَ السِّلْعَةَ بِدَيْنٍ، فَرَبِحَ فِي الْمَالِ، ثُمَّ هَلَكَ الَّذِي أَخَذَ الْمَالَ، قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَ الْمَالَ، قَالَ: إِنْ أَرَادَ وَرَثَتُهُ أَنْ يَقْبِضُوا ذَلِكَ الْمَالَ، وَهُمْ عَلَى شَرْطِ أَبِيهِمْ مِنَ الرِّبْحِ، فَذَلِكَ لَهُمْ، إِذَا كَانُوا أُمَنَاءَ عَلَى ذَلِكَ، فَإِنْ كَرِهُوا أَنْ يَقْتَضُوهُ، وَخَلَّوْا بَيْنَ صَاحِبِ الْمَالِ وَبَيْنَهُ، لَمْ يُكَلَّفُوا أَنْ يَقْتَضُوهُ، وَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِمْ، وَلاَ شَيْءَ لَهُمْ، إِذَا أَسْلَمُوهُ إِلَى رَبِّ الْمَالِ، فَإِنِ اقْتَضَوْهُ، فَلَهُمْ فِيهِ مِنَ الشَّرْطِ وَالنَّفَقَةِ، مِثْلُ مَا كَانَ لأَبِيهِمْ فِي ذَلِكَ، هُمْ فِيهِ بِمَنْزِلَةِ أَبِيهِمْ، فَإِنْ لَمْ يَكُونُوا أُمَنَاءَ عَلَى الْمَالِ، فَإِنَّ لَهُمْ أَنْ يَأْتُوا بِأَمِينٍ، فَيَقْتَضِي ذَلِكَ الْمَالَ، فَإِذَا اقْتَضَى جَمِيعَ الْمَالِ، وَجَمِيعَ الرِّبْحِ، كَانُوا فِي ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ أَبِيهِمْ[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە دەربارەی كەسێك كە ماڵ و سەروەتێك دەدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و كەسەكە كاڵایێكی پێ دەكڕێ، دواتر كاڵاكە بەقەرز دەفرۆشێت و قازانج لە ماڵەكەدا دەكات، دواتر ئەو كەسەی ماڵەكەی وەرگرتووە بەر لەوەی ماڵە قەرزەكە وەربگرێت دەمرێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: میراتگرەكانی ئەگەر ویستیان ماڵەكە وەربگرن و هێشتا لە قازانجەكەدا لەسەر مەرجی باوكیان بن، ئەوەیان بۆ هەیە، (بە مەرجێك) ئەگەر لەوەدا ئەمین بوون، جا ئەگەر پێیان باش نەبوو قەرزەكە وەربگرنەوە و قەرزەكە بۆ خاوەن ماڵ و پارەكە لێ گەڕان، ئەوە داوایان لێ ناكرێت قەرزەكە وەربگرنەوە، جا هیچیان لەسەر نییە و هیچیشیان بۆ نییە ئەگەر تەسلیمی خاوەن ماڵەكەیان كرد، (بەڵام) ئەگەر وەریانگرتەوە ئەوە مەرج و مەسرەفی خۆیان بۆ هەیە، وەك ئەوەی بۆ باوكیان هەبوو، ئەوان وەك باوكیانن، جا ئەگەر ئەمین نەبوون لەسەر ماڵەكە، ئەوە بۆیان هەیە كەسی ئەمین بێنن ماڵەكە وەربگرێتەوە، جا كە گشت ماڵ و قازانجەكەی وەرگرتەوە ئەوە لەوەدا وەك باوكیانن.

---

(١) ـ الدَّيْنُ فِي الْقِرَاضِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤٨ في القراض، عن مالك به.

**٢٠٣٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا عَلَى أَنَّهُ يَعْمَلُ فِيهِ، فَمَا بَاعَ بِهِ مِنْ دَيْنٍ فَهُوَ ضَامِنٌ لَهُ، إِنَّ ذَلِكَ لاَزِمٌ لَهُ، إِنْ بَاعَ بِدَيْنٍ فَقَدْ ضَمِنَهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش لەسەر ئەو بنەمایەی كاری پێ بكات، جا ئەوەی بە قەرز دەیفرۆشێت ئەوە زامنە، چونكە ئەوە دەكەوێتە ئەستۆی ئەو (واتە عامیلەكە)، ئەگەر بە قەرز بیفرۆشێت ئەوە خۆی كردۆتە زامن.

## ١٢- كاڵا لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[2]

**٢٠٣٦- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، وَاسْتَسْلَفَ مِنْ صَاحِبِ الْمَالِ سَلَفًا، أَوِ اسْتَسْلَفَ مِنْهُ صَاحِبُ الْمَالِ سَلَفًا، أَوْ أَبْضَعَ مَعَهُ صَاحِبُ الْمَالِ بِضَاعَةً يَبِيعُهَا لَهُ، أَوْ بِدَنَانِيرَ يَشْتَرِي لَهُ بِهَا سِلْعَةً، قَالَ مَالِكٌ ﵀: إِنْ كَانَ صَاحِبُ الْمَالِ إِنَّمَا أَبْضَعَ مَعَهُ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لَوْ لَمْ يَكُنْ مَالُهُ عِنْدَهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ مِثْلَ ذَلِكَ فَعَلَهُ، لإِخَاءٍ بَيْنَهُمَا، أَوْ لِيَسَارَةِ مَؤُونَةِ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَلَوْ أَبَى ذَلِكَ عَلَيْهِ لَمْ يَنْزِعْ مَالَهُ مِنْهُ، أَوْ كَانَ الْعَامِلُ إِنَّمَا اسْتَسْلَفَ مِنْ صَاحِبِ الْمَالِ، أَوْ حَمَلَ لَهُ بِضَاعَتَهُ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لَوْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ مَالُهُ فَعَلَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، وَلَوْ أَبَى ذَلِكَ عَلَيْهِ لَمْ يَرْدُدْ عَلَيْهِ مَالَهُ، فَإِذَا صَحَّ ذَلِكَ مِنْهُمَا جَمِيعًا، وَكَانَ ذَلِكَ مِنْهُمَا عَلَى وَجْهِ الْمَعْرُوفِ، وَلَمْ يَكُنْ شَرْطًا فِي أَصْلِ الْقِرَاضِ، فَذَلِكَ جَائِزٌ لاَ بَأْسَ بِهِ، وَإِنْ دَخَلَ ذَلِكَ شَرْطٌ، أَوْ خِيفَ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا صَنَعَ ذَلِكَ الْعَامِلُ لِصَاحِبِ الْمَالِ، لِيُقِرَّ مَالَهُ فِي يَدَيْهِ، أَوْ إِنَّمَا صَنَعَ ذَلِكَ صَاحِبُ الْمَالِ، لأَنْ يُمْسِكَ الْعَامِلُ مَالَهُ، وَلاَ يَرُدَّهُ عَلَيْهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَجُوزُ فِي الْقِرَاضِ، وَهُوَ مِمَّا يَنْهَى عَنْهُ أَهْلُ الْعِلْمِ[3].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش، كەسەكەش قەرزێك لە خاوەن ماڵەكە بكات، یان خاوەن ماڵەكە قەرزێك لەو بكات، یان خاوەنی ماڵ كاڵایێكی خۆی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٠ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ الْبِضَاعَةُ فِي الْقِرَاضِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤٦ في القراض، عن مالك به.

لەگەڵ دابنێت تا بۆی بفرۆشێت، یان پارەی پێ بدات تا کاڵایێکی بۆ بکڕێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خاوەنی ماڵەکە کە کاڵایەکەی لەلا داناوە ئەگەر دەیزانی ماڵەکەشی لەلا نەبووایە و داوای لێ بکردایە ئەوەی بۆ بکات ئەوە هەر بۆی دەکرد، لەبەر برایەتی و خۆشەویستی نێوانیان یان لەبەر ئاسانی و بێمەسرەفی کارەکە لەسەر ئەو کەسە، وە (دەیزانی) ئەگەر ڕازی نەبێت بۆی ئەنجام بدات خاوەن ماڵەکە ماڵەکەی خۆی لێ نەسەنێتەوە (ئەگەر بەو شێوەیە بوو دروستە)، یان کارکەرەکە تەنها لەبەر ئەوە قەرزی لە خاوەن ماڵەکە کردووە یان کاڵاکەی بۆ هەڵگرتووە، دەزانێت ئەگەر ماڵەکەی ئەویشی لەلا نەبووایە ئەو کارەی هەر پێ دەکرد، وە ئەگەر خاوەن ماڵەکەش قەرزەکەی پێ نەدابووایە ئەو ماڵەکەی نەدەگەڕاندەوە (واتە دەیانزانی بە هیچ شێوەیەك هاوبەشییەکە کاریگەر نەدەبوو بۆ ئەو کارە)، جا ئەگەر لەسەر بنەمای ڕاست و دروست ئەو شتانەیان لێ ڕوو دا و نەیانکردە مەرج لە بنچینەی مامەڵە هاوبەشەکە، ئەوە دروستە و کێشەی تیا نییە، (بەڵام) ئەگەر مەرجی تێ کەوت یان ترسی ئەوە هەبوو کارکەرەکە کە ئەوە بۆ خاوەن ماڵەکە دەکات بۆ ئەوەیە تا ماڵەکە لەژێر دەستی بهێڵێتەوە، یان کە خاوەن ماڵەکە ئەوەی ئەنجام دەدا بۆ ئەوەی بوو تاوەکوو کارکەرەکە ماڵەکە بگرێتە خۆی و ڕەتی نەکاتەوە، جا (ئەگەر لەسەر ئەو بنەمایانە بوو) ئەوە شتی وا لە قازانجی هاوبەشدا دروست نییە، وە ئەوە بەشێکە لەوەی زانایان نەهییان لێ کردووە و بە نادروستیان داناوە.

## ١٣- قەرز لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[1]

**٢٠٣٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ أَسْلَفَ رَجُلاً مَالاً، ثُمَّ سَأَلَهُ الَّذِي تَسَلَّفَ الْمَالَ أَنْ يُقِرَّهُ عِنْدَهُ قِرَاضًا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أُحِبُّ ذَلِكَ، حَتَّى يَقْبِضَ مَالَهُ مِنْهُ، ثُمَّ يَدْفَعَهُ إِلَيْهِ قِرَاضًا إِنْ شَاءَ أَوْ يُمْسِكَهُ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك کە ماڵ و سەروەتێك بەقەرز دەدات بە کەسێك دواتر داوا لەو کەسە دەکات کە ماڵەکەی

---

(١) ـ السَّلَفُ فِي الْقِرَاضِ.




بەقەرز لێ وەرگرتووە بەوەی ماڵەکە بۆ قازانجی هاوبەش لەلای خۆی بهێڵێتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەم پێ باش و دروست نییە، تاوەکوو ماڵەکەی خۆی لێ وەردەگرێت، دواتر ئەگەر ویستی با بەقازانجی هاوبەش بیداتێ یان بیگرێتەوە (پێی نەدات و مامەڵەی لەگەڵ نەکات، دەبێ ئەو سەلاحییەتە هەبێ).

**٢٠٣٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَدِ اجْتَمَعَ عِنْدَهُ، وَسَأَلَهُ أَنْ يَكْتُبَهُ عَلَيْهِ سَلَفًا، قَالَ: لاَ أُحِبُّ ذَلِكَ، حَتَّى يَقْبِضَ مِنْهُ مَالَهُ، ثُمَّ يُسَلِّفَهُ إِيَّاهُ إِنْ شَاءَ، أَوْ يُمْسِكَهُ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ مَخَافَةَ أَنْ يَكُونَ قَدْ نَقَصَ فِيهِ، فَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَهُ عَنْهُ، عَلَى أَنْ يَزِيدَهُ فِيهِ مَا نَقَصَ مِنْهُ، فَذَلِكَ مَكْرُوهٌ، وَلاَ يَجُوزُ وَلاَ يَصْلُحُ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵێك بدات بە کەسێك بۆ قازانجی هاوبەش، جا کەسەکە هەواڵی پێ بدات بەڵێ بەوەی پارەکەی هاتۆتە لا و بەدەستی گەیشتووە، جا داوای لێ بکات بەوەی بەقەرز لەسەری بنووسێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەم پێ باش و دروست نییە، تاوەکوو ماڵەکەی لێ وەردەگرێتەوە، دواتر با بەقەرز بیداتێ ئەگەر ویستی، یان بیگرێتەوە (بەقەرز پێی نەدات، ئەگەر ویستی)، ئەوەش تەنها لەبەر ترسی ئەوەیە نەوەك پارەکە کەمی کردبێ و حەز بکات دوای بخات بۆ ئەوەی زیادی بکاتەوە، ئەوە ناپەسەند و نادروست و نەگونجاوە.

### ١٤- حیسابکردن و ژمێریاری لە مامەڵەی قازانجی هاوبەشدا[٢]

**٢٠٣٩- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَعَمِلَ فِيهِ، فَرَبِحَ، فَأَرَادَ أَنْ يَأْخُذَ حِصَّتَهُ مِنَ الرِّبْحِ، وَصَاحِبُ الْمَالِ غَائِبٌ، قَالَ: لاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا، إِلاَّ بِحَضْرَةِ صَاحِبِ الْمَالِ، وَإِنْ أَخَذَ شَيْئًا فَهُوَ لَهُ ضَامِنٌ، حَتَّى يُحْسَبَ مَعَ الْمَالِ إِذَا اقْتَسَمَاهُ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٤٧ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ الْمُحَاسَبَةُ فِي الْقِرَاضِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٤ في القراض، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی کەسێك کە ماڵێك بدات بە کەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و ئەویش کاری پێ بکات و قازانج بکات و بیەوێ پشکی خۆی لە قازانجەکە وەربگرێت لە کاتێکدا خاوەنی ماڵ و سەروەتەکە غائیبە و ئامادە نییە، ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بۆی نییە هیچی لێ ببات، تەنها بەئامادەبوونی خاوەنی ماڵ و سەروەتەکە نەبێت، جا ئەگەر هەر شتێکی لێ برد، ئەوە زامنە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ماڵەکە حیساب بکرێت کاتێ دابەشی دەکەن.

**٢٠٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ يَجُوزُ لِلْمُتَقَارِضَيْنِ أَنْ يَتَحَاسَبَا، وَيَتَفَاصَلاَ، وَالْمَالُ غَائِبٌ عَنْهُمَا، حَتَّى يَحْضُرَ الْمَالُ، فَيَسْتَوْفِي صَاحِبُ الْمَالِ رَأْسَ مَالِهِ، ثُمَّ يَقْتَسِمَانِ الرِّبْحَ عَلَى شَرْطِهِمَا[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بۆ دوو مامەڵەکارەکانی ماڵی قازانجی هاوبەش دروست نییە حیسابات لەگەڵ یەکدی بکەن و بابەتەکە ببڕیننەوە و لێك جیا ببنەوە، لە کاتێکدا ماڵ و سەروەتەکە لەوێ نییە و ئامادە نییە و غائیبە، تا ماڵەکە ئامادە دەبێ و خاوەنی ماڵەکە سەرمایەکەی وەردەگرێتەوە، دواتر بەپێی ئەو مەرجەی لە نێوانی خۆیان دایانناوە قازانجەکە دابەش دەکەن.

**٢٠٤١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي رَجُلٍ أَخَذَ مَالاً قِرَاضًا، فَاشْتَرَى بِهِ سِلْعَةً، وَقَدْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ، فَطَلَبَهُ غُرَمَاؤُهُ، فَأَدْرَكُوهُ بِبَلَدٍ غَائِبٍ عَنْ صَاحِبِ الْمَالِ، وَفِي يَدَيْهِ عَرْضٌ مُرَبَّحٌ بَيِّنٌ فَضْلُهُ، فَأَرَادُوا أَنْ يُبَاعَ لَهُمُ الْعَرْضُ، فَيَأْخُذُوا حِصَّتَهُ مِنَ الرِّبْحِ، قَالَ: لاَ يُؤْخَذُ مِنْ رِبْحِ الْقِرَاضِ شَيْءٌ، حَتَّى يَحْضُرَ صَاحِبُ الْمَالِ، فَيَأْخُذَ مَالَهُ، ثُمَّ يَقْتَسِمَانِ الرِّبْحَ عَلَى شَرْطِهِمَا[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی کەسێك کە ماڵێك بدات بە کەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و کاڵایێکی پێ بکڕێ لە کاتێکدا قەرزێکی لەسەرە و خاوەنی قەرزەکان داوای قەرزەکەی لێ بکەن و لە شوێنێك و ناوچەیەك پێی بگەن کە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٥ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥١ في القراض، عن مالك به.

خاوەنی ماڵەکە لەوێ نییە و ببینن (قەرزارەکەیان) کاڵای بەقازانجی چاکی لەژێر دەستە، جا (داوای لێ بکەن و) بیانەوێ بۆیان بفرۆشێت و پشکەکەی ئەو لە قازانجەکە وەربگرن بۆ قەرزەکەیان، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ هیچ لە قازانجی مامەڵەی قازانجی هاوبەش وەربگیرێت تاوەکوو خاوەنی ماڵەکە ئامادە دەبێت و سەرمایەکەی وەردەگرێتەوە، دواتر قازانجەکە بەپێی ڕێککەوتنی سەرەتای خۆیان دابەش دەکەن.

**٢٠٤٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَتَجَرَ فِيهِ فَرَبِحَ، ثُمَّ عَزَلَ رَأْسَ الْمَالِ، وَقَسَمَ الرِّبْحَ، فَأَخَذَ حِصَّتَهُ، وَطَرَحَ حِصَّةَ صَاحِبِ الْمَالِ فِي الْمَالِ، بِحَضْرَةِ شُهَدَاءَ أَشْهَدَهُمْ عَلَى ذَلِكَ، قَالَ: لاَ تَجُوزُ قِسْمَةُ الرِّبْحِ إِلاَّ بِحَضْرَةِ صَاحِبِ الْمَالِ، وَإِنْ كَانَ أَخَذَ شَيْئًا رَدَّهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَ صَاحِبُ الْمَالِ رَأْسَ مَالِهِ، ثُمَّ يَقْتَسِمَانِ مَا بَقِيَ بَيْنَهُمَا عَلَى شَرْطِهِمَا[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵێك بدات بە کەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و ئەویش بازرگانی پێوە بکات و قازانج بکات، دواتر سەرمایەی خاوەن ماڵەکە بخاتە لایەك و جیای بکاتەوە و قازانجەکە دابەش بکات و بەشی خۆی وەربگرێ و پشکی قازانجی خاوەن ماڵەکە بخاتە ناو سەرمایەکە بە ئامادەبوونی چەند شاهیدێك کە بیانکاتە شاهید لەسەر بابەتەکە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دابەشکردنی قازانج دروست نییە تەنها بە ئامادەبوونی خاوەن ماڵەکە نەبێت، جا ئەگەر شتێکی وەرگرتبێت ئەوە دەبێ بیگەڕێنێتەوە تاوەکوو خاوەن ماڵ سەرمایەکەی خۆی وەردەگرێتەوە، دواتر ئەوەی لە قازانجەکە دەمێنێتەوە بەپێی مەرجی خۆیان لە نێوانی خۆیان دابەشی دەکەن.

**٢٠٤٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا فَعَمِلَ فِيهِ، فَجَاءَهُ، فَقَالَ لَهُ: هَذِهِ حِصَّتُكَ مِنَ الرِّبْحِ، وَقَدْ أَخَذْتُ لِنَفْسِي مِثْلَهُ، وَرَأْسُ مَالِكَ وَافِرٌ عِنْدِي، قَالَ مَالِكٌ: لاَ أُحِبُّ ذَلِكَ حَتَّى يَحْضُرَ الْمَالُ كُلُّهُ، فَيُحَاسِبَهُ حَتَّى يَحْصُلَ رَأْسُ الْمَالِ، وَيَعْلَمَ أَنَّهُ وَافِرٌ، وَيَصِلَ إِلَيْهِ، ثُمَّ يَقْتَسِمَانِ الرِّبْحَ بَيْنَهُمَا عَلَى شَرْطِهِمَا، ثُمَّ يَرُدُّ إِلَيْهِ الْمَالَ إِنْ شَاءَ، أَوْ يَحْبِسُهُ، وَإِنَّمَا

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٦ في القراض، عن مالك به.

يَجِبُ حُضُورُ الْمَالِ، مَخَافَةَ أَنْ يَكُونَ الْعَامِلُ قَدْ نَقَصَ فِيهِ، فَهُوَ يُحِبُّ أَنْ لاَ يُنْزَعَ مِنْهُ، وَأَنْ يُقِرَّهُ فِي يَدِهِ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و كاری پێ بكات و دواتر بێت بۆ لای و پێی بڵێت: ئەوە پشكی تۆیە لە قازانجەكە و بۆ خۆشم ئەوەندەم گێڕاوەتەوە و سەرمایەكەشت بەتەواوی و بەبێ كەموكوڕی لەلای خۆمە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم باش و دروست نییە تا كۆی گشتی ماڵەكە ئامادە دەكات و حیسابی دەكات تا سەرمایەكە دەردەكەوێت و دڵنیا دەبێت تەواوە و بەدڵنیاییی گەیشتۆتە دەستی، دواتر بەپێی مەرجی سەرەتای مامەڵەكەیان قازانجەكە لە نێوانی خۆیان دابەش دەكەن، دواتر ئەگەر ویستی (دووبارە) ماڵەكەی پێ دەداتەوە (بۆ دووبارەكردنەوەی مامەڵەی قازانجی هاوبەش) یان لای خۆی دەیهێڵێتەوە و چیدی نایداتێ، جا ئەوە دەبێ تەنها بە ئامادەبوونی ماڵەكە ئەنجام بدرێت، (كەواتە دەبێ ماڵەكە ڕادەست بكات و ئەوەندە بەس نییە بڵێ ماڵەكە لەلای خۆمە دەی با دووبارە مامەڵەیەكی دیكە دەست پێ بكەینەوە)، (جا كە دروست نییە) لە ترسی ئەوەیە نەوەك كاركەرەكە سەرمایەكەی كەم كردبێت و حەز بكات لێی نەستێنن و لەدەستی بمێنێتەوە (بۆ بەردەوامبوونی كار و كەسابەتەكەی).

## ١٥- ئەو بابەتە جۆراوجۆرانەی دەربارەی مامەڵەی قازانجی هاوبەش هاتوون[٢]

**٢٠٤٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا فَابْتَاعَ بِهِ سِلْعَةً، فَقَالَ لَهُ صَاحِبُ الْمَالِ: بِعْهَا، وَقَالَ الَّذِي أَخَذَ الْمَالَ: لاَ أَرَى وَجْهَ بَيْعٍ، فَاخْتَلَفَا فِي ذَلِكَ، قَالَ: لاَ يُنْظَرُ إِلَى قَوْلِ وَاحِدٍ مِنْهُمَا، وَيُسْأَلُ عَنْ ذَلِكَ أَهْلُ الْمَعْرِفَةِ وَالْبَصَرِ بِتِلْكَ السِّلْعَةِ، فَإِنْ رَأَوْا وَجْهَ بَيْعٍ بِيعَتْ عَلَيْهِمَا، وَإِنْ رَأَوْا وَجْهَ انْتِظَارٍ انْتُظِرَ بِهَا[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥٧ في القراض، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي الْقِرَاضِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٩ في القراض، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵێك بدات بە کەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و کەسەکەش کاڵایێکی پێ بکرێت، خاوەنی ماڵەکەش پێی بڵێت: بیفرۆشە، ئەو کەسەش کە ماڵەکەی وەرگرتووە بڵێت: بە هیچ جۆرێك فرۆشتنم پێ باش نییە (لەبەر سەرفنەبوون و شکانی نرخەکەی لە بازاڕ)، جا دەربارەی ئەوە ڕاجیاییان بکەوێتە نێوان (ئەو بڵێ دەیفرۆشین، ئەوەی دیکە بڵێ نایفرۆشین)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: سەیری قسەی هیچ کامیان ناکرێت و پرسیار لە خەڵکی شارەزا دەکرێت لەو کاڵایە، جا ئەگەر پێیان چاك بوو بفرۆشرێت ئەوە بەسەر هەردووکیاندا دەفرۆشرێت، ئەگەریش پێیان چاك بوو چاوەڕێ بکرێت ڕادەگیرێت.

**٢٠٤٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ أَخَذَ مِنْ رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا فَعَمِلَ فِيهِ، ثُمَّ سَأَلَهُ صَاحِبُ الْمَالِ عَنْ مَالِهِ، فَقَالَ: هُوَ عِنْدِي وَافِرٌ، فَلَمَّا آخَذَهُ بِهِ، قَالَ: قَدْ هَلَكَ عِنْدِي مِنْهُ كَذَا وَكَذَا لِمَالٍ يُسَمِّيهِ، وَإِنَّمَا قُلْتُ لَكَ ذَلِكَ، لِكَيْ تَتْرُكَهُ عِنْدِي، قَالَ: لاَ يَنْتَفِعُ بِإِنْكَارِهِ بَعْدَ إِقْرَارِهِ أَنَّهُ عِنْدَهُ، وَيُؤْخَذُ بِإِقْرَارِهِ عَلَى نَفْسِهِ، إِلاَّ أَنْ يَأْتِيَ عَلَى هَلاَكِ ذَلِكَ الْمَالِ بِأَمْرٍ يُعْرَفُ بِهِ قَوْلُهُ، فَإِنْ لَمْ يَأْتِ بِأَمْرٍ مَعْرُوفٍ أُخِذَ بِإِقْرَارِهِ، وَلَمْ يَنْفَعْهُ إِنْكَارُهُ[1].

قَالَ: وَكَذَلِكَ أَيْضًا لَوْ قَالَ: رَبِحْتُ فِي الْمَالِ كَذَا وَكَذَا، فَسَأَلَهُ رَبُّ الْمَالِ أَنْ يَدْفَعَ إِلَيْهِ مَالَهُ وَرِبْحَهُ، فَقَالَ: مَا رَبِحْتُ فِيهِ شَيْئًا، وَمَا قُلْتُ ذَلِكَ إِلاَّ لأَنْ تُقِرَّهُ فِي يَدِي، فَذَلِكَ لاَ يَنْفَعُهُ، وَيُؤْخَذُ بِمَا أَقَرَّ بِهِ، إِلاَّ أَنْ يَأْتِيَ بِأَمْرٍ يُعْرَفُ بِهِ قَوْلُهُ وَصِدْقُهُ، فَلاَ يَلْزَمُهُ ذَلِكَ.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە ماڵ و سامانێك لە کەسێك وەردەگرێت بۆ مامەڵەی قازانجی هاوبەش و کەسەکەش کاری پێ دەکات، دواتر خاوەنی ماڵەکە داوای ماڵەکەی خۆی لێ دەکاتەوە، ئەویش بڵێ: ماڵەکە بەتەواوی بەبێ کەموکوڕی لەلای خۆمە، جا کاتێ وەریدەگرێتەوە کارکەرەکە بڵێت: (پێشتر) ئەوە و ئەوە لەلای من لەناو چووە، ناوی هەندێك لە ماڵەکە بێنێت (کە لەناو چووە)، بەڵام کە پێم گوتی ماڵەکە کامڵە و هیچی نەفەوتاوە بۆ ئەوەم بوو ماڵەکەم لەلا بهێڵیتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئینکارکردنەکەی (بەوەی کە بڵێت:

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٣ في القراض، عن مالك به.

هەر لە سەرەتاوە ماڵەكە لە كاتی بازرگانیدا زەرەری كردبوو و كامڵ نەمابوو و فەوتابوو) سوودی نابێت دوای ئەوەی ئیقراری كرد بەوەی بەتەواوی و كامڵی لەلایەتی، وە بە دانپێدانانی خۆی دەگیرێ، تەنها لەو كاتە نەبێت كە بەڵگەیەك بێنێت قسەكەی بسەلمێنێت دەربارەی لەناوچوونی ماڵەكە، جا ئەگەر بەڵگەیەكی ناسراو و ئاشكرای نەهێنا ئەوە بە دانپێدانانی خۆی دەگیرێت و ئینكاركردنەكەی سوودی پێ ناگەیەنێ.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە ئەگەر بڵێت: ئەوەندە و ئەوەندەم قازانج كردووە، خاوەن ماڵیش داوای لێ بكات ماڵەكە و قازانجەكەی بداتەوە، ئەویش بڵێت: هیچم تێدا قازانج نەكردووە و ئەوەی گوتم تەنها لەبەر ئەوە بوو ماڵەكە بهێڵێتەوە لەلام، ئەوە سوودی پێ ناگەیەنێ و بە دانپێدانانی خۆی دەگیرێ، تەنها لەو كاتە نەبێت بەڵگەیەك بێنێت ڕاستی قسەكەی بسەلمێنێت، ئەو كات ئەوەی ناكەوێتە سەر (ئەگەرنا دەبێ ئەو قازانجە بداتە خاوەن ماڵەكە كە گوتوویەتی).

٢٠٤٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضًا، فَرَبِحَ فِيهِ رِبْحًا، فَقَالَ الْعَامِلُ: قَارَضْتُكَ عَلَى أَنَّ لِي الثُّلُثَيْنِ، وَقَالَ صَاحِبُ الْمَالِ: قَارَضْتُكَ عَلَى أَنَّ لَكَ الثُّلُثَ، قَالَ مَالِكٌ: الْقَوْلُ قَوْلُ الْعَامِلِ، وَعَلَيْهِ فِي ذَلِكَ الْيَمِينُ، إِذَا كَانَ مَا قَالَ يُشْبِهُ قِرَاضَ مِثْلِهِ، وَكَانَ ذَلِكَ نَحْوًا مِمَّا يَتَقَارَضُ عَلَيْهِ النَّاسُ، وَإِنْ جَاءَ بِأَمْرٍ يُسْتَنْكَرُ لَيْسَ عَلَى مِثْلِهِ يَتَقَارَضُ النَّاسُ، لَمْ يُصَدَّقْ، وَرُدَّ إِلَى قِرَاضِ مِثْلِهِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە ماڵێك بدات بە كەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و قازانجی كرد، جا كاركەرەكە بڵێت: من لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش بەژداریم لەگەڵ كردی لەسەر ئەوەی دوو لەسەر سێی قازانجەكە بۆ من بێت، خاوەنی ماڵەكەش بڵێت: من مامەڵەم لەگەڵ تۆ دەست پێ كرد لەسەر ئەوەی سێیەك بۆ تۆ بێت (نەك دوو لەسەر سێ)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: قسە قسەی كاركەرەكەیە (قسەی ئەو وەردەگیرێ) و سوێندخواردنی لەسەرە،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٦ في القراض، عن مالك به.




(جا بەو شێوەیە قسەی ئەو وەردەگیرێ، بە مەرجێك) ئەگەر ئەوەی ئەو دەیڵێت لە مامەڵەی کەسانی هاوشێوەی ئەو بچێت و هاوشێوەی ئەوە بێت کە خەڵك مامەڵەی قازانجی هاوبەشی لەسەر دەکەن، بەڵام ئەگەر قسەیەك بکات نامۆ بێت و خەڵك لەسەر ئەو ئەندازەیە مامەڵەی قازانجی هاوبەش نەکەن (بۆ نموونە بڵێت: هەشت لەسەر نۆ بۆ من)، ئەوە باوەڕی پێ ناکرێت و دەگەڕێندرێتەوە بۆ ئەندازەی مامەڵەی هاوشێوە.

**٢٠٤٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ أَعْطَى رَجُلاً مِئَةَ دِينَارٍ قِرَاضًا، فَاشْتَرَى بِهَا سِلْعَةً، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَدْفَعَ إِلَى رَبِّ السِّلْعَةِ الْمِئَةَ دِينَارٍ، فَوَجَدَهَا قَدْ سُرِقَتْ، فَقَالَ رَبُّ الْمَالِ: بِعِ السِّلْعَةَ، فَإِنْ كَانَ فِيهَا فَضْلٌ كَانَ لِي، وَإِنْ كَانَ فِيهَا نُقْصَانٌ كَانَ عَلَيْكَ، لأَنَّكَ أَنْتَ ضَيَّعْتَ، وَقَالَ الْمُقَارَضُ: بَلْ عَلَيْكَ وَفَاءُ حَقِّ هَذَا، إِنَّمَا اشْتَرَيْتُهَا بِمَالِكَ الَّذِي أَعْطَيْتَنِي، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَلْزَمُ الْعَامِلَ الْمُشْتَرِيَ أَدَاءُ ثَمَنِهَا إِلَى الْبَائِعِ، وَيُقَالُ لِصَاحِبِ الْمَالِ الْقِرَاضِ: إِنْ شِئْتَ فَأَدِّ الْمِئَةَ الدِّينَارِ إِلَى الْمُقَارَضِ، وَالسِّلْعَةُ بَيْنَكُمَا، وَتَكُونُ قِرَاضًا عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ الْمِئَةُ الأُولَى، وَإِنْ شِئْتَ فَابْرَأْ مِنَ السِّلْعَةِ، فَإِنْ دَفَعَ الْمِئَةَ دِينَارٍ إِلَى الْعَامِلِ، كَانَتْ قِرَاضًا عَلَى سُنَّةِ الْقِرَاضِ الأَوَّلِ، وَإِنْ أَبَى، كَانَتِ السِّلْعَةُ لِلْعَامِلِ، وَكَانَ عَلَيْهِ ثَمَنُهَا[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە سەت دینار بدات بە کەسێك بۆ قازانجی هاوبەش و کەسەکە کاڵایێکی پێ بکڕێ، دواتر بچێت تا سەت دینارەکە بداتەوە خاوەن ماڵەکە و ببینێت پارەکە دزراوە، خاوەن ماڵەکەش بڵێت: کاڵاکە بفرۆشە، جا ئەگەر زیادی کرد و قازانجی کرد ئەوە زیادەکە بۆ منە، وە ئەگەر کەمی کرد و زەرەری تێ کەوت ئەوە کەمی و زەرەرەکە لەسەر تۆیە، چونکە تۆ پارەکەت فەوتاندووە، هاوبەشەکەشی بڵێت: بەڵکوو لەسەرت واجبە حەق و قازانجی ئەو کاڵایەم بدەیتێ کە دەیفرۆشین، ئەوەم بەو ماڵەی تۆ کڕیوە کە بە منت دابوو (واتە گوتی: لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش حیسابە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کارکەرە کڕیارەکە دەبێ پارەی کاڵاکە بداتەوە فرۆشیارەکە، جا بە خاوەنی ماڵەکە دەگوترێت: ئەگەر دەتەوێت ئەوە سەت دینار

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٧ في القراض، عن مالك به.

بدەوە کارکەرەکە و کاڵاکە بۆ هەردووکتان بێت و مامەڵە هاوبەشەکە لەسەر هەمان سەت دینارەکەی یەکەم جار دەبێت، وە ئەگەر دەتەوێت خۆت لە کاڵاکە بەری بکە، جا ئەگەر سەت دینارەکەی دایە کارکەرەکە ئەوە دەکا ماڵی قازانجی هاوبەشە لەسەر هەمان قازانجی هاوبەشی سەرەتا، وە ئەگەر ئەوەی ڕەت کردەوە، ئەوە کاڵاکە بۆ کارکەرەکەیە و پارەی کاڵاکەی لەسەرە و دەبێ بیداتەوە خاوەن ماڵەکە.

**٢٠٤٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُتَقَارِضَيْنِ إِذَا تَفَاصَلاَ، فَبَقِيَ بِيَدِ الْعَامِلِ مِنَ الْمَتَاعِ الَّذِي يَعْمَلُ فِيهِ خَلَقُ الْقِرْبَةِ أَوْ خَلَقُ الثَّوْبِ أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: كُلُّ شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ كَانَ تَافِهًا، لاَ خَطْبَ لَهُ، فَهُوَ لِلْعَامِلِ، وَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا أَفْتَى بِرَدِّ ذَلِكَ، وَإِنَّمَا يُرَدُّ مِنْ ذَلِكَ الشَّيْءُ الَّذِي لَهُ ثَمَنٌ، وَإِنْ كَانَ شَيْئًا لَهُ اسْمٌ مِثْلُ الدَّابَّةِ أَوِ الْجَمَلِ أَوِ الشَّاذَكُونَةِ، أَوْ أَشْبَاهِ ذَلِكَ مِمَّا لَهُ ثَمَنٌ، فَإِنِّي أَرَى أَنْ يَرُدَّ مَا بَقِيَ عِنْدَهُ مِنْ هَذَا، إِلاَّ أَنْ يَتَحَلَّلَ صَاحِبَهُ مِنْ ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو دوو کەسەی مامەڵەی قازانجی هاوبەش لەگەڵ یەکدی دەکەن کاتێ لەیەکدی جیا دەبنەوە و هەندێك لەو کاڵایەی کارکەرەکە کار و بازرگانی پێوە کردووە دەمێنێتەوە وەك گۆزەی کۆن و جلی کۆن و شتی ئاوا، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گشت شتێکی لەو جۆرە کە بێنرخە و گرنگی نییە، ئەوە بۆ کارکەرەکەیە، نەمبیستووە کەس فەتوای بە گەڕاندنەوەی دابێت، بەڵکوو تەنها شتێك دەگەڕێندرێتەوە کە نرخی هەبێت، وە ئەگەر شتێك بێت ناوی گەورەی هەبێت وەك وڵاغ و وشتر و شازەکونە (کە جلێکی ئەستووری یەمەنییە) یان هاوشێوەی ئەو شتانە کە نرخی هەیە، من بۆچوونم وایە ئەوەی لەلای کارکەرەکە دەمێنێتەوە لەو شتانە دەبێ بگەڕێندرێتەوە تەنها لەو کاتە نەبێت کە گەردنی خۆی بە خاوەنەکەی ئازاد بکات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦٨ في القراض، عن مالك به.





## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی باغەوانی (کردن بۆ کەسی تر)[١]

**٢٠٤٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِيَهُودِ خَيْبَرَ يَوْمَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ: أُقِرُّكُمْ مَا أَقَرَّكُمُ اللهُ ﷻ عَلَى أَنَّ الثَّمَرَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَبْعَثُ عَبْدَ اللهِ بْنَ رَوَاحَةَ، فَيَخْرُصُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ، ثُمَّ يَقُولُ: إِنْ شِئْتُمْ فَلَكُمْ، وَإِنْ شِئْتُمْ فَلِيَ، فَكَانُوا يَأْخُذُونَهُ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی خەیبەردا بە جوولەکەکانی خەیبەری فەرموو: ئەو مافەتان بۆ دادەنێم کە خوای پەروەردگار بۆی داناون، بەوەی بەروبوومی خەیبەر بە نیوە بێت لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی دەنارد و بەرووبومەکەی دەخەمڵاند، دواتر دەیگوت: ئەگەر حەز دەکەن با بۆ ئێوە بێت (و دواتر نیوەمان بدەنێ)، ئەگەر حەزیش دەکەن با بۆ ئێمە بێت (و دواتر نیوەتان دەدەینێ)، جا ئەوان وەریاندەگرت (دواتر نیوەیان دەدا بە مسوڵمانان).

**٢٠٥٠-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَبْعَثُ عَبْدَ اللهِ بْنَ رَوَاحَةَ إِلَى خَيْبَرَ فَيَخْرُصُ بَيْنَهُ، وَبَيْنَ يَهُودِ خَيْبَرَ، قَالَ: فَجَمَعُوا لَهُ حَلْيًا مِنْ حَلْيِ نِسَائِهِمْ، فَقَالُوا: هَذَا لَكَ، وَخَفِّفْ عَنَّا، وَتَجَاوَزْ فِي الْقَسْمِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ: يَا مَعْشَرَ يَهُودَ، وَاللَّهِ إِنَّكُمْ لَمِنْ أَبْغَضِ خَلْقِ اللهِ إِلَيَّ، وَمَا ذَاكَ بِحَامِلِي عَلَى أَنْ أَحِيفَ عَلَيْكُمْ، فَأَمَّا مَا عَرَضْتُمْ مِنَ الرَّشْوَةِ، فَإِنَّهَا سُحْتٌ، وَإِنَّا لاَ نَأْكُلُهَا، فَقَالُوا: بِهَذَا قَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ[٣].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی دەنارد بۆ خەیبەر و بەروبوومەکانی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْمُسَاقَاةِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٧ في الشفعة؛ والشيباني: ٨٣١ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ٤٢٧؛ وفي: ١٠٩٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٨ في الشفعة؛ والشيباني: ٨٣٢ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ٤٢٨، كلهم عن مالك به.





دەخەملاند بۆ (دیاریکردنی پشکی) مسوڵمانان و جوولەکانی خەیبەر، دەڵێ: جا چەند خشڵێکی ئافرەتەکانی خۆیانیان بۆ کۆ کردبوویەوە و گوتیان: ئەوە بۆ تۆیە، تۆش لەسەرمان سوککە (خاترمان بگرە و پشکی ئێمە زیاتر دانێ)، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەش گوتی: ئەی کۆمەڵانی جوولەکە، سوێند بەخوا ﷻ ئێوە خراپترین دروستکراوی خوان لەلای من، بەڵام ئەوە وا ناکات ستەمتان لێ بکەم، هەرچی ئەوەشە کە پێشنیارتان کردووە بۆم لە ڕەشوە و بەرتیل (کە بریتییە لەو خشڵانە) ئەوە حەڕامە و ئێمە نایخۆین، ئەوانیش گوتیان: (ڕاستە) ئاسمان و زەوی بەو دادپەروەرییە ڕاوەستاوە.

**٢٠٥١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا سَاقَى الرَّجُلُ النَّخْلَ، وَفِيهَا الْبَيَاضُ، فَمَا ازْدَرَعَ الرَّجُلُ الدَّاخِلُ فِي الْبَيَاضِ، فَهُوَ لَهُ، قَالَ: وَإِنِ اشْتَرَطَ صَاحِبُ الأَرْضِ أَنَّهُ يَزْرَعُ فِي الْبَيَاضِ لِنَفْسِهِ، فَذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّ الرَّجُلَ الدَّاخِلَ فِي الْمَالِ، يَسْقِي لِرَبِّ الْمَالِ الأَرْضَ، فَذَلِكَ زِيَادَةٌ ازْدَادَهَا عَلَيْهِ[1].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاوێك باغەوانی بۆ کەسێك ئەنجام دا لە دارخورمادا لە کاتێکدا بەشێك لە زەوی چۆڵ و بێدرەخت و کشتوکاڵی تێدا بوو، جا ئەو کشتوکاڵ و داچاندنەی کەسە باغەوانەکە لەو زەوییە چۆڵ و ڕەقەدا ئەنجامی دەدات و پڕی دەکاتەوە بۆ خۆیەتی، گوتوویەتی: وە ئەگەر خاوەنی درەخت و زەوییەکە بە مەرج دابنێت کشتوکاڵ بکات لە زەوییە ڕووت و چۆڵەکە بۆ خۆی، ئەوە دروست نییە، چونکە ئەو کەسە باغەوانەی هاتووە بۆ ناو زەوییەکە تەنها زەوییەکە بۆ خاوەن ماڵ ئاو دەدات، ئەوەش زیادەیە بەسەریدا زیادی کردووە (بۆیە دروست نییە تەنها بۆ خاوەن ماڵ بێت).

**٢٠٥٢- [فتوى] قَالَ: وَإِنِ اشْتَرَطَ الزَّرْعَ بَيْنَهُمَا، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، إِذَا كَانَتِ الْمَؤُونَةُ كُلُّهَا عَلَى الدَّاخِلِ فِي الْمَالِ: الْبَذْرُ، وَالسَّقْيُ، وَالْعِلاَجُ كُلُّهُ، فَإِنِ اشْتَرَطَ الدَّاخِلُ فِي الْمَالِ عَلَى رَبِّ الْمَالِ، أَنَّ الْبَذْرَ عَلَيْكَ، فَإِنَّ ذَلِكَ غَيْرُ جَائِزٍ، لأَنَّهُ قَدِ اشْتَرَطَ عَلَى رَبِّ الْمَالِ زِيَادَةً ازْدَادَهَا عَلَيْهِ، وَإِنَّمَا تَكُونُ الْمُسَاقَاةُ عَلَى أَنَّ الدَّاخِلَ فِي الْمَالِ: الْمَؤُونَةَ كُلَّهَا، وَالنَّفَقَةَ، وَلاَ يَكُونُ عَلَى رَبِّ الْمَالِ مِنْهَا شَيْءٌ، فَهَذَا وَجْهُ الْمُسَاقَاةِ الْمَعْرُوفُ[2].**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٩ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٠ في الشفعة، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر (خاوەنی زەوییەکە) داچاندن و کشتوکاڵی بە مەرج گرت (بەوەی بەرهەمەکەی) بە نیوەیی بێت لە نێوانیاندا، ئەوە کێشەی تیا نییە، ئەگەر گشت مەسرەفەکە لەسەر ئەو کەسە بێت کە هاتووە باغەوانی بۆ زەوییەکە دەکات، (مەسرەفەکان وەك): تۆو و ئاودان و گشت کارکردنێك، جا ئەگەر ئەو کەسەی هاتۆتە ناو زەوییەکە و باغەوانی دەکات بە مەرجی گرت لەسەر خاوەن زەوییەکە بەوەی تۆو لەسەر ئەو بێت، ئەوە دروست نییە، چونکە شتێکی لەسەر خاوەن ماڵ بە مەرج گرتووە کە زیادەیەکە لەسەری زیاد کردووە، چونکە باغەوانی کردن بۆ کەسی تر ئەوەیە گشت مەسرەفێك لەسەر باغەوانەکە بێت، هیچ شتێك لەوانە لەسەر خاوەن زەوییەکە نییە، ئەوە بریتییە لە باغەوانی کردنی دروست (جۆری دیکە دروست نییە).

**٢٠٥٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْعَيْنِ تَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، فَيَنْقَطِعُ مَاؤُهَا، فَيُرِيدُ أَحَدُهُمَا أَنْ يَعْمَلَ فِي الْعَيْنِ، وَيَقُولُ الآخَرُ: لاَ أَجِدُ مَا أَعْمَلُ بِهِ، إِنَّهُ يُقَالُ لِلَّذِي يُرِيدُ أَنْ يَعْمَلَ فِي الْعَيْنِ: اعْمَلْ وَأَنْفِقْ، وَيَكُونُ لَكَ الْمَاءُ كُلُّهُ، تَسْقِي بِهِ، حَتَّى يَأْتِيَ صَاحِبُكَ بِنِصْفِ مَا أَنْفَقْتَ، فَإِذَا جَاءَ بِنِصْفِ مَا أَنْفَقْتَ، أَخَذَ حِصَّتَهُ مِنَ الْمَاءِ، قَالَ: وَإِنَّمَا أُعْطِيَ الأَوَّلُ الْمَاءَ كُلَّهُ، لأَنَّهُ أَنْفَقَ، وَلَوْ لَمْ يُدْرِكْ شَيْئًا بِعَمَلِهِ، لَمْ يَعْلَقِ الآخَرَ مِنَ النَّفَقَةِ شَيْءٌ[1].**

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کانییەی لە نێوان دوو کەسدایە (دوو کەس شەریکن تیایدا) و ئاوەکەی دەپچڕێت و نامێنێت، جا یەکێکیان بیەوێ کار لە کانییەکەدا بکات (بۆ ئەوەی ئاوی پەیدا بێتەوە)، ئەوەی دیکەشیان بڵێت: پارەم نییە کاری تێدا بکەم، گوتوویەتی: بەو کەسە دەگوترێت کە ویستوویەتی کار لە کانییەکەدا بکات: کار بکە و مەسرەفی لێ بکە و ئاوەکە گشتی دەبێتە هی تۆ، ئاودانی خۆتی پێ ئەنجام بدە، تاوەکوو شەریکەکەت نیوەی ئەو پارەیە دەهێنێت کە کردووتە بە مەسرەف، جا ئەگەر نیوەی ئەو مەسرەفەی هێنا کە کردووتە، ئەوە پشکی خۆی لە ئاوەکە وەردەگرێت، گوتوویەتی: ئەوەی یەکەمیان بۆیە گشت ئاوەکەی دەدرێتێ، چونکە ئەو مەسرەفی کردووە، جا (ئەوەی یەکەم کە بەتەنها

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠١ في الشفعة، عن مالك به.

مەسرەفەكەی كردووە) ئەگەر بەو كاركردنەی نەگەیشت بە هیچ، ئەوە ئەوەی دیكەیان پابەند نابێت بە هیچ مەسرەفێك.

**٢٠٥٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا كَانَتِ النَّفَقَةُ كُلُّهَا، وَالْمَؤُونَةُ عَلَى رَبِّ الْحَائِطِ، وَلَمْ يَكُنْ عَلَى الدَّاخِلِ فِي الْمَالِ شَيْءٌ، إِلاَّ أَنَّهُ يَعْمَلُ بِيَدِهِ، إِنَّمَا هُوَ أَجِيرٌ بِبَعْضِ الثَّمَرِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّهُ لاَ يَدْرِي كَمْ إِجَارَتُهُ؟ إِذَا لَمْ يُسَمِّ لَهُ شَيْئًا يَعْرِفُهُ، وَيَعْمَلُ عَلَيْهِ، لاَ يَدْرِي أَيَقِلُّ ذَلِكَ أَمْ يَكْثُرُ؟[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر گشت مەسرەفەكە لەسەر خاوەن بێستانەكە بێت و هیچ شتێك لەسەر باغەوانەكە نەبێت كە هاتۆتە ناو بێستانەكە، تەنها ئەو شتە نەبێت كە بە دەستی خۆی دەیكات، ئەوە بریتییە لە بەكرێگیراو بە بەشێك لە بەروبوومەكە، جا ئەوە دروست نییە، چونكە نازانێ كرێكەی چەندە؟ ئەگەر ناوی شتێك و ئەندازەیەكی دیاریكراوی نەگۆڕی بۆ نەهێنێ كە بزانێت و كاری لەسەر بكات، (ئەگەر وا نەبێت) نازانێ ئایا (كرێكەی) كەم دەبێ یان زۆر دەبێ؟

**٢٠٥٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ مُقَارِضٍ، أَوْ مُسَاقٍ، فَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَسْتَثْنِيَ مِنَ الْمَالِ وَلاَ مِنَ النَّخْلِ شَيْئًا دُونَ صَاحِبِهِ، وَذَلِكَ أَنَّهُ يَصِيرُ أَجِيرًا بِذَلِكَ، يَقُولُ: أُسَاقِيكَ عَلَى أَنْ تَعْمَلَ لِي فِي كَذَا وَكَذَا نَخْلَةً تَسْقِيهَا، وَتَأْبُرُهَا، وَأُقَارِضُكَ فِي كَذَا وَكَذَا مِنَ الْمَالِ، عَلَى أَنْ تَعْمَلَ لِي بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، لَيْسَتْ مِمَّا أُقَارِضُكَ عَلَيْهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَنْبَغِي، وَلاَ يَصْلُحُ، وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك مامەڵەی قازانجی هاوبەش بكات یان باغەوانی بكات، بۆی نییە شتێك بۆ خۆی جیا بكاتەوە لە سامانەكە و لە بەروبوومی باغەكە بەبێ بەژداری بەرانبەرەكەی، چونكە بەو كارە دەبێتە كرێكار (نەك كەسی مامەڵەكار لە مامەڵەی قازانجی هاوبەش و باغەوانی)، (بەوەی) بڵێت: دەتكەم بە باغەوانی خۆم بەوەی كارم بۆ لە ئەوەندە و ئەوەندە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٢ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٣ في الشفعة، عن مالك به.




دارخورمایە بکە باغەوانییان بۆ بکە و تەلقیحیان بکە، وە دەتکەم بە خاوەنی قازانجی هاوبەشیش (واتە جگە لە باغەوانی مامەڵەی قازانجی هاوبەشیشت لەگەڵ دەکەم) لەوەندە و لەوەندەماڵەدا بەوەی کارم بۆ بکەیت بە دە دینار، جیا لە بەژدارییپێکردنت لە قازانجە هاوبەشەکە، (ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی): ئەوە نابێت و دروست نییە، بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە.

**٢٠٥٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالسُّنَّةُ فِي الْمُسَاقَاةِ الَّتِي يَجُوزُ لِرَبِّ الْحَائِطِ أَنْ يَشْتَرِطَهَا عَلَى الْمُسَاقِي مِنْهَا: شَدُّ الْحِظَارِ، وَخَمُّ الْعَيْنِ، وَسَرْوُ الشَّرَبِ، وَإِبَّارُ النَّخْلِ، وَقَطْعُ الْجَرِيدِ، وَجَذُّ الثَّمَرِ، هَذَا وَأَشْبَاهُهُ، عَلَى أَنَّ لِلْمُسَاقِي شَطْرَ الثَّمَرِ أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ، أَوْ أَكْثَرَ إِذَا تَرَاضَيَا عَلَيْهِ، غَيْرَ أَنَّ صَاحِبَ الأَصْلِ لاَ يَشْتَرِطُ ابْتِدَاءَ عَمَلٍ جَدِيدٍ، يُحْدِثُهُ الْعَامِلُ فِيهَا، مِنْ بِئْرٍ يَحْتَفِرُهَا، أَوْ عَيْنٍ يَرْفَعُ رَأْسَهَا، أَوْ غِرَاسٍ يَغْرِسُهُ فِيهَا، يَأْتِي بِأَصْلِ ذَلِكَ مِنْ عِنْدِهِ، أَوْ ضَفِيرَةٍ يَبْنِيهَا، تَعْظُمُ فِيهَا نَفَقَتُهُ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ أَنْ يَقُولَ رَبُّ الْحَائِطِ لِرَجُلٍ مِنَ النَّاسِ: ابْنِ لِي هَاهُنَا بَيْتًا، أَوِ احْفِرْ لِي بِئْرًا، أَوْ أَجْرِ لِي عَيْنًا، أَوِ اعْمَلْ لِي عَمَلاً، بِنِصْفِ ثَمَرِ حَائِطِي هَذَا، قَبْلَ أَنْ يَطِيبَ ثَمَرُ الْحَائِطِ، وَيَحِلَّ بَيْعُهُ، فَهَذَا بَيْعُ الثَّمَرِ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلاَحُهُ، وَقَدْ نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێگەی ڕاست و تەواوی شەرعی کە دروست بێ بۆ خاوەنی باغ و بێستان (بەوەی) مەرج لەسەر ئەو کەسە دابنێ کە باغەوانی بۆ دەکات ئەو مەرجانەن: سیلە و شوڕە قایمکردنی بێستان و پاککردنەوەی سەرچاوە ئاوەکە و لادان و پاککردنەوەی گۆلەکانی ژێر درەختەکان (لە گژوگیا) و تەلقیحکردنی دارخورما و بڕینی لقەداری شکاو و بڕینەوە و چنینەوە و لێکردنەوەی میوە و شتی لەو شێوەیە، لەسەر ئەوەی نیوەی بەروبوومەکە یان کەمتر یان زیاتر ئەگەر هەردووکیان لەسەری ڕێك کەوتن بۆ باغەوانەکە بێت (بەم شێوەیە دروستە)، (بەڵام ئەوەی دروست نییە ئەوەیە) نابێ خاوەنی باغ و بێستانەکە مەرجی کارێکی نوێ دابنێ، بەوەی کرێکار و باغەوانەکە لە نوێوە ئەنجامی بدات: لە بیرهەڵکەندن یان کانییێك هەڵچنێ و بەرزی بکاتەوە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٤ في الشفعة، عن مالك به.

یان درەختی لێ بچێنێ، باغەوانەکە لە بنچینەوە لەلایەن خۆیەوە ئەنجامی بدات، یان حەوزێکی گەورەی ئاو دروست بکات کە مەسرەفی زۆر بێت (ئەمانە هیچیان دروست نین)، ئەو بابەتە وەك ئەوە وایە خاوەنی بێستان بە کەسێك بڵێت: لێرەدا خانوویێکم بۆ دروست بکە یان بیرێکم بۆ هەڵکەنە، یان ئاوی کانییێکم بۆ بێنە ئێرە، یان کارێکم بۆ بکە، بە نیوەی بەروبوومی ئەو بێستانەم، (ئەو مامەڵەیە بکات) بەر لەوەی بەروبوومی بێستانەکە پێ بگات و فرۆشتنی دروست بێت، ئەوە (دروست نییە و بریتییە لە) فرۆشتنی بەروبووم بەر لەوەی پێ بگات، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی بەروبوومی حەرام کردووە بەر لەوەی پێ بگات.

**٢٠٥٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا إِذَا طَابَ الثَّمَرُ، وَبَدَا صَلاَحُهُ، وَحَلَّ بَيْعُهُ، ثُمَّ قَالَ رَجُلٌ لِرَجُلٍ: اعْمَلْ لِي بَعْضَ هَذِهِ الأَعْمَالِ، لِعَمَلٍ يُسَمِّيهِ لَهُ، بِنِصْفِ ثَمَرِ حَائِطِي هَذَا، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، وَإِنَّمَا اسْتَأْجَرَهُ بِشَيْءٍ مَعْرُوفٍ مَعْلُومٍ، قَدْ رَآهُ وَرَضِيَهُ، قَالَ: فَأَمَّا الْمُسَاقَاةُ، فَإِنَّهُ إِنْ لَمْ يَكُنْ لِلْحَائِطِ ثَمَرٌ، أَوْ قَلَّ ثَمَرُهُ، أَوْ فَسَدَ، فَلَيْسَ لَهُ إِلاَّ ذَلِكَ، وَأَنَّ الأَجِيرَ لاَ يُسْتَأْجَرُ إِلاَّ بِشَيْءٍ مُسَمًّى، لاَ تَجُوزُ الإِجَارَةُ إِلاَّ بِذَلِكَ، وَإِنَّمَا الإِجَارَةُ بَيْعٌ مِنَ الْبُيُوعِ، إِنَّمَا يَشْتَرِي مِنْهُ عَمَلَهُ، وَلاَ يَصْلُحُ ذَلِكَ إِذَا دَخَلَهُ الْغَرَرُ، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ[1].**

**(فەتوا)**: واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەوەیە کە بەروبوومەکە خۆش بووە و تەواو پێ گەییوە و فرۆشتنی دروست بووە، دواتر کەسێك بە کەسێك بڵێت: هەندێك لەو کارانەم بۆ بکە، باسی کارەکانی بۆ بکات، بە نیوەی بەروبوومی بێستانەکەم، ئەوە هیچ کێشەی تیا نییە، چونکە بەکرێی گرتووە بە شتێکی دروستی ڕوون و دیار و زانراو (چونکە کە بەروبوومەکە پێ گەیشتووە دیارە ئەندازەی چەندە)، خۆیشی بینیویەتی و پێی ڕازی بووە، (ئیمامی مالیك رحمه الله) گوتوویەتی: بەڵام هەرچی باغەوانییە، ئەوە ئەگەر بێستانەکە بەروبوومی نەبوو یان بەروبوومی کەم بوو یان تێکچوو، ئەوە هیچی بۆ نییە جگە لەوە، وە بەکرێگیراو (کرێکار) بەکرێ ناگیرێ تەنها بە شتێکی ناوهێنراوی ڕوون و دیار نەبێ، بەکرێگرتن دروست نییە تەنها بەوە نەبێت، چونکە بەکرێگرتن بەیع و

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٥ في الشفعة؛ والشيباني: ٧٧٥ في البيوع والتجارات والسلم، عن مالك به.




مامەڵەیەکە لە مامەڵەکان، کەسەکە کار و ئیشکردنی کەسەکە دەکڕێت، ئەوەش دروست نییە ئەگەر نادیاری و ناڕوونی بکەوێتە ناو، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی نادیاری قەدەغە و حەڕام کردووە.

٢٠٥٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ فِي الْمُسَاقَاةِ عِنْدَنَا، أَنَّهَا تَكُونُ فِي أَصْلِ كُلِّ نَخْلٍ، أَوْ كَرْمٍ، أَوْ زَيْتُونٍ، أَوْ تِينٍ، أَوْ رُمَّانٍ، أَوْ فِرْسِكٍ، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الأُصُولِ، جَائِزٌ لاَ بَأْسَ بِهِ، عَلَى أَنَّ لِرَبِّ الْمَالِ نِصْفَ الثَّمَرِ مِنْ ذَلِكَ، أَوْ ثُلُثَهُ أَوْ رُبُعَهُ أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَقَلَّ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازی شەرعی دەربارەی باغەوانی لەلای ئێمە ئاوایە: باغەوانی لە درەختی خورما و مێو و زەیتون و هەنجیر و هەنار و خۆخ و هاوشێوەی ئەوانەدایە لە درەخت، دروستە و هیچ کێشەی تیا نییە بەوەی (هەر چەند بەروبووم وەدەست هات) نیوەی بەروبوومەکە یان سێیەکی یان چواریەکی یان زیاتر لەوە یان کەمتر لەوە بۆ خاوەن ماڵ و درەختەکە بێت.

٢٠٥٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمُسَاقَاةُ أَيْضًا تَجُوزُ فِي الزَّرْعِ إِذَا خَرَجَ وَاسْتَقَلَّ، فَعَجَزَ صَاحِبُهُ عَنْ سَقْيِهِ وَعَمَلِهِ وَعِلاَجِهِ، فَالْمُسَاقَاةُ فِي ذَلِكَ أَيْضًا جَائِزَةٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: باغەوانی لە دانەوێڵەش دروستە ئەگەر لە زەوی دەرچووبێت و سەری دەرهێنابێ و خاوەنەکەشی نەتوانێ ئاوی بدات و کاری تێدا بکات و جێبەجێی بکات، باغەوانی لەوەشدا دروستە[٢].

٢٠٦٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ تَصْلُحُ الْمُسَاقَاةُ فِي شَيْءٍ مِنَ الأُصُولِ مِمَّا تَحِلُّ فِيهِ الْمُسَاقَاةُ، إِذَا كَانَ فِيهِ ثَمَرٌ قَدْ طَابَ وَبَدَا صَلاَحُهُ وَحَلَّ بَيْعُهُ، وَإِنَّمَا يَنْبَغِي أَنْ يُسَاقَى مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ، وَإِنَّمَا مُسَاقَاةُ مَا حَلَّ بَيْعُهُ مِنَ الثِّمَارِ إِجَارَةٌ، لأَنَّهُ إِنَّمَا سَاقَى صَاحِبَ الأَصْلِ ثَمَرًا قَدْ بَدَا صَلاَحُهُ، عَلَى أَنْ يَكْفِيَهُ إِيَّاهُ وَيَجُذَّهُ لَهُ، بِمَنْزِلَةِ الدَّنَانِيرِ وَالدَّرَاهِمِ يُعْطِيهِ إِيَّاهَا، وَلَيْسَ ذَلِكَ بِالْمُسَاقَاةِ، إِنَّمَا الْمُسَاقَاةُ مَا بَيْنَ أَنْ يَجُذَّ النَّخْلَ إِلَى أَنْ يَطِيبَ الثَّمَرُ وَيَحِلَّ بَيْعُهُ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٦ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی تەنها لە دارخورما و دار مێودا دروستە.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٧ في الشفعة، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: باغەوانی دروست نییە لەو داروبارەی باغەوانی تێدا دروستە ئەگەر بەروبوومی تیا بێت پێ گەیشتبێت و فرۆشتنی دروست بوویێت، بەڵکوو دەبێ بۆ ساڵی داهاتوو باغەوانی بکات، چونکە باغەوانیکردنی ئەو بەروبوومەی فرۆشتنی حەڵاڵ و دروست بووە بەکرێگرتنە (نەك باغەوانی)، چونکە دەکا خاوەنی درەختەکان باغەوانی گرتووە بۆ بەروبوومێك کە پێ گەیشتووە، بەوەی بۆی تەواو جێبەجێ بکات و بیبڕێتەوە، لە جیاتی دینار و درهەم و (پارە) لەسەر باغەوانی بیداتێ، (ئەوەش نابێت، چونکە) ئەوە بابەتی باغەوانی نییە، چونکە باغەوانی تەنها لەو کاتەوەیە کە خورماکە دەبڕدرێتەوە تا ئەو کاتەی بەروبوومەکە جارێکی دیکە پێ دەگات و فرۆشتنی حەڵاڵ و دروست دەبێت.

**٢٠٦١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ سَاقَى ثَمَرًا فِي أَصْلٍ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلاَحُهُ، وَيَحِلَّ بَيْعُهُ، فَتِلْكَ الْمُسَاقَاةُ بِعَيْنِهَا جَائِزَةٌ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك باغەوانی بکات لە میوەیەکدا بەر لەو کاتەی تەواو پێ بگات و فرۆشتنی حەڵاڵ بوویێت، ئەوە خودی باغەوانییە و دروستە (هیچ کێشەی نییە).

**٢٠٦٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَنْبَغِي أَنْ تُسَاقَى الأَرْضُ الْبَيْضَاءُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ يَحِلُّ لِصَاحِبِهَا كِرَاؤُهَا بِالدَّنَانِيرِ وَالدَّرَاهِمِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الأَثْمَانِ الْمَعْلُومَةِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ زەوی ڕووتی بێدانەوێڵە و درەخت بە باغەوانی کاری لەسەر بکرێت (بەوەی بەرهەمەکە بە هاوبەشی بێت لە نێوان خاوەنی زەوییەکە و ئەو کەسەی خزمەتی دەکات)، چونکە بۆ خاوەنەکەی دروستە بەکرێی بدات بە دینار و درهەم و جۆرەکانی دیکەی پارەی دیاریکراو (کەواتە هەتا مامەڵەی ڕوون هەبێت نابێ مامەڵەی نادیار بکات، چونکە زەوی کە هیچی تێدا نەڕوابێت سەرەنجامی دیار نییە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٧ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠٩ في الشفعة، عن مالك به.




**٢٠٦٣- [فتوى]** قَالَ: فَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي يُعْطِي أَرْضَهُ الْبَيْضَاءَ بِالثُّلُثِ أَوِ الرُّبُعِ مِمَّا يَخْرُجُ مِنْهَا، فَذَلِكَ مِمَّا يَدْخُلُهُ الْغَرَرُ، لأَنَّ الزَّرْعَ يَقِلُّ مَرَّةً وَيَكْثُرُ مَرَّةً، وَرُبَّمَا هَلَكَ رَأْسًا، فَيَكُونُ صَاحِبُ الأَرْضِ قَدْ تَرَكَ كِرَاءً مَعْلُومًا، يَصْلُحُ لَهُ أَنْ يُكْرِيَ أَرْضَهُ بِهِ، وَأَخَذَ أَمْرًا غَرَرًا لاَ يَدْرِي أَيَتِمُّ أَمْ لاَ؟ فَهَذَا مَكْرُوهٌ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ، مَثَلُ رَجُلٍ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا لِسَفَرٍ بِشَيْءٍ مَعْلُومٍ، ثُمَّ قَالَ الَّذِي اسْتَأْجَرَ الأَجِيرَ: هَلْ لَكَ أَنْ أُعْطِيَكَ عُشْرَ مَا أَرْبَحُ فِي سَفَرِي هَذَا إِجَارَةً لَكَ؟ فَهَذَا لاَ يَحِلُّ وَلاَ يَنْبَغِي[1]، قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَلَا يَنْبَغِي لِرَجُلٍ أَنْ يُؤَاجِرَ نَفْسَهُ وَلَا أَرْضَهُ وَلَا سَفِينَتَهُ، إِلاَّ بِشَيْءٍ مَعْلُومٍ لاَ يَزُولُ إِلَى غَيْرِهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: هەرچی ئەو کەسەیە کە زەوییە ڕووت و بێدانەوێڵەکەی بە سێیەك یان چواریەکی بەرهەمەکەی دەدات، ئەوە بریتییە لەو مامەڵەی کە نادیاری تێدایە (دروست نییە)، چونکە دانەوێڵە و کشتوکاڵ جارێك کەم دەکات و جارێك زیاد دەکات (دیار نییە)، هەندێ جاریش گشتی دەفەوتێ، جا خاوەنی زەوییەکە (کە ئەو مامەڵەیە دەکات) کرێی دیاریکراوی واز لێ هێناوە کە بۆی دەگونجا و دروست بوو زەوییەکەی پێ بە کرێ بدات (لەگەڵ ئەوەدا) چووە مامەڵەی نادیاری ئەنجام داوە کە نازانێ ئایا تەواو دەبێ و بەرهەم دەستەبەر دەبێ یان نا؟ ئەوە حەڕامە، نموونەی ئەوە وەك کەسێك وایە کرێکارێك بەکرێ بگرێت بۆ سەفەرێك بە پارە و شتێکی دیاریکراو، دواتر ئەو کەسەی کرێکارەکەی بەکرێ گرتووە بە کرێکارەکە بڵێت: ئایا ڕازیت بەوەی دەیەکی ئەوەی قازانجی لێ دەکەم لەم سەفەرەمدا پێت ببەخشم و ئەوە ببێت بە کرێیەکەت؟ ئەوە حەڵاڵ نییە و نابێ، ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بۆ هیچ کەسێك دروست نییە نە خۆی بەکرێ بدات نە زەوییەکەی بەکرێ بدات نە کەشتییەکەی بەکرێ بدات تەنها بە شتێکی دیاریکراو نەبێت کە بۆ شتی دیکە نەگۆڕێت (واتە دەبێت کرێیێکی نەگۆڕ بێت و نادیاری تێدا نەبێت).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١٠ في الشفعة، عن مالك به.




٢٠٦٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا فَرَّقَ بَيْنَ الْمُسَاقَاةِ فِي النَّخْلِ وَالأَرْضِ الْبَيْضَاءِ، أَنَّ صَاحِبَ النَّخْلِ لاَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَهَا، حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهُ، وَصَاحِبُ الأَرْضِ يُكْرِيهَا وَهِيَ أَرْضٌ بَيْضَاءُ لاَ شَيْءَ فِيهَا(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی جیاوازی کردووە لە نێوان باغەوانی کردن لە دارخورما و باغەوانی کردن لە زەوی ڕووت و بێدانەوێڵە و درەخت، ئەوەیە خاوەنی دارخورما ناتوانێ بەروبوومەکەی بفرۆشێت تاوەکوو بەتەواوی پێ دەگات، بەڵام خاوەنی زەوی بۆی هەیە بەکرێی بدات لە کاتێکدا ڕووتە و هیچی تیا نییە.

٢٠٦٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِي النَّخْلِ أَيْضًا: إِنَّهَا تُسَاقِي السِّنِينَ الثَّلاَثَ وَالأَرْبَعَ وَأَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ وَأَكْثَرَ، قَالَ: وَذَلِكَ الَّذِي سَمِعْتُ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە هەر دەربارەی دارخورما (بابەتێکی دیکە هەیە) ئەویش ئەوەیە: دارخورما سێ ساڵ و چوار ساڵ و کەمتر لەوە و زیاتر لەوەش دروستە باغەوانی تێدا بکرێت.

٢٠٦٦- **[فتوى]** وَكُلُّ شَيْءٍ مِثْلُ ذَلِكَ مِنَ الأُصُولِ بِمَنْزِلَةِ النَّخْلِ، يَجُوزُ فِيهِ لِمَنْ سَاقَى مِنَ السِّنِينَ مِثْلُ مَا يَجُوزُ فِي النَّخْلِ(٣).

(فەتوا): واتە: گشت درەختێك وەك دارخورما وایە، چەندین ساڵ نیوەباغی دروستە وەك لەوەی دروست بوو بۆ دارخورما، بۆ ئەو کەسەی باغەوانی تێدا ئەنجام دەدات.

٢٠٦٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُسَاقِي: إِنَّهُ لاَ يَأْخُذُ مِنْ صَاحِبِهِ الَّذِي سَاقَاهُ شَيْئًا مِنْ ذَهَبٍ وَلاَ وَرِقٍ يَزْدَادُهُ، وَلاَ طَعَامٍ، وَلاَ شَيْئًا مِنَ الأَشْيَاءِ، لاَ يَصْلُحُ ذَلِكَ، وَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يَأْخُذَ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١١ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١٢ في الشفعة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١٣ في الشفعة، عن مالك به.





**الْمُسَاقَى مِنْ رَبِّ الْحَائِطِ شَيْئًا يَزِيدُهُ إِيَّاهُ، مِنْ ذَهَبٍ وَلاَ وَرِقٍ وَلاَ طَعَامٍ وَلاَ شَيْءٍ مِنَ الأَشْيَاءِ، وَالزِّيَادَةُ فِيمَا بَيْنَهُمَا لاَ تَصْلُحُ.**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی باغەوان دەگرێت گوتوویەتی: نابێ هیچ شتێك زیاد بكات و وەریبگرێت لەو كەسەی بە باغەوانی گرتوویەتی، نە لە زێڕ و نە لە زیو و نە لە خواردن و نە لە هیچ شتێك لە شتەكان، دروست نییە، وە نابێ ئەو كەسەی بە باغەوانی گیراوە هیچ شتێكی زیاد لە خاوەنی بێستانەكە وەربگرێت نە لە زێڕ و نە لە زیو و نە لە خواردن و نە لە هیچ شتێك لە شتەكان، زیادە لە نێوانیان نابێ و دروست نییە.

**٢٠٦٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمُقَارِضُ أَيْضًا بِهَذِهِ الْمَنْزِلَةِ لاَ يَصْلُحُ، إِذَا دَخَلَتِ الزِّيَادَةُ فِي الْمُسَاقَاةِ، أَوِ الْمُقَارَضَةِ صَارَتْ إِجَارَةً، وَمَا دَخَلَتْهُ الإِجَارَةُ فَإِنَّهُ لاَ يَصْلُحُ، وَلاَ يَنْبَغِي أَنْ تَقَعَ الإِجَارَةُ بِأَمْرٍ غَرَرٍ، لاَ يَدْرِي أَيَكُونُ أَمْ لاَ يَكُونُ، أَوْ يَقِلُّ أَوْ يَكْثُرُ**[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو كەسەش كە مامەڵەی قازانجی هاوبەش دەكات بە هەمان شێوەیە زیادە وەرگرتن تیایدا دروست نییە، ئەگەر زیادە بكەوێتە ناو باغەوانی و ناو قازانجی هاوبەش ئەوە دەبێتە بەكرێگرتن، ئەو شتانەش بەكرێگرتنیان بكەوێتە ناو دروست نین، وە ناشبێ بەكرێگرتن لە شتی نادیار بكرێت، كە نازانرێ ئایا دەبێت نابێت، یان كەم دەبێت یان زۆر دەبێت (كەواتە ئەو جۆرە مامەڵەیە بەو شێوەیە نە باغەوانییە نە قازانجی هاوبەشە نە بەكرێگرتنە).

**٢٠٦٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُسَاقِي الرَّجُلَ الأَرْضَ فِيهَا النَّخْلُ وَالْكَرْمُ، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الأُصُولِ، فَتَكُونُ فِيهَا الأَرْضُ الْبَيْضَاءُ، قَالَ مَالِكٌ: إِذَا كَانَ الْبَيَاضُ تَبَعًا لِلأَصْلِ، وَكَانَ الأَصْلُ أَعْظَمَ مِنْ ذَلِكَ وَأَكْثَرَهُ، فَلاَ بَأْسَ بِمُسَاقَاتِهِ، وَذَلِكَ أَنْ يَكُونَ النَّخْلُ الثُّلُثَيْنِ أَوْ أَكْثَرَ، وَيَكُونَ الْبَيَاضُ الثُّلُثَ أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ، وَذَلِكَ أَنَّ الْبَيَاضَ حِينَئِذٍ تَبَعٌ لِلأَصْلِ، وَإِذَا كَانَتِ الأَرْضُ الْبَيْضَاءُ فِيهَا نَخْلٌ أَوْ كَرْمٌ أَوْ مَا يُشْبِهُ ذَلِكَ مِنَ الأُصُولِ فَكَانَ الأَصْلُ الثُّلُثَ أَوْ أَقَلَّ، وَالْبَيَاضُ الثُّلُثَيْنِ أَوْ**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١٤ في الشفعة، عن مالك به.

أَكْثَرَ، جَازَ فِي ذَلِكَ الْكِرَاءُ، وَحَرُمَتْ فِيهِ الْمُسَاقَاةُ، وَذَلِكَ أَنَّ مِنْ أَمْرِ النَّاسِ أَنْ يُسَاقُوا الأَصْلَ وَفِيهِ الْبَيَاضُ، وَتُكْرَى الأَرْضُ وَفِيهَا الشَّيْءُ الْيَسِيرُ مِنَ الأَصْلِ، أَوْ يُبَاعَ الْمُصْحَفُ أَوِ السَّيْفُ وَفِيهِمَا الْحِلْيَةُ مِنَ الْوَرِقِ بِالْوَرِقِ، أَوِ الْقِلاَدَةُ أَوِ الْخَاتَمُ وَفِيهِمَا الْفُصُوصُ وَالذَّهَبُ بِالدَّنَانِيرِ، وَلَمْ تَزَلْ هَذِهِ الْبُيُوعُ جَائِزَةً يَتَبَايَعُهَا النَّاسُ وَيَبْتَاعُونَهَا، وَلَمْ يَأْتِ فِي ذَلِكَ شَيْءٌ مَوْصُوفٌ مَوْقُوفٌ عَلَيْهِ، إِذَا هُوَ بَلَغَهُ كَانَ حَرَامًا، أَوْ قَصُرَ عَنْهُ كَانَ حَلاَلاً، وَالأَمْرُ فِي ذَلِكَ عِنْدَنَا الَّذِي عَمِلَ بِهِ النَّاسُ وَأَجَازُوهُ بَيْنَهُمْ، أَنَّهُ إِذَا كَانَ الشَّيْءُ مِنْ ذَلِكَ الْوَرِقِ أَوِ الذَّهَبِ تَبَعًا لِمَا هُوَ فِيهِ جَازَ بَيْعُهُ، وَذَلِكَ أَنْ يَكُونَ النَّصْلُ أَوِ الْمُصْحَفُ أَوِ الْفُصُوصُ قِيمَتُهُ الثُّلُثَانِ، أَوْ أَكْثَرُ، وَالْحِلْيَةُ قِيمَتُهَا الثُّلُثُ أَوْ أَقَلُّ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی باغەوانی زەوییەك بۆ کەسێك دەکات کە دارخورما و مێوی تیایە، یان درەختێکی هاوشێوەی ئەوانە و ئەو زەوییە زەوی ڕووت و بێدرەختی تیا بێ، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر زەوییە ڕووت و بێدرەختەکە لەگەڵ ئەو زەوییە سەرەکییە بوو کە باغەوانی بۆ دەکرێ و زەوییە سەرەکییەکەش زیاتر بوو لە زەوییە بێ درەختەکە، ئەوە کێشە لە باغەوانیکردنەکەدا نییە (دروستە)، جا (زۆری و کەمییەکە) ئەوەیە دارخورماکان دوو لەسەر سێ یان زیاتر بن، زەوییە ڕووت و بێدرەختەکەش سێیەك یان کەمتر بێت، چونکە ئەو کات زەوییە بێ درەختەکە دەبێتە تابیعی زەوییە سەرەکییەکە، (بەڵام) ئەگەر زەوییە ڕووت و بێدرەختەکە زەوی دارخورما و مێو و هاوشێوەکانی بوو و زەوییە سەرەکییەکە سێیەك یان کەمتر بوو، زەوییە بێ درەختەکەش دوو لەسەر سێ یان زیاتر بوو، ئەوە بەکرێدانی دروستە و باغەوانی کردنی حەڕامە، جا ئەوە لەبەر ئەوەیە کاروباری خەڵکی ئاوایە باغەوانی بۆ زەوییەك دەکەن لە کاتێکدا هەندێك زەوی کەمی بێدرەختی هەر تیایە، وە زەوی بەکرێ دەدرێت لە کاتێکدا کەمێك زەوی بە درەختی تیایە، (بابەتێکی دیکە): موسحەف یان شمشێرێك بە زیو بفرۆشرێت لە کاتێکدا خشڵی زیویان تیایە، یان ملوانکە یان ئەنگوستیلە (گوستیلە)یەك بە زێڕ بفرۆشرێت لە کاتێکدا مورووو و زێڕیان تیایە، جا بەردەوام

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١٥ في الشفعة، عن مالك به.



ئەو كڕین و فرۆشتنانە جائیز بوون، خەڵك پێكیان فرۆشتووە و لێكیان كڕیوە و هیچ (دەقێكی شەرعی) دیاریكراو و كارپێكراو دەربارەی ئەوە نەهاتووە كە ئەگەر بگات بەوەندە حەرام بێت و ئەگەر لەوەندە كەمتر بێت حەڵاڵ بێت، جا بابەتەكە لەلای ئێمە كە خەڵك كاریان پێ كردووە و لە نێوانی خۆیان جێبەجێیان كردووە ئەوەیە: ئەگەر شتە زیوەكە یان زێڕەكە لەگەڵ شتە كڕاوەكە بوو و بەشێك بوو لێی ئەوە كڕین و فرۆشتنی دروستە، ئەویش بریتییە لەوەی تیرەكە (یان شمشێرەكە) یان موسحەفەكە یان مۆرییەكان و سەرە گوستیلەكە نرخەكەی دوو لەسەر سێی نرخی شتەكە بێت یان زیاتر، خشڵەكەش نرخی سێیەك یان كەمتر بێت.

## ٢- مەرجدانان (بۆ كارپێكردنی) كۆیلە لە باغەوانیدا[١]

**٢٠٧٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا سُمِعَ فِي عُمَّالِ الرَّقِيقِ فِي الْمُسَاقَاةِ، يَشْتَرِطُهُمُ الْمُسَاقَى عَلَى صَاحِبِ الأَرْضِ: إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، لأَنَّهُمْ عُمَّالُ الْمَالِ، فَهُمْ بِمَنْزِلَةِ الْمَالِ، لاَ مَنْفَعَةَ فِيهِمْ لِلدَّاخِلِ، إِلاَّ أَنَّهُ تَخِفُّ عَنْهُ بِهِمُ الْمَؤُونَةُ، وَإِنْ لَمْ يَكُونُوا فِي الْمَالِ اشْتَدَّتْ مَؤُونَتُهُ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ الْمُسَاقَاةِ فِي الْعَيْنِ وَالنَّضْحِ، وَلَنْ تَجِدَ أَحَدًا يُسَاقَى فِي أَرْضَيْنِ سَوَاءٍ فِي الأَصْلِ وَالْمَنْفَعَةِ، إِحْدَاهُمَا بِعَيْنٍ وَاثِنَةٍ غَزِيرَةٍ، وَالأُخْرَى بِنَضْحٍ عَلَى شَيْءٍ وَاحِدٍ، لِخِفَّةِ مُؤْنَةِ الْعَيْنِ، وَشِدَّةِ مُؤْنَةِ النَّضْحِ، قَالَ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

قَالَ: وَالْوَاثِنَةُ الثَّابِتُ مَاؤُهَا، الَّتِي لاَ تَغُورُ وَلاَ تَنْقَطِعُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاكترینی ئەوەی بیستراوە دەربارەی كرێكاری كۆیلە لە باغەوانیدا كە ئەو كەسەی بە باغەوانی گیراوە (بەژداریكردنی كرێكارێكی كۆیلە كە هی خاوەنی زەوییەكەیە) بە مەرج بگرێت لەسەر خاوەن زەوییەكە، هیچ كێشەی تیا نییە، چونكە ئەوان بە ماڵ و زەوییەكە حیسابن، هیچ سوودی بۆ ئەو باغەوانە نییە كە هاتۆتە ناو زەوییەكە، تەنها بەهۆیانەوە مەسرەف لەسەر خاوەن زەوییەكە سووك دەبێت، ئەگەر ئەوان لەناو

---

(١) ـ الشَّرْطُ فِي الرَّقِيقِ فِي الْمُسَاقَاةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١٩ في الشفعة، عن مالك به.




زەوییەكە نەبن مەسرەف زیاتر دەبێت، جا ئەو بابەتە وەك باغەوانییە (لە دوو زەوی یەكێكیان) كانی و (ئەوەی دیكەیان) ئاوی لە ڕووبار بۆ بهێنرێت و بگوازرێتەوە بە وڵاغ و ئامێر، كەسیشت دەست نەكەوێت باغەوانیت بۆ بكات لە دوو زەوی وەكوو یەكدی لە ڕووی درەخت و سوودەوە، یەكێكیان بە كانییێكی بەردەوامی خاوەن ئاوی زۆر ئاو بدرێت، ئەوەی دیكەشیان بە ئاژەڵێك ئاو بدرێت (و ئاوی لە شوێنی دیكە بۆ بهێنرێت)، لەبەر سووكی مەسرەفی كانییەكە و زۆری مەسرەفی ئاوهێنانەكە، (ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی): بابەتەكە لای ئێمە ئاوایە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (الْوَاثِنَةُ) واتە: ئەوەیە كە ئاوی بەردەوامە، كە بە زەویدا ناچێتە خوارەوە و ناپچڕێت و كۆتایی نایەت.

**٢٠٧١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ لِلْمُسَاقى أَنْ يَعْمَلَ بِعُمَّالِ الْمَالِ فِي غَيْرِهِ، وَلاَ أَنْ يَشْتَرِطَ ذَلِكَ عَلَى الَّذِي سَاقَاهُ[١].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ ئەو كەسە نییە كە بۆ باغەوانی گیراوە كار بە كرێكارەكانی خاوەنی زەوییەكە بكات لە كاروباری دیكەی جگە لە زەویەكە، بۆشی نییە كارپێكردنیان بە مەرج بگرێت لەسەر ئەو كەسەی بە باغەوانی دەیگرێت بەوەی ڕێگەی بدات كاری جگە لە زەوییەكەیان پێ بكات.

**٢٠٧٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَجُوزُ لِلَّذِي سَاقَى أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَى رَبِّ الْمَالِ رَقِيقًا يَعْمَلُ بِهِمْ فِي الْحَائِطِ، لَيْسُوا فِيهِ حِينَ سَاقَاهُ إِيَّاهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَنْبَغِي لِرَبِّ الْمَالِ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَى الَّذِي دَخَلَ فِي مَالِهِ بِمُسَاقَاةٍ، أَنْ يَأْخُذَ مِنْ رَقِيقِ الْمَالِ أَحَدًا يُخْرِجُهُ مِنَ الْمَالِ، وَإِنَّمَا مُسَاقَاةُ الْمَالِ عَلَى حَالِهِ الَّذِي هُوَ عَلَيْهِ، قَالَ: فَإِنْ كَانَ صَاحِبُ الْمَالِ يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَ مِنْ رَقِيقِ الْمَالِ أَحَدًا، فَلْيُخْرِجْهُ، أَوْ يُرِيدُ أَنْ يُدْخِلَ فِيهِ أَحَدًا، فَلْيَفْعَلْ ذَلِكَ قَبْلَ الْمُسَاقَاةِ، ثُمَّ يُسَاقِي بَعْدَ ذَلِكَ إِنْ شَاءَ.**

**قَالَ: وَمَنْ مَاتَ مِنَ الرَّقِيقِ أَوْ غَابَ أَوْ مَرِضَ، فَعَلَى رَبِّ الْمَالِ أَنْ يُخْلِفَهُ[٢].**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٢٠ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٢١ في الشفعة، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها دروست نییە بۆ ئەو کەسەی باغەوانی دەکات کۆیلە بکاتە مەرج بەسەر خاوەن زەوییەکە بەوەی کاریان پێ بکات لە بێستانەکەدا، کە لە بێستانەکەدا نەبووبن کاتێ بوو بە باغەوانی ئەو، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ خاوەن بێستانەکەش نییە مەرج لەسەر ئەو باغەوانە دابنێت بەوەی دەبێ هەندێك لە کۆیلەکانی بێستانەکە ببات و کاریان پێ بکات، چونکە باغەوانی بێستانەکە دەبێ وەك خۆی بێت (بەبێ مەرج لەسەر یەکدی دانان)، گوتوویەتی: جا ئەگەر خاوەنی بێستانەکە ویستی یەکێك لە کۆیلەکانی بێستانەکە بێنێتە دەرەوە، ئەوە با بیهێنێتە دەرەوە، یان ویستی یەکێك بخاتە ناوەوە با ئەنجامی بدات بەر لە گرێبەستی باغەوانییەکە، دواتر گرێبەستی باغەوانی بکات ئەگەر ویستی.

گوتوویەتی: هەروەها هەر کەسێك لە کۆیلەکان مرد یان غائیب بوو یان نەخۆش بوو، ئەوە لەسەر خاوەن بێستانەکەیە کەسی دیکە لە شوێنی دابنێ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەکرێدانی زەوی[١]

**٢٠٧٣-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ.

قَالَ حَنْظَلَةُ ﷺ: فَسَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، فَقَالَ: أَمَّا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ فَلاَ بَأْسَ بِهِ[٢].

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە بەکرێدانی زەوی کشتوکاڵ.

حەنزەڵە ﷺ گوتوویەتی: جا پرسیارم لە ڕافیعی کوڕی خەدیج کرد (نەهی کردووە لە بەکرێدانی زەوی) بە زێڕ و زیویش (واتە بە پارە)؟ گوتی: ئەگەر بە زێڕ و زیو بێت کێشە نییە (واتە نەهی و قەدەغەکردنەکە دەربارەی بەکرێدانی زەوییە بە پێدانی بەشێك لە بەرهەمەکە نەك پێدانی زێڕ و زیو و پارەی دیاریکراو).

**٢٠٧٤-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ[٣].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ کرد دەربارەی بەکرێدانی زەوی کشتوکاڵ بە زێڕ و زیو (بە پارە)، گوتی: کێشەی تیا نییە.

**٢٠٧٥-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ، فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهَا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي كِرَاءِ الأَرْضِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه الشيباني: ٨٣٠ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ١٢٤١؛ وابن حنبل: ١٧٢٩٧؛ والقابسي: ١٦٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح.




قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: فَقُلْتُ لَهُ: أَرَأَيْتَ الْحَدِيثَ الَّذِي يُذْكَرُ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ؟ فَقَالَ: أَكْثَرَ رَافِعٌ، وَلَوْ كَانَ لِي مَزْرَعَةٌ أَكْرَيْتُهَا[1].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کردووە دەربارەی بەکرێدانی زەوی کشتوکاڵ، ئەویش گوتی: کێشەی تیا نییە بە زێڕ و زیو (بە پارە).

ئیبنو شیهاب ﷺ دەڵێت: منیش پێم گوت: ئەی چی دەڵێیت دەربارەی ئەو فەرموودەیەی لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە باس دەکرێت؟ ئەویش گوتی: ڕافیع زۆری کردووە (واتە چەندین فەرموودەی باس کردووە کە مەبەست پێی ڕووکەشەکە نییە بەڵکوو ڕوونکردنەوەی پێویستە)، جا ئەگەر زەوییەکی کشتوکاڵیم هەبووایە دەمدا بەکرێ (دیارە سالم ئاگای لەوە نەبووە بەوەی ڕافیعیش ڕوونی کردۆتەوە بە زێڕ و زیو دروستە).

٢٠٧٦- أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ ﷺ تَكَارَى أَرْضًا، فَلَمْ تَزَلْ فِي يَدَيْهِ بِكِرَاءٍ حَتَّى مَاتَ، قَالَ ابْنُهُ: فَمَا كُنْتُ أُرَاهَا إِلاَّ لَنَا مِنْ طُولِ مَا مَكَثَتْ فِي يَدَيْهِ، حَتَّى ذَكَرَهَا لَنَا عِنْدَ مَوْتِهِ، فَأَمَرَنَا بِقَضَاءِ شَيْءٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنْ كِرَائِهَا ذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ[2].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ زەوییەکی بەکرێ دەگرت، جا هەر بەکرێ لە دەستیدا بوو تا وەفاتی کرد، کوڕەکەی گوتوویەتی: من هەر وام دەزانی هی ئێمەیە لەبەر زۆر مانەوەی زەوییەکە لە دەستی بابم، تا لە کاتی مردن بۆی باس کردین و فەرمانی پێ کردین بە دانەوەی قەرزی هەندێك لە کرێکە کە لەسەری مابوو لە زێڕ یان زیو.

٢٠٧٧- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُكْرِي أَرْضَهُ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ[3].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٢٦ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٢٤ في الشفعة، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح.




واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە زەوییەکەی بە زێڕ و زیو (واتە بە پارە) بەکرێ دەدا.

٢٠٧٨- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ أَكْرَى مَزْرَعَتَهُ بِمِئَةِ صَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، أَوْ مِمَّا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنَ الْحِنْطَةِ، أَوْ مِنْ غَيْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، فَكَرِهَ ذَلِكَ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێك کە زەوییە کشتوکاڵەکەی بە سەت صاع خورما یان بەو گەنمەی لێی بەرهەم دێت یان بە خواردنێکی غەیری ئەوەی لە زەوییەکە بەرهەم دێت بەکرێ دەدات (ئایا دروستە)، (ئیمامی مالیك ﷺ) پێی ناپەسەند بوو (قەدەغەی کرد).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٢٨ في الشفعة، عن مالك به.




## ١- ئەو شتانەی شوفعەیان تێدایە[١]

**٢٠٧٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى بِالشُّفْعَةِ فِيمَا لَمْ يُقْسَمْ بَيْنَ الشُّرَكَاءِ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ بَيْنَهُمْ، فَلاَ شُفْعَةَ فِيهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ السُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا عِنْدَنَا[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویانە): پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری بە شوفعە داوە لەو شتەی دابەش ناکرێت لەنێوان شەریکەکاندا، جا ئەگەر سنوور و جیابوونەوەی تیا بووایە لە نێوان شەریکەکان (هەر کەسەو پشکی دیار بووایە)، ئەوە شوفعەی تیا نەبوو (چونکە کێشەی تیا دروست نابێت و هەر کەسەو سنوور و پشکی دیارە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لای ئێمە ڕێبازەکە لەسەر ئەوەیە کە هیچ ڕاجیایی تیا نییە.

(ڕوونکردنەوە: الشفعە: بریتییە لە مافی هاوبەش بۆ گێڕانەوەی ئەو بەشەی کە هاوبەشەکەی بەبێ ئاگاداری ئەو دەیفرۆشێت).

**٢٠٨٠-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الشُّفْعَةِ هَلْ فِيهَا مِنْ سُنَّةٍ؟ فَقَالَ: نَعَمِ، الشُّفْعَةُ فِي الدوور وَالأَرَضِينَ، وَلاَ تَكُونُ إِلاَّ بَيْنَ الشُّرَكَاءِ[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ پرسیاری لێ کراوە دەربارەی شوفعە کە ئاخۆ ڕێبازی تایبەتی شەرعی تیایە؟ گوتی: بەڵێ، شوفعە لە خانوو و زەوی هەیە، تەنها لە نێوانی شەریکەکانیش دایە.

---

(١) ـ مَا تَقَعُ فِيهِ الشُّفْعَةُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧١ في الشفعة؛ والشيباني: ٨٥٥ في العتاق؛ والشافعي: ٨٨٥؛ والترمذي: الفرائض: ١٦؛ وابن ماجه: ٢٥٢٣ في الأحكام؛ وابن حبان: ٥١٨٥؛ وشرح معاني الآثار: ٥٩٨٧، وفي: ٥٩٩١، وفي: ٥٩٩١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨٣ في الشفعة، عن مالك به.




**٢٠٨١- وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ مِثْلُ ذَلِكَ[١].**

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس كردم بەوەی هەمان وتەی لە سولەیمانی كوڕی یەسارەوە ﷺ پێ گەیشتووە.

**٢٠٨٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ اشْتَرَى شِقْصًا مَعَ قَوْمٍ فِي أَرْضٍ بِحَيَوَانٍ: عَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الْعُرُوضِ، فَجَاءَ الشَّرِيكُ يَأْخُذُ بِشُفْعَتِهِ بَعْدَ ذَلِكَ، فَوَجَدَ الْعَبْدَ أَوِ الْوَلِيدَةَ قَدْ هَلَكَا، وَلاَ يَعْلَمْ أَحَدٌ قَدْرَ قِيمَتِهِمَا، فَيَقُولُ الْمُشْتَرِي: قِيمَةُ الْعَبْدِ أَوِ الْوَلِيدَةِ مِئَةُ دِينَارٍ، وَيَقُولُ صَاحِبُ الشُّفْعَةِ الشَّرِيكُ: بَلْ قِيمَتُهُمَا خَمْسُونَ دِينَارًا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَحْلِفُ الْمُشْتَرِي أَنَّ قِيمَةَ مَا اشْتَرَى بِهِ مِئَةُ دِينَارٍ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَنْ يَأْخُذَ صَاحِبُ الشُّفْعَةِ أَخَذَ أَوْ يَتْرُكَ، إِلاَّ أَنْ يَأْتِيَ الشَّفِيعُ بِبَيِّنَةٍ، أَنَّ قِيمَةَ الْعَبْدِ أَوِ الْوَلِيدَةِ دُونَ مَا قَالَ الْمُشْتَرِي[٢].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك كە پارچە زەوییەك لە زەوییەكی هاوبەش بە گیانلەبەرێك: كۆیلەیەك یان كەنیزەكێك یان كاڵایەكی هاوشێوەی ئەوە دەكڕێت، جا دوای ئەوە شەریكەكە بێت تا بە شوفعە وەریبگرێتەوە و ببینێ كۆیلەكە یان كەنیزەكەكە مردووە و كەسیش نەزانێ نرخی چەندە و كڕیار بڵێت: نرخی كۆیلەكە سەت دینار بوو، خاوەنی شوفعەكەش كە شەریكەكەیە بڵێت: بەڵكوو نرخەكەی پەنجا دینارە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كڕیارەكە سوێند دەخوات لەسەر ئەوەی نرخەكەی سەت دینار بووە، دواتر خاوەنی شوفعەكە ئەگەر حەز بكات بەو نرخە وەریدەگرێتەوە یان وازی لێ دێنێت، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە خاوەنی شوفعەكە بەڵگە بێنێتەوە بەوەی نرخی كۆیلەكە یان كەنیزەكەكە كەمتر بووە لەوەی كڕیارەكە دەیڵێت.

**٢٠٨٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ وَهَبَ شِقْصًا فِي دَارٍ، أَوْ أَرْضٍ مُشْتَرَكَةٍ، فَأَثَابَهُ الْمَوْهُوبُ لَهُ بِهَا نَقْدًا أَوْ عَرْضًا، فَإِنَّ الشُّرَكَاءَ يَأْخُذُونَهَا بِالشُّفْعَةِ إِنْ شَاؤُوا، وَيَدْفَعُونَ إِلَى الْمَوْهُوبِ لَهُ قِيمَةَ مَثُوبَتِهِ دَنَانِيرَ أَوْ دَرَاهِمَ[٣].**

---

(١) ـ مقطوع ضعيف.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧٢ في الشفعة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧٤ في الشفعة، عن مالك به.





(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك پشکی خۆی لە خانووێك یان زەوییەکی هاوبەش بکاتە دیاری بۆ کەسێك و کەسەکەش پاداشتی بداتەوە بە پارە یان زەوییەك، شەریکەکان بۆیان هەیە پشکەکە لە کەسە پێبەخشراوەکە بسەننەوە ئەگەر بیانەوێ، جا بە دینار یان بە درهەم نرخی ئەو پاداشتە دەدەنەوە کەسە پێبەخشراوەکە کە داویەتیە کەسە بەخشەرەکە.

٢٠٨٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ وَهَبَ هِبَةً فِي دَارٍ أَوْ أَرْضٍ مُشْتَرَكَةٍ، فَلَمْ يُثَبْ مِنْهَا، وَلَمْ يَطْلُبْهَا، فَأَرَادَ شَرِيكُهُ أَنْ يَأْخُذَهَا بِقِيمَتِهَا، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُ، مَا لَمْ يُثَبْ عَلَيْهَا، فَإِنْ أُثِيبَ، فَهُوَ لِلشَّفِيعِ بِقِيمَةِ الثَّوَابِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەشێك لە خانوو یان زەوی هاوبەشی بەخشی بە کەسێك و پاداشت نەدرایەوە لەسەری و داوای پاداشتیشی نەکرد، جا شەریکەکەی ویستی وەریبگرێتەوە بە نرخی خۆی، ئەوەی بۆ نییە، مادەم پاداشت نەدراوەتەوە لەسەری، جا ئەگەر پاداشت درایەوە لەسەری، ئەوە بۆ شەریکەکەی هەیە وەریبگرێتەوە بە نرخی پاداشتەکە.

٢٠٨٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ اشْتَرَى شِقْصًا فِي أَرْضٍ مُشْتَرَكَةٍ، بِثَمَنٍ إِلَى أَجَلٍ، فَأَرَادَ الشَّرِيكُ أَنْ يَأْخُذَهَا بِالشُّفْعَةِ، قَالَ مَالِكٌ: إِنْ كَانَ مَلِيًّا، فَلَهُ الشُّفْعَةُ بِذَلِكَ الثَّمَنِ إِلَى ذَلِكَ الأَجَلِ، وَإِنْ كَانَ مَخُوفًا أَنْ لاَ يُؤَدِّيَ الثَّمَنَ إِلَى ذَلِكَ الأَجَلِ، فَإِذَا جَاءَهُمْ بِحَمِيلٍ مَلِيٍّ ثِقَةٍ، مِثْلِ الَّذِي اشْتَرَى مِنْهُ الشِّقْصَ فِي الأَرْضِ الْمُشْتَرَكَةِ، فَذَلِكَ لَهُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی پارچەیەك لە زەوییەکی هاوبەشی کڕی، بە نرخێك تا ماوەیەکی دیاریکراو (واتە ڕێك کەوتن بەوەی تا فڵانە کات پارەکە بدات)، جا شەریکەکە ویستی بە شوفعە بۆ خۆی وەریبگرێتەوە و بیکڕێتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر شەریکەکە هەبوون بوو ئەوە شوفعەی بۆ هەیە بە هەمان نرخ تا ئەو ماوەیە (کە لەسەری فرۆشرابوو بەوەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨٩ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧٥ في الشفعة؛ وفي: ٢٣٧٦ في الشفعة، عن مالك به.

تا ئەو كات بیدات)، وە ئەگەر ترسی لەسەر بوو ئەو پارەیە تا ئەو كاتە نەدات، جا ئەگەر كەسێكی دەوڵەمەندی جێی متمانەی بۆ هێنان كە حاڵی وەك ئەو كەسە وا بوو كە پارچە زەوییە هاوبەشەكەی كڕیوە، ئەوە دیسان ئەوەی بۆ هەیە (و شوفعەكەی بۆ دادەمەزرێ).

**٢٠٨٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ تَقْطَعُ شُفْعَةَ الْغَائِبِ غَيْبَتُهُ، وَإِنْ طَالَتْ غَيْبَتُهُ، وَلَيْسَ لِذَلِكَ عِنْدَنَا حَدٌّ تُقْطَعُ إِلَيْهِ الشُّفْعَةُ[1].

(**فەتوا**): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: شوفعەی كەسی غائیب ناپچڕێت، هەرچەندە غائیبیەكەشی دوور و درێژ و زۆر بێت، لەلای ئێمە سنوورێك و ئەندازەیەكی دیاریكراو نییە شوفعەی تێدا بپچڕێت.

**٢٠٨٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُوَرِّثُ الأَرْضَ نَفَرًا مِنْ وَلَدِهِ، ثُمَّ يُولَدُ لأَحَدِ النَّفَرِ، ثُمَّ يَهْلِكُ الأَبُ، فَيَبِيعُ أَحَدُ وَلَدِ الْمَيِّتِ حَقَّهُ فِي تِلْكَ الأَرْضِ، فَإِنَّ أَخَا الْبَائِعِ أَحَقُّ بِشُفْعَتِهِ مِنْ عُمُومَتِهِ شُرَكَاءِ أَبِيهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا[2].

(**فەتوا**): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی زەوییەك دەكاتە میرات بۆ چەند كوڕێكی خۆی، دواتر كوڕێكیان مناڵی دەبێ، دواتر ئەو باوكە دەمرێت و یەكێك لە كوڕەكانی مردووەكە پشكی خۆی لەو زەوییە دەفرۆشێت، ئەوە برای فرۆشیارەكە لەپێشترە بە شوفعە لە مامەكانی كە شەریكی باوكی ئەون.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەكە لەلای ئێمە بەو شێوەیەیە.

**٢٠٨٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الشُّفْعَةُ بَيْنَ الشُّرَكَاءِ عَلَى قَدْرِ حِصَصِهِمْ، يَأْخُذُ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ بِقَدْرِ نَصِيبِهِ، إِنْ كَانَ قَلِيلاً فَقَلِيلاً، وَإِنْ كَانَ كَثِيرًا فَبِقَدْرِهِ، وَذَلِكَ إِذَا تَشَاحُّوا فِيهَا[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧٧ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧٨ في الشفعة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧٩ في الشفعة، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: شوفعە لە نێوان شەریكەكان بە ئەندازەی پشكەكانیانە، هەر كەسە و بە ئەندازەی پشكی خۆی وەردەگرێت، ئەگەر كەم بێت كەمە، ئەگەر زۆر بێت بە ئەندازەی زۆرییەكەیەتی، ئەوە لە كاتێكدایە كە كێشمەكێشمی لەسەر بكەن.

ڕوونكردنەوە: مەبەستی ئیمامی مالیك ئەوەیە بۆ نموونە: سێ كەس هاوبەش بن لە خانووێكدا، پشكی یەكێكیان نیوە بێت و پشكی یەكێكیشیان سێیەك بێت و پشكی ئەوی دیكەشیان شەشیەك بێت، جا خاوەنی نیوەكە چوو نیوەكەی خۆی فرۆشت، ئەوە خاوەنی سێیەكەكە دوو لەسەر سێی نیوەكە وەردەگرێتەوە و خاوەنی شەشیەكەكەش سێیەكی نیوەكە وەردەگرێتەوە.

**٢٠٨٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا أَنْ يَشْتَرِيَ رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ مِنْ شُرَكَائِهِ حَقَّهُ، فَيَقُولُ أَحَدُ الشُّرَكَاءِ: أَنَا آخُذُ مِنَ الشُّفْعَةِ بِقَدْرِ حِصَّتِي، وَيَقُولُ الْمُشْتَرِي: إِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْخُذَ الشُّفْعَةَ كُلَّهَا أَسْلَمْتُهَا إِلَيْكَ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَدَعَ فَدَعْ. فَإِنَّ الْمُشْتَرِيَ إِذَا خَيَّرَهُ فِي هَذَا، وَأَسْلَمَهُ إِلَيْهِ، فَلَيْسَ لِلشَّفِيعِ إِلاَّ أَنْ يَأْخُذَ الشُّفْعَةَ كُلَّهَا، أَوْ يُسْلِمَهَا إِلَيْهِ، فَإِنْ أَخَذَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا، وَإِلاَّ فَلاَ شَيْءَ لَهُ فِيهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەوەیە كە كڕیار پشكی كەسێك لە شەریكەكان بكڕێتەوە، جا یەكێك لە شەریكەكان بڵێت: من بەشوفعە ئەندازەی پشكی خۆم وەردەگرمەوە (و دەیكڕمەوە)، كڕیاریش بڵێت: ئەگەر دەتەوێ بەشوفعە گشتی وەرگرەوە و بیكڕەوە دەتدەمەوە، وە ئەگەر دەشتەوێ وازی لێ بێنی ئەوە وازی لێ بێنە، چونكە ئەگەر كڕیارەكە سەرپشكی بكات لەوەدا، وە ڕادەستی كرد، ئەوە بۆ خاوەنی شوفعەكە نییە تەنها ئەوە نەبێ گشت زەوییە فرۆشراوەكە بەشوفعە وەربگرێتەوە (نەك تەنها بەئەندازەی پشكی خۆی)، یانیش دەبێ گشتی واز لێ بێنێت و ڕادەستی كڕیارەكەی بكات، جا ئەگەر خۆی (گشتی) وەرگرتەوە ئەوە ئەو لەپێشترە، ئەگەرنا (ئەگەر گشتی وەرنەگرتەوە) ئەوە هیچی ئەوی تێدا نییە (شوفعەی بۆ نییە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨٠ في الشفعة، عن مالك به.




**٢٠٩٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي الأَرْضَ، فَيَعْمُرُهَا بِالأَصْلِ يَضَعُهُ فِيهَا، أَوِ الْبِئْرِ يَحْفِرُهَا، ثُمَّ يَأْتِي رَجُلٌ فَيُدْرِكُ فِيهَا حَقًّا، فَيُرِيدُ أَنْ يَأْخُذَهَا بِالشُّفْعَةِ، إِنَّهُ لاَ شُفْعَةَ لَهُ فِيهَا، إِلاَّ أَنْ يُعْطِيَهُ قِيمَةَ مَا عَمَرَ، فَإِنْ أَعْطَاهُ قِيمَةَ مَا عَمَرَ، كَانَ أَحَقَّ بِشُفْعَتِهِ، وَإِلاَّ فَلاَ حَقَّ لَهُ فِيهَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی زەوییەك دەکڕێت و ئاوەدانی دەکاتەوە بە چاندنی درەخت یان هەڵکەندنی بیر تیایدا، دواتر کەسێك دێت و مافی لە زەوییەکەدا هەیە (شەریکی ئەو کەسەیە کە ئێستا پشکەکەی خۆی فرۆشتووە)، جا دەیەوێت بەشوفعە وەریبگرێتەوە (و بیکڕێتەوە)، ئەوە شوفعەی بۆ نییە لە زەوییەکەدا (چونکە مەسرەف و گۆڕانکاری ڕیشەیی تێدا ئەنجام دراوە)، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە قیمەتی ئەو نۆژەنکردنەوەیە بدات بە کڕیارەکە، جا ئەگەر قیمەتی ئەو نۆژەنکردنەوەی دا بە کڕیارەکە، ئەوە لەو کاتەدا ئەو لەپێشترە بە شوفعە، ئەگەرنا هیچ مافێکی تێدا نییە.

**٢٠٩١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ بَاعَ حِصَّتَهُ مِنْ أَرْضٍ أَوْ دَارٍ مُشْتَرَكَةٍ، فَلَمَّا عَلِمَ أَنَّ صَاحِبَ الشُّفْعَةِ يَأْخُذُ بِالشُّفْعَةِ، اسْتَقَالَ الْمُشْتَرِيَّ، فَأَقَالَهُ، قَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ لَهُ، وَالشَّفِيعُ أَحَقُّ بِهَا بِالثَّمَنِ الَّذِي كَانَ بَاعَهَا بِهِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك پشکەکەی خۆی لە زەوییەك یان خانووێکی هاوبەشدا فرۆشت، جا کاتێ زانی خاوەنی شوفعە بە شوفعە وەریدەگرێتەوە، (پەشیمان بۆیەوە و) داوای لە موشتەری کرد پەشیمانبوونەوەکەی قبووڵ بکات و مامەڵەکە هەڵبوەشێنێتەوە، ئەویش پەشیمانبوونەوەکەی قبووڵ کرد و مامەڵەکەی هەڵوەشاندەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی بۆ نییە لە کاتێکدا شەفیعە هاوبەشەکەی لەپێشترە بەو نرخەی کە پێی فرۆشتووە (واتە دەبێ ئەوان مامەڵەکەیان تێکنەدەن، دواتر بە چەند فرۆشراوە شەریکەکە بەو نرخە وەریدەگرێتەوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨١ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨٢ في الشفعة، عن مالك به.




**٢٠٩٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنِ اشْتَرَى شِقْصًا فِي دَارٍ أَوْ أَرْضٍ، وَحَيَوَانًا وَعُرُوضًا فِي صَفْقَةٍ وَاحِدَةٍ، فَطَلَبَ الشَّفِيعُ شُفْعَتَهُ فِي الدَّارِ أَوِ الأَرْضِ، فَقَالَ الْمُشْتَرِي: خُذْ مَا اشْتَرَيْتُ جَمِيعًا، فَإِنِّي إِنَّمَا اشْتَرَيْتُهُ جَمِيعًا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: بَلْ يَأْخُذُ الشَّفِيعُ شُفْعَتَهُ فِي الدَّارِ أَوِ الأَرْضِ، بِحِصَّتِهَا مِنْ ذَلِكَ الثَّمَنِ، يُقَامُ كُلُّ شَيْءٍ اشْتَرَاهُ عَلَى حِدَتِهِ، عَلَى الثَّمَنِ الَّذِي اشْتَرَاهُ بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ الشَّفِيعُ شُفْعَتَهُ بِالَّذِي يُصِيبُهَا مِنَ الْقِيمَةِ مِنْ رَأْسِ الثَّمَنِ، وَلاَ يَأْخُذُ مِنَ الْحَيَوَانِ وَالْعُرُوضِ شَيْئًا، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەشێك لە خانوو یان زەوی لەگەڵ ئاژەڵ و کاڵای دیکەی بە یەك مامەڵە کڕی (کە شەریکایەتی تیا بوو)، جا خاوەنی شوفعە (واتە شەریکی فرۆشیارەکە) داوای شوفعەی خۆی کرد تەنها لە خانوو یان زەوییەکە، کڕیارەکەش گوتی: هەموو ئەوە ببەرەوە و بیکڕەوە کە کڕیومە (زەوییەکە و ئاژەڵەکە و کاڵاکان)، چونکە من بەیەکەوە کڕیومە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵکوو خاوەنی شوفعەکە شوفعەکەی خۆی وەردەگرێت لە خانوو یان زەوییەکە بەگوێرەی پشکی خۆی بەو نرخەی پێی فرۆشراوە، گشت شتێك کە کڕیویەتی بەجیا حیساب دەکرێت بەو پارەیەی پێی کڕیوە، دواتر خاوەنی شوفعەکە شوفعەکەی خۆی وەردەگرێتەوە بەگوێرەی ئەو پشکەی بەری دەکەوێت لە نرخەکە، بەڵام هیچ لە ئاژەڵ و کەلوپەلەکان وەرناگرێتەوە (چونکە شوفعەی تیا نییە)، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێ کە خۆی بیەوێ.

**٢٠٩٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ بَاعَ شِقْصًا مِنْ أَرْضٍ مُشْتَرَكَةٍ، فَسَلَّمَ بَعْضُ مَنْ لَهُ فِيهَا الشُّفْعَةُ لِلْبَائِعِ، وَأَبَى بَعْضُهُمْ إِلاَّ أَنْ يَأْخُذَ بِشُفْعَتِهِ: إِنَّ مَنْ أَبَى أَنْ يُسَلِّمَ، يَأْخُذُ بِالشُّفْعَةِ كُلِّهَا، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَأْخُذَ بِقَدْرِ حَقِّهِ وَيَتْرُكَ مَا بَقِيَ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك پشکی خۆی لە زەوییەکی هاوبەش بفرۆشێت (لە کاتێکدا ژمارەی شەریکەکان لە دوو کەس زیاتر بوو)، جا یەکێکیان کە شوفعەی بۆ هەیە پشکی خۆی تەسلیمی فرۆشیارەکە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨٤ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨٦ في الشفعة، عن مالك به.





كرد (ڕازی بوو بیفرۆشێت)، یەكێكیشیان ڕازی نەبوو تەنها دەیەویست پشكی خۆی وەرگرێتەوە بەشوفعە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو كەسەی ڕازی نەبووە پشكی خۆی تەسلیمی فرۆشیارەكە بكات دەبێ گشت زەوییەكە بەشوفعە وەربگرێتەوە، بۆی نییە تەنها بەئەندازەی حەقی خۆی وەربگرێتەوە و ئەوەیدی واز لێ بهێنێت.

٢٠٩٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي نَفَرٍ شُرَكَاءَ فِي دَارٍ وَاحِدَةٍ، فَبَاعَ أَحَدُهُمْ حِصَّتَهُ، وَشُرَكَاؤُهُ غُيَّبٌ كُلُّهُمْ إِلاَّ رَجُلاً، فَعُرِضَ عَلَى الْحَاضِرِ أَنْ يَأْخُذَ بِالشُّفْعَةِ أَوْ يَتْرُكَ، فَقَالَ: أَنَا آخُذُ بِحِصَّتِي، وَأَتْرُكُ حِصَصَ شُرَكَائِي حَتَّى يَقْدَمُوا، فَإِنْ أَخَذُوا فَذَلِكَ، وَإِنْ تَرَكُوا أَخَذْتُ جَمِيعَ الشُّفْعَةِ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ لَهُ إِلاَّ أَنْ يَأْخُذَ ذَلِكَ كُلَّهُ أَوْ يَتْرُكَ، فَإِنْ جَاءَ شُرَكَاؤُهُ، أَخَذُوا مِنْهُ، أَوْ تَرَكُوا إِنْ شَاؤُوا، فَإِذَا عُرِضَ هَذَا عَلَيْهِ فَلَمْ يَقْبَلْهُ، فَلاَ أَرَى لَهُ شُفْعَةً[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی چەند كەسێك كە لە یەك خانوودا شەریك بن، جا یەكێكیان پشكی خۆی بفرۆشێت و شەریكەكانیشی هیچیان ئامادە نەبن و غائیب بن تەنها یەك كەس نەبێت، جا پێشنیار بكرێت بۆ ئەو كەسەی ئامادەیە بەوەی ماڵە فرۆشراوەكە بەشوفعە وەربگرێتەوە یان وازی لێ بێنێت، ئەویش بڵێت: من بەگوێرەی پشكی خۆم وەریدەگرمەوە و پشكی شەریكەكانی دیكەم واز لێ دەهێنم تا دەگەڕێنەوە، جا ئەگەر ئەوانیش وەریانگرتەوە ئەوە باشە، وە ئەگەر وازیان لێ هێنا وەریاننەگرتەوە، ئەوە من پشكی ئەوانیش بەشوفعە وەردەگرمەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆی نییە تەنها ئەوە نەبێ كە گشتی وەربگرێتەوە یان گشتی واز لێ بهێنێ، جا كاتێ شەریكەكانی هاتن با پشكی خۆیانی لێ وەربگرنەوە یان بۆ ئەو وازی لێ بێنن، جا ئەگەر كەسە ئامادەبووەكە ئەوەی بۆ پێشنیار كرا و بەو شێوەیە قبووڵی نەكرد، ئەوە پێم وا نییە شوفعەی بۆ هەبێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨٧ في الشفعة، عن مالك به.




## ٢- ئەو شتانەی شوفعەیان تێدا نییە[١]

**٢٠٩٥-** أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: إِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ فِي الأَرْضِ، فَلاَ شُفْعَةَ فِيهَا، وَلاَ شُفْعَةَ فِي بِئْرٍ، وَلاَ فِي فَحْلِ النَّخْلِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى هَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا[٢].

واتە: عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر سنوور و جیاكردنەوە دەگونجا بۆ زەوییەك، ئەوە شوفعەی تیا نییە، وە شوفعە لە بیریشدا نییە، وە لە تۆوی تەلقیحی خورماشدا نییە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەكە لەلای ئێمەش هەر لەسەر ئەوەیە.

**٢٠٩٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ شُفْعَةَ فِي طَرِيقٍ صَلُحَ الْقَسْمُ فِيهَا أَوْ لَمْ يَصْلُحْ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: شوفعە لە ڕێگە و كۆڵاندا نییە، جا بگونجێ دابەش بكرێت یان نەگونجێت (جیاوازی نییە).

**٢٠٩٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ شُفْعَةَ فِي عَرْصَةِ دَارٍ، صَلُحَ الْقَسْمُ فِيهَا أَوْ لَمْ يَصْلُحْ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە شوفعە لە حەوشەی خانوودا نییە، جا بگونجێ دابەش بكرێت یان نەگونجێت (جیاوازی نییە).

**٢٠٩٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ اشْتَرَى شِقْصًا مِنْ أَرْضٍ مُشْتَرَكَةٍ، عَلَى أَنَّهُ فِيهَا بِالْخِيَارِ، فَأَرَادَ شُرَكَاءُ الْبَائِعِ أَنْ يَأْخُذُوا مَا بَاعَ شَرِيكُهُمْ بِالشُّفْعَةِ، قَبْلَ أَنْ يَخْتَارَ الْمُشْتَرِي، إِنَّ ذَلِكَ لاَ يَكُونُ لَهُمْ، حَتَّى يَأْخُذَ الْمُشْتَرِي، وَيَثْبُتَ لَهُ الْبَيْعُ، فَإِذَا وَجَبَ لَهُ الْبَيْعُ، فَلَهُمُ الشُّفْعَةُ[٤].

---

(١) ـ مَا لَا تَقَعُ فِيهِ الشُّفْعَةُ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٠ في الشفعة؛ والشيباني: ٨٥٤ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩١ في الشفعة، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٢ في الشفعة، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە پارچەیەك لە زەوییەكی هاوبەش دەكرێت لەسەر ئەوەی سەرپشك بێت (بەوەی تا فلاَنە كات بۆی هەبێت كڕینەكە بچەسپێنێت یان هەڵیبوەشێنێتەوە)، شەریكەكانی فرۆشیارەكەش بەر لەوەی كڕیارەكە كڕینەكە هەڵبژێرێت بیانەوێ ئەو زەوییە بەشوفعە وەربگرنەوە كە شەریكەكەیان فرۆشتوویەتی، (ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی:) ئەوەیان بۆ نییە تاوەكوو كڕیارەكە زەوییەكە وەردەگرێت و كڕینەكەی بۆ دادەمەزرێت، جا كاتێ مامەڵەكەی بۆ دامەزرا شەریكەكان شوفعەیان بۆ هەیە.

**٢٠٩٩- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي أَرْضًا فَتَمْكُثُ فِي يَدَيْهِ حِينًا، ثُمَّ يَأْتِي رَجُلٌ فَيُدْرِكُ فِيهَا حَقًّا بِمِيرَاثٍ: إِنَّ لَهُ الشُّفْعَةَ إِنْ ثَبَتَ حَقُّهُ، وَإِنَّ مَا أَغَلَّتِ الأَرْضُ مِنْ غَلَّةٍ، فَهِيَ لِلْمُشْتَرِي الأَوَّلِ، إِلَى يَوْمِ يَثْبُتُ حَقُّ الآخَرِ، لأَنَّهُ قَدْ كَانَ ضَمِنَهَا لَوْ هَلَكَ مَا كَانَ فِيهَا مِنْ غِرَاسٍ، أَوْ ذَهَبَ بِهِ سَيْلٌ[1].

قَالَ: فَإِنْ طَالَ الزَّمَانُ، أَوْ هَلَكَ الشُّهُودُ، أَوْ مَاتَ الْبَائِعُ أَوِ الْمُشْتَرِي، أَوْ هُمَا حَيَّانِ، فَنُسِيَ أَصْلُ الْبَيْعِ وَالاِشْتِرَاءِ لِطُولِ الزَّمَانِ، فَإِنَّ الشُّفْعَةَ تَنْقَطِعُ، وَيَأْخُذُ حَقَّهُ الَّذِي ثَبَتَ لَهُ، وَإِنْ كَانَ أَمْرُهُ عَلَى غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ فِي حَدَاثَةِ الْعَهْدِ وَقُرْبِهِ، وَأَنَّهُ يَرَى أَنَّ الْبَائِعَ غَيَّبَ الثَّمَنَ وَأَخْفَاهُ لِيَقْطَعَ بِذَلِكَ حَقَّ صَاحِبِ الشُّفْعَةِ، قُوِّمَتِ الأَرْضُ عَلَى قَدْرِ مَا يُرَى أَنَّهُ ثَمَنُهَا، فَيَصِيرُ ثَمَنُهَا إِلَى ذَلِكَ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى مَا زَادَ فِي الأَرْضِ مِنْ بِنَاءٍ أَوْ غِرَاسٍ أَوْ عِمَارَةٍ، فَيَكُونُ عَلَى مَا يَكُونُ عَلَيْهِ مَنِ ابْتَاعَ الأَرْضَ بِثَمَنٍ مَعْلُومٍ، ثُمَّ بَنَى فِيهَا أَوْ غَرَسَ، ثُمَّ أَخَذَهَا صَاحِبُ الشُّفْعَةِ بَعْدَ ذَلِكَ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی زەوییەك دەكڕێت و ماوەیەك لە دەستی دەمێنێتەوە، دواتر كەسێك دێت و مافی خۆی تێدا دەدۆزێتەوە بە میرات: ئەوە شوفعەی بۆ هەیە ئەگەر مافەكەی سەلما، وە هەر بەروبوومێك كە زەوییەكە داویەتی بۆ كڕیاری یەكەمە (بۆ خاوەن شوفعەكە نییە)، تا ئەو ڕۆژەی مافی كەسەكەی دیكە (كە خاوەنی شوفعەكەیە) دەسەلمێ، چونكە (كڕیاری یەكەم) زەرەری لەئەستۆ گرتووە ئەگەر ئەو درەختانەی لەناویەتی لەناو چوون یان ئەگەر لافاو بردی.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٣.





گوتوویەتی: جا ئەگەر کاتێکی دوور و درێژی بەسەردا چوو یان شاهیدەکان مردن یان کڕیار یان فرۆشیار مرد، یان هەردووکیان زیندوو بوون (بەڵام) نرخی کڕین و فرۆشتنەکەیان لەیاد کرابوو و بیر چووبۆیەوە بە هۆی تێپەڕی زۆری کاتەکەی، ئەوە شوفعە نامێنێت و تەنها مافی خۆی وەردەگرێتەوە کە بۆی سەلماوە (بەڵام ناتوانێت بەشەکەی دیکەش بەشوفعە بکڕێتەوە)، وە ئەگەر بەم شێوەیە نەبوو لە ڕووی نزیکی ماوەکە (واتە ماوەیەکی زۆر تێ نەپەڕیبوو) و پێی وابوو فرۆشیارەکە بەئەنقەست نرخەکەی دەشارێتەوە (دەڵێت یادم نەماوە) تا بەهۆی ئەوەوە مافی خاوەن شوفعەکە نەمێنێت، ئەوە (لەو کاتەدا) زەوییەکە نرخەکەی دەخەملێندرێت بەگوێرەی ئەوەی پێیان وایە ئەوە نرخەکەیەتی، جا نرخەکەی دەبێتە ئەوە، دواتر سەیری ئەو بینا و درەخت و نۆژەنکردنەوەیە دەکرێت کە زیاد بووە (و لەبەرچاو دەگیرێت)، جا بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت وەك چۆن کەسێك زەوییەك بە نرخێکی دیاریکراو بکڕێت و دواتر بینای لەناو بونیاد بنێت و درەختی تێدا بچێنێت (دەبێ ئاوا نرخی بینا و درەختەکانیش حیساب بکرێت دوای نرخی زەوییەکە)، دواتر خاوەنی شوفعەکە بەشوفعە وەریدەگرێتەوە.

**٢١٠٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالشُّفْعَةُ ثَابِتَةٌ فِي مَالِ الْمَيِّتِ، كَمَا هِيَ فِي مَالِ الْحَيِّ، فَإِنْ خَشِيَ أَهْلُ الْمَيِّتِ أَنْ يَنْكَسِرَ مَالُ الْمَيِّتِ، قَسَمُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِمْ فِيهِ شُفْعَةٌ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: شوفعە لە ماڵ و سەروەتی مردووشدا هەیە، وەك چۆن لە ماڵ و سەروەتی زیندوودا هەیە، جا ئەگەر خزمانی مردووەکە ترسان لەوەی موڵکی مردووەکە بشکێت و (نرخی کەم بکات)، بۆیە دابەشیان کرد و فرۆشتیان، ئەوە شوفعەیان لەسەر نییە.

**٢١٠١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ شُفْعَةَ عِنْدَنَا فِي عَبْدٍ وَلاَ وَلِيدَةٍ، وَلاَ بَعِيرٍ وَلاَ بَقَرَةٍ وَلاَ شَاةٍ، وَلاَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْحَيَوَانِ، وَلاَ فِي ثَوْبٍ، وَلاَ فِي بِئْرٍ لَيْسَ لَهَا بَيَاضٌ، إِنَّمَا الشُّفْعَةُ فِيمَا يَصْلُحُ أَنَّهُ يَنْقَسِمُ وَتَقَعُ فِيهِ الْحُدُودُ مِنَ الأَرْضِ، فَأَمَّا مَا لاَ يَصْلُحُ فِيهِ الْقَسْمُ، فَلاَ شُفْعَةَ فِيهِ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٤ في الشفعة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٦ في الشفعة، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە شوفعە لە کۆیلە و کەنیزەك و وشتر و مانگا و مەڕ و بزن و هیچ ئاژەڵێکدا نییە، وە لە پۆشاکیشدا نییە، وە لە بیرێکیشدا نییە کە زەوی لەگەڵ نەبێت، چونکە شوفعە تەنها لەو زەوییەدا هەیە کە دابەش دەکرێت و سنووردانانی بۆ دەگونجێت، بەڵام هەرچی ئەوەیە کە دابەشبوونی تێدا ناگونجێت، شوفعەی تێدا نییە.

**٢١٠٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنِ اشْتَرَى أَرْضًا فِيهَا شُفْعَةٌ لِنَاسٍ حُضُورٍ، فَلْيَرْفَعْهُمْ إِلَى السُّلْطَانِ، فَإِمَّا أَنْ يَسْتَحِقُّوا، وَإِمَّا أَنْ يُسَلِّمَ لَهُ السُّلْطَانُ، فَإِنْ تَرَكَهُمْ فَلَمْ يَرْفَعْ أَمْرَهُمْ إِلَى السُّلْطَانِ، وَقَدْ عَلِمُوا بِاشْتِرَائِهِ، فَتَرَكُوا ذَلِكَ حَتَّى طَالَ زَمَانُهُ، ثُمَّ جَاؤُوا يَطْلُبُونَ شُفْعَتَهُمْ، فَلاَ أَرَى ذَلِكَ لَهُمْ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك زەوییەك بکڕێت کە شوفعە و هاوبەشی خەڵکانێکی تیایە کە ئامادەن (لە ناوچەکە)، با هاوبەشەکان بابەتەکە ببەن بۆ لای کاربەدەست، جا یان وەریدەگرنەوە، یانیش کاربەدەست دەیدات بە کڕیارەکە، جا ئەگەر بەدوای بابەتەکەدا نەچوون و کارەکەیان بەرز نەکردەوە بۆ لای کاربەدەست، لە کاتێکدا زانیارییان هەبوو بە کڕینەکە و وازیان لێ هێنا تا کاتێکی زۆری بەسەردا چوو، دواتر هاتنەوە و داوای شوفعەکەی خۆیان کرد، ئەوە پێم وا نییە ئەو مافەیان هەبێ (چونکە کەمتەرخەم بوون).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٩٥ في الشفعة، عن مالك به.

## ١- هاندان دەربارەی دادوەریکردن بەحەق[١]

**٢١٠٣-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ مِنْهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِشَيْءٍ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ، فَلاَ يَأْخُذَنَّ مِنْهُ شَيْئًا، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ[٢].

واتە: لە ئوممو سەلەمەی  خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من مرۆڤێکم، ئێوەش کێشەتان دێنن بۆ لای من، جا ڕەنگە هەندێکتان زمانتان پاراوتر بێت لە هەندێکی دیکە لە بەڵگەهێنانەوە، جا من بڕیاری بۆ دەدەم (مافەکە دەدەم بەو) لەسەر بنەمای ئەوەی گوێبیستی بووم لێی، جا هەر کەسێك شتێکم لە مافی براکەی بۆ بڕیار دا و پێم دا (لەسەر بنەمای قسەزانییەکەی و ڕووکەشی بەڵگەکەی)، ئەوە با وەرینەگرێت (ئەگەر دەزانێ حەق لەلای خۆی نییە)، (چونکە) ئەوە پارچە ئاگرێکە بۆی دادەبڕم و پێی دەدەم.

**٢١٠٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ  اخْتَصَمَ إِلَيْهِ مُسْلِمٌ وَيَهُودِيٌّ، فَرَأَى عُمَرُ  أَنَّ الْحَقَّ لِلْيَهُودِيِّ، فَقَضَى لَهُ، فَقَالَ لَهُ الْيَهُودِيُّ: وَاللَّهِ لَقَدْ قَضَيْتَ بِالْحَقِّ، فَضَرَبَهُ عُمَرُ بِالدِّرَّةِ، ثُمَّ قَالَ: وَمَا يُدْرِيكَ؟ فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: إِنَّا نَجِدُ، أَنَّهُ لَيْسَ قَاضٍ يَقْضِي بِالْحَقِّ، إِلاَّ كَانَ عَنْ يَمِينِهِ مَلَكٌ، وَعَنْ شِمَالِهِ مَلَكٌ، يُسَدِّدَانِهِ، وَيُوَفِّقَانِهِ لِلْحَقِّ، مَا دَامَ مَعَ الْحَقِّ، فَإِذَا تَرَكَ الْحَقَّ عَرَجَا وَتَرَكَاهُ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە  گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): مسوڵمانێك و جوولەکەیەك کێشەیان هەبوو و هێنایانە لای عومەری کوڕی خەتتاب ، جا عومەر بینی حەقەکە هی جوولەکەکەیە، جا بڕیاری بۆ ئەو دا (شتەکەی دا بە ئەو)، جا جوولەکەکە گوتی: سوێند بە خوا بەحەق بڕیارت دا، ئیامی عومەریش

---

(١) ـ التَّرْغِيبُ فِي الْقَضَاءِ بِالْحَقِّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧٧ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٢ في القضاء؛ والشافعي: ٧٣٢؛ وفي: ١٢٨١؛ والبخاري: ٢٦٨٠ في الشهادات، وفي: ٧١٦٩ في الأحكام؛ وابن حبان: ٥٠٧٠؛ والقابسي: ٤٧٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧٨ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٢أفي القضاء، عن مالك به.




ﷺ به گۆچانەکە لێی دا و گوتی: چۆن دەزانی؟ جوولەکەکە گوتی: ئێمە (لە پەرتووکدا) بینیومانە: هیچ دادوەرێك نییە دادوەری بەحەق بکات حەتمەن لەلای ڕاستی فریشتەیەك هەیە و لەلای چەپیشی فریشتەیەك هەیە، ڕاستەڕێی دەکەن و تەوفیقی دەدەن بۆ حەق، مادەم لەگەڵ حەقدا بێت، جا کاتێ وازی لە حەق هێنا، بەرز دەبنەوە و وازی لێ دەهێنن.

## ٢- شاهێدییەکان[١]

٢١٠٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ، الَّذِي يَأْتِي بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا، أَوْ يُخْبِرُ بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هاواڵتان پێ نەدەم بە باشترین شاهێدەکان؟ ئەو کەسەیە خۆی دێت شاهێدی دەدات بەر لەوەی داوای لێ بکرێ، یان خۆی دێت شاهێدییەکە ڕادەگەیێنێت بەر لەوەی داوای لێ بکرێ.

٢١٠٦- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَقَالَ: لَقَدْ جِئْتُكَ لأَمْرٍ، مَا لَهُ رَأْسٌ، وَلاَ ذَنَبٌ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: مَا هُوَ؟ قَالَ: شَهَادَاتُ الزُّورِ ظَهَرَتْ بِأَرْضِنَا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَوَ قَدْ كَانَ ذَلِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَاللَّهِ لاَ يُؤْسَرُ رَجُلٌ فِي الإِسْلاَمِ بِغَيْرِ الْعُدُولِ[٣].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێکی خەڵکی عێراق هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و گوتی: من هاتوومەتە لات بۆ بابەتێك نە سەر و نە کلکی هەیە (واتە سەر و بنی نییە)، ئیمامی

---

(١) ـ الشَّهَادَاتِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣١ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٩٠ في القضاء؛ والشيباني: ٨٤٩ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٧٠٨١، وفي: ٢١٧٢٩؛ ومسلم: في القضاء: ١٩؛ وأبو داود: ٣٥٩٦ في الأقضية؛ والترمذي: ٢٢٩٥ في الشهادات؛ وابن حبان: ٥٠٧٩؛ والقابسي: ٣١٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٢ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٩٠أفي القضاء، عن مالك به.




عومەریش ﷺ گوتی: بابەتەکە چییە؟ گوتی: شاهێدی بەدرۆیە کە سەری هەڵداوە لە ناوچەکەمان، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئایا ئەوە ڕووی داوە؟! گوتی: بەڵێ، ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: سوێند بە خوا هیچ کەسێك ناکرێتە ئەسیر لە ئیسلامدا لەمەودوا بەبێ شاهێدی کەسانی عادیل (واتە بۆ شتە گرینگەکان دەبێ لەمەودوا بەدوای سیفەتی عەدالەتدا بگەڕێین، دیارە دوای هاوەڵان خەڵکانی فاسیق پەیدابوون و شاهێدی بەدرۆ لایان ئاساییە!).

**٢١٠٧-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ خَصْمٍ وَلاَ ظَنِينٍ[1].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم کە پێی گەیشتووە، بەوەی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: شاهێدی کەسی دژ و کەسی تۆمەتبار جێبەجێ ناکرێ.

## ٣- دادوەریکردن بە شاهێدیدانی ئەو کەسەی (پێشتر) سزای شەرعی بەسەردا جێبەجێ کراوە[2]

**٢١٠٨-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ وَغَيْرِهِ، أَنَّهُمْ سُئِلُوا: عَنْ رَجُلٍ جُلِدَ الْحَدَّ أَتَجُوزُ شَهَادَتُهُ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، إِذَا ظَهَرَتْ مِنْهُ التَّوْبَةُ[3].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە لە سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ و جگە لەویش پێی گەیشتووە بەوەی پرسیاریان لێ کراوە دەربارەی ئەو کەسەی قامچی سزای شەرعی لێ دراوە ئاخۆ شاهێدییەکەی جێبەجێ دەکرێت؟ گوتوویانە: بەڵێ، ئەگەر تەوبەی پێوە دیار بوو.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٣ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٩٠ب في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي شَهَادَةِ الْمَحْدُودِ.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٤ في الأقضية، عن مالك به.

٢١٠٩- وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ يُسْأَلُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ ﷺ [١].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم بەوەی گوێی لە ئیبنو شیهاب ﷺ بووە پرسیاری دەربارەی ئەوە لێ کراوە، ئەویش هەمان قسەی سولەیمانی کوڕی یەساری ﷺ گوتووە.

٢١١٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا، وَذَلِكَ لِقَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾ النور[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَالأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، أَنَّ الَّذِي يُجْلَدُ الْحَدَّ ثُمَّ تَابَ، وَأَصْلَحَ تَجُوزُ شَهَادَتُهُ، وَهُوَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە، لەبەر وتەی خوای پەروەردگار ﷻ کە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾ النور، واتە: [وە ئەوانەی کە بوهتانی زینا دەدەنە پاڵ ئافرەتانی داوێنپاك، لەپاشان چوار شاهێد ناهێنن (لەسەر ڕاستی قسەکەیان) ئەوە هەشتا قامچییان لێ دەدرێت، ئیدی هەرگیز شاهێدییان لێ وەرمەگرن وە ئەوانە لە سنووردەرچوون، تەنها ئەوانە نەبێت کە دوای ئەوە تەوبە دەکەن و کردەوەیان چاك دەکەن، ئەوسا بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و بەبەزەییە].

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: ئەو کەسەی قامچی سزای شەرعی لێ دەدرێ و دواتر تەوبە دەکات و دەبێتە

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٤ في الأقضية، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٤ في الأقضية، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٧ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٩١ب في القضاء، عن مالك به.




کەسێکی چاك، شاهێدییەکەی جێبەجێ دەکرێت، ئەوەش خۆشەویسترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم لەو بارەیەوە.

## ٤- دادوەریکردن بە سوێندخواردن لەگەڵ شاهێدێك[1]

**٢١١١-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ[2].

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری کرد بە سوێندخواردن و یەك شاهێد.

**٢١١٢-** عَنْ أَبِي الزِّنَادِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ كَتَبَ إِلَى عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، وَهُوَ عَامِلٌ عَلَى الْكُوفَةِ: أَنِ اقْضِ بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ[3].

واتە: لە ئەبو زینادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ نووسراوێکی نووسی بۆ عەبدولحەمیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتاب ﷺ، لە کاتێکدا کاربەدەستی کوفە بوو، (بۆی نووسی): دادوەری بکە بە سوێندخواردن و یەك شاهێد.

**٢١١٣-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ سُئِلاَ: هَلْ يُقْضَى بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ، فَقَالاَ: نَعَمْ[4].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم بەوەی پێی گەیشتووە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان و سولەیمانی کوڕی یەسار پرسیاریان لێ کرا: ئایا دادوەری دەکرێت بە سوێندخواردن و یەك شاهێد؟ گوتیان: بەڵێ.

---

(١) ـ الْقَضَاءُ بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١١ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٤ في القضاء؛ والشيباني: ٨٤٦ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٢ في الأقضية، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٣ في الأقضية، عن مالك به.

**٢١١٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَضَتِ السُّنَّةُ فِي الْقَضَاءِ بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ الْوَاحِدِ، يَحْلِفُ صَاحِبُ الْحَقِّ مَعَ شَاهِدِهِ، وَيَسْتَحِقُّ حَقَّهُ، فَإِنْ نَكَلَ وَأَبَى أَنْ يَحْلِفَ، أُحْلِفَ الْمَطْلُوبُ، فَإِنْ حَلَفَ سَقَطَ عَنْهُ ذَلِكَ الْحَقُّ، وَإِنْ أَبَى أَنْ يَحْلِفَ ثَبَتَ عَلَيْهِ الْحَقُّ لِصَاحِبِهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێچكەی ئیسلامەتی لە دادوەریكردندا بەوە هاتووە دادوەری بكرێت بە سوێندخواردن و یەك شاهێد، خاوەنی حەقەكە سوێند بخوات لەگەڵ هێنانی تاكە شاهێدەكەی و مافەكەی وەربگرێت، جا ئەگەر نكوڵی كرد و ڕازی نەبوو سوێند بخوات، (ئەو كات) ئەو كەسەی داواكراوە (ئەوەی بەرانبەر) سوێند دەدرێت، جا ئەگەر سوێندی خوارد ئەو مافە بۆ (ئەو كەسەی شاهێدییەكەی هێناوە) نامێنێت، وە ئەگەر ئەویش نكوڵی كرد لەوەی سوێند بخوات ئەوە مافەكە بۆ بەرانبەرەكەی جێگیر دەبێت (دەبێتە هی ئەو، چونكە ئەو بەهێزترە و شاهێدی هەیە).

**٢١١٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا يَكُونُ ذَلِكَ فِي الأَمْوَالِ خَاصَّةً، وَلاَ يَقَعُ ذَلِكَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْحُدُودِ، وَلاَ فِي نِكَاحٍ، وَلاَ فِي طَلاَقٍ، وَلاَ فِي عَتَاقَةٍ، وَلاَ فِي سَرِقَةٍ، وَلاَ فِي فِرْيَةٍ، فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ: فَإِنَّ الْعَتَاقَةَ مِنَ الأَمْوَالِ، فَقَدْ أَخْطَأَ، لَيْسَ ذَلِكَ عَلَى مَا قَالَ، وَلَوْ كَانَ ذَلِكَ عَلَى مَا قَالَ، لَحَلَفَ الْعَبْدُ مَعَ شَاهِدِهِ، إِذَا جَاءَ بِشَاهِدٍ أَنَّ سَيِّدَهُ أَعْتَقَهُ، وَأَنَّ الْعَبْدَ إِذَا جَاءَ بِشَاهِدٍ عَلَى مَالٍ مِنَ الأَمْوَالِ ادَّعَاهُ، حَلَفَ مَعَ شَاهِدِهِ، وَاسْتَحَقَّ حَقَّهُ كَمَا يَحْلِفُ الْحُرُّ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (قبووڵكردنی سوێند لەگەڵ یەك شاهێد) تەنها و بەتایبەت لە ماڵ و سامانداا وەردەگیرێت، ئەوە ڕوو نادات و وەرناگیرێت نە لە (چەسپاندنی) سزا شەرعییەكان و نە لە نیكاح و نە لە تەڵاق و نە لە ئازادكردن و نە لە دزی و نە لە بوختان، جا ئەگەر كەسێك بڵێت: خۆ ئازادكردن لە ماڵ و سامان حیسابە، ئەوە هەڵەی كردووە، بەو شێوەیە نییە كە گوتی، ئەگەر وا بێت كە گوتی، ئەوە كۆیلە بۆی هەیە سوێند بخوات لەگەڵ هێنانی یەك شاهێد، ئەگەر شاهێدێك بێنێت لەسەر ئەوەی گەورەكەی ئازادی كردووە (كەچی ئەوەی لێ

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٤ في الأقضية، عن مالك به.




قبووڵ ناکرێت، چونکە دەربارەی ئازادبوونە)، (بەڵام ئەگەر) کۆیلە شاهێدێك بێنێت لەسەر ماڵ و سەروەتێك کە بانگەشەی بۆ بکات کە هی ئەوە، جا سوێند بخوات لەگەڵ هێنانی شاهێدەکەی، ئەوە مافی خۆی وەردەگرێت وەك چۆن کەسی ئازاد سوێند دەخوات (لێرە لێی قبووڵ دەکرێت، چونکە بابەتی ماڵ و سەروەتە و جیایە لەگەڵ ئازادبوون، کەواتە دەرکەوت ئازادبوون بەشێك نییە لە سەروەت و سامان).

٢١١٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَالسُّنَّةُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا جَاءَ بِشَاهِدٍ عَلَى عَتَاقَتِهِ، اسْتُحْلِفَ سَيِّدُهُ مَا أَعْتَقَهُ، وَبَطَلَ ذَلِكَ عَنْهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازەکە وایە لای ئێمە: کۆیلە ئەگەر یەك شاهێد بهێنێت لەسەر ئازادبوونی خۆی (گەورەکەشی نکوڵی بکات)، ئەوە گەورەکەی سوێند دەدرێت لەسەر ئەوەی ئازادی نەکردووە، جا ئازادبوونەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

٢١١٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ السُّنَّةُ عِنْدَنَا أَيْضًا فِي الطَّلَاقِ، إِذَا جَاءَتِ الْمَرْأَةُ بِشَاهِدٍ أَنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا، أُحْلِفَ زَوْجُهَا مَا طَلَّقَهَا، فَإِذَا حَلَفَ لَمْ يَقَعْ عَلَيْهِ الطَّلَاقُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازەکە لای ئێمە لە تەڵاقیش بە هەمان شێوە هاتووە: ئەگەر ئافرەت شاهێدێك بێنێت لەسەر ئەوەی هاوسەرەکەی تەڵاقی داوە (هاوسەرەکەشی نکوڵی بکات)، ئەوە هاوسەرەکەی سوێند دەدرێت بەوەی تەڵاقی نەداوە، جا ئەگەر سوێندی خوارد تەڵاقی ناکەوێت.

٢١١٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَسُنَّةُ الطَّلَاقِ وَالْعَتَاقَةِ عِنْدَنَا فِي الشَّاهِدِ الْوَاحِدِ وَاحِدَةٌ، إِنَّمَا يَكُونُ الْيَمِينُ عَلَى زَوْجِ الْمَرْأَةِ، وَعَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ، وَإِنَّمَا الْعَتَاقَةُ حَدٌّ مِنَ الْحُدُودِ، لَا تَجُوزُ فِيهَا شَهَادَةُ النِّسَاءِ، لِأَنَّهُ إِذَا عَتَقَ الْعَبْدُ ثَبَتَتْ حُرْمَتُهُ، وَوَقَعَتْ لَهُ الْحُدُودُ، وَوَقَعَتْ عَلَيْهِ، وَإِنْ زَنَى وَقَدْ أُحْصِنَ رُجِمَ، وَإِنْ قَتَلَ الْعَبْدَ قُتِلَ بِهِ، وَثَبَتَ لَهُ الْمِيرَاثُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ مَنْ يُوَارِثُهُ، فَإِنِ احْتَجَّ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٦ في الأقضية، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٧ في الأقضية، عن مالك به.

مُحْتَجٌّ فَقَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ عَبْدَهُ، وَجَاءَ رَجُلٌ يَطْلُبُ سَيِّدَ الْعَبْدِ بِدَيْنٍ لَهُ عَلَيْهِ، فَشَهِدَ لَهُ عَلَى حَقِّهِ ذَلِكَ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ، فَإِنَّ ذَلِكَ يُثْبِتُ الْحَقَّ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ، حَتَّى تُرَدَّ بِهِ عَتَاقَتُهُ، إِذَا لَمْ يَكُنْ لِسَيِّدِ الْعَبْدِ مَالٌ غَيْرُ الْعَبْدِ، يُرِيدُ أَنْ يُجِيزَ بِذَلِكَ شَهَادَةَ النِّسَاءِ فِي الْعَتَاقَةِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ عَلَى مَا قَالَ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ الرَّجُلُ يَعْتِقُ عَبْدَهُ، ثُمَّ يَأْتِي طَالِبُ الْحَقِّ عَلَى سَيِّدِهِ بِشَاهِدٍ وَاحِدٍ، فَيَحْلِفُ مَعَ شَاهِدِهِ، ثُمَّ يَسْتَحِقُّ حَقَّهُ، وَتُرَدُّ بِذَلِكَ عَتَاقَةُ الْعَبْدِ، أَوْ يَأْتِي الرَّجُلُ قَدْ كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ سَيِّدِ الْعَبْدِ مُخَالَطَةٌ وَمُلاَبَسَةٌ، فَيَزْعُمُ أَنَّ لَهُ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ مَالاً، فَيُقَالُ لِسَيِّدِ الْعَبْدِ: احْلِفْ مَا عَلَيْكَ مَا ادَّعَى، فَإِنْ نَكَلَ وَأَبَى أَنْ يَحْلِفَ، حُلِّفَ صَاحِبُ الْحَقِّ، وَثَبَتَ حَقُّهُ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ، فَيَكُونُ ذَلِكَ يَرُدُّ عَتَاقَةَ الْعَبْدِ، إِذَا ثَبَتَ الْمَالُ عَلَى سَيِّدِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: تەڵاق و ئازادکردن لەلای ئێمە بە یەك شاهێد یەك شتە، سوێند لەسەر مێردی ئافرەتەکە و گەورەی کۆیلەکەیە، چونکە ئازادکردن حەدێکە لە حەدەکان (کە تایبەتە بە مافی خوای پەروەردگار)، شاهێدی ئافرەتانی تیادا دروست نییە، چونکە کاتێ کۆیلە ئازاد دەبێت حورمەتی دادەمەزرێت و سزا شەرعییەکانی (وەك کەسێکی ئازاد) دەکەوێتە سەر (ئەگەر تاوانەکان ئەنجام بدات)، ئەگەر زینا بکات و هاوسەرگیری کردبێت ئەوە ڕەجم دەکرێت، وە ئەگەر کەسێك بکوژێت بەهۆیەوە دەکوژرێتەوە، وە میراتیشی بۆ دادەمەزرێت لە نێوان خۆی و ئەو کەسانەی میراتی لێ دەگرن، جا ئەگەر کەسێك بەڵگە بێنێتەوە و بڵێت: ئەگەر کەسێك کۆیلەکەی خۆی ئازاد بکات و کەسێك بێت و داوا لە گەورەی کۆیلەکە بکات بۆ قەرزێکی خۆی کە گوایە لەسەر ئەو هەیەتی، جا پیاوێك و دوو ئافرەت شاهێدی بدەن لەسەر ئەو مافەی ئەو، خۆ مافەکە دەچەسپێنێت لەسەر گەورەی کۆیلەکە، تا ئازادکراوەکەی پێ بگەڕێندرێتەوە ئەگەر گەورەی کۆیلەکە ماڵ و سەروەتی جگە لە کۆیلەکەی نەبوو (تا کۆیلەکە بەر قەرزەکە بکەوێت)، دەیەوێ بەوە ڕێگە بدات بە شاهێدی ئافرەتان دەربارەی ئازادبوون (بەوەی دەڵێت: خۆ شاهێدی ئەو ئافرەتانە بوو بە گەڕاندنەوەی کۆیلە و کاریگەری لەسەر ئازادبوون کرد لەو نموونەیەدا)، (ئیمامی مالیکیش) دەڵێت: ئەوە بەڵگە نییە لەسەر قسەکەی، نموونەی ئەوە وەك نموونەی ئەو کەسە وایە کە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٨ في الأقضية، عن مالك به.





کۆیلەکەی خۆی ئازاد دەکات، دواتر کەسێك کە مافێکی لەسەر گەورەی کۆیلەکە هەیە بە یەك شاهێدەوە دێت و سوێند دەخوات لەگەڵ هێنانی شاهێدەکەی، دواتر دەبێتە خاوەنی مافەکەی، بەوەش ئازادبوونی کۆیلەکە ڕەت دەبێتەوە، یان (نموونەیەکی دیکە) کەسێك دێت کە تێکەڵاوی و بەیەکەوەبوون هەیە لە نێوان خۆی و گەورەی کۆیلەکە، جا دەڵێت ماڵ و سەروەتێکم هەیە لەسەر گەورەی کۆیلەکە، جا بە گەورەی کۆیلەکە دەگوترێت: سوێند بخۆ بەوەی ئەو مافەت لەسەر نییە کە (هاوڕێکەت) بانگەشەی بۆ دەکا، جا ئەگەر نکوڵی کرد و ڕازی نەبوو سوێند بخوات، ئەوە خاوەنی مافەکە سوێند دەدرێت و مافەکەی جێگیر دەبێت لەسەر گەورەی کۆیلەکە، ئەوەش ئازادکردنی کۆیلەکە ڕەت دەکاتەوە، کاتێ ماڵەکە دەچەسپێت بەسەر گەورەکەی (کەواتە نەك شاهێدی ئافرەت بەڵکوو سوێندیش دەتوانێت بە ناڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ئازادبوونی کۆیلە دروست بکات، بەڵام مەسەلەکەی ئێمە ئەوە نییە، مەبەستمان کاریگەری ڕاستەوخۆیە کە سوێند و شاهێدێك ناتوانن بیچەسپێنن).

٢١١٩- **[فتوى]** قَالَ: وَكَذَلِكَ أَيْضًا الرَّجُلُ يَنْكِحُ الأَمَةَ، فَتَكُونُ امْرَأَتَهُ، فَيَأْتِي سَيِّدُ الأَمَةِ إِلَى الرَّجُلِ الَّذِي تَزَوَّجَهَا فَيَقُولُ: ابْتَعْتَ مِنِّي جَارِيَتِي فُلاَنَةَ، أَنْتَ وَفُلاَنٌ بِكَذَا وَكَذَا دِينَارًا، فَيُنْكِرُ ذَلِكَ زَوْجُ الأَمَةِ، فَيَأْتِي سَيِّدُ الأَمَةِ بِرَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ، فَيَشْهَدُونَ عَلَى مَا قَالَ، فَيَثْبُتُ بَيْعُهُ، وَيَحِقُّ حَقُّهُ، وَتَحْرُمُ الأَمَةُ عَلَى زَوْجِهَا، وَيَكُونُ ذَلِكَ فِرَاقًا بَيْنَهُمَا، وَشَهَادَةُ النِّسَاءِ لاَ تَجُوزُ فِي الطَّلاَقِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە کە پیاوێك هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی کۆیلە دەکات و دەبێتە خێزانی، جا سەیید و گەورەی ئافرەتە کۆیلەکە بێت بۆ لای ئەو پیاوەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتەکە کردووە و بڵێت: تۆ و فڵانە کەس فڵانە جارییەت لە من کڕیوە بەوەندە و بەوەندە دینارە، مێردی جارییەکەش نکوڵی لەوە بکات، جا گەورەی ئافرەتە کۆیلەکە پیاوێك و دوو ئافرەت لەگەڵ خۆی بهێنێت و شاهێدی لەسەر قسەکەی ئەو بدەن، ئەوە فرۆشتنەکەی دەچەسپێ و حەقەکەی بۆ دادەمەزرێت (کە بریتییە لە نرخی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٩ في الأقضية، عن مالك به.




جارییەکە)، ئافرەتەکەش لەسەر مێردی حەڕام دەبێ و ئەوەش دەبێتە جیابوونەوە لە نێوانیاندا، کەچی شاهێدی ئافرەتانیش جێبەجێ ناکرێت لە تەڵاقدا (جا لێرەدا شاهێدی ئافرەتەکان دەربارەی پارەکە وەرگیراوە نەك دەربارەی تەڵاق، بەڵام کە دەربارەی پارە دامەزرا بابەتەکە وایە تەڵاقیش ڕوو دەدات، چونکە کە موڵکایەتی دامەزرا نیکاح فەسخ دەبێتەوە).

**٢١٢٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِنْ ذَلِكَ أَيْضًا الرَّجُلُ يَفْتَرِي عَلَى الرَّجُلِ الْحُرِّ، فَيَقَعُ عَلَيْهِ الْحَدُّ، فَيَأْتِي رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ، فَيَشْهَدُونَ أَنَّ الَّذِي افْتُرِيَ عَلَيْهِ عَبْدٌ مَمْلُوكٌ، فَيَضَعُ ذَلِكَ الْحَدَّ عَنِ الْمُفْتَرِي بَعْدَ أَنْ وَقَعَ عَلَيْهِ، وَشَهَادَةُ النِّسَاءِ لاَ تَجُوزُ فِي الْفِرْيَةِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە لەو بابەتەیە: کەسێك بوختان بە کەسێکی (بە حیساب) ئازاد بکات و سزای بوختانی بکەوێتە سەر، جا پیاوێك و دوو ئافرەت بێن و شاهێدی بدەن بەوەی ئەو کەسەی بوختانی پێ کراوە کۆیلەیە، ئەوە ئەو سزایە لەسەر بوختانکەرەکە نامێنێ کە پێشتر کەوتبووە سەری (چونکە ئەو کەسەی بوختان بە کۆیلە بکات حەدی لێ دەرناکرێت)، شاهێدی ئافرەتانیش جێبەجێ ناکرێ لە بابەتی بوختاندا (بەڵام بۆیە سزاکە لەسەر بوختانکەرەکە هەڵدەگیرێ، چونکە گومان دەکەوێتە ناو بابەتەکە).

**٢١٢١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُشْبِهُ ذَلِكَ أَيْضًا مِمَّا يَفْتَرِقُ فِيهِ الْقَضَاءُ، وَمَا مَضَى مِنَ السُّنَّةِ، أَنَّ الْمَرْأَتَيْنِ تَشْهَدَانِ عَلَى اسْتِهْلاَلِ الصَّبِيِّ، فَيَجِبُ بِذَلِكَ مِيرَاثُهُ حَتَّى يَرِثَ، وَيَكُونُ مَالُهُ لِمَنْ يَرِثُهُ، إِنْ مَاتَ الصَّبِيُّ، وَلَيْسَ مَعَ الْمَرْأَتَيْنِ اللَّتَيْنِ شَهِدَتَا، رَجُلٌ وَلاَ يَمِينٌ، وَقَدْ يَكُونُ ذَلِكَ فِي الأَمْوَالِ الْعِظَامِ، مِنَ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ وَالرِّبَاعِ وَالْحَوَائِطِ وَالرَّقِيقِ وَمَا سِوَى ذَلِكَ مِنَ الأَمْوَالِ، وَلَوْ شَهِدَتِ امْرَأَتَانِ عَلَى دِرْهَمٍ وَاحِدٍ، أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرَ، لَمْ تَقْطَعْ شَهَادَتُهُمَا شَيْئًا، وَلَمْ تَجُزْ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَعَهُمَا شَاهِدٌ أَوْ يَمِينٌ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەوەی پێشەوە دەچێ لەوەی دادوەری تیادا جیاوازە و ڕێبازەکە لەمەوبەر لەسەر ئەوە هاتووە ئەوەیە:

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٠ في الأقضية، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢١ في الأقضية، عن مالك به.




دوو ئافرەت شاهێدی بدەن لەسەر دەنگلێوەهاتنی منالێك (لە كاتی لەدایكبووندا)، بەوە میراتەکەی بۆ دابمەزرێت تا میرات بگرێت و دواتریش ماڵەکەی بۆ ئەو کەسانە بێت کە میراتی لێ دەگرن، ئەگەر منالەکە مردبوو، جا دوو ئافرەتەکان کە شاهێدیان داوە هیچ پیاو و سوێندێکیان لەگەڵدا نەبێت، بابەتەکەش لەسەر سەروەتی زۆر بێت لە زێڕ و زیو و خانوو و بێستان و كۆیلە و جگە لەوانەش لە ماڵ و سەروەت، جا (نەك ئەوە بەڵکوو) ئەگەر دوو ئافرەت شاهێدی بدەن لەسەر یەك درهەمیش یان زیاتر لەوە یان کەمتر لەوە، ئەوە شاهێدییەکەیان هیچ نابڕێتەوە و جێبەجێ ناکرێت تەنها لەو کاتە نەبێت کە پیاوێکی شاهێد یان سوێندیان لەگەڵ بێت (ئەو کات جێبەجێ دەکرێت).

**٢١٢٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ: لاَ تَكُونُ الْيَمِينُ مَعَ الشَّاهِدِ الْوَاحِدِ، وَيَحْتَجُّ بِقَوْلِ اللهِ ﷻ، وَقَوْلُهُ الْحَقُّ: ﴿وَٱسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴿٢٨٢﴾﴾ البقرة، يَقُولُ: فَإِنْ لَمْ يَأْتِ بِرَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ، فَلاَ شَيْءَ لَهُ، وَلاَ يُحَلَّفُ مَعَ شَاهِدِهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَمِنَ الْحُجَّةِ عَلَى مَنْ قَالَ ذَلِكَ الْقَوْلَ، أَنْ يُقَالَ لَهُ: أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً ادَّعَى عَلَى رَجُلٍ مَالاً، أَلَيْسَ يَحْلِفُ الْمَطْلُوبُ مَا ذَلِكَ الْحَقُّ عَلَيْهِ، فَإِنْ حَلَفَ بَطَلَ ذَلِكَ عَنْهُ، وَإِنْ نَكَلَ عَنِ الْيَمِينِ حُلِّفَ صَاحِبُ الْحَقِّ إِنَّ حَقَّهُ لَحَقٌّ، وَثَبَتَ حَقُّهُ عَلَى صَاحِبِهِ، فَهَذَا مَا لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، وَلاَ بِبَلَدٍ مِنَ الْبُلْدَانِ، فَبِأَيِّ شَيْءٍ أَخَذَ هَذَا؟ أَوْ فِي أَيِّ مَوْضِعٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ وَجَدَهُ؟ فَإِذَا أَقَرَّ بِهَذَا، فَلْيُقْرِرْ بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللهِ ﷻ، وَأَنَّهُ لَيَكْفِي مِنْ ذَلِكَ مَا مَضَى مِنَ السُّنَّةِ، وَلَكِنِ الْمَرْءُ قَدْ يُحِبُّ أَنْ يَعْرِفَ وَجْهَ الصَّوَابِ وَمَوْقِعَ الْحُجَّةِ، فَفِي هَذَا بَيَانُ مَا أَشْكَلَ مِنْ ذَلِكَ، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەندێ لە خەڵكی دەڵێن: سوێند خواردن لەگەڵ یەك شاهێد بڕیاری پێ نادرێت، وە بەڵگە بە وتەی خوای پەروەردگار ﷻ دەهێننەوە، وتەکەشی حەقە دەفەرمووێ: ﴿وَٱسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴿٢٨٢﴾﴾ البقرة،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٢ في الأقضية، عن مالك به.




واتە: [وە دوو شاهێد بگرن لە پیاوانی خۆتان، جا ئەگەر دوو پیاو نەبوون ئەوە با پیاوێك و دوو ژن بن لەوانەی کە پەسەندیان دەکەن لە شاهێدەکان] دەڵێن: ئەگەر پیاوێك و دوو ئافرەت بە شاهێد نەهێنێت، ئەوە هیچی بۆ نییە و سوێند نادرێت لەگەڵ شاهێدەکەی.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا یەکێك لە بەڵگەکان لەسەر ئەو کەسانەی ئەو بەڵگەیە دێننەوە ئەوەیە پێیان بگوترێت: چی دەڵێی ئەگەر کەسێك داوا لەسەر کەسێك تۆمار بکات دەربارەی ماڵ و سەروەتێك، ئایا داواکراوەکە سوێند ناخوات بەوەی ئەو حەقەی لەسەر نییە، جا ئەگەر سوێندی خوارد خۆ ئەوەی لەسەر نامێنێ، وە ئەگەر نکوڵی کرد سوێند بخوات ئەوە خاوەنی مافەکە سوێند دەخوات بەوەی ئەوە مافی ئەوە، جا مافەکەی جێگیر دەبێت لەسەر بەرانبەرەکەی، جا ئەوە شتێکە ڕاجیایی تیا نییە لەلای هیچ کەسێك و هیچ شارێك، جا بە چ شتێك ئەوەی وەرگرت؟ یان لە چ شوێنێك لە پەرتووکی خوا بینیویەتی؟ جا ئەگەر دانینا بەوە، ئەوە با دانیش بنێ بە سوێند لەگەڵ یەك شاهێد، هەرچەندە لە پەرتووکی خواشدا نەبێت، ئەوەندە بەسە کە سوونەتی پێشینە ئاوا هاتووە، بەڵام مرۆڤ هەر حەز دەکات ڕوانگەی ڕاستی بابەتەکان و شوێنی بەڵگە بزانێت، جا ئەوە ئەو ڕوونکردنەوەی تیایە کە ناڕوون بووە، إن شاء الله تعالى.

## ٥- دادوەری دەربارەی ئەو کەسەی دەمرێ لە کاتێکدا قەرزێکی هەیە و قەرزێکیشی لەسەر هەیە تیایدا یەك شاهێد هەیە[1]

**٢١٢٣- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَهْلِكُ وَلَهُ دَيْنٌ، عَلَيْهِ شَاهِدٌ وَاحِدٌ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ لِلنَّاسِ، لَهُمْ فِيهِ شَاهِدٌ وَاحِدٌ، فَيَأْبَى وَرَثَتُهُ أَنْ يَحْلِفُوا عَلَى حُقُوقِهِمْ مَعَ شَاهِدِهِمْ، قَالَ: فَإِنَّ الْغُرَمَاءَ يَحْلِفُونَ وَيَأْخُذُونَ حُقُوقَهُمْ، فَإِنْ فَضَلَ فَضْلٌ لَمْ يَكُنْ لِلْوَرَثَةِ مِنْهُ شَيْءٌ، وَذَلِكَ أَنَّ الأَيْمَانَ عُرِضَتْ عَلَيْهِمْ قَبْلُ، فَتَرَكُوهَا، إِلاَّ أَنْ يَقُولُوا: لَمْ نَعْلَمْ لِصَاحِبِنَا فَضْلاً، وَيُعْلَمُ أَنَّهُمْ إِنَّمَا تَرَكُوا الأَيْمَانَ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ، فَإِنِّي أَرَى أَنْ يَحْلِفُوا وَيَأْخُذُوا مَا بَقِيَ بَعْدَ دَيْنِهِ[2].

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِيمَنْ هَلَكَ وَلَهُ دَيْنٌ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ لَهُ فِيهِ شَاهِدٌ وَاحِدٌ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٣ في الأقضية، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارە ئەو پیاوەی دەمرێت و قەرزێکی لەلای کەسێك هەیە و یەك شاهێدیشی لەسەر ئەوە هەیە، وە قەرزێکی خەڵکیشی لەسەرە و ئەوانیش یەك شاهێدیان لەسەر ئەوە هەیە، جا میراتگرەکانی ڕەتی دەکەنەوە بۆ مافەکەیان سوێند بخۆن لەگەڵ شاهێدەکەیان، گوتوویەتی: خاوەن قەرزەکان سوێند دەخۆن و مافی خۆیان وەردەگرن، جا ئەگەر شتێك زیاد بوو لە سەروەتەکە (دوای دانەوەی قەرزەکە) هیچی بۆ میراتگرەکان نییە، چونکە پێشتر سوێندخواردنیان بۆ پێشنیار کرا و وازیان لێ هێنا، تەنها لەو کاتە نەبێت کە بڵێن: نەمانزانی خزمەکەمان سەروەتی زیاتر لە قەرزەکەی هەیە، وە بشزانرێت کە وازیان لە سوێند هێناوە هەر لەبەر ئەوە بووە، جا من بۆچوونم وایە: سوێند بخۆن و ئەوەی دوای قەرزەکە دەمێنێتەوە وەریبگرن.

## ٦- دادوەریکردن لە دەعوا و سکاڵادا[1]

**٢١٢٤-** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: عَنْ جَمِيلِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُؤَذِّنِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَحْضُرُ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ وَهُوَ يَقْضِي بَيْنَ النَّاسِ، فَإِذَا جَاءَهُ الرَّجُلُ يَدَّعِي عَلَى الرَّجُلِ حَقًّا، نَظَرَ، فَإِنْ كَانَتْ بَيْنَهُمَا مُخَالَطَةٌ أَوْ مُلاَبَسَةٌ، أَحْلَفَ الَّذِي ادُّعِيَ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ لَمْ يُحَلِّفْهُ[2].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە جەمیلی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی بانگبێژەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە (عادەتی وا بوو) لە مەجلیسەکانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ ئامادە دەبوو لە کاتێکدا دادوەری لە نێوان خەڵکیدا دەکرد، جا (جارێکیان) پیاوێك هات داوای مافێکی بو خۆی دەکرد لەسەر پیاوێك، سەیری دەکرد، ئەگەر تێکەڵییەك و بەیەکەوەبوونێك لە نێوانیان هەبووایە (وەك بازرگانی و شەریکایەتی ... هتد)، ئەوە ئەو کەسەی سوێند دەدا کە داواکەی لەسەرکراوە، وە ئەگەر تێکەڵییان لە نێواندا نەبووایە، ئەوە سوێندی نەدەدا.

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الدَّعْوَى.

(٢) ـ مقطوع حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٤ في الأقضية، عن مالك به.

**٢١٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ مَنِ ادَّعَى عَلَى رَجُلٍ بِدَعْوَى، نُظِرَ، فَإِنْ كَانَتْ بَيْنَهُمَا مُخَالَطَةٌ أَوْ مُلاَبَسَةٌ، أُحْلِفَ الْمُدَّعَى عَلَيْهِ، فَإِنْ حَلَفَ بَطَلَ ذَلِكَ الْحَقُّ عَنْهُ، وَإِنْ أَبَى أَنْ يَحْلِفَ، وَرَدَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعِي، فَحَلَفَ طَالِبُ الْحَقِّ، أَخَذَ حَقَّهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لەلای ئێمە لەسەر ئەوەیە: هەر کەسێك دەعوایێك لەسەر کەسێك بکات، سەیر دەکرێت، ئەگەر تێکەڵییەك و بەیەکەوەبوونێك لە نێوانیاندا هەبێت، ئەو کەسەی بانگەشەکەی لەسەرە سوێند دەدرێت، جا ئەگەر سوێندی خوارد، ئەو مافەی لەسەر نامێنێت، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوو سوێند بخوات و سوێندەکەی گەڕاندەوە بۆ ئەو کەسەی بانگەشەکە دەکات و داواکاری مافەکە سوێندی خوارد، ئەوە مافەکە وەردەگرێت.

## ٧- دادوەریکردن بە شاهێدی منداڵان[2]

**٢١٢٦-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ كَانَ يَقْضِي بِشَهَادَةِ الصِّبْيَانِ، فِيمَا بَيْنَهُمْ مِنَ الْجِرَاحِ[3].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دادوەری دەکرد بە شاهێدی مناڵان، لەوەی لە نێوانی خۆیان ڕوو دەدات لە جینایەت و برینەکان.

**٢١٢٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، أَنَّ شَهَادَةَ الصِّبْيَانِ تَجُوزُ فِيمَا بَيْنَهُمْ مِنَ الْجِرَاحِ، وَلاَ تَجُوزُ عَلَى غَيْرِهِمْ، وَإِنَّمَا تَجُوزُ شَهَادَتُهُمْ فِيمَا بَيْنَهُمْ مِنَ الْجِرَاحِ وَحْدَهَا، لاَ تَجُوزُ فِي غَيْرِ ذَلِكَ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَتَفَرَّقُوا، أَوْ يُخَبَّبُوا أَوْ يُعَلَّمُوا، فَإِنِ افْتَرَقُوا فَلاَ شَهَادَةَ لَهُمْ، إِلاَّ أَنْ يَكُونُوا قَدْ أَشْهَدُوا الْعُدُولَ عَلَى شَهَادَتِهِمْ، قَبْلَ أَنْ يَتَفَرَّقُوا[4].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٥ في الأقضية، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي شَهَادَةِ الصِّبْيَانِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٦ في الأقضية، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٧ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٧ في القضاء، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: شاهێدی منالان جێبەجێ دەکرێت لەوەی ڕوو دەدات لە نێوانی خۆیان لە برین و شکست و جینایەت، (بەڵام) شاهێدییەکەیان لەسەر گەوران جێبەجێ ناکرێت، شاهێدییەکەیان تەنها لە نێوانی خۆیان جێبەجێ دەکرێت لە برین و شکستەکان بەتەنها، لە جگە لەوە جێبەجێ ناکرێت، (لە نێوان خۆشیان ئەو کات جێبەجێ دەکرێت) ئەگەر پێش جیابوونەوە بوو یان پێش ئەوەی فێڵیان لێ بکرێت (پێش ئەوەی مەسەلەکەیان لێ بشێوێندرێت) یان پێش ئەوەی فێر بکرێن (تەلقین بدرێن کە چی بڵێن)، جا ئەگەر لە یەکدی جیابوونەوە، ئەوە شاهێدییان قبووڵ نییە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە کەسانی گەورەش بکەنە شاهێد لەسەر قسەکانیان کە شاهێدی بدەن بەوەی بەر لەوەی لێك جیا بووبنەوە بابەتەکە ئاوا بووە (ئەوانیان بینی بێت و پشتڕاستی بکەنەوە).

## ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی سوێندخواردن لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ[١]

**٢١٢٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى مِنْبَرِي آثِمًا، تَبَوَّأَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ[٢].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاڕییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بەتاوانباری سوێند بخوات لەسەر مینبەرەکەم (واتە سوێندی درۆ بخوات)، ئەوە شوێنی خۆی دیاری کردووە لە ئاگر.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْحِنْثِ عَلَى مِنْبَرَ النَّبِيِّ ﷺ

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٨ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٨ في القضاء؛ والشافعي: ٧٤٥؛ وابن حنبل: ١٤٧٤٧؛ وابن حبان: ٤٣٦٨؛ وأبو يعلى الموصلي: ١٧٨٢؛ والقابسي: ٤٨٤، كلهم عن مالك به.

**٢١٢٩**- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، وَأَوْجَبَ لَهُ النَّارَ، قَالُوا: وَإِنْ كَانَ شَيْئًا يَسِيرًا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَإِنْ كَانَ قَضِيبًا مِنْ أَرَاكٍ، وَإِنْ كَانَ قَضِيبًا مِنْ أَرَاكٍ، وَإِنْ كَانَ قَضِيبًا مِنْ أَرَاكٍ، قَالَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ[١].

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مافی کەسێکی مسوڵمان بە سوێندەکەی بۆ خۆی دابڕێت، خوا بەهەشتی لەسەر حەڕام دەکات و دۆزەخی بۆ یەکلایی دەکاتەوە، گوتیان: هەرچەندە شتێکی کەمیش بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: هەرچەندە لاچکە دارێکی ئەڕاکیش بێت (کە بۆ سیواك بەکار دێت)، هەرچەندە لاچکە دارێکی ئەڕاکیش بێت، هەرچەندە لاچکە دارێکی ئەڕاکیش بێت، سێ جار فەرمووی.

## ٩- بابەتی جۆراوجۆر لەوەی هاتووە دەربارەی سوێندخواردن لەسەر مینبەر[٢]

**٢١٣٠**-عَنْ دَاوُدَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا غَطَفَانَ بْنَ طَرِيفٍ الْمُرِّيَّ ﷺ يَقُولُ: اخْتَصَمَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ، وَابْنُ مُطِيعٍ، فِي دَارٍ كَانَتْ بَيْنَهُمَا، إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْمَدِينَةِ، فَقَضَى مَرْوَانُ عَلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ بِالْيَمِينِ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ: أَحْلِفُ لَهُ مَكَانِي، قَالَ: فَقَالَ مَرْوَانُ: لاَ وَاللَّهِ، إِلاَّ عِنْدَ مَقَاطِعِ الْحُقُوقِ، قَالَ: فَجَعَلَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ يَحْلِفُ أَنَّ حَقَّهُ لَحَقٌّ، وَيَأْبَى أَنْ يَحْلِفَ عَلَى الْمِنْبَرِ، قَالَ: فَجَعَلَ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ يَعْجَبُ مِنْ ذَلِكَ[٣].

واتە: لە داودی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئەبو غەتەفانی کوڕی تەریفی موڕی ﷺ بووە دەیگوت: زەیدی کوڕی سابیت و ﷺ ئیبنو موتیع کێشەیان لە نێوان دروست بوو لەسەر خانووێك کە هی هەردووکیان بوو، (جا

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢٩ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٨أفي القضاء؛ وابن حنبل: ٢١٢٨٨؛ والقابسي: ١٤٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي الْيَمِينِ عَلَى الْمِنْبَرِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٠ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٩ في القضاء؛ والشيباني: ٨٤٧ في العتاق؛ والشافعي: ٧٤٦، كلهم عن مالك به.

کێشەکەیان برد) بۆ لای مەڕوانی کوڕی حەکەم، کە گەورەی مەدینە بوو، جا مەڕوان بڕیاری بەسەر زەیدی کوڕی سابیتدا ﷺ دا بەوەی دەبێ سوێند بخوات لەلای مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ، زەیدی کوڕی سابیتیش ﷺ گوتی: لە شوێنی خۆم سوێندی بۆ دەخۆم، دەڵێ: مەڕوانیش گوتی: نەخێر سوێند بە خوا، تەنها دەبێ لەو شوێنە بێت کە شوێنی یەکلاییکردنەوەی مافەکانە (کە لای مینبەرە)، دەڵێ: جا زەیدی کوڕی سابیت هەر سوێندی دەخوارد بەوەی مافەکەی ماوە (و پارەی پشکی خانووەکەی وەرنەگرتووە)، وە ڕازی نەبوو بەوەی لەلای مینبەر سوێند بخوات، دەڵێ: جا مەڕوانی کوڕی حەکەم سەری سوڕمابوو لەوە[١].

**٢١٣١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَرَى أَنْ يُحَلَّفَ أَحَدٌ عَلَى الْمِنْبَرِ عَلَى أَقَلَّ مِنْ رُبُعِ دِينَارٍ، وَذَلِكَ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆچوونم وا نییە کەس لەسەر مینبەر سوێند بدرێت لەسەر کەمتر لە چارەکە دینارێك، کە بریتییە لە سێ درهەم.

## ١٠- ئەوەی دروست نییە لە هێشتنەوە و خواردنی نرخی زیادەی ڕەهن[٣]

**٢١٣٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَغْلَقُ الرَّهْنُ[٤].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەهن بە باتڵ نابێ بفەوتێ[٥].

---

(١) ـ تێبینی: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ بۆیە سوێندی لەلای مینبەر نەخواردووە، چونکە ترساوە و هەڕەشەی گەورەکراوە لەو کەسەی سوێند لەلای مینبەر بخوات وەك ئەوەی لە فەرموودەی ژمارە (٢١٢٨) هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوێند بخوات لەسەر مینبەری من بەتاوانباری (واتە سوێندی درۆ بخوات)، ئەوە شوێنی خۆی دیاری کردووە لە ئاگر. جا مانای ئەوە نییە سوێندەکەی ناڕاست بووە، نەخێر، بەڵکوو تەقوا و ترسی زۆر بووە بۆیە نەیکردووە.

(٢) ـ أخرجه الحدثاني: ٢٨٩أفي القضاء، عن مالك به.

(٣) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنْ غَلَقِ الرَّهْنِ.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٧ في الرهون؛ والشيباني: ٨٤٨ في العتاق، عن مالك به.

(٥) ـ تێبینی: ڕوونکردنەوەکەی لە فەرموودەی دواترە.




**٢١٣٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، أَنْ يَرْهَنَ الرَّجُلُ الرَّهْنَ عِنْدَ الرَّجُلِ بِالشَّيْءِ، وَفِي الرَّهْنِ فَضْلٌ عَمَّا رُهِنَ بِهِ، فَيَقُولُ الرَّاهِنُ لِلْمُرْتَهِنِ: إِنْ جِئْتُكَ بِحَقِّكَ، إِلَى أَجَلٍ يُسَمِّيهِ لَهُ، وَإِلاَّ فَالرَّهْنُ لَكَ بِمَا فِيهِ، قَالَ: فَهَذَا لاَ يَصْلُحُ وَلاَ يَحِلُّ، وَهَذَا الَّذِي نُهِيَ عَنْهُ، وَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهُ بِالَّذِي رَهَنَ بِهِ بَعْدَ الأَجَلِ، فَهُوَ لَهُ، وَأُرَى هَذَا الشَّرْطَ مُنْفَسِخًا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لێكدانەوەی ئەوە بە بۆچوونی ئێمە ـ والله أعلم ـ ئەوەیە: كەسێك ڕەهن و بارمتەیەك لەلای كەسێك دابنێت بە هۆی (كڕین و بەكرێگرتنی) شتێك، جا ڕەهنەكە زیاتر بێت لەوەی لە پێناوی كراوەتە ڕەهن، جا خاوەنی ڕەهنەكە بەو كەسە بڵێ كە ڕەهنەكەی وەرگرتووە: ئەگەر مافی تۆم هێنا تا ئەو كاتە، ناوی كاتێك بێنێت (ئەوە باشە ڕەهنەكەم وەردەگرمەوە)، ئەگەرنا ڕەهنەكە بۆ خۆت بێت لەوەی تیایەتی (لە زیادە نرخ)، ئیمامی مالیك گوتوویەتی: ئەوە نابێت و حەڵاڵ نییە، ئەوەیە كە نەهی لێ كراوە، هەرچەندە هاوڕێكەی ئەو شتە دوای كاتەكەش بهێنێت، ڕەهنەكە هی خۆیەتی و بۆچوونم وایە ئەو مەرجە هەڵوەشاوەیە (زیادە نرخەكە نابێتە هی ڕەهنوەرگرەكە).

## ١١- دادوەریكردن دەربارەی ڕەهنی بەروبووم و ئاژەڵ[2]

**٢١٣٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِيمَنْ رَهَنَ حَائِطًا لَهُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَيَكُونُ ثَمَرُ ذَلِكَ الْحَائِطِ قَبْلَ ذَلِكَ الأَجَلِ: إِنَّ الثَّمَرَ لَيْسَ بِرَهْنٍ مَعَ الأَصْلِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ اشْتَرَطَ ذَلِكَ الْمُرْتَهِنُ فِي رَهْنِهِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ إِذَا ارْتَهَنَ جَارِيَةً وَهِيَ حَامِلٌ، أَوْ حَمَلَتْ بَعْدَ ارْتِهَانِهِ إِيَّاهَا، إِنَّ وَلَدَهَا مَعَهَا[3].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو كەسەی بێستانێك دەكاتە ڕەهن تا ماوەیەكی دیاریكراو و بێستانەكەش بەروبوومی پەیدابوو بەر لە كۆتایی كاتەكە، دەیگوت: بەروبوومەكە لەگەڵ بێستانەكە ڕەهن نییە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٨ في الرهون؛ والحدثاني: ٢٩٧ في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي رَهْنِ الثَّمَرِ وَالْحَيَوَانِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٩ في الرهون، عن مالك به.




(تەنها بێستانەکە ڕەهنە)، تەنها لەو کاتە نەبێت کە ڕەهنوەرگرەکە ئەوە بە مەرج دابنێت لە ڕەهنەکەیدا، وە کەسێك ئەگەر جارییەیەك بە ڕەهن دابنێت لە کاتێکدا دووگیان بێت، یان دوای کردنی بە ڕەهن دووگیان بوو، ئەوە منالّەکەش ڕەهنە لەگەڵیدا.

**٢١٣٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَفُرِقَ بَيْنَ الثَّمَرِ وَبَيْنَ وَلَدِ الْجَارِيَةِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ بَاعَ نَخْلاً قَدْ أُبِّرَتْ، فَثَمَرُهَا لِلْبَائِعِ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُ الْمُبْتَاعُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جیاوازی کراوە لە نێوان بەروبووم و لە نێوان منالّی جارییە، (بەوەی) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دارخورمای فرۆشتن کە تەلقیح کرابوون، ئەوە بەروبوومەکە بۆ فرۆشیارەکەیە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە کڕیار ئەوە بە مەرج دابنێت (و بڵێت دەبێ بەروبوومەکەشم بدەیتێ، ئەو کات دەبێت بە هی ئەو).

**٢١٣٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، أَنَّ مَنْ بَاعَ وَلِيدَةً، أَوْ شَيْئًا مِنَ الْحَيَوَانِ، وَفِي بَطْنِهَا جَنِينٌ، أَنَّ ذَلِكَ الْجَنِينَ لِلْمُشْتَرِي، اشْتَرَطَهُ الْمُشْتَرِي أَوْ لَمْ يَشْتَرِطْهُ، فَلَيْسَتِ النَّخْلُ مِثْلَ الْحَيَوَانِ، وَلَيْسَ الثَّمَرُ مِثْلَ الْجَنِينِ فِي بَطْنِ أُمِّهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنَّ مِنْ أَمْرِ النَّاسِ، أَنْ يَرْهَنَ الرَّجُلُ ثَمَرَ النَّخْلِ، وَلاَ يَرْهَنُ النَّخْلَ، وَلَيْسَ يَرْهَنُ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ جَنِينًا فِي بَطْنِ أُمِّهِ مِنَ الرَّقِيقِ، وَلاَ مِنَ الدَّوَابِّ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: هەر کەسێك ئافرەتێکی کۆیلە بفرۆشێت، یان ئاژەڵێك بفرۆشێت، لە کاتێکدا کۆرپەلە و بێچووی لە سکدا بێت، ئەوە کۆرپەلە و بێچووەکە بۆ کڕیارە، (چون یەکە) کڕیارەکە ئەوەی بە مەرج گرتبێت یان نا، (بەڵام) دارخورما وەکوو ئاژەڵ نییە، وە بەروبوومیش وەکوو کۆرپەلەی ناو سکی دایك نییە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە بە هەمان شێوە ئەوەی جیاوازییەکە ڕوون دەکاتەوە ئەوەیە: کاروباری خەڵکی ئاوایە: کەسی وا هەیە بەروبوومی دارخورما

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٩ في الرهون، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦١ في الرهون، عن مالك به.

دەکات بە ڕەهن، دارخورماکان ناکات بە ڕەهن (لەیەکدی جیان)، (بەڵام) کەس نییە کۆرپەلەی ناو سکی دایکی بکات بە ڕەهن لە کۆیلەکان، وە نە لە ئاژەڵانیش (بێچوو دەکات بە ڕەهن).

## ١٢- بڕیاری شەرعی دەربارەی ڕەهنی ئاژەڵ[1]

**٢١٣٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا فِي الرَّهْنِ: أَنَّ مَا كَانَ مِنْ أَمْرٍ يُعْرَفُ هَلاَكُهُ مِنْ أَرْضٍ، أَوْ دَارٍ أَوْ حَيَوَانٍ، فَهَلَكَ فِي يَدِ الْمُرْتَهِنِ، وَعُلِمَ هَلاَكُهُ، فَهُوَ مِنَ الرَّاهِنِ، وَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَنْقُصُ مِنْ حَقِّ الْمُرْتَهِنِ شَيْئًا، وَمَا كَانَ مِنْ رَهْنٍ يَهْلِكُ فِي يَدِ الْمُرْتَهِنِ، فَلاَ يُعْلَمُ هَلاَكُهُ إِلاَّ بِقَوْلِهِ، فَهُوَ مِنَ الْمُرْتَهِنِ، وَهُوَ لِقِيمَتِهِ ضَامِنٌ، يُقَالُ لَهُ: صِفْهُ، فَإِذَا وَصَفَهُ، أُحْلِفَ عَلَى صِفَتِهِ، وَتَسْمِيَةِ مَالِهِ فِيهِ، ثُمَّ يُقَوِّمُهُ أَهْلُ الْبَصَرِ بِذَلِكَ، فَإِنْ كَانَ فِيهِ فَضْلٌ عَمَّا سَمَّى فِيهِ الْمُرْتَهِنُ، أَخَذَهُ الرَّاهِنُ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِمَّا سَمَّى، أُحْلِفَ الرَّاهِنُ عَلَى مَا سَمَّى الْمُرْتَهِنُ، وَبَطَلَ عَنْهُ الْفَضْلُ الَّذِي سَمَّى الْمُرْتَهِنُ فَوْقَ قِيمَةِ الرَّهْنِ[2]، وَإِنْ أَبَى الرَّاهِنُ أَنْ يَحْلِفَ، أُعْطِيَ الْمُرْتَهِنُ مَا فَضَلَ بَعْدَ قِيمَةِ الرَّهْنِ، فَإِنْ قَالَ الْمُرْتَهِنُ: لاَ عِلْمَ لِي بِقِيمَةِ الرَّهْنِ، حُلِّفَ الرَّاهِنُ عَلَى صِفَةِ الرَّهْنِ، وَكَانَ ذَلِكَ لَهُ، إِذَا جَاءَ بِالأَمْرِ الَّذِي لاَ يُسْتَنْكَرُ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ إِذَا قَبَضَ الْمُرْتَهِنُ الرَّهْنَ، وَلَمْ يَضَعْهُ عَلَى يَدَيْ غَيْرِهِ.

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە دەربارەی ڕەهن ئەوەیە: هەر شتێك لەناووچونەکەی بزانرێت لە زەوی و خانوو و ئاژەڵ، جا لە دەستی ڕەهنوەرگر (کە خاوەنی قەرزە) لەناو چوو و لەناوچوونەکەی زانرا، ئەوە لە خاوەنی ڕەهنەکە دەفەوتێ و (ئەو لەناوچوونەش) هیچ لە مافی ڕەهنوەرگر کەم ناکاتەوە، وە هەر ڕەهنێك لە دەستی ڕەهنوەرگر بفەوتێ و لەناوچوونەکەی نەزانرێت تەنها بە قسەی ڕەهنوەرگرەکە نەبێت، ئەوە لە ڕەهنوەرگر دەفەوتێ و زامنی نرخەکەیەتی، پێی دەگوترێت: وەسفی شتەکە بکە، جا ئەگەر وەسفی کرد سوێند دەدرێت لەسەر سیفەتی شتەکە و ئەندازەی ماڵە

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الرَّهْنِ مِنَ الْحَيَوَانِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٤ في الرهون، عن مالك به.

قەرزەکەی، دواتر کەسانی شارەزا نرخی شتەکە بەو سیفەتە دەخەمڵێنن، جا ئەگەر نرخی شتە ڕەهنکراوە لەناوچووەکە کە ڕەهنوەرگرەکە وەسفی کردبوو زیاتر بوو لە قەرزەکە، ئەوە خاوەنی قەرزەکە زیادەکە وەردەگرێ، وە ئەگەر نرخی کەمتر بوو لەوەی باسی کردبوو، ئەوە خاوەنی ڕەهنەکە سوێند دەدرێت (لەسەر ئەوەی نرخی شتەکە کەمتر نەبووە لە قەرزەکە و زیادەی ناکەوێتە سەر)، جا ئەو زیادەیەی لەسەر لادەچێ کە ڕەهنوەرگر باسی کردووە کە لە سەرووی نرخی ڕەهنەکەیە، وە ئەگەر خاوەنی ڕەهنەکە سوێندی نەخوارد، ئەوە ڕەهنوەرگرەکە ئەو زیادەیەی پێ دەدرێت کە لە سەرووی نرخی ڕەهنەکەوەیە، جا ئەگەر ڕەهنوەرگر گوتی: من زانیاریم نییە بە نرخی ڕەهنەکە، ئەو کات خاوەنی ڕەهنەکە سوێند دەدرێت لەسەر سیفەت و چۆنییەتی ڕەهنەکە، جا ئەوەی بۆ هەیە کە دەیڵێت، (بە مەرجێك) ئەگەر شتێکی نەگوت ئینکاری بکرێت (و دوور بێت لە واقیع).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی باس کرا لە کاتێکدایە ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە (واتە خاوەنی قەرزەکە) بۆ خۆی ڕەهنەکەی وەرگرتبوو و لەلای خۆی بوو و لە دەستی کەسی دانەنابوو (بەڵام ئەگەر لە دەستی کەسێکی دانابێ ئەو کاتە ڕەهنوەرگرەکە زامن نابێ).

## ١٣- بڕیاری شەرعی دەربارەی یەك ڕەهن کە لە نێوانی دوو کەس بێت[1]

**٢١٣٨- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الرَّجُلَيْنِ يَكُونُ لَهُمَا رَهْنٌ بَيْنَهُمَا، فَيَقُومُ أَحَدُهُمَا بِبَيْعِ رَهْنِهِ، وَقَدْ كَانَ الآخَرُ أَنْظَرَهُ بحَقِّهِ سَنَةً، قَالَ: إِنْ كَانَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يُقْسَمَ الرَّهْنُ، وَلاَ يَنْقُصَ حَقُّ الَّذِي أَنْظَرَهُ بِحَقِّهِ، بِيعَ لَهُ نِصْفُ الرَّهْنِ الَّذِي كَانَ بَيْنَهُمَا، فَأُوفِيَ حَقَّهُ، وَإِنْ خِيفَ أَنْ يَنْقُصَ حَقُّهُ، بِيعَ الرَّهْنُ كُلُّهُ، فَأُعْطِيَ الَّذِي قَامَ بِبَيْعِ رَهْنِهِ، حَقَّهُ مِنْ ذَلِكَ، فَإِنْ طَابَتْ نَفْسُ الَّذِي أَنْظَرَهُ بِحَقِّهِ أَنْ يَدْفَعَ نِصْفَ الثَّمَنِ إِلَى الرَّاهِنِ، وَإِلاَّ حُلِّفَ الْمُرْتَهِنُ، أَنَّهُ مَا أَنْظَرَهُ إِلاَّ لِيُوقِفَ لِي رَهْنِي عَلَى هَيْئَتِهِ، ثُمَّ أُعْطِيَ حَقَّهُ عَاجِلاً[2].

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الرَّهْنِ يَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٢ في الرهون، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی دوو پیاو كە ڕەهنێكیان لە نێوان بێت (واتە كەسێك قەرزاری هەردووكیان بێت و یەك ڕەهنی لەلای هەردووكیان دانابێت) جا یەكێكیان بیەوێت هەڵسێت بە فرۆشتنی ڕەهنەكەی خۆی و ئەوەی دیكەش بیەوێ ساڵێكی دیكە مۆڵەتی قەرزارەكە بدات (و ڕەهنەكە نەفرۆشێت)، گوتوویەتی: ئەگەر توانرا ڕەهنەكە دابەش بكرێت و لە مافی ئەو كەسە كەم نەدەبۆیەوە كە بۆ مافەكەی خۆی ساڵێكی دیكە چاوەڕێی دەكات، ئەوە نیوەی ئەو ڕەهنەی كە لە نێوانیاندایە (بۆ ئەو كەسەی ناوەستێت) دەفرۆشرێت و مافی خۆی وەردەگرێتەوە، وە ئەگەر ترس هەبوو لەوەی بەو فرۆشتنە مافی ئەو كەسە كەم بێتەوە كە چاوەڕوان دەكات، ئەوە گشت ڕەهنەكە دەفرۆشرێت و مافی ئەو كەسەی ویستوویەتی بفرۆشرێت لە پارەی ڕەهنە فرۆشراوەكە دەدرێت، جا ئەگەر ئەو كەسەی چاوەڕێی قەرزارەكە دەكات بەپێخۆشی خۆی ویستی نیوەی نرخی ڕەهنەكە (كە ماوەتەوە) بداتەوە بە خاوەنی ڕەهنەكە ـ قەرزارەكە ـ (ئەوە وا دەكات)، ئەگەرنا ڕەهنوەرگرەكە سوێند دەدرێت بەوەی ئەو نەیویستووە چاوەڕوانی بكات و كاتی بۆ درێژ بكاتەوە تەنها بۆ ئەوە بووە تا ڕەهنەكە وەك خۆی بۆ خۆم بمێنێتەوە، دواتر (كە ئەو سوێندەی خوارد و تازە ڕەهنیش نەماوە) بەپەلە مافەكەی دەدرێتەوە (دەبێ قەرزەكەی لە پارەی ڕەهنەكە بدرێتەوە).

**٢١٣٩- [فتوى]** قَالَ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الْعَبْدِ يَرْهَنُهُ سَيِّدُهُ، وَلِلْعَبْدِ مَالٌ: إِنَّ مَالَ الْعَبْدِ لَيْسَ بِرَهْنٍ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُ الْمُرْتَهِنُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی كۆیلە كە گەورەكەی بیكات بە ڕەهن و كۆیلەكەش ماڵ و سەروەتی هەبێت، گوتوویەتی: ماڵی كۆیلەكە (لەگەڵ كۆیلەكەدا) نابێت بە ڕەهن، تەنها لەو كاتەدا نەبێت ڕەهنوەرگرەكە ئەوە بكات بە مەرج.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٣ في الرهون، عن مالك به.




## ١٤- بڕیاری شەرعی دەربارەی بابەتی جۆراوجۆری ڕەهن[١]

**٢١٤٠- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِيمَنِ ارْتَهَنَ مَتَاعًا، فَهَلَكَ الْمَتَاعُ عِنْدَ الْمُرْتَهِنِ، وَأَقَرَّ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ بِتَسْمِيَةِ الْحَقِّ، وَاجْتَمَعَا عَلَى التَّسْمِيَةِ، وَتَدَاعَيَا فِي الرَّهْنِ، فَقَالَ الرَّاهِنُ: قِيمَتُهُ عِشْرُونَ دِينَارًا، وَقَالَ الْمُرْتَهِنُ: قِيمَتُهُ عَشَرَةُ دَنَانِيرَ، وَالْحَقُّ الَّذِي لِلرَّجُلِ فِيهِ عِشْرُونَ دِينَارًا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُقَالُ لِلَّذِي بِيَدِهِ الرَّهْنُ: صِفْهُ، فَإِذَا وَصَفَهُ، أُحْلِفَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَقَامَ تِلْكَ الصِّفَةَ أَهْلُ الْمَعْرِفَةِ بِهَا، فَإِنْ كَانَتِ الْقِيمَةُ أَكْثَرَ مِمَّا رُهِنَ بِهِ، قِيلَ لِلْمُرْتَهِنِ: ارْدُدْ إِلَى الرَّاهِنِ بَقِيَّةَ حَقِّهِ، وَإِنْ كَانَتِ الْقِيمَةُ أَقَلَّ مِمَّا رُهِنَ بِهِ، أَخَذَ الْمُرْتَهِنُ بَقِيَّةَ حَقِّهِ مِنَ الرَّاهِنِ، وَإِنْ كَانَتِ الْقِيمَةُ بِقَدْرِ حَقِّهِ، فَالرَّهْنُ بِمَا فِيهِ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی کاڵایێك بە ڕەهن دادەنێت و کاڵاکە لەلای ڕەهنوەرگر لەناو دەچێت و ئەو کەسەش کە قەرزەکەی لەسەرە دان دەنێ بە ئەندازەی قەرزەکە و هەردووکیان (قەرزارەکە و خاوەنی قەرزەکە) کۆکن لەسەر ئەندازەی قەرزەکە، (بەڵام) لە ڕەهنەکە جیاوازن، خاوەنی ڕەهنەکە دەڵێت: نرخی ڕەهنەکە بیست دینار بوو، ڕەهنوەرگرەکەش دەڵێت: نرخی دە دینار بوو، قەرزەکەش کە لەسەر کەسەکەیە بیست دینارە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەو کەسە دەگوترێت کە ڕەهنەکەی بەدەستەوە بووە (واتە ڕەهنوەرگرەکە): وەسفی ڕەهنەکە بکە، جا کە وەسفی کرد سوێند دەدرێت لەسەر وەسفەکە، دواتر کەسانی شارەزا نرخی کاڵاکە بەو سیفەتانە دەخەمڵێنن، جا ئەگەر نرخەکە زیاتر بوو لەو قەرزەی ڕەهنەکەی بۆ داندراوە، ئەوە بە ڕەهنوەرگر دەگوترێت: ئەو زیادەیەی ماوەتەوە لە سەرووی قەرزەکە بیدەرەوە خاوەنی ڕەهنەکە، وە ئەگەر نرخەکە کەمتر بوو لەو قەرزەی ڕەهنەکەی بۆ داندرابوو، ئەوە ڕەهنوەرگر باقی مافەکەی لە خاوەنی ڕەهنەکە وەردەگرێت، وە ئەگەر نرخەکە بەئەندازەی قەرزەکە بوو، ئەوە ڕەهنەکە بەر قەرزەکە کەوتووە (پاك لە پاك).

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي جَامِعِ الرُّهُونِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٥ في الرهون، عن مالك به.




٢١٤١- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلَيْنِ يَخْتَلِفَانِ فِي الرَّهْنِ، يَرْهَنُهُ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَيَقُولُ الرَّاهِنُ: رَهَنْتُكَهُ بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، وَيَقُولُ الْمُرْتَهِنُ: ارْتَهَنْتُهُ مِنْكَ بِعِشْرِينَ دِينَارًا، وَالرَّهْنُ ظَاهِرٌ بِيَدِ الْمُرْتَهِنِ، قَالَ: يُحَلَّفُ الْمُرْتَهِنُ حَتَّى يُحِيطَ بِقِيمَةِ الرَّهْنِ، فَإِنْ كَانَ ذَلِكَ، لاَ زِيَادَةَ فِيهِ وَلاَ نُقْصَانَ عَمَّا حُلِّفَ أَنَّ لَهُ فِيهِ، أَخَذَهُ الْمُرْتَهِنُ بِحَقِّهِ، وَكَانَ أَوْلَى بِالتَّبْدِئَةِ بِالْيَمِينِ، لِقَبْضِهِ الرَّهْنَ وَحِيَازَتِهِ إِيَّاهُ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّ الرَّهْنِ أَنْ يُعْطِيَهُ حَقَّهُ الَّذِي حُلِّفَ عَلَيْهِ، وَيَأْخُذَ رَهْنَهُ[1].

قَالَ: وَإِنْ كَانَ الرَّهْنُ أَقَلَّ مِنَ الْعِشْرِينَ الَّتِي سَمَّى، أُحْلِفَ الْمُرْتَهِنُ عَلَى الْعِشْرِينَ الَّتِي سَمَّى، ثُمَّ يُقَالُ لِلرَّاهِنِ: إِمَّا أَنْ تُعْطِيَهُ الَّذِي حَلَفَ عَلَيْهِ، وَتَأْخُذَ رَهْنَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَحْلِفَ عَلَى الَّذِي قُلْتَ أَنَّكَ رَهَنْتَهُ بِهِ، وَيَبْطُلُ عَنْكَ مَا زَادَ الْمُرْتَهِنُ عَلَى قِيمَةِ الرَّهْنِ، فَإِنْ حَلَفَ الرَّاهِنُ بَطَلَ ذَلِكَ عَنْهُ، وَإِنْ لَمْ يَحْلِفْ لَزِمَهُ غُرْمُ مَا حَلَفَ عَلَيْهِ الْمُرْتَهِنُ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی دوو کەس کە ناکۆکییان هەبێ دەربارەی ڕەهن کە یەکێکیان ڕەهنی دانابێت لەلای ئەوەی دیکە (چونکە قەرزاری بووە) جا خاوەنی ڕەهنەکە بڵێت: ڕەهنم لەلات داناوە بە هۆی قەرزی دە دینار، ڕەهنوەرگرەکەش بڵێت: (نەخێر) من ڕەهنم لە تۆ وەرگرتووە بە هۆی قەرزی بیست دینار، لە کاتێکدا ڕەهنەکە ڕوون و دیارە بە دەستی ڕەهنوەرگرەکەوەیە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕەهنوەرگرەکە سوێند دەدرێت (لە سوێندەکەیدا) تا ئەو ئەندازەیەی (لێ قبووڵ دەکرێت) کە نرخی ڕەهنەکەیە، جا ئەگەر هەمان نرخی ڕەهنەکە بوو، زیاد و کەمی تیا نەبوو لەو ئەندازەی سوێند درابوو لەسەری، ئەوە ڕەهنوەرگرەکە مافەکەی خۆی وەردەگرێت (کە دەکاتە تەواوی ڕەهنەکە)، جا ئەو لەپێشترە بە دەستپێکردن بە سوێندخواردن، لەبەر وەرگرتنی ڕەهنەکە و بوونی ڕەهنەکە لەلای ئەو (کەواتە ڕەهنەکە دەبێتە هی ئەو)، تەنها لەو کاتە نەبێت کە خاوەنی ڕەهنەکە بیەوێت مافی خاوەن قەرزەکە (بە پارە بداتەوە) کە سوێندی لەسەر خواردووە و بۆی سەلماوە، ڕەهنەکەشی وەرگرێتەوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٦ في الرهون، عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: وە ئەگەر نرخی ڕەهنەکە کەمتر بوو لەو بیست دینارەی باسی کردووە، ئەوە ڕەهنوەرگرەکە سوێند دەدرێت لەسەر ئەو بیست دینارەی گوتوویەتی، دواتر بە خاوەنی ڕەهنەکە دەگوترێت: یان ئەو ئەندازەیە دەدەیت کە ڕەهنوەرگر سوێندی لەسەر خواردووە و ڕەهنەکەت وەردەگریتەوە، یانیش تۆش سوێند دەخۆی لەسەر ئەوەی ئەو ڕەهنەت بۆ دە دینار داناوە، ئەو کات ئەو زیادەیەت لەسەر لادەچێ کە ڕەهنوەرگر زیادی کردووە بەسەر ڕەهنەکەوە، جا ئەگەر خاوەنی ڕەهنەکە سوێندی خوارد، ئەوە زیادەکەی لەسەر لادەچێ، (بەڵام) ئەگەر سوێندی نەخوارد پابەند دەبێ بەوەی ڕەهنوەرگرەکە سوێندی لەسەر خواردووە (دەبێ بیست دیناری پێ بدات).

**٢١٤٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَإِنْ هَلَكَ الرَّهْنُ، وَتَنَاكَرَا الْحَقَّ، فَقَالَ الَّذِي لَهُ الْحَقُّ: كَانَتْ لِي فِيهِ عِشْرُونَ دِينَارًا، وَقَالَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ: لَمْ يَكُنْ لَكَ فِيهِ إِلاَّ عَشَرَةُ دَنَانِيرَ، وَقَالَ الَّذِي لَهُ الْحَقُّ: قِيمَةُ الرَّهْنِ عَشَرَةُ دَنَانِيرَ، وَقَالَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ: قِيمَتُهُ عِشْرُونَ دِينَارًا، قِيلَ لِلَّذِي لَهُ الْحَقُّ: صِفْهُ، فَإِذَا وَصَفَهُ، أُحْلِفَ عَلَى صِفَتِهِ، ثُمَّ أَقَامَ تِلْكَ الصِّفَةَ أَهْلُ الْمَعْرِفَةِ بِهَا، فَإِنْ كَانَتْ قِيمَةُ الرَّهْنِ أَكْثَرَ مِمَّا ادَّعَى فِيهِ الْمُرْتَهِنُ، أُحْلِفَ عَلَى مَا ادَّعَى، ثُمَّ يُعْطَى الرَّاهِنُ مَا فَضَلَ مِنْ قِيمَةِ الرَّهْنِ، وَإِنْ كَانَتْ قِيمَتُهُ أَقَلَّ مِمَّا يَدَّعِي فِيهِ الْمُرْتَهِنُ، أُحْلِفَ عَلَى الَّذِي زَعَمَ أَنَّهُ لَهُ فِيهِ، ثُمَّ قَاصَّهُ بِمَا بَلَغَ الرَّهْنُ، ثُمَّ أُحْلِفَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ عَلَى الْفَضْلِ الَّذِي بَقِيَ لِلْمُدَّعَى عَلَيْهِ، بَعْدَ مَبْلَغِ ثَمَنِ الرَّهْنِ، وَذَلِكَ أَنَّ الَّذِي بِيَدِهِ الرَّهْنُ صَارَ مُدَّعِيًا عَلَى الرَّاهِنِ، فَإِنْ حَلَفَ بَطَلَ عَنْهُ بَقِيَّةُ مَا حَلَفَ عَلَيْهِ الْمُرْتَهِنُ مِمَّا ادَّعَى فَوْقَ قِيمَةِ الرَّهْنِ، وَإِنْ نَكَلَ لَزِمَهُ مَا بَقِيَ مِنْ حَقِّ الْمُرْتَهِنِ بَعْدَ قِيمَةِ الرَّهْنِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەگەر ڕەهنەکە لەناو چوو و خاوەنی قەرز و قەرزارەکە قسەی یەکدیيان ڕەت دەکردەوە (و ناکۆك بوون لەسەر ئەندازەی قەرزەکە)، خاوەنی قەرزەکە دەیگوت: بیست دینار قەرزم هەبوو لە ڕەهنەکەدا (واتە ڕەهنەکە لەبری بیست دیناری قەرز داندراوە)، ئەو کەسەش کە ماف و قەرزەکەی لەسەرە دەیگوت: ڕەهنەکە بۆ تۆ لە دە دینار زیاتری تیا نەبووە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٧ في الرهون، عن مالك به.




(تەنها دە دینار قەرزار بووم)، (وە لە نرخی ڕەهنە لەناوچووەکەش جیاواز بن) خاوەنی قەرزەکە بڵێت: نرخی ڕەهنەکە دە دینار بوو، ئەو کەسەش کە قەرزەکەی لەسەرە بڵێت: نرخی بیست دینار بوو، (ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی:) بە خاوەن ماف و قەرزەکە دەگوترێت: وەسفی ڕەهنەکە بکە، جا کە وەسفی کرد سوێند دەدرێت لەسەر وەسفەکەی، دواتر خەڵکی شارەزا نرخی ئەو ڕەهنە دیاری دەکەن بەو سیفەتانە، جا ئەگەر نرخی ڕەهنەکە زیاتر بوو لەوەی ڕەهنوەرگرەکە (خاوەنی قەرزەکە) بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەوە سوێند دەدرێت لەسەر ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکات، دواتر ئەوەی زیاد بوو (بەسەر قەرزەکە) لە نرخی ڕەهنەکە دەدرێت بە خاوەنی ڕەهنەکە، وە ئەگەر (ڕەهنە وەسفکراوەکە) نرخەکەی کەمتر بوو لەوەی ڕەهنوەرگر (خاوەنی قەرزەکە) بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەوە سوێند دەدرێت لەسەر ئەندازەی ئەو قەرزەی لە ڕەهنەکە هەیەتی، دواتر ئەوەندە دەشکێنێت کە نرخی ڕەهنەکەیە، دواتر ئەو کەسەی قەرزەکەی لەسەرە سوێند دەدرێت لەسەر ئەو زیادەیەی لەسەری ماوەتەوە دوای نرخی ڕەهنەکە، (جا کە دەڵێین خاوەنی ڕەهن دەبێ سوێند بدرێت) لەبەر ئەوەیە ئەو کەسەی ڕەهنەکەی بەدەستەوە بووە بۆتە سکاڵاکار لەسەر ئەو کەسەی ڕەهنەکەی داناوە (لە فەرموودەشدا هاتووە دەبێ داواکراو سوێند بخوات)، جا ئەگەر سوێندی خوارد ئەو ئەندازەیە پووچەڵ دەبێتەوە کە ڕەهنوەرگر بانگەشەی بۆ دەکات کە لە سەرەوەی نرخی ڕەهنەکەوەیە، وە ئەگەر پاشەکشەی کرد لە سوێندخواردن و سوێندی نەخوارد، ئەوە پابەند دەبێ بە مافە (زیادەکەی) ڕەهنوەرگر دوای نرخی ڕەهنەکە.

## ١٥- بڕیاری شەرعی دەربارەی کرێی ئاژەڵ و تێپەڕاندنی (لەو شوێنەی بۆی بەکرێ گیراوە)[1]

**٢١٤٣- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يَسْتَكْرِي الدَّابَّةَ إِلَى الْمَكَانِ الْمُسَمَّى، ثُمَّ يَتَعَدَّى ذَلِكَ وَيَتَقَدَّمُ، قَالَ: فَإِنَّ رَبَّ الدَّابَّةِ مُخَيَّرٌ، فَإِنْ أَحَبَّ

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي كِرَاءِ الدَّابَّةِ وَالتَّعَدِّي بِهَا.

أَنْ يَأْخُذَ كِرَاءَ دَابَّتِهِ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي تُعُدِّيَ بِهَا إِلَيْهِ، أُعْطِيَ ذَلِكَ، وَيَقْبِضُ دَابَّتَهُ، وَلَهُ الْكِرَاءُ الأَوَّلُ، وَإِنْ أَحَبَّ رَبُّ الدَّابَّةِ، فَلَهُ قِيمَةُ دَابَّتِهِ مِنَ الْمَكَانِ الَّذِي تَعَدَّى مِنْهُ الْمُسْتَكْرِي، وَلَهُ الْكِرَاءُ الأَوَّلُ، إِنْ كَانَ اسْتَكْرَى الدَّابَّةَ الْبَدْأَةَ، فَإِنْ كَانَ اسْتَكْرَاهَا ذَاهِبًا وَرَاجِعًا، ثُمَّ تَعَدَّى حِينَ بَلَغَ الْبَلَدَ الَّذِي اسْتَكْرَى إِلَيْهِ، فَإِنَّمَا لِرَبِّ الدَّابَّةِ نِصْفُ الْكِرَاءِ الأَوَّلِ، وَذَلِكَ أَنَّ الْكِرَاءَ نِصْفُهُ فِي الْبَدْأَةِ، وَنِصْفُهُ فِي الرَّجْعَةِ، فَتَعَدَّى الْمُتَعَدِّي بِالدَّابَّةِ، فَلَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ إِلاَّ نِصْفُ الْكِرَاءِ الأَوَّلِ، وَلَوْ أَنَّ الدَّابَّةَ هَلَكَتْ حِينَ بَلَغَ بِهَا الْبَلَدَ الَّذِي اسْتَكْرَى إِلَيْهِ، لَمْ يَكُنْ عَلَى الْمُسْتَكْرِي ضَمَانٌ، وَلَمْ يَكُنْ لِلْمُكْرِي، إِلاَّ نِصْفُ الْكِرَاءِ.

قَالَ: وَعَلَى ذَلِكَ أَمْرُ أَهْلِ التَّعَدِّي وَالْخِلاَفِ، لِمَا أَخَذُوا الدَّابَّةَ عَلَيْهِ[١].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو كەسەی ئاژەڵێك بەكرێ وەردەگرێ بۆ شوێنێكی دیاریكراو، دواتر لەو شوێنە تێ دەپەڕێت و زیاتر دەڕوات، گوتوویەتی: خاوەنی ئاژەڵەكە سەرپشكە: ئەگەر حەزی كرد كرێی ئاژەڵەكەی وەربگرێت (لەو شوێنەی بڕیار بووە بۆی بچێت) تا ئەو شوێنەی تێ پەڕێندراوە، ئەوە ئەوەی پێ دەدرێت (ئەو مافەی هەیە)، وە كرێی یەكەمیشی بۆ هەیە (واتە كرێی شوێنی دیاریكراو)، وە ئەگەر خاوەنی ئاژەڵەكە حەزی كرد (نرخی ئاژەڵەكە وەربگرێت چونكە بەهۆی شوێنە دوورەكە زەرەری بەركەوتووە و ڕۆیشتنی وەك جاران نەماوە و ئاژەڵەكە بێتوانا بووە)، ئەوە نرخی ئاژەڵەكەی وەردەگرێت (بەگوێرەی نرخی ئاژەڵەكە لەو ڕۆژ و) شوێنەی بەكرێگرەكە لێی تێی پەڕاندووە، وە كرێی یەكەمیشی بۆ هەیە، (جا ئەوە لە حاڵەتێك بوو) ئەگەر ئاژەڵەكەی تەنها بۆ چوون بەكرێ گرتبوو (نەك چوون و هاتنەوە)، وە ئەگەر بەكرێی گرتبوو بۆ چوون و هاتنەوە، دواتر زیاتر تێ پەڕی لەو شوێنەی بۆی بەكرێ گرتووە، ئەوە نیوەی كرێی یەكەم بۆ خاوەن ئاژەڵەكە هەیە، چونكە كرێیەكە نیوەی بۆ چوونە و نیوەی بۆ هاتنەوەیە و كەسەكەش ئاژەڵەكەی زیاتر تێ پەڕاندووە، جا جگە لە نیوەی كرێی یەكەمی لەسەر واجب نییە (چونكە بە تێپەڕاندن و بێهێزبوونی ئاژەڵەكە، زەمانەتی دەكەوێتە سەر و ئاژەڵەكە دەبێتە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٣ في الوصايا، عن مالك به.





هی خۆی کەواتە کرێی نیوەی دووەمی ڕێگاکە پووچەڵ دەبێتەوە چونکە بۆتە موڵکی خۆی، تەنها کرێی نیوەی یەکەم دەدات لەگەڵ پارەی ئاژەڵەکە)، وە ئەگەر ئاژەڵەکە فەوتا و لەناو چوو کاتێ گەیشت بەو شوێنەی بۆی بەکرێ گرتووە، ئەوە بەکرێگرەکە زەمانی لەسەر نییە (پارەی فەوتانی ئاژەڵەکە نادات)، وە بەکرێگرەکە هیچی لەسەر نییە تەنها نیوەی کرێکە نەبێت (چونکە سنووری نەبەزاندووە و هەجەلەکە بەو شێوەیە بووە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە بابەتی کەسانی تێپەڕێنەر و سەرپێچیکارە لەو شتەی ئاژەڵی بۆ وەردەگرن و بەکرێی دەگرن.

**٢١٤٤- [فتوى]** قَالَ: وَكَذَلِكَ أَيْضًا مَنْ أَخَذَ مَالاً قِرَاضًا مِنْ صَاحِبِهِ، فَقَالَ لَهُ رَبُّ الْمَالِ: لاَ تَشْتَرِ بِهِ حَيَوَانًا، وَلاَ سِلَعًا كَذَا وَكَذَا، لِسِلَعٍ يُسَمِّيهَا، وَيَنْهَاهُ عَنْهَا، وَيَكْرَهُ أَنْ يَضَعَ مَالَهُ فِيهَا، فَيَشْتَرِي الَّذِي أَخَذَ الْمَالَ الَّذِي نُهِيَ عَنْهُ، يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنْ يَضْمَنَ الْمَالَ، وَيَذْهَبَ بِرِبْحِ صَاحِبِهِ، فَإِذَا صَنَعَ ذَلِكَ فَرَبُّ الْمَالِ بِالْخِيَارِ، إِنْ أَحَبَّ أَنْ يَدْخُلَ مَعَهُ فِي السِّلْعَةِ عَلَى مَا شَرَطَا بَيْنَهُمَا مِنَ الرِّبْحِ، فَعَلَ، وَإِنْ أَحَبَّ، فَلَهُ رَأْسُ مَالِهِ ضَامِنًا عَلَى الَّذِي أَخَذَ الْمَالَ وَتَعَدَّى[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەهامان شێوە ئەو کەسەی ماڵێك بە قازانجی هاوبەش لە هاوڕێکەی وەردەگرێت، خاوەنی ماڵەکەش پێی دەڵێت: فڵان ئاژەڵ و فڵان کاڵا مەکڕە، ناوی چەند شتێك بڵێت و ڕێگری لێ بکات و پێی ناخۆش بێت پارەکەی بەو شتانە بدرێت، جا ئەو کەسەی پارە و سامانەکەی وەرگرتووە ئەو شتانەی کڕی کە (لەلایەن خاوەن پارەکە) قەدەغەی لێ کراوە، مەبەستی بەو کارە ئەوەیە ببێتە زامنی پارەکە و قازانجی هاوڕێکەی بفەوتێنێت و بەژداری پێ نەکات (واتە تا بگوترێت تۆ زامنی پارەکەی بدەوە و بازرگانییەکە لە نێوانتان نەما و بوو بە هی خۆت)، جا ئەگەر ئەو کارەی کرد، ئەوە خاوەنی سەروەت و پارەکە سەرپشکە: ئەگەر حەزی کرد لەگەڵی بچێتە ناو مامەڵەی کاڵاکە و بەژدار بێت لەسەر ئەو مەرج و ئەندازەی دایانناوە لە نێوانی خۆیان لە قازانج، ئەوە وا دەکات، ئەوە ئەگەر حەزیش بکات (بەژدار نەبێت) ئەوە سەرمایەکەی لە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٤ في الوصايا، عن مالك به.




ئەستۆی ئەو کەسەیە کە ماڵەکەی لێ وەرگرتووە و لایداوە لە مەرجەکانی (دەبێ ماڵەکەی بداتەوە و زامنە).

**٢١٤٥- [فتوى]** قَالَ: وَكَذَلِكَ أَيْضًا الرَّجُلُ يُبْضِعُ مَعَهُ الرَّجُلُ بِضَاعَةً، فَيَأْمُرُهُ صَاحِبُ الْمَالِ أَنْ يَشْتَرِيَ لَهُ سِلْعَةً بِاسْمِهَا، فَيُخَالِفُ، فَيَشْتَرِي بِبِضَاعَتِهِ غَيْرَ مَا أَمَرَهُ بِهِ، وَيَتَعَدَّى ذَلِكَ، فَإِنَّ صَاحِبَ الْبِضَاعَةِ عَلَيْهِ بِالْخِيَارِ، إِنْ أَحَبَّ أَنْ يَأْخُذَ مَا اشْتُرِيَ بِمَالِهِ، أَخَذَهُ، وَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ الْمُبْضِعُ مَعَهُ ضَامِنًا لِرَأْسِ مَالِهِ، فَذَلِكَ لَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هامان شێوە کەسێك بەژدار بێت لەگەڵ کەسێکی دیکە لە کڕینی کاڵاییێك، جا خاوەنی پارەکە فەرمان بە کەسەکە بکات بەوەی بە ناوهێنان فڵان کاڵای بۆ بکڕێت (بۆ قازانجیان)، جا ئەو سەرپێچی بکات و بە ماڵەکەی ئەو کاڵاییێکی جگە لەوە بکرێت کە خاوەنەکەی فەرمانی پێ کردووە و سنوور (ی مەرجەکە) ببەزێنێت، ئەوە خاوەنی ماڵەکە سەرپشکە: ئەگەر حەزی کرد ئەو شتە وەربگرێت کە بە ماڵەکەی ئەو کڕاوە، ئەوە وەریدەگرێت، وە ئەگەر حەزیشی کرد کاڵاکڕەکە زامن بێت بۆ سەرمایە و پارەکەی، ئەوە ئەوەشی بۆ هەیە (ئەو کات دەبێ کەسەکە هەر چۆنێك بێت پارەکەی بداتەوە و مامەڵەکە نامێنێت).

## ١٦- بڕیاردان دەربارەی ئافرەتی زۆرلێکراو[2]

**٢١٤٦-** عنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ الْمَلِكِ بْنَ مَرْوَانَ قَضَى فِي امْرَأَةٍ أُصِيبَتْ مُسْتَكْرَهَةً، بِصَدَاقِهَا عَلَى مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ بِهَا[3].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان بڕیاری دا و دادوەری کرد دەربارەی ئەو ئافرەتەی بە هەڕەشە و زۆرلێکردن

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٥ في الوصايا، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي الْمُسْتَكْرَهَةِ مِنَ النِّسَاءِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٩ في الأقضية؛ والشيباني: ٧٠٣ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

جووتبوونی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت، بە پێدانی مارەیی بە ئافرەتەکە لەسەر ئەو کەسەی ئاوای لێ کردووە.

**٢١٤٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يَغْتَصِبُ الْمَرْأَةَ، بِكْرًا كَانَتْ أَوْ ثَيِّبًا، إِنَّهَا إِنْ كَانَتْ حُرَّةً، فَعَلَيْهِ صَدَاقُ مِثْلِهَا، وَإِنْ كَانَتْ أَمَةً، فَعَلَيْهِ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِهَا، وَالْعُقُوبَةُ فِي ذَلِكَ عَلَى الْمُغْتَصِبِ، وَلاَ عُقُوبَةَ عَلَى الْمُغْتَصَبَةِ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ، وَإِنْ كَانَ الْمُغْتَصِبُ عَبْدًا، فَذَلِكَ عَلَى سَيِّدِهِ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ أَنْ يُسَلِّمَهُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو پیاوەی دەستدرێژی دەکاتە سەر ئافرەتێك، جا ئافرەتەکە کچ بێت یان ژن بێت، ئەگەر ئافرەتەکە ئازاد بێت ئەوە هاوشێوەی مارەیی ئەو ئافرەتەی لەسەرە، وە ئەگەر ئافرەتەکە کۆیلە بێت، ئەوە بەهۆی ئەوەوە نرخەکەی چەندی کەم کردووە دەبێ بیدات، عوقوبە و سزای شەرعیش تەنها لەسەر ئەو کەسەیە کە دەستدرێژییەکەی ئەنجام داوە، لەسەر ئەو ئافرەتە نییە کە دەستدرێژی کراوەتە سەر لە هەموو بابەتەکاندا، وە ئەگەر ئەو کەسەی دەستدرێژییەکەی ئەنجام داوە کۆیلە بوو، ئەوە سزاکەی لەسەر گەورەکەیەتی (ئەو دەبێ لەسەر کۆیلەکە جێبەجێی بکات)، تەنها لەو کاتە نەبێت کە خۆی بیەوێت تەسلیمی دەوڵەتی بکات و دەوڵەت خۆی سزاکەی ئەنجام بدات.

## ١٧- دادوەریکردن دەربارەی لەناوبردنی ئاژەڵ و خواردن و شتی دیکە[2]

**٢١٤٨- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَنِ اسْتَهْلَكَ شَيْئًا مِنَ الْحَيَوَانِ بِغَيْرِ إِذْنِ صَاحِبِهِ: أَنَّ عَلَيْهِ قِيمَتَهُ يَوْمَ اسْتَهْلَكَهُ، لَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يُؤْخَذَ بِمِثْلِهِ مِنَ الْحَيَوَانِ، وَلاَ يَكُونُ لَهُ أَنْ يُعْطِيَ صَاحِبَهُ، فِيمَا اسْتَهْلَكَ شَيْئًا مِنَ الْحَيَوَانِ، وَلَكِنْ عَلَيْهِ قِيمَتُهُ يَوْمَ اسْتَهْلَكَهُ الْقِيمَةُ أَعْدَلُ، ذَلِكَ فِيمَا بَيْنَهُمَا فِي الْحَيَوَانِ وَالْعُرُوضِ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١٠ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٤ في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي اسْتِهْلَاكِ الْحَيَوَانِ وَالطَّعَامِ وَغَيْرِهِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٠ في الوصايا، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی ئاژەڵێك لەناو دەبات بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی (جا بەخواردنی بێت یان بە کوشتن یان فرۆشتن)، ئەوە نرخی ئاژەڵەکەی لەسەرە لەو ڕۆژەی لەناوی بردووە، لەسەری نییە هاوشێوەی هەمان ئاژەڵی لێ وەربگیرێت، بۆشی نییە ئاژەڵ بدات بە خاوەنەکەی، لەوەی کە ئاژەڵی لەناو بردووە، بەڵکوو نرخەکەی لەسەرە لەو ڕۆژەی لەناوی بردووە، نرخەکە هاوسەنگتر و عادیلانەترە، ئەوە لەو شتانە ئاوایە کە بابەتی ئاژەڵ و کەلوپەل بێت لە نێوان دوو کەس (واتە لە نێوان لەناوبەرەکە و خاوەنەکەی).

**٢١٤٩- [فتوى]** قَالَ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: مَنِ اسْتَهْلَكَ شَيْئًا مِنَ الطَّعَامِ بِغَيْرِ إِذْنِ صَاحِبِهِ، فَإِنَّمَا يَرُدُّ عَلَى صَاحِبِهِ مِثْلَ طَعَامِهِ بِمَكِيلَتِهِ مِنْ صِنْفِهِ، وَإِنَّمَا الطَّعَامُ بِمَنْزِلَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، إِنَّمَا يَرُدُّ مِنَ الذَّهَبِ الذَّهَبَ، وَمِنَ الْفِضَّةِ الْفِضَّةَ، وَلَيْسَ الْحَيَوَانُ بِمَنْزِلَةِ الذَّهَبِ فِي ذَلِكَ، فَرَقَ بَيْنَ ذَلِكَ السُّنَّةُ، وَالْعَمَلُ الْمَعْمُولُ بِهِ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: هەر کەسێك خواردنێك بەکار بێنێت و لەناوی ببات بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، ئەوە هەمان خواردن بەپێوانەی خۆی لە جۆری خۆی بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێنێتەوە، (چونکە) خواردن وەك زێڕ و زیو وایە، لە زێڕیش هەر زێڕ دەگەڕێنێتەوە، لە زیویش هەر زیو دەگەڕێنێتەوە، (بەڵام) ئاژەڵ وەك زێڕ نییە لەو بابەتەدا، سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ جیاوازی لەوەدا کردووە، کرداریش لەسەر ئەوەیە.

**٢١٥٠- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: إِذَا اسْتُوْدِعَ الرَّجُلُ مَالاً، فَابْتَاعَ بِهِ لِنَفْسِهِ وَرَبِحَ فِيهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ الرِّبْحَ لَهُ، لأَنَّهُ ضَامِنٌ لِلْمَالِ، حَتَّى يُؤَدِّيَهُ إِلَى صَاحِبِهِ[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەگەر کەسێك ماڵ و سەروەتێکی بەئەمانەت وەرگرت، جا بە ماڵ و سەروەتەکە بۆ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١١ في الوصايا، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٢ في الوصايا، عن مالك به.





خۆی شتی کڕی و قازانجی تیا کرد، ئەوە قازانجەکە بۆخۆیەتی، چونکە ئەو زامنی ماڵەکەیە تا دەیداتەوە خاوەنەکەی.

## ١٨- دادوەریکردن دەربارەی ئەو کەسەی لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە[١]

**٢١٥١- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ غَيَّرَ دِينَهُ، فَاضْرِبُوا عُنُقَهُ[٢].**

وَمَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، مَنْ غَيَّرَ دِينَهُ، فَاضْرِبُوا عُنُقَهُ، أَنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنَ الإِسْلاَمِ إِلَى غَيْرِهِ، مِثْلُ الزَّنَادِقَةِ وَأَشْبَاهِهِمْ، فَإِنَّ أُولَئِكَ، إِذَا ظُهِرَ عَلَيْهِمْ قُتِلُوا، وَلَمْ يُسْتَتَابُوا، لأَنَّهُ لاَ تُعْرَفُ تَوْبَتُهُمْ، وَأَنَّهُمْ كَانُوا يُسِرُّونَ الْكُفْرَ، وَيُعْلِنُونَ الإِسْلاَمَ، فَلاَ أَرَى أَنْ يُسْتَتَابَ هَؤُلاَءِ، وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهُمْ قَوْلُهُمْ، وَأَمَّا مَنْ خَرَجَ مِنَ الإِسْلاَمِ إِلَى غَيْرِهِ، وَأَظْهَرَ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ يُسْتَتَابُ، فَإِنْ تَابَ، وَإِلاَّ قُتِلَ، وَذَلِكَ لَوْ أَنَّ قَوْمًا كَانُوا عَلَى ذَلِكَ، رَأَيْتُ أَنْ يُدْعَوْا إِلَى الإِسْلاَمِ وَيُسْتَتَابُوا، فَإِنْ تَابُوا، قُبِلَ ذَلِكَ مِنْهُمْ، وَإِنْ لَمْ يَتُوبُوا قُتِلُوا، وَلَمْ يَعْنِ بِذَلِكَ، فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، مَنْ خَرَجَ مِنَ الْيَهُودِيَّةِ إِلَى النَّصْرَانِيَّةِ، وَلاَ مِنَ النَّصْرَانِيَّةِ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ، وَلاَ مَنْ يُغَيِّرُ دِينَهُ مِنْ أَهْلِ الأَدْيَانِ كُلِّهَا، إِلاَّ الإِسْلاَمَ، فَمَنْ خَرَجَ مِنَ الإِسْلاَمِ إِلَى غَيْرِهِ، وَأَظْهَرَ ذَلِكَ، فَذَلِكَ الَّذِي عُنِيَ بِهِ، وَاللهُ أَعْلَمُ[٣].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك دینی خۆی گۆڕی، لە گەردنی بدەن.

جا مانای وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ((هەر کەسێك دینی خۆی گۆڕی، لە گەردنی بدەن))، بە بۆچوونی ئێمە ـ والله أعلم ـ ئەوەیە: هەر کەسێك لە دینی ئیسلام دەربچێت بۆ شتێکی دیکە (کە بێدینی بێت)، وەك زەندیقەکان و هاوشێوەکانیان، ئەوانە ئەگەر (هەڵگەڕانەوەکەیان) دەرکەوت دەکوژرێن و داوای تەوبەیان لێ ناکرێت، چونکە ئەوانە تەوبەیان نازانرێت، (چونکە) کوفر لە ناخیان دەشارنەوە و ئیسلامەتی دەردەخەن، پێم وا نییە ئەوانە داوای تەوبەیان لێ بکرێت، وە قسەشیان

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِيمَنِ ارْتَدَّ عَنِ الإِسْلاَمِ.

(٢) ـ صحيح لغيره.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨٧ في الرهون؛ والحدثاني: ٣٠٤ في القضاء، عن مالك به.




قبووڵ نەكرێت (دەربارەی تەوبەكردنیان)، بەڵام ئەوەی لە ئیسلام دەربچێت بۆ ئاینێكی دیكە و دەریبخات، ئەوە داوای تەوبەی لێ دەكرێت، جا ئەگەر تەوبەی كرد (ئەوە باشە)، ئەگەرنا دەكوژرێ، جا ئەگەر قەومێك لەسەر ئەوە بوون، بۆچوونم وایە بانگ بكرێن بۆ ئیسلام و داوای تەوبەیان لێ بكرێت، جا ئەگەر تەوبەیان كرد، لێیان قبووڵ بكرێت، وە ئەگەر تەوبەیان نەكرد بكوژرێن (ئەوە مەبەستی فەرموودەكە بوو)، جا ئێمە پێمان وایە مەبەستی فەرموودەكە ئەوە نییە ـ والله أعلم ـ بەوەی هەر كەسێك لە ئاینی جوولەكە بۆ ئاینی گاور دەربچێت، وە ئەوەش ناگرێتەوە كە لە ئاینی گاورایەتی بۆ ئاینی جولەكە دەردەچێت، وە ئەوەش ناگرێتەوە كە لە هەر دینێك بێت دینی خۆی بگۆڕێت، تەنها دینی ئیسلام نەبێت، هەر كەسێك لە ئیسلام دەربچێت بۆ جگە لە ئیسلام و دەریبخات، ئەوە مەبەستەكەیە، والله أعلم.

**٢١٥٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ قِبَلِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنِ النَّاسِ، فَأَخْبَرَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: هَلْ كَانَ فِيكُمْ مِنْ مُغَرِّبَةِ خَبَرٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، رَجُلٌ كَفَرَ بَعْدَ إِسْلاَمِهِ، قَالَ: فَمَا فَعَلْتُمْ بِهِ؟ قَالَ: قَرَّبْنَاهُ، فَضَرَبْنَا عُنُقَهُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَفَلاَ حَبَسْتُمُوهُ ثَلاَثًا، وَأَطْعَمْتُمُوهُ كُلَّ يَوْمٍ رَغِيفًا، وَاسْتَتَبْتُمُوهُ، لَعَلَّهُ يَتُوبُ، وَيُرَاجِعُ أَمْرَ اللهِ؟ ثُمَّ قَالَ عُمَرُ ﷺ: اللهُمَّ إِنِّي لَمْ أَحْضُرْ، وَلَمْ آمُرْ، وَلَمْ أَرْضَ إِذْ بَلَغَنِي[1].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەبدی قاریئەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك لەلایەن ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ﷺ هات بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ ئەویش پرسیاری حاڵی خەڵكی لێ كرد، ئەویش هەواڵی پێ دا، دواتر عومەر ﷺ پێی گوت: ئایا لەناو ئێوە شتێك ڕووی داوە ببێتە شایەنی ئەوەی لە دوورەوە مرۆڤ بێت و بیكاتە هەواڵ؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، پیاوێك كافر بۆیەوە دوای ئەوەی

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨٦ في الرهون؛ والحدثاني: ٣٠٣ في القضاء؛ والشيباني: ٨٦٩ في العتاق؛ والشافعي: ١٥٠٣، كلهم عن مالك به.




ببوو بە مسولمان، ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: جا چیتان لێ کرد؟ گوتی: هێنامان و لە گەردنمان دا، ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: بۆچی سێ ڕۆژ بەندتان نەکرد، وە هەموو ڕۆژێك سەمونێکتان پێ دابا و داوای تەوبەتان لێ کردبا، بەشکوو تەوبەی بکردایە و بگەڕابایەوە بۆ فەرمانی خوا؟ دواتر گوتی: پەروەردگارا من لەوێ نەبووم و فەرمانم نەکردووە و کاتێ هەواڵەکەشم پێ گەیشتووە ڕازی نەبووم.

## ١٩- بڕیاری شەرعی دەربارەی ئەو کەسەی پیاوێك لەگەڵ خێزانی خۆی دەبینێت[1]

**٢١٥٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ إِنْ وَجَدْتُ مَعَ امْرَأَتِي رَجُلاً، أَأُمْهِلُهُ حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئایا چی دەفەرمووی ئەگەر (فەرەزەن دامانئا) من پیاوێکم لەگەڵ خێزانەکەم بینی (لە کاتی خراپەکاری) ئایا واز لە پیاوەکە بێنم تا چوار شاهێد دێنم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

**٢١٥٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الشَّامِ، يُقَالُ لَهُ: ابْنُ خَيْبَرِيٍّ، وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، فَقَتَلَهُ، أَوْ قَتَلَهَا، فَأَشْكَلَ عَلَى مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ الْقَضَاءُ فِيهِ، فَكَتَبَ إِلَى أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ، يَسْأَلُ لَهُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَسَأَلَ أَبُو مُوسَى ﷺ عَنْ ذَلِكَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، فَقَالَ لَهُ عَلِيٌّ ﷺ: إِنَّ هَذَا الشَّيْءَ مَا هُوَ بِأَرْضِي، عَزَمْتُ عَلَيْكَ لَتُخْبِرَنِّي، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى ﷺ: كَتَبَ إِلَيَّ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ عَلِيٌّ ﷺ: أَنَا أَبُو حَسَنٍ، إِنْ لَمْ يَأْتِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ، فَلْيُعْطَ بِرُمَّتِهِ[3].

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِيمَنْ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ٣٠١ في القضاء؛ والشافعي: ٩٧٥؛ وابن حنبل: ١٠٠٠٨؛ ومسلم: في اللعان: ١٥؛ والقابسي: ٤٤١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨٣ في الرهون؛ والحدثاني: ٣٠١أفي القضاء؛ والشافعي: ١٣٣٧؛ وفي: ١٦٧٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێکی خەڵکی شام کە پێیان دەگوت: ئیبنو خەیبەری، پیاوێکی لەگەڵ خێزانەکەی بینی بوو، جا پیاوەکەی کوشتبوو ـ یان ژنەکەی کوشتبوو ـ جا قەزییەکە ئیشکالی لەسەر موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ دروست کرد (موعاویە نەیزانی چۆن بڕیار بدات)، جا ـ موعاویە ـ نووسراوێکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ نووسی داوای لێ کرد پرسیاری بۆ لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بکات، جا ئەبو موسا ﷺ پرسیاری ئەوەی لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ کرد، جا ئیمامی عەلی ﷺ پێی گوت: ئەوە لە ناوچەی من ڕووی نەداوە (ئەو پرسیارە بۆ دەکەیت؟)، پێداگریت لەسەر دەکەم دەبێ هەواڵم پێ بدەیت، ئەبو موساش ﷺ پێی گوت: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ نووسراوی بۆ کردووم پرسیار لە تۆ بکەم دەربارەی ئەوە، ئیمامی عەلیش ﷺ گوتی: من باوکی حەسەنم، ئەگەر (من حوکم بکەم) ئەو پیاوە چوار شاهێدم بۆ نەهێنێت، ئەوە دەبێ (خاوەن و وەلییەکانی پیاوە کوژراوەکە) پەتی ملی (پیاوە بکوژەکەیان) پێ بدرێت (واتە دەبێ بکوژرێتەوە).

## ٢٠- بڕیاری شەرعی دەربارەی مناڵی فڕێدراو[١]

**٢١٥٥-** عَنْ سُنَيْنٍ أَبِي جَمِيلَةَ، رَجُلٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، أَنَّهُ وَجَدَ مَنْبُوذًا فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: فَجِئْتُ بِهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى أَخْذِ هَذِهِ النَّسَمَةِ؟ فَقَالَ: وَجَدْتُهَا ضَائِعَةً، فَأَخَذْتُهَا، فَقَالَ لَهُ عَرِيفُهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّهُ رَجُلٌ صَالِحٌ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: أَكَذَلِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: اذْهَبْ، فَهُوَ حُرٌّ، وَلَكَ وَلَاؤُهُ، وَعَلَيْنَا نَفَقَتُهُ[٢].

واتە: لە سونەین ئەبو جەمیلەوە کە پیاوێکی نەوەی سولەیمە گێڕدراوەتەوە، (جارێکیان) لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ مناڵێکی دۆزییەوە، دەڵێ: جا هاتم بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: چی وای

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الْمَنْبُوذِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢٠ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١٢أفي القضاء؛ والشافعي: ١١٠٥، كلهم عن مالك به.

لێ کردی ئەو مرۆڤە هەڵگریتەوە؟ ئەویش گوتی: بینیم فڕێدراوە و هەڵمگرتەوە، جا (ڕاوێژکار) و یاریدەدەر (ی ئیمامی عومەر کە شارەزای خەڵك بوو) گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران، ئەوە پیاوێکی چاکە، ئیمامی عومەریش ﷺ پێی گوت: ئاوایە؟ گوتی: بەڵێ، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: بڕۆ، مناڵەکە بە ئازاد حیسابە، وەلائەکەشی بۆ تۆیە، نەفەقە و مەسرەفەکەشی لەسەر ئێمەیە.

**٢١٥٦- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْمَنْبُوذِ، أَنَّهُ حُرٌّ، وَأَنَّ وَلاَءَهُ لِلْمُسْلِمِينَ هُمْ يَرِثُونَهُ وَيَعْقِلُونَ عَنْهُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی مناڵی فڕێدراو (حوکمەکە ئاوایە): بە ئازاد حیسابە، وەلائەکەشی بۆ مسوڵمانانە، میراتی لێ دەگرن و خوێنبایی لەبری ئەو دەدەن (کاتێ بەهەڵە تاوان و کەتنێکی ئەنجام دا).

## ٢١- بڕیاری شەرعی بە لکاندنی مناڵ بە باوکیەوە[2]

**٢١٥٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ عُتْبَةُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ عَهِدَ إِلَى أَخِيهِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ مِنِّي، فَاقْبِضْهُ إِلَيْكَ، قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ عَامُ الْفَتْحِ، أَخَذَهُ سَعْدٌ، وَقَالَ: ابْنُ أَخِي، قَدْ كَانَ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ، فَقَامَ إِلَيْهِ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ، فَقَالَ: أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ، فَتَسَاوَقَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ. فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، ابْنُ أَخِي، قَدْ كَانَ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ، وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: أَخِي، وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، ثُمَّ قَالَ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ: احْتَجِبِي مِنْهُ، لِمَا رَأَى مِنْ شَبَهِهِ بِعُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، قَالَتْ: فَمَا رَآهَا حَتَّى لَقِيَ اللهَ ﷻ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢١ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١٢ب في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ بِإِلْحَاقِ الْوَلَدِ بِأَبِيهِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧٩ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٣ في القضاء؛ والشيباني: ٨٤٥ في العتاق؛ وابن حنبل: ٢٦١٣٥؛ والبخاري: ٢٠٥٣ في البيوع، وفي: ٢٧٤٥ في الوصايا، وفي: ٤٣٠٣ في المغازي، وفي:

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص بەڵێنی لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی برای وەرگرت بەوەی منالْی (ناو سکی) زەمعە هی منە (کاتێ لەدایك بوو بیهێنە بۆ لای خۆت بیکە بە برازای خۆت، چونکە زەمعە کۆیلە بوو و کوڕێکی هەبوو بەناوی عەبد، وە عوتبەی برای سەعد لەگەڵی جووت ببوو، جا پێی وا بوو منالەکە کوڕی خۆی حیسابە و دوای مردنی خۆی دەبێ بە ناوی ئەو بانگ بکرێت)، جا بیهێنە بۆ لای خۆت، دەڵێ: جا لە کاتی ئازادکردنی مەککە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﵁ منالە تازەلەدایکبووەکەی زەمعەی برد، گوتی: کوڕی برامە، پەیمانی لێ وەرگرتووم دەربارەی، جا عەبدی کوڕی زەمعە بۆی هەڵسا و گوتی: برامە و کوڕی جارییەی باوکمە، لەسەر پێخەفی ئەو لەدایك بووە (واتە بە شەرع بێت باوکم هاوسەریەتی)، جا یەکدییان ڕاکێشا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سەعد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو منالە کوڕی برامە، پەیمانی لێ وەرگرتووم دەربارەی، عەبدی کوڕی زەمعەش گوتی: برامە، کوڕی جارییەی باوکمە، لەسەر پێخەفی ئەو لەدایك بووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بۆ تۆیە ئەی عەبدی کوڕی زەمعە (واتە برای تۆیە نەك کوڕی عوتبە)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منالْ هی سەر پێخەفە (واتە هی خاوەنی عەقدی شەرعییە)، داوێنپیسیش بەردی بۆ هەیە (واتە هیچی بۆ نییە، ڕەجمی بۆ هەیە ئەگەر خێزاندار بێ)، دواتر بە سەودەی کچی زەمعەی فەرموو: خۆتی لێ داپۆشە، کاتێ بینی منالەکە لە عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص دەچوو، دەڵێ: جا ئەو منالە تا گەیشت بە خوا ﷻ و وەفاتی کرد سەودەی نەبینی (وەك نامەحرەم مامەڵەی لەگەڵ دەکرد).

**٢١٥٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ ﵁، أَنَّ امْرَأَةً هَلَكَ عَنْهَا زَوْجُهَا، فَاعْتَدَّتْ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، ثُمَّ تَزَوَّجَتْ حِينَ حَلَّتْ، فَمَكَثَتْ عِنْدَ زَوْجِهَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَنِصْفَ شَهْرٍ، ثُمَّ وَلَدَتْ وَلَدًا تَامًّا، فَجَاءَ زَوْجُهَا إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَدَعَا عُمَرُ ﵁ نِسْوَةً مِنْ نِسَاءِ الْجَاهِلِيَّةِ قُدَمَاءَ، فَسَأَلَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: أَنَا أُخْبِرُكَ عَنْ هَذِهِ الْمَرْأَةِ، هَلَكَ عَنْهَا

---

٦٧٤٩ في الفرائض، وفي: ٧١٨٢ في الأحكام؛ وابن حبان: ٤١٠٥؛ وشرح معاني الآثار: ٤٦٧٢؛ والقابسي: ٤١، كلهم عن مالك به.




زَوْجُهَا حِينَ حَمَلَتْ مِنْهُ، فَأُهَرِيقَتْ عَلَيْهِ الدِّمَاءُ، فَحَشَّ وَلَدُهَا فِي بَطْنِهَا، فَلَمَّا أَصَابَهَا زَوْجُهَا الَّذِي نَكَحَهَا، وَأَصَابَ الْوَلَدَ الْمَاءُ، تَحَرَّكَ الْوَلَدُ فِي بَطْنِهَا، وَكَبِرَ، فَصَدَّقَهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا، وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَبْلُغْنِي عَنْكُمَا إِلاَّ خَيْرٌ، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالأَوَّلِ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئافرەتێك مێردەکەی مرد و چوار مانگ و دە ڕۆژ عیدەی بینی، دواتر شووی کردەوە کاتێ حەڵاڵ بۆیەوە، جا چوار مانگ و نیو لەلای مێردی مایەوە، دواتر منداڵێکی تەواوی بوو، جا مێردەکەی هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، ئیمامی عومەریش ﷺ چەند ئافرەتێکی بەتەمەنی سەردەمی نەفامی بانگ کرد (کە شارەزاییان هەبوو)، جا پرسیاری لێ کردن دەربارەی ئەو حاڵەتە، ئافرەتێك لەوان گوتی: من هەواڵت پێ دەدەم دەربارەی ئەو ئافرەتە، پیاوەکەی مردووە کاتێ لێی دووگیان بووە، جا منداڵەکە خوێنی ڕژاوەتە سەر و لە ناو ڕەحمیدا پووچ و بێهێز و وشك بووە، جا کاتێ مێردی دووەمی جیماعی لەگەڵ کردووە و ئاو بەر منداڵەکە کەوتووە، منداڵەکە گەشەی جوڵاوە لە سکیدا و گەورە بووە، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پێی باوەڕ کرد و لێکی جیا کردنەوە (چونکە دەکا لە عیدەدا مێردی کردۆتەوە و هێشتا پاشماوەی پیاوی یەکەم لانەچووە)، وە ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: لە چاکە زیاترم پێ نەگەیشتووە دەربارەی ئێوە (واتە بابەتی زینا لەئارادا نییە)، وە نەسەبی منداڵەکەی لکاند بە پیاوی یەکەم.

**٢١٥٩**- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يُلِيطُ أَوْلاَدَ الْجَاهِلِيَّةِ بِمَنِ ادَّعَاهُمْ فِي الإِسْلاَمِ، فَأَتَى رَجُلاَنِ كِلاَهُمَا يَدَّعِي وَلَدَ امْرَأَةٍ، فَدَعَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ قَائِفًا، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا، فَقَالَ الْقَائِفُ: لَقَدِ اشْتَرَكَا فِيهِ، فَضَرَبَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ بِالدِّرَّةِ، ثُمَّ دَعَا الْمَرْأَةَ، فَقَالَ: أَخْبِرِينِي خَبَرَكِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ هَذَا لأَحَدِ الرَّجُلَيْنِ يَأْتِينِي، وَهِيَ فِي إِبِلٍ لأَهْلِهَا، فَلاَ يُفَارِقُهَا حَتَّى يَظُنَّ وَتَظُنَّ أَنَّهُ قَدِ اسْتَمَرَّ بِهَا حَبَلٌ، ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهَا، فَأُهَرِيقَتْ عَلَيْهِ دِمَاءٌ، ثُمَّ خَلَفَ عَلَيْهَا هَذَا، تَعْنِي الآخَرَ، فَلاَ أَدْرِي مِنْ أَيِّهِمَا هُوَ؟ قَالَ: فَكَبَّرَ الْقَائِفُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ لِلْغُلاَمِ: وَالِ أَيَّهُمَا شِئْتَ[2].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨٨ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٥ في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨٩ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٧ في القضاء، عن مالك به.




واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نەسەبی منالانی سەردەمی نەفامی دەلکاند بەو کەسەی داوای بکردبا لە سەردەمی ئیسلامەتیدا، جا (جارێکیان) دوو پیاو هاتن هەردووکیان داوای منالی ئافرەتێکیان دەکرد (دەیانگوت هی منە)، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بانگی ڕەگەزناسێکی کرد، سەیری هەردووکیانی کرد، ڕەگەزناسەکە گوتی: هەردووکیان پشکیان تێدایە، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ بە گۆچانەکەی لێی دا (چونکە پێی وا بوو دوو ئاو بەیەکەوە لە یەك منالدا کۆ نابنەوە)، دواتر ئافرەتەکەی بانگ کرد و گوتی: هەوالی سەرگوزشتەی خۆتم بدەرێ؟ ئەویش ئاماژەی بۆ یەکێك لە دوو پیاوەکە کرد و گوتی: ئەوەیان لەگەلم جووت بوو لە کاتێکدا من لەناو وشترەکانی ئەوان بووم، جا لێم جیا نەبۆیەوە تاوەکوو ئەو و منیش گومانی زۆرمان برد حەمل پەیدا بووە، دواتر ڕۆیشت، خوێنی حەیزیش کەوتە سەر حەملەکە، دواتر دوای ئەو ئەوە هات، واتە پیاوەکەی دیکە، جا نازانم منالەکە لە کامیانە؟ دەلێ: جا ڕەگەزناسەکە تەکبیری کرد (گوتی: الله أکبر، لە خۆشی ئەوەی زانست و قسەکەی ڕاست دەرچوو)، جا ئیمامی عومەر ﷺ بە منالە هەرزەکارەکەی گوت: وەلائت بدە هەر کامێکیان کە حەز دەکەیت.

**٢١٦٠-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، أَوْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ قَضَى أَحَدُهُمَا فِي امْرَأَةٍ غَرَّتْ رَجُلاً بِنَفْسِهَا، وَذَكَرَتْ أَنَّهَا حُرَّةٌ فَتَزَوَّجَهَا، فَوَلَدَتْ لَهُ أَوْلَادًا، فَقَضَى أَنْ يَفْدِيَ وَلَدَهُ بِمِثْلِهِمْ[١].

قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: وَالْقِيمَةُ أَعْدَلُ فِي هَذَا، إِنْ شَاءَ اللهُ.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب یان عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ یەکێکیان دادوەری کرد دەربارەی ئافرەتێك کە پیاوێکی بۆخۆی خەلەتاند و بۆی باس کرد بەوەی ئافرەتێکی ئازادە، پیاوەکەش هاوسەرگیری لەگەل کرد و چەند منالێکی لێ بوو، جا (ئیمامی عومەر یان ئیمامی عوسمان ﷺ) بڕیاری دا بەوەی کۆیلەی هاوشێوەی منالەکانی ئازاد بکات.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٨ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١١أفي القضاء، عن مالك به.

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: قیمەت چاكترە لەوە (واتە نرخی كۆیلەی وەك منداڵەكانی بكاتە خێر چاكترە لە ئازادكردنی كۆیلەی هاوشێوەی منداڵەكانی)، ئەگەر خوا پێی خۆش بێ.

## ٢٢- بڕیاری شەرعی دەربارەی میراتی منداڵی نەسەبلكێندراو[1]

**٢١٦١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، فِي الرَّجُلِ يَهْلِكُ وَلَهُ بَنُونَ، فَيَقُولُ أَحَدُهُمْ: قَدْ أَقَرَّ أَبِي أَنَّ فُلاَنًا ابْنُهُ: إِنَّ ذَلِكَ النَّسَبَ لاَ يَثْبُتُ بِشَهَادَةِ إِنْسَانٍ وَاحِدٍ، وَلاَ يَجُوزُ إِقْرَارُ الَّذِي أَقَرَّ، إِلاَّ عَلَى نَفْسِهِ فِي حِصَّتِهِ مِنْ مَالِ أَبِيهِ، يُعْطَى الَّذِي شَهِدَ لَهُ قَدْرَ مَا يُصِيبُهُ مِنَ الْمَالِ الَّذِي بِيَدِهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنْ يَهْلِكَ الرَّجُلُ، وَيَتْرُكَ ابْنَيْنِ لَهُ، وَيَتْرُكَ سِتَّمِئَةِ دِينَارٍ، فَيَأْخُذُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا ثَلاَثَمِئَةِ دِينَارٍ، ثُمَّ يَشْهَدُ أَحَدُهُمَا، أَنَّ أَبَاهُ الْهَالِكَ أَقَرَّ أَنَّ فُلاَنًا ابْنُهُ، فَيَكُونُ عَلَى الَّذِي شَهِدَ لِلَّذِي اسْتُلْحِقَ، مِئَةُ دِينَارٍ، وَذَلِكَ نِصْفُ مِيرَاثِ الْمُسْتَلْحَقِ، لَوْ لَحِقَ، وَلَوْ أَقَرَّ لَهُ الآخَرُ، أَخَذَ الْمِئَةَ الأُخْرَى، فَاسْتَكْمَلَ حَقَّهُ وَثَبَتَ نَسَبُهُ، وَهُوَ أَيْضًا بِمَنْزِلَةِ الْمَرْأَةِ تُقِرُّ بِالدَّيْنِ عَلَى أَبِيهَا أَوْ عَلَى زَوْجِهَا، وَيُنْكِرُ ذَلِكَ الْوَرَثَةُ، فَعَلَيْهَا أَنْ تَدْفَعَ إِلَى الَّذِي أَقَرَّتْ لَهُ بِالدَّيْنِ، قَدْرَ الَّذِي يُصِيبُهَا مِنْ ذَلِكَ الدَّيْنِ، لَوْ ثَبَتَ عَلَى الْوَرَثَةِ كُلِّهِمْ، إِنْ كَانَتِ امْرَأَةً وَرِثَتِ الثُّمُنَ، دَفَعَتْ إِلَى الْغَرِيمِ ثُمُنَ دَيْنِهِ، وَإِنْ كَانَتِ ابْنَةً وَرِثَتِ النِّصْفَ، دَفَعَتْ إِلَى الْغَرِيمِ نِصْفَ دَيْنِهِ، عَلَى حِسَابِ هَذَا يَدْفَعُ إِلَيْهِ مَنْ أَقَرَّ لَهُ مِنَ النِّسَاءِ[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە دەربارەی ئەو پیاوەی دەمرێت و چەند كوڕێكی هەیە، یەكێك لە كوڕەكان دەڵێت: باوكم ئیقراری كردووە فڵانە كەس كوڕی ئەوە، ئەوە نەسەب بە شاهێدی یەك كەس ناچەسپێ و ئیقراری ئەو كەسە جێبەجێ ناكرێ كە ئیقرار دەكات، تەنها لەسەر خۆی جێبەجێ دەبێت لە پشكەمیراتی خۆی

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي مِيرَاثِ الْوَلَدِ الْمُسْتَلْحَقِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩١ في الأقضية، عن مالك به.

لە سەروەتی باوكی، ئەو كەسەی شاهێدی بۆ دراوە ئەو ئەندازەیەی دەدرێتێ كە بەریدەكەوێت لەو سەروەتەی لەبەر دەستی ئەو كەسەیە كە ئیقڕاری بۆ كردووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونكردنەوەی ئەوە بەو شێوەیەیە: پیاوێك بمرێت و دوو كوڕ لەدوای خۆی جێ بهێڵێت، وە شەش سەت دینار لەدوای خۆی (بە میرات) جێ بهێڵێت، هەر یەك لە كوڕەكان سێسەت دینار بە میرات وەربگرن، دواتر یەكێكیان شاهێدی بدات بەوەی باوكی ئیقڕاری كردووە فڵانە كەسیش كوڕی ئەوە، ئەوە سەت دینار لەسەر ئەو كەسە واجبە كە شاهێدی داوە بیدات بەو كەسەی شاهێدی بۆ دراوە، ئەوەش بریتییە لە نیوەی میراتی كەسە نەسەبلكێندراوەكە، ئەگەر (بە حەقیقەت) بلكێندرێت، وە ئەگەر كوڕەكەی دیكەش ئیقڕاری بۆ كرد، سەتەكەی دیكەش وەردەگرێت، ئەو كات حەقی خۆی تەواو دەكات و نەسەبەكەی جێگیر دەبێت، ئەوە وەك ئەو ئافرەتە وایە ئیقڕار بە قەرزێك دەكات لەسەر باوكی یان لەسەر مێردی، میراتگرانیش ئینكاری بكەن، ئەوە ئافرەتەكە لەسەریەتی بە ئەندازەی پشكی خۆی (لە میرات) لە قەرزەكە بدات بەو كەسەی ئیقڕاری بۆ بە قەرز كردووە، (ئەگەر وا حیساب بكرێ ئیقڕارەكە لەسەر گشت میراتگران جێگیر بووە)، (بۆ نموونە) ئەگەر ئافرەتێك بوو هەشت لەسەر یەك میراتی برد، ئەوە دەبێ هەشت لەسەر یەكی قەرزەكە بدات بە خاوەنی قەرزەكە، وە ئەگەر كچی مردووەكە بوو و نیوەی میراتی برد، ئەوە دەبێ نیوەی قەرزەكە بداتەوە خاوەنی قەرزەكە، لەسەر ئەو حیسابە پێی دەدرێت ئەو كەسەی ئافرەتێك ئیقڕاری بۆ بكات.

**٢١٦٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ شَهِدَ رَجُلٌ عَلَى مِثْلِ مَا شَهِدَتْ بِهِ الْمَرْأَةُ، أَنَّ لِفُلَانٍ عَلَى أَبِيهِ دَيْنًا، أُحْلِفَ صَاحِبُ الدَّيْنِ مَعَ شَهَادَةِ شَاهِدِهِ، وَأُعْطِيَ الْغَرِيمُ حَقَّهُ كُلَّهُ، وَلَيْسَ هَذَا بِمَنْزِلَةِ الْمَرْأَةِ، لأَنَّ الرَّجُلَ تَجُوزُ شَهَادَتُهُ، وَيَكُونُ عَلَى صَاحِبِ الدَّيْنِ مَعَ شَهَادَةِ شَاهِدِهِ، أَنْ يَحْلِفَ وَيَأْخُذَ حَقَّهُ كُلَّهُ، فَإِنْ لَمْ يَحْلِفْ أَخَذَ مِنْ مِيرَاثِ الَّذِي أَقَرَّ لَهُ، قَدْرَ مَا يُصِيبُهُ مِنْ ذَلِكَ الدَّيْنِ، لأَنَّهُ أَقَرَّ بِحَقِّهِ، وَأَنْكَرَ الْوَرَثَةُ، وَجَازَ عَلَيْهِ إِقْرَارُهُ[1].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٢ في الأقضية، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: وە ئەگەر پیاوێك وەك ئافرەت (كە پێشتر باس كرا) شاهێدی دا بەوەی فلانە كەس قەرزێكی لەسەر باوكی هەیە، ئەوە خاوەنی قەرزەكە سوێند دەدرێت لەگەڵ وەرگرتنی شاهێدی شاهێدەكەی و خاوەنی قەرزەكە حەقی خۆی بەتەواوی وەردەگرێ، ئەوە وەك ئافرەت نییە، چونكە شاهێدی پیاو جێبەجێ دەكرێت و لەسەر خاوەنی قەرزەكەش پێویستە لەگەڵ شاهێدی شاهێدەكەی سوێند بخوات و حەقی خۆی بەتەواوی وەربگرێت، جا ئەگەر سوێندی نەخوارد ئەوە بەئەندازەی پشكی میراتی كەسەكە (كە دانی بۆ داناوە) لە قەرزەكە وەردەگرێ، چونكە ئەو ئیقراری بە حەقی خاوەن قەرزەكە كردووە و میراتگرەكانی دیكەش ئینكاری دەكەن، جا ئەویان ئیقراری خۆی بەسەر جێبەجێ دەكرێت.

## ٢٣- بڕیاری شەرعی دەربارەی جارییەی مناڵبوو لە گەورەكەی[1]

**٢١٦٣-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷻ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَطَؤُونَ وَلاَئِدَهُمْ، ثُمَّ يَعْزِلُونَهُنَّ، لاَ تَأْتِينِي وَلِيدَةٌ يَعْتَرِفُ سَيِّدُهَا أَنْ قَدْ أَلَمَّ بِهَا، إِلاَّ أَلْحَقْتُ بِهِ وَلَدَهَا، فَاعْزِلُوا بَعْدُ، أَوِ اتْرُكُوا[2].

واتە: لە سالمی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷻ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چییە پیاوانێك جیماع لەگەڵ جارییەكانیان دەكەن، دواتر مەنعی مناڵ دەكەن (تا مناڵیان نەبێت و مناڵەكە نەدرێتە پاڵیان و ئافرەتەكە نەبێتە ئازاد)؟! (نەخێر شتی وا نابێت) هیچ جارییەیەك نییە ئیعتیراف بكات بەوەی گەورەكەی جیماعی لەگەڵ كردووە، حەتمەن نەسەبی مناڵی ئافرەتەكە دەلكێنم بە گەورەكەی، جا بۆ

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي أُمَّهَاتِ الأَوْلاَدِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه الحدثاني: ٢٧٤ في القضاء؛ والشيباني: ٥٥١ في النكاح؛ والشافعي: ١٠٩٧، كلهم عن مالك به.





خۆتان دوای ئەوە مەنع بکەن یان وازی لێ بێنن (جیاوازی نییە، حوکمەکە ئاوا جێبەجێ دەکەم و ئەو فێڵانە سوودتان پێ ناگەیەنێ).

**٢١٦٤-** عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَطَؤُونَ وَلاَئِدَهُمْ، ثُمَّ يَدَعُونَهُنَّ يَخرُجْنَ، لاَ تَأْتِينِي وَلِيدَةٌ يَعْتَرِفُ سَيِّدُهَا، أَنْ قَدْ أَلَمَّ بِهَا، إِلاَّ قَدْ أَلْحَقْتُ بِهِ وَلَدَهَا، فَأَرْسِلُوهُنَّ بَعْدُ، أَوْ أَمْسِكُوهُنَّ[1].

واتە: لە صەفیەی کچی ئەبو عوبەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە بەوەی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چییە پیاوانێك جیماع لەگەڵ جارییەکانیان دەکەن، دواتر وازیان لێ دێنن بچنە دەرەوە (جا مناڵیان ببێت دەیخەنە ئەستۆی خەڵکی دیکە چونکە چوونەتە دەرەوە)؟! (نەخێر شتی وا نابێت) هیچ جارییەیەك نییە ئیعتیڕاف بکات بەوەی گەورەکەی جیماعی لەگەڵ کردووە، حەتمەن نەسەبی مناڵی ئافرەتەکە دەلکێنم بە گەورەکەی، جا بۆ خۆتان دوای ئەو قسەی من ڕەوانیان بکەن یان بیانگرنەوە لە چوونەدەر (جیاوازی نییە، حوکمەکە ئاوا جێبەجێ دەکەم و ئەو فێڵانە سوودتان پێ ناگەیەنێ).

**٢١٦٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي أُمِّ الْوَلَدِ إِذَا جَنَتْ جِنَايَةً، ضَمِنَ سَيِّدُهَا مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ قِيمَتِهَا، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُسَلِّمَهَا، وَلَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يَحْمِلَ مِنْ جِنَايَتِهَا أَكْثَرَ مِنْ قِيمَتِهَا[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی جارییەی مناڵبوو لە گەورەکەی ئەگەر جینایەتێکی ئەنجام دا، ئەوە گەورەکەی زامنە لە نێوان نرخی جینایەتەکە و نرخی ئافرەتەکە، وە بۆی نییە ئافرەتەکە تەسلیم بکات (بەو کەسەی جینایەتەکەی بەرانبەر ئەنجام دراوە)، وە لەسەریشی نییە لە جینایەتی ئافرەتەکەدا زیاتر لە نرخی ئافرەتەکە لەئەستۆ بگرێت و بیدات.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨١ في الأقضية؛ والشيباني: ٥٥٢ في النكاح، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨٣ في الأقضية، عن مالك به.




## ٢٤- بڕیاری شەرعی دەربارەی ئاوەدانکردنەوەی زەوی مردوو[1]

**٢١٦٦**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيِّتَةً فَهِيَ لَهُ، وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ[2].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْعِرْقُ الظَّالِمُ: كُلُّ مَا احْتُفِرَ أَوْ أُخِذَ أَوْ غُرِسَ بِغَيْرِ حَقٍّ[3].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوروەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر زەوییەکی مردوو (بێخاوەن) زیندوو بکاتەوە ئەوە بۆ خۆیەتی، دەماری ستەمکار (لە زەویوزاردا) هیچ مافێکی نییە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دەماری ستەمکار بریتییە لەوەی: هەر حەفرێك لێ بدرێت یان زەوییەك وەربگیرێت یان دابچێنرێت بەناحەق.

**٢١٦٧**- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيِّتَةً فَهِيَ لَهُ[4].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك زەوییەکی مردووی بێخزمەت زیندوو بکاتەوە (و دایبچێنێت) ئەوە بۆ خۆیەتی.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە.

---

(١) ـ الْقَضَاءِ فِي عِمَارَةِ الْمَوَاتِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٣ في الأقضية؛ والشيباني: ٨٣٣ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ١٠٩٩؛ وفي: ١٧٥٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه الحدثاني: ٢٧٨ في القضاء، عن مالك به.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٤ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٨أفي القضاء؛ والشافعي: ١١٠٠، كلهم عن مالك به.




## ٢٥- بڕیاری شەرعی دەربارەی ئاو[١]

**٢١٦٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: فِي سَيْلِ مَهْزُورٍ، وَمُذَيْنِبٍ يُمْسَكُ حَتَّى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُرْسِلُ الأَعْلَى عَلَى الأَسْفَلِ[٢].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئاوی مەهزور و موزەینیب (کە دوو ئاو بوون بەهۆی باران پەیدا دەبوون) فەرموویەتی: دەگیردرێتەوە تا گۆزینگ (واتە ئەو کەسانەی لە سەرەوەی ئاوەکەن بۆیان هەیە تا گۆزینگ ئاوەکە بۆ خۆیان گل بدەنەوە)، دواتر با ئەوەی سەرەوە بەریبداتەوە بۆ ئەوەی خوارەوە.

**٢١٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ الْكَلأُ[٣].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاوی زیاد نابێ لە خەڵکی قەدەغە بکرێ تا وای لێ دێ دواتر لەوەڕیش قەدەغە دەکرێت.

**٢١٧٠- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵂، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يُمْنَعُ نَقْعُ بِئْرٍ[٤].**

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاوی زیادەی بیر نابێ (لە خەڵکی) قەدەغە بکرێ.

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الْمِيَاهِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٩ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٠ في القضاء؛ والشيباني: ٨٣٥ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٠ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٠أفي القضاء؛ والشافعي: ١٧٥٨؛ والبخاري: ٢٣٥٣ في المساقاة، وفي: ٦٩٦٢ في الحيل؛ ومسلم: المساقاة: ٣٦؛ وابن حبان: ٤٩٥٤؛ والقابسي: ٣٥٥، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠١ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٠ب في القضاء؛ والشيباني: ٨٣٨ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

## ٢٦- بڕیاری شەرعی دەربارەی شت و مافی هاوبەش[١]

**٢١٧١-** عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ[٢].

واتە: لە عەمری کوڕی یەحیای مازینییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لە ئیسلامدا) نە زەرەرلێدان هەیە (بەبێ پەرچەکردار)، نە زەرەرلێدانیش هەیە (بە پەرچەکردار و تۆڵەکردنەوە).

**٢١٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَمْنَعُ أَحَدُكُمْ جَارَهُ خَشَبَةً يَغْرِزُهَا فِي جِدَارِهِ، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ؟ وَاللَّهِ لأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با کەس لە ئێوە دراوسێکەی قەدەغە نەکات لەوەی دارێك بچەقێنێت لە دیوارەکەیدا، دواتر ئەبو هورەیرە ﵁ دەیگوت: ئەوە چییە دەتانبینم پشت لە قسەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن؟ سوێند بە خوا ﷻ دەبێ ئەو قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەناوتاندا بدەم (دەبێ هەر بۆتان دووبارە بکەمەوە و گوێبیستتان بکەم).

**٢١٧٣-** عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ ﵀، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ الضَّحَّاكَ بْنَ خَلِيفَةَ، سَاقَ خَلِيجًا لَهُ مِنَ الْعُرَيْضِ، فَأَرَادَ أَنْ يَمُرَّ بِهِ فِي أَرْضِ مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ ﵁، فَأَبَى مُحَمَّدٌ، فَقَالَ لَهُ الضَّحَّاكُ: لِمَ تَمْنَعُنِي وَهُوَ لَكَ مَنْفَعَةٌ تَشْرَبُ بِهِ أَوَّلاً وَآخِرًا، وَلاَ يَضُرُّكَ، فَأَبَى مُحَمَّدٌ، فَكَلَّمَ فِيهِ الضَّحَّاكُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁، فَدَعَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ ﵁، فَأَمَرَهُ أَنْ يُخَلِّيَ سَبِيلَهُ، فَقَالَ مُحَمَّدٌ ﵁: لاَ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: لِمَ تَمْنَعُ أَخَاكَ مَا يَنْفَعُهُ، وَهُوَ لَكَ نَافِعٌ، تَسْقِي

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الْمِرْفَقِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٥ في الأقضية، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٦ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٩أفي القضاء؛ والشيباني: ٨٠٤ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ١١٠٢؛ وابن حنبل: ٩٩٦٢؛ والبخاري: ٢٤٦٣ في المظالم؛ ومسلم: المساقاة: ١٣٦؛ والقابسي: ٨٢، كلهم عن مالك به.

بِهِ أَوَّلاً وَآخِرًا، وَهُوَ لاَ يَضُرُّكَ، فَقَالَ مُحَمَّدٌ ﷺ: لاَ وَاللَّهِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَاللَّهِ لَيَمُرَّنَّ بِهِ، وَلَوْ عَلَى بَطْنِكَ، فَأَمَرَهُ عُمَرُ أَنْ يَمُرَّ بِهِ، فَفَعَلَ الضَّحَّاكُ[١].

واتە: لە عەمری کوڕی یەحیای مازینییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): زەححاکی کوڕی خەلیفە ڕوبارێکی بچووکی خۆی لە عورەیزەوە هێنا (کە دۆڵێکە لە مەدینە)، جا ویستی بە ناو زەوی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەدا ﷺ بیهێنێ، موحەممەدیش ﷺ ڕازی نەبوو، زەححاکیش پێی گوت: بۆ ڕێگریم لێ دەکەی لە کاتێکدا سوودی بۆ تۆش هەیە و لە هەموو کەس لەپێشتر دەبی لە خواردنەوە لێی و زیانیشت پێ ناگەیەنێ، جا موحەممەد ﷺ هەر ڕازی نەبوو، بۆیە زەححاك دەربارەی ئەو بابەتە قسەی لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کرد، عومەریش ﷺ موحەممەدی کوڕی سەلەمەی بانگ کرد و فەرمانی پێ کرد ڕێگەی بدات، موحەممەدیش ﷺ گوتی: نەخێر، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بۆچی ڕێگە لە براکەت دەگری بۆ شتێك کە سوودی پێ دەگەیەنێ و بۆ تۆش بەسوودە؟! لە هەموو کەس زیاتر ئاودانی پێ دەکەیت و زیانت پێ ناگەیەنێ، موحەممەد ﷺ گوتی: نەخێر سوێند بە خوا، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: سوێند بە خوا دەبێ پێی دا ببات ئەگەر لەسەر ورگیشت بێت (چۆن دەبێ حەق جێبەجێ نەکەیت)، جا ئیمامی عومەر ﷺ فەرمانی کرد پێی دا تێپەڕ بکات، زەحححاکیش ﷺ ئەنجامی دا.

**٢١٧٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ فِي حَائِطِ جَدِّهِ رَبِيعٌ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، فَأَرَادَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ أَنْ يُحَوِّلَهُ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ الْحَائِطِ، هِيَ أَقْرَبُ إِلَى أَرْضِهِ، فَمَنَعَهُ صَاحِبُ الْحَائِطِ، فَكَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ فِي ذَلِكَ، فَقَضَى لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ بِتَحْوِيلِهِ[٢].

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٧ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٩ب في القضاء؛ والشيباني: ٨٣٦ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ١١٠٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩٨ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٧٩ج في القضاء؛ والشيباني: ٨٣٧ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەمری کوڕی یەحیای مازینییەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە یەحیای باوکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: ڕووبارێکی بچووك لەناو بێستانی باپیرم هەبوو هی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ بوو، جا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ ویستی بیگوازێتەوە بۆ لایەکی دیکەی بێستانەکە، نزیکتر بوو لە زەوییەکەی، خاوەنی بێستانەکەش (کە باپیرمە) ڕێگری لێ کرد، جا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەربارەی ئەوە قسەی لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کرد، ئیمامی عومەریش ﷺ بڕیاری شەرعی بۆ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دا بە گواستنەوەی (چونکە نابێ دراوسێ ڕێگری قازانجی یەکدی بن و زەرەر لە یەکدی بدەن).

## ٢٧- بڕیاری شەرعی دەربارەی دابەشکردنی سەروەت[١]

**٢١٧٥-** عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا دَارٍ أَوْ أَرْضٍ قُسِمَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَهِيَ عَلَى قَسْمِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَأَيُّمَا دَارٍ أَوْ أَرْضٍ أَدْرَكَهَا الإِسْلاَمُ وَلَمْ تُقْسَمْ، فَهِيَ عَلَى قَسْمِ الإِسْلاَمِ[٢].

واتە: لە سەوری کوڕی زەیدی دەیلییەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر خانووێك یان زەوییێك لە سەردەمی جاهیلی دابەش کرابێ، ئەوە لەسەر دابەشکردنی سەردەمی جاهیلی دەمێنێتەوە، وە هەر خانووێك یان زەوییەك کەوتبێتە ناو سەردەمی ئیسلامەتی و دابەش نەکرابێ، ئەوە بەپێی دابەشکردنی ئیسلام دابەش دەکرێ.

**٢١٧٦- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِيمَنْ هَلَكَ، وَتَرَكَ أَمْوَالاً بِالْعَالِيَةِ، وَالسَّافِلَةِ: إِنَّ الْبَعْلَ لاَ يُقْسَمُ مَعَ النَّضْحِ، إِلاَّ أَنْ يَرْضَى أَهْلُهُ بِذَلِكَ، وَإِنَّ الْبَعْلَ يُقْسَمُ مَعَ الْعَيْنِ إِذَا كَانَ يُشْبِهُهَا، وَأَنَّ الأَمْوَالَ إِذَا كَانَتْ بِأَرْضٍ وَاحِدَةٍ، الَّذِي بَيْنَهُمَا مُتَقَارِبٌ، فَإِنَّهُ يُقَامُ كُلُّ مَالٍ مِنْهَا ثُمَّ يُقْسَمُ بَيْنَهُمْ، وَالْمَسَاكِنُ وَالدوور بِهَذِهِ الْمَنْزِلَةِ[٣].

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي قَسْمِ الأَمْوَالِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٢ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨١ في القضاء، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٣ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨١أفي القضاء، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو كەسەی دەمرێت و چەندین موڵك لە عالیە و سافیلە (كە دوو شوێنن لە مەدینە) جێ دەهێڵێت، گوتوویەتی: زەوی دێمی دابەش ناكرێت لەبەرانبەر زەوییەك كە بە مەسرەف و ئامراز ئاوی بۆ دەهێندرێت (واتە هاوتای یەكدی حیساب ناكرێن بۆ دابەشكردن)، تەنها (لەو كاتە دروستە) كە خاوەنەكەی ڕازی بێت (واتە ئەوەی بۆی دەربچێت لاری نەبێت)، (بەڵكوو) زەوی دێمی لەگەڵ زەوی بە كانی دابەش دەكرێت ئەگەر وەكوو یەكدی بوون (لە ڕووی بێمەسرەفی)، وە ئەگەر چەندین موڵك لەناو یەك زەوی بوون و موڵكەكان (چاكی و باشییان) لێك نزیك بوو، ئەوە هەر موڵكێك حیساب دەكرێت و دواتر لە نێوانیان دابەش دەكرێت، (هەروەها دابەشكردنی) یەكەی نیشتەجێبوون و خانووش هەر بەو شێوەیەیە.

## ٢٨- بڕیاری شەرعی دەربارەی پەلامار و تێبەربوونی ئاژەڵ بۆ ناو بێستان و دەربارەی كۆزی ئاژەڵ[1]

**٢١٧٧-** عَنْ حَرَامِ بْنِ سَعْدِ بْنِ مُحَيِّصَةَ ﷺ، أَنَّ نَاقَةً لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، دَخَلَتْ حَائِطَ رَجُلٍ، فَأَفْسَدَتْ فِيهِ، فَقَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنَّ عَلَى أَهْلِ الْحَوَائِطِ حِفْظَهَا بِالنَّهَارِ، وَأَنَّ مَا أَفْسَدَتِ الْمَوَاشِي بِاللَّيْلِ ضَامِنٌ عَلَى أَهْلِهَا[2].

واتە: لە حەڕامی كوڕی سەعدی كوڕی موحەیصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): وشترێكی بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ چووە ناو بێستانی پیاوێك و زەرەری گەیاند بە بێستانەكە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری كرد و بڕیاری دا بەوەی: خاوەنی بێستان و باغەكان لەسەریانە بەڕۆژ بێستانەكانیان بپارێزن و ئەوەشی ئاژەڵ بەشەو تێكی دەدات و زەرەری پێ دەگەیەنێت (بەناو بێستانەكان) ئەوە لەسەر خاوەنەكەیەتی و زامنە (و دەبێ زەرەرەكە قەرەبوو بكاتەوە).

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الضَّوَارِي وَالْحَرِيسَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٤ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٢ في القضاء؛ والشيباني: ٦٧٨ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٩٥٢؛ وابن حنبل: ٢٣٧٤١، كلهم عن مالك به.

**٢١٧٨-** عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَاطِبٍ ﷺ، أَنَّ رَقِيقًا لِحَاطِبٍ سَرَقُوا نَاقَةً لِرَجُلٍ مِنْ مُزَيْنَةَ، فَانْتَحَرُوهَا، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَأَمَرَ عُمَرُ ﷺ كَثِيرَ بْنَ الصَّلْتِ ﷺ أَنْ يَقْطَعَ أَيْدِيَهُمْ، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ ﷺ: أَرَاكَ تُجِيعُهُمْ، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ ﷺ: وَاللَّهِ لأُغَرِّمَنَّكَ غُرْمًا يَشُقُّ عَلَيْكَ، ثُمَّ قَالَ لِلْمُزَنِيِّ: كَمْ ثَمَنُ نَاقَتِكَ؟ فَقَالَ الْمُزَنِيُّ: قَدْ كُنْتُ وَاللَّهِ أَمْنَعُهَا مِنْ أَرْبَعِ مِئَةِ دِرْهَمٍ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَعْطِهِ ثَمَانَمِئَةِ دِرْهَمٍ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاتیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): چەند کۆیلەیەکی حاتیب وشترێکی مێیان لە پیاوێکی موزەینە دزی و سەریان بڕی، جا ئەو کێشەیە بەرز کرایەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، جا ئیمامی عومەر ﷺ فەرمانی بە کەسیری کوڕی صەلت ﷺ کرد بەوەی دەستیان ببڕێت، دواتر ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: (ئەی حاتیب) دەتبینم برسییان دەکەی، دواتر ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: سوێند بە خوا دەبێ غەرامەیەکت بکەم لەسەرت زۆر سەخت بێت، دواتر بە کابرا موزەنییەکەی گوت: نرخی وشترەکەی تۆ چەندە؟ کابرا موزەنییەکەش گوتی: سوێند بە خوا بە چوار سەت درهەم نەمدەدا، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: هەشت سەت درهەمی بدەرێ.

**٢١٧٩- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: وَلَيْسَ عَلَى هَذَا الْعَمَلُ عِنْدَنَا، فِي تَضْعِيفِ الْقِيمَةِ، وَلَكِنْ مَضَى أَمْرُ النَّاسِ عِنْدَنَا عَلَى أَنَّهُ، إِنَّمَا يَغْرَمُ الرَّجُلُ قِيمَةَ الْبَعِيرِ أَوِ الدَّابَّةِ يَوْمَ يَأْخُذُهَا[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە کردار لەسەر ئەوە نییە دەربارەی زیادکردنی قیمەت (وەك ئیمامی عومەر ئەنجامی دا لە فەرموودەی پێشوو)، بەڵکوو کاروباری خەڵکی لەلای ئێمە لەسەر ئەوە هاتووە پیاو قیمەتی وشترەکە یان ئاژەڵە دەدات، (قیمەتی) ئەو ڕۆژەی بردوویەتی (بەڵام ئیمامی عومەر تەنها بۆ عقوبە وای لێ کرد).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٥ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٢أفي القضاء؛ والشافعي: ١١٠٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٦ في الأقضية، عن مالك به.




## ٢٩- بڕیاری شەرعی دەربارەی ئەو کەسەی شتێك لە ئاژەڵێك دەكات[١]

**٢١٨٠- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَنْ أَصَابَ شَيْئًا مِنَ الْبَهَائِمِ، إِنَّ عَلَى الَّذِي أَصَابَهَا قَدْرَ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِهَا.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی زەبر و زەرەرێك لە ئاژەڵێك دەدات، ئەو کەسەی زەرەری لێ داوە بەئەندازەی کەمکردنی نرخەکەی غەرامەی لەسەرە.

**٢١٨١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الْجَمَلِ يَصُولُ عَلَى الرَّجُلِ، فَيَخَافُهُ عَلَى نَفْسِهِ، فَيَقْتُلُهُ أَوْ يَعْقِرُهُ، فَإِنَّهُ إِنْ كَانَتْ لَهُ بَيِّنَةٌ عَلَى أَنَّهُ أَرَادَهُ، وَصَالَ عَلَيْهِ، فَلاَ غُرْمَ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ تَقُمْ لَهُ بَيِّنَةٌ إِلاَّ مَقَالَتُهُ، فَهُوَ ضَامِنٌ لِلْجَمَلِ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو وشترەی هێرش دەکاتە سەر کەسێك و کەسەکە لە خۆی بترسێت (وشترەکە بیکوژێت)، جا وشترەکەی کوشت یان سەری بڕی (بۆ بەرگریکردن لە خۆی، گوتوویەتی:) ئەگەر بەڵگە و شاهێدی هەبوو لەسەر ئەوەی وشترەکە بەمەبەست بۆ ئەو چووە و هێرشی بۆ کردووە، ئەوە هیچ غەرامەی لەسەر نییە، وە ئەگەر بەڵگە و شاهێدی نەبوو تەنها قسەکەی خۆی نەبێت، ئەوە زامنی وشترەکەیە (دەبێت پارەکەی بدات).

## ٣٠- بڕیاری شەرعی دەربارەی ئەو شتەی دەدرێت بە پیشەکار (بۆ ئەوەی کارێکی بۆ بکات)[٣]

**٢١٨٢- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِيمَنْ دَفَعَ إِلَى الْغَسَّالِ ثَوْبًا يَصْبُغُهُ، فَصَبَغَهُ، فَقَالَ صَاحِبُ الثَّوْبِ: لَمْ آمُرْكَ بِهَذَا الصَّبْغِ؟ وَقَالَ الْغَسَّالُ: بَلْ أَنْتَ أَمَرْتَنِي بِذَلِكَ، فَإِنَّ الْغَسَّالَ مُصَدَّقٌ فِي ذَلِكَ، وَالْخَيَّاطُ مِثْلُ ذَلِكَ، وَالصَّائِغُ مِثْلُ ذَلِكَ، وَيَحْلِفُونَ عَلَى

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِيمَنْ أَصَابَ شَيْئًا مِنَ الْبَهَائِمِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠٨ في الأقضية؛ والحدثاني: ٢٨٣ في القضاء، عن مالك به.

(٣) ـ الْقَضَاءُ فِيماَ يُعْطَى الْعُمَاَّلُ.

ذَلِكَ، إِلاَّ أَنْ يَأْتُوا بِأَمْرٍ لاَ يُسْتَعْمَلُونَ فِي مِثْلِهِ، فَلاَ يَجُوزُ قَوْلُهُمْ فِي ذَلِكَ، وَلْيَحْلِفْ صَاحِبُ الثَّوْبِ، فَإِنْ رَدَّهَا، وَأَبَى أَنْ يَحْلِفَ، حُلِّفَ الصَّبَّاغُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی جلێك دەدات بە جلشۆر تا بۆیەی بکات، ئەویش بۆیەی بکات، جا خاوەنی جلەکە بڵێت: من فەرمانم پێ نەکردی بەو ڕەنگە (یان بەو جۆرە بۆیەیە)! جلشۆرەکەش بڵێت: بەڵکوو تۆ خۆت فەرمانت پێ کردم بەو بۆیەیە، (ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی:) جلشۆرەکە بەڕاست دادەندرێت و باوەڕی پێ دەکرێت دەربارەی ئەو بابەتە (بەڵام لای ئیمامی ئەبو حەنیفە و شافیعی ﷺ پێچەوانەیە)، بەرگدرووش بە هەمان شێوەیە (قسەی ئەو دەخوات)، زێڕنگەریش بە هەمان شێوە، (گشتیان) سوێند دەخۆن (و بابەتەکە بەلای ئەواندا دەشکێتەوە)، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە بانگەشەی شتێك بکەن کە ئەو کەسانە پیشەیان ئەوە نییە و ناگونجێ بۆیان، ئەو کات قسەی ئەوان ناخوات و دەبێ خاوەنی جلەکە سوێند بخوات (جا مافەکەی وەردەگرێتەوە)، جا ئەگەر ڕەتی کردەوە و ڕازی نەبوو سوێند بخوات، ئەوە جلشۆر و جلبۆیەکەرەکە سوێند دەخوات (ئەو کات مافەکەی لەسەر لادەچێت).

٢١٨٣- **[فتوى]** قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الصَّبَّاغِ يُدْفَعُ إِلَيْهِ الثَّوْبُ فَيُخْطِئُ بِهِ، فَيَدْفَعُهُ إِلَى رَجُلٍ آخَرَ، حَتَّى يَلْبَسَهُ الَّذِي أَعْطَاهُ إِيَّاهُ: إِنَّهُ لاَ غُرْمَ عَلَى الَّذِي لَبِسَهُ، وَيَغْرَمُ الْغَسَّالُ لِصَاحِبِ الثَّوْبِ، وَذَلِكَ إِذَا لَبِسَ الثَّوْبَ الَّذِي دُفِعَ إِلَيْهِ عَلَى غَيْرِ مَعْرِفَةٍ، بِأَنَّهُ لَيْسَ لَهُ، فَإِنْ لَبِسَهُ وَهُوَ يَعْرِفُ أَنَّهُ لَيْسَ ثَوْبَهُ، فَهُوَ ضَامِنٌ لَهُ[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی جلبۆیەکەر کە جلی پێ بدرێت (بۆ ئەوەی بۆیەی بکات)، جا هەڵە دەکات و دەیدات بە کەسێکی دیکە، تا ئەو کەسەی پێی داوە لەبەری دەکات و دەیپۆشێت، گوتوویەتی: ئەو کەسەی پۆشیویەتی غەرامەی لەسەر نییە، (بەڵکو) جلشۆرەکە (بۆیەکەرەکە) غەرامە دەداتە خاوەنی جلەکە، (جا کە دەڵێین ئەو کەسەی جلەکەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٨ في الرهون، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦٩ في الرهون، عن مالك به.




پۆشیوە غەرامەی ناكەوێتە سەر) لەو كاتەیە كە جلەكە بپۆشێت كە پێی دراوە نەزانێت هی خۆی نییە، بەڵام ئەگەر پۆشی لە كاتێكدا دەیزانی جلی خۆی نییە، ئەوە زامنە (و دەبێ غەرامە بداتە خاوەنی جلەكە).

## ٣١- بڕیاری شەرعی دەربارەی كەفالەت و تەحویلكردن (بۆ قەرز)[١]

**٢١٨٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يُحِيلُ الرَّجُلَ عَلَى الرَّجُلِ بِدَيْنٍ لَهُ عَلَيْهِ، أَنَّهُ إِنْ أَفْلَسَ الَّذِي أُحِيلَ عَلَيْهِ، أَوْ مَاتَ، فَلَمْ يَدَعْ وَفَاءً، فَلَيْسَ لِلْمُحْتَالِ عَلَى الَّذِي أَحَالَهُ شَيْءٌ، وَأَنَّهُ لاَ يَرْجِعُ عَلَى صَاحِبِهِ الأَوَّلِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو كەسەی (قەرزارە) كەسێك (واتە خاوەنی قەرزێك) دەنێرێت بۆ لای كەسێك كە ئەو قەرزی لەسەر هەیە (تا لە بری قەرزەكەی خۆی قەرزەكە بداتەوە ئەو پیاوە)، ئەگەر ئەو كەسەی ڕەوانە كراوە بۆ لای موفلیس و مایەپووچ ببوو و سەروەتی نەمابوو یان مردبوو، وە پارەی قەرزەكەی جێ نەهێشتبوو، ئەوە ئەو كەسەی ڕەوانە كراوە هیچی بۆ نییە لەسەر ئەو كەسەی ڕەوانەی كردووە و ناگەڕێتەوە بۆ كەسی یەكەم.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتە لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە.

**٢١٨٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا الرَّجُلُ يَتَحَمَّلُ لَهُ الرَّجُلُ بِدَيْنٍ لَهُ عَلَى رَجُلٍ آخَرَ، ثُمَّ يَهْلِكُ الْمُتَحَمِّلُ، أَوْ يُفْلِسُ، فَإِنَّ الَّذِي تُحُمِّلَ لَهُ، يَرْجِعُ عَلَى غَرِيمِهِ الأَوَّلِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (بەڵام) هەرچی ئەو كەسەیە كە خاوەنی قەرزەكە لەسەری هەڵدەگرێت بۆ سەر كەسێكی دیكە (چونكە كەسەكەی

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الْحَمَالَةِ وَالحَوْلِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٠ في الرهون، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧١ في الرهون، عن مالك به.

دیکە قەرزەکەی ئەوی لەئەستۆ گرتووە)، دواتر ئەو کەسە دەمرێت کە قەرزەکەی خستۆتە سەر خۆی یان موفلیس و مایەپووچ دەبێت، ئەوە ئەو کەسەی قەرزەکەی بۆ خراوەتە ئەستۆ دەگەڕێتەوە بۆ قەرزاری یەکەم (مافەکەی نافەوتێ، چونکە کەسی دووەم وەك وەسیقەیە کە وەسیقەکە نەما دەگەڕێتەوە بۆ خاڵی یەکەم).

## ٣٢- بڕیاری شەرعی دەربارەی ئەو کەسەی جلێك دەکڕێت و عەیبێکی هەیە[١]

٢١٨٦- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: إِذَا ابْتَاعَ الرَّجُلُ ثَوْبًا وَبِهِ عَيْبٌ مِنْ حَرْقٍ أَوْ غَيْرِهِ، قَدْ عَلِمَهُ الْبَائِعُ، فَشُهِدَ عَلَيْهِ بِذَلِكَ، أَوْ أَقَرَّ بِهِ، فَأَحْدَثَ فِيهِ الَّذِي ابْتَاعَهُ حَدَثًا مِنْ تَقْطِيعٍ يُنَقِّصُ مِنْ ثَمَنَ الثَّوْبِ، ثُمَّ عَلِمَ الْمُبْتَاعُ بِالْعَيْبِ، فَهُوَ رَدٌّ عَلَى الْبَائِعِ، وَلَيْسَ عَلَى الَّذِي ابْتَاعَهُ غُرْمٌ فِي تَقْطِيعِهِ إِيَّاهُ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەگەر کەسێك جلێکی کڕی و عەیبێکی هەبوو وەك سوتان و یان شتی دیکە، فرۆشیارەکەش دەیزانی و شاهێدی لەسەر درا یان خۆی دانی نا بەوە، ئەو کەسەش کە کڕیویەتی عەیبی نوێی لێ پەیدا کرد وەك بڕین کە لە نرخەکەی کەم دەکردەوە، دواتر فرۆشیارەکە بە عەیبە (کۆنە)کەی زانی، ئەوە دەگەڕێندرێتەوە بۆ فرۆشیارەکە و ئەوەشی کە کڕیویەتی هیچ غەرامەیەکی لەسەر نییە دەربارەی بڕینەکە (عەیبە نوێیەکە).

٢١٨٧- **[فتوى]** قَالَ: وَإِنِ ابْتَاعَ رَجُلٌ ثَوْبًا وَبِهِ عَيْبٌ مِنْ حَرْقٍ أَوْ عَوَارٍ، فَزَعَمَ الَّذِي بَاعَهُ، أَنَّهُ لَمْ يَعْلَمْ بِذَلِكَ، وَقَدْ قَطَعَ الثَّوْبَ الَّذِي ابْتَاعَهُ، أَوْ صَبَغَهُ، فَالْمُبْتَاعُ بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَ أَنْ يُوضَعَ عَنْهُ قَدْرُ مَا نَقَصَ الْحَرْقُ أَوِ الْعَوَارُ مِنْ ثَمَنِ الثَّوْبِ، وَيُمْسِكُ الثَّوْبَ، فَعَلَ، وَإِنْ شَاءَ أَنْ يَغْرَمَ مَا نَقَصَ التَّقْطِيعُ أَوِ الصِّبْغُ مِنْ ثَمَنِ الثَّوْبِ، وَيَرُدُّهُ، فَعَلَ، وَهُوَ فِي ذَلِكَ بِالْخِيَارِ، فَإِنْ كَانَ

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِيمَنِ ابْتَاعَ ثَوْبًا وَبِهِ عَيْبٌ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٢ في الرهون، عن مالك به.

الْمُبْتَاعُ قَدْ صَبَغَ الثَّوْبَ صِبْغًا يَزِيدُ فِي ثَمَنِهِ، فَالْمُبْتَاعُ بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَ أَنْ يُوضَعَ عَنْهُ قَدْرُ مَا نَقَصَ الْعَيْبُ مِنْ ثَمَنِ الثَّوْبِ، وَإِنْ شَاءَ أَنْ يَكُونَ شَرِيكًا لِلَّذِي بَاعَهُ الثَّوْبَ، فَعَلَ، وَيُنْظَرُ كَمْ ثَمَنُ الثَّوْبِ وَفِيهِ الْحَرْقُ أَوِ الْعَوَارُ، فَإِنْ كَانَ ثَمَنُهُ عَشَرَةَ دَرَاهِمَ، وَثَمَنُ مَا زَادَ فِيهِ الصِّبْغُ خَمْسَةَ دَرَاهِمَ، كَانَا شَرِيكَيْنِ فِي الثَّوْبِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِقَدْرِ حِصَّتِهِ، فَعَلَى حِسَابِ هَذَا يَكُونُ مَا زَادَ الصِّبْغُ فِي ثَمَنِ الثَّوْبِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر كەسێك جلێك (قوماشێكی) كڕی و عەیبێكی هەبوو وەك سوتان یان دڕان و شەقبوون، ئەو كەسەش كە فرۆشتوویەتی گوتی نەمزانیوە ئاوایە، ئەو كەسەش كە كڕیویەتی جلەكەی پارچە كردبوو یان بۆیەی كردبوو، ئەوە كڕیارەكە سەرپشكە: ئەگەر بیەوێ ئەو ئەندازەیە لابدا كە سوتانەكە یان بڕان و شەقبوونەكە لە نرخەكەی كەمی كردووە و جلەكە بۆ خۆی بهێڵێتەوە، ئەوە وا دەكات، وە ئەگەر بیەوێ غەرامەی ئەو بڕین و بۆیەكردنە بدات كە لە نرخی جلەكەی كەم كردۆتەوە كە خۆی ئەنجامی داوە و جلەكە بگەڕێنێتەوە (بۆ خاوەنەكەی)، ئەوە وا دەكات و لەوەدا سەرپشكە، جا ئەگەر كڕیارەكە جلەكەی بۆیە كردبوو بە بۆیەیەك لە نرخی جلەكەی زیاد دەكرد، ئەو كاتیش كڕیار سەرپشكە: ئەگەر ویستی ئەو ئەندازەیە لابدا و كەمی بكاتەوە كە عەیبەكە لە نرخی جلەكەی كەم كردووە (ئەوە وا دەكات)، وە ئەگەر ویستیشی ببێتە شەریك و هاوبەش لەگەڵ ئەو كەسەی جلەكەی پێ فرۆشتووە، ئەوە وا دەكات (بەم شێوەیە): سەیر دەكرێت نرخی جلەكە چەندە لە كاتێكدا ئەو سوتان یان بڕان یان شەقبوونەی پێوە بێ، جا (بۆ نموونە) ئەگەر نرخەكەی دە دینار بێ و نرخی ئەو زیادەیەی بۆیەكەش زیادی كردووە پێنج دینار بێ، ئەوە هەردووكیان شەریكن لە جلەكە هەر یەكەیان بەپێی پشكی خۆی (كەواتە دوو لەسەر سێ بۆ فرۆشیارە و سێیەك بۆ كڕیارە)، بەو گوێرەیە حیساب دەكرێت ئەو زیادەیەی بۆیەكە لە نرخی جلەكەی زیاد كردووە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٤ في الرهون، عن مالك به.

## ٣٣- ئەوەی دروست نییە لە دیاری و بەخششدا[١]

**٢١٨٨-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَعَنْ مُحَمَّدِ بْنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ أَبَاهُ بَشِيرًا أَتَى بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَمًا كَانَ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ هَذَا؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَارْتَجِعْهُ[٢].

واتە: لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و موحەممەدی کوڕی نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، هەردووکیان لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە بەوەی گوتوویەتی: بەشیری باوکی هێناویەتی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتوویەتی: من کۆیلەیەکم هەبووە بەخشیومە بەو کوڕەم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا هەمان شتت داوە بە گشت کوڕەکانت؟ ئەویش گوتی: نەخێر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کەواتە بیگەڕێنەوە.

**٢١٨٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ كَانَ نَحَلَهَا جَادَّ عِشْرِينَ وَسْقًا مِنْ مَالِهِ بِالْغَابَةِ، فَلَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ، قَالَ: وَاللَّهِ يَا بُنَيَّةُ مَا مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَحَبُّ إِلَيَّ غِنًى بَعْدِي مِنْكِ، وَلاَ أَعَزُّ عَلَيَّ فَقْرًا بَعْدِي مِنْكِ، وَإِنِّي كُنْتُ نَحَلْتُكِ جَادَّ عِشْرِينَ وَسْقًا، فَلَوْ كُنْتِ جَدَدْتِيهِ وَاحْتَزْتِيهِ كَانَ لَكِ، وَإِنَّمَا هُوَ الْيَوْمَ مَالُ وَارِثٍ، وَإِنَّمَا هُمَا أَخَوَاكِ، وَأُخْتَاكِ، فَاقْتَسِمُوهُ عَلَى كِتَابِ اللهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ، فَقُلْتُ: يَا أَبَتِ، وَاللَّهِ لَوْ كَانَ كَذَا وَكَذَا لَتَرَكْتُهُ، إِنَّمَا هِيَ أَسْمَاءُ، فَمَنِ الأُخْرَى؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: ذُو بَطْنِ بِنْتِ خَارِجَةَ، أُرَاهَا جَارِيَةً[٣].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ئەبو بەکری صدیق ﷺ بڕینەوەی بیست وەسق لە خورمای بۆ کردە دیاری لە زەوییەکەی

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ النُّحْلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٨ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٢ في القضاء؛ والشيباني: ٨٠٧ في البيوع والتجارات والسلم؛ والبخاري: ٢٥٨٦ في الهبة؛ ومسلم: الهبات: ٩؛ والنسائي: ٣٦٧٣ في النحل؛ وابن حبان: ٥١٠٠؛ والقابسي: ٣٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣٩ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٢أفي القضاء؛ والشيباني: ٨٠٨ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

لە غابە (کە شوێنێك بوو بەریدێك لە مەدینە دوور بوو لەسەر ڕێی شام بوو)، جا کاتێ مردن بۆ ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ هات گوتی: بە خوا کچۆڵەکەم (عائیشە) هیچ کەسێك نییە پێم خۆشتر بێت دەوڵەمەند و بێپێویستی بێت لەدوای مردنی من لە تۆ، وە کەس نییە هەژارییەکەی لەسەرم قورستر بێت لە تۆ، وە من بڕینەوەی بیست وەسق لە خورمام کردبوو بە دیاری بۆت، جا ئەگەر بیبڕیتەوە و بیبەیەوە لای خۆت ئەوە هی تۆیە، بەڵام ئێستا ماڵی میراتگرە (چونکە من خەریکە دەمرم و تۆش هێشتا وەرتنەگرتووە)، دوو براشت هەیە (عەبدوڕڕەحمان و موحەممەد)، لەگەڵ دوو خوشك، جا (بۆ خۆتی مەبە و) بەپێی پەرتووکی خوا دابەشی بکەن، عائیشە ﷺ دەڵێ منیش گوتم: ئەی باوکە سوێند بە خوا ئەگەر ئەوەندە و ئەوەندەش بووایە (واتە هەرچەندە سەروەتێکی زۆریش بووایە) ئەوە هەر وازم لێ دەهێنا (بۆ ڕەزامەندی خوا و جێبەجێکردنی فەرمانی تۆ)، (بەڵام کە باسی دوو خوشکەکانمت کرد مەبەستت کێ بوو) ئەوە ئەسماء دیارە ئەوەی دیکە کێیە؟ ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ گوتی: کۆرپەلەکەی ناو زگی (حەبیبە)ی کچی خاریجەی (خێزانم)، پێم وایە کچە (جا ڕاست دەرچوو کچ بوو و ناویان لێنا ئوم کەلسوم).

٢١٩٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَنْحَلُونَ أَبْنَاءَهُمْ نُحْلاً، ثُمَّ يُمْسِكُونَهَا، فَإِنْ مَاتَ ابْنُ أَحَدِهِمْ، قَالَ: مَا لِي بِيَدِي لَمْ أُعْطِهِ أَحَدًا، وَإِنْ مَاتَ هُوَ، قَالَ: هُوَ لِابْنِي قَدْ كُنْتُ أَعْطَيْتُهُ إِيَّاهُ، مَنْ نَحَلَ نِحْلَةً، فَلَمْ يَحُزْهَا الَّذِي نُحِلَهَا، حَتَّى تَكُونَ إِنْ مَاتَ لِوَرَثَتِهِ، فَهِيَ بَاطِلٌ[1].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبد قاریئەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ئەوە پیاوانێك چییانە دەچن دیاری و بەخشش دەدەن بە (یەکێك لە) منداڵەکانیان، دواتریش دیارییەکە لەدەستی خۆیان دەهێڵنەوە (تەسلیمی ناکەن)، جا ئەگەر منداڵی یەکێکیان بمرێت، (باوکەکە) دەڵێت: ماڵی خۆم بەدەستی خۆمەوەیە نەمداوەتە کەس، ئەگەر خۆشی خەریك بێ بمرێ

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤٠ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٢ب في القضاء؛ والشيباني: ٨٠٩ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

دەڵێت: فڵان ماڵم هی فڵان منداڵمە من پێشتر پێم بەخشیوە، جا هەر کەسێك دیارییەك ببەخشێت و نەیداتە دەستی ئەو کەسەی پێی بەخشراوە تا وای لێ دێت خەریك دەبێ بمرێت و ببێتە هی میراتگران (ئەو کات بیەوێ تەسلیمی بکات)، ئەوە باتڵە (نابێتە دیاری، چونکە دیاری دەبێ پێشی نەخۆشیی مردن تەسلیمی خاوەنەکەی بکرێت و باڵادەست بێت بەسەری).

## ٣٤- ئەوەی دروست نییە لە بەخشیندا[1]

**٢١٩١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَنْ أَعْطَى أَحَدًا عَطِيَّةً لاَ يُرِيدُ ثَوَابَهَا، فَأَشْهَدَ عَلَيْهَا، فَإِنَّهَا ثَابِتَةٌ لِلَّذِي أُعْطِيَهَا، إِلاَّ أَنْ يَمُوتَ الْمُعْطِي قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَهَا الَّذِي أُعْطِيَهَا.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی بەخششێك بە کەسێك بدات و مەبەستی پاداشتدانەوە نەبێت (لەو کەسەی پێی بەخشراوە)، وە شاهێدی لەسەر گرت، ئەوە بۆ ئەو کەسە جێگیر دەبێت کە پێی بەخشراوە، تەنها لەو کاتە نەبێت ئەو کەسەی بەخشیویەتی بمرێت بەر لەوەی ئەو کەسە وەریبگرێت کە پێی بەخشراوە (ئەو کات بەتاڵ دەبێتەوە).

**٢١٩٢- [فتوى]** قَالَ: وَإِنْ أَرَادَ الْمُعْطِي إِمْسَاكَهَا بَعْدَ أَنْ أَشْهَدَ عَلَيْهَا، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُ، إِذَا قَامَ عَلَيْهِ بِهَا صَاحِبُهَا، أَخَذَهَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر کەسی بەخشەر ویستی (ئەو بەخششەی بەڵێنی داوە) بیگرێتەوە (نەیبەخشێت) دوای ئەوەی شاهێدیشی لەسەر گرتبوو، ئەوەی بۆ نییە، ئەگەر خاوەنەکەی لەسەر بەخششەکە شاهێدەکانی هێنا، ئەوە وەریدەگرێت (هەرچەندە پەشیمانیش بووبێتەوە).

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الْعَطِيَّةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤٥ في النحل والعطية، عن مالك به.





**٢١٩٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ أَعْطَى عَطِيَّةً، ثُمَّ نَكَلَ الَّذِي أَعْطَاهَا، فَجَاءَ الَّذِي أُعْطِيَهَا بِشَاهِدٍ يَشْهَدُ لَهُ أَنَّهُ أَعْطَاهُ ذَلِكَ، عَرَضًا كَانَ أَوْ ذَهَبًا أَوْ وَرِقًا أَوْ حَيَوَانًا، أُحْلِفَ الَّذِي أُعْطِيَ مَعَ شَهَادَةِ شَاهِدِهِ، فَإِنْ أَبَى الَّذِي أُعْطِيَ أَنْ يَحْلِفَ، حُلِّفَ الْمُعْطِي، وَإِنْ أَبَى أَنْ يَحْلِفَ أَيْضًا، أَدَّى إِلَى الْمُعْطَى مَا ادَّعَى عَلَيْهِ، إِذَا كَانَ لَهُ شَاهِدٌ وَاحِدٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ شَاهِدٌ، فَلاَ شَيْءَ لَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەخششێك ببەخشێت، دواتر ئەو کەسەی بەخشیوەتی نکوڵی لێ بکات، جا ئەوەی پێی بەخشراوە شاهێدێك بێنێت شاهێدی بۆ بدات کە ئەو شتەی پێ بەخشیوە، جا زەوی یان زێڕ یان زیو یان ئاژەڵ بێت، ئەوە ئەو کەسەی پێی بەخشراوە سوێند دەدرێت لەگەڵ هێنانی شاهێدی شاهێدەکەی، جا ئەگەر ئەو کەسەی پێی بەخشراوە ڕازی نەبوو سوێند بخوات، ئەو کەسە سوێند دەدرێت کە بەخشیوەتی، جا ئەگەر ئەویش ڕەتی کردەوە سوێند بخوا، ئەوە ئەو شتە پێبەخشراوەی کە بانگەشەی بۆ دەکات پێی دەدرێت، ئەگەر یەك شاهێدی هەبێت، جا ئەگەر هیچ شاهێدێکی نەبێت، ئەوە هیچی بۆ نییە.

**٢١٩٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ أَعْطَى عَطِيَّةً لاَ يُرِيدُ ثَوَابَهَا ثُمَّ مَاتَ الْمُعْطَى، فَوَرَثَتُهُ بِمَنْزِلَتِهِ، وَإِنْ مَاتَ الْمُعْطِي، قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَ الْمُعْطَى عَطِيَّتَهُ، فَلاَ شَيْءَ لَهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ أُعْطِيَ عَطَاءً لَمْ يَقْبِضْهُ، فَإِنْ أَرَادَ الْمُعْطِي أَنْ يُمْسِكَهَا، وَقَدْ أَشْهَدَ عَلَيْهَا حِينَ أَعْطَاهَا، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُ، إِذَا قَامَ صَاحِبُهَا أَخَذَهَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەخششێك ببەخشێت کە مەبەستی پاداشتدانەوە نەبێت (لەلایەن ئەو کەسەی پێی دەبەخشێت)، دواتر پێبەخشراوەکە مرد، ئەوە میراتگرەکانی لە شوێنی ئەون، وە ئەگەر کەسە بەخشەرەکە مرد بەر لەوەی پێبەخشراوەکە بەخششەکە وەربگرێت، ئەوە هیچی بۆ نییە، چونکە بەخششێکی دراوەتێ وەرینەگرتووە، وە ئەگەر بەخشەرەکە بیەوێت بەخششەکە بگرێتەوە (نەیبەخشێت) لە کاتێکدا ئەو کاتەی بەخشیوەتی شاهێدی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤٤ في النحل والعطية، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤٦ في النحل والعطية، عن مالك به.

لەسەر گرتووە، ئەوە بۆی نییە بیگرێتەوە و نەیبەخشێت، جا ئەگەر خاوەنەکەی هەڵبستێت بە هێنانی شاهێدەکە بەخششەکە وەردەگرێت.

## ٣٥- دادوەریکردن دەربارەی دیاری و بەخشش[1]

**٢١٩٥-** عَنْ أَبِي غَطَفَانَ بْنِ طَرِيفٍ الْمُرِّيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَنْ وَهَبَ هِبَةً لِصِلَةِ رَحِمٍ، أَوْ عَلَى وَجْهِ صَدَقَةٍ، فَإِنَّهُ لاَ يَرْجِعُ فِيهَا، وَمَنْ وَهَبَ هِبَةً يَرَى أَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ بِهَا الثَّوَابَ، فَهُوَ عَلَى هِبَتِهِ، يَرْجِعُ فِيهَا إِذَا لَمْ يُرْضَ مِنْهَا[2].

واتە: لە ئەبو غەتەفانی کوڕی تەریفی موڕییەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك شتێك ببەخشێت بەخزمایەتی، یان بەخێر، ئەوە نابێت تیایدا پەشیمان ببێتەوە، وە هەر کەسێك شتێکی بەخشی مەبەستی پێ وەرگرتنی پاداشتێك بێت (لەلایەن ئەو کەسەی پێی دەبەخشێت)، ئەوە دەگەڕێتەوە سەر بەخششی (بەرانبەرەکەی)، پەشیمان دەبێتەوە تیایدا ئەگەر پێی ڕازی نەبوو.

**٢١٩٦- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الْهِبَةَ إِذَا تَغَيَّرَتْ عِنْدَ الْمَوْهُوبِ لَهُ لِلثَّوَابِ، بِزِيَادَةٍ أَوْ نُقْصَانٍ، فَإِنَّ عَلَى الْمَوْهُوبِ لَهُ، أَنْ يُعْطِيَ صَاحِبَهَا قِيمَتَهَا، يَوْمَ قَبَضَهَا[3].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: دیاری و بەخشش کە بۆ پاداشتدانەوە (بدرێت بە کەسێك تا ئەویش شتێکی پێ بدات) ئەگەر لەلای ئەو کەسەی بۆی دەکرێت بە دیاری گۆڕانکاری بەسەر هات، بە زیادبوون یان

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الْهِبَةِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤٧ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٤ في القضاء؛ والشيباني: ٨٠٥ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤٨ في النحل والعطية، عن مالك به.

کەمبوون، ئەوە لەسەر ئەو کەسە واجبە کە بۆی کراوەتە دیاری، نرخی شتەکە بدات بە هاوەڵەکەی (کە شتەکەی پێ بەخشیوە)، (نرخی) ئەو ڕۆژەی وەریگرتووە.

## ٣٦- گەڕاندنەوە لە صەدەقەدا[1]

**٢١٩٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، أَنَّ كُلَّ مَنْ تَصَدَّقَ عَلَى ابْنِهِ بِصَدَقَةٍ قَبَضَهَا الابْنُ، أَوْ كَانَ فِي حَجْرِ أَبِيهِ، فَأَشْهَدَ لَهُ عَلَى صَدَقَتِهِ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَعْتَصِرَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، لأَنَّهُ لاَ يَرْجِعُ فِي شَيْءٍ مِنَ الصَّدَقَةِ[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: هەر کەسێك صەدەقە و خێرێك بە کوڕەکەی بکات و کوڕەکەی (ئەگەر گەورە و باڵغ بێت) وەریبگرێت، یان (ئەگەر بچووك بوو) لە ژێر چاودێری باوکی بوو و (باوکەکە) شاهێدی بۆ گرت لەسەر خێر و صەدەقەکەی (کە پێی بەخشیوە)، ئەوە (لە هەردوو حاڵەتدا) بۆ باوکەکە نییە هیچ شتێك لەوە بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە، چونکە نابێ لە هیچ صەدەقە و خێرێك پەشیمان ببێتەوە.

**٢١٩٨- [فتوى]** قَالَ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ: يَقُولُ الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِيمَنْ نَحَلَ وَلَدَهُ نُحْلاً، أَوْ أَعْطَاهُ عَطَاءً لَيْسَ بِصَدَقَةٍ: إِنَّ لَهُ أَنْ يَعْتَصِرَ ذَلِكَ، مَا لَمْ يَسْتَحْدِثِ الْوَلَدُ دَيْنًا يُدَايِنُهُ النَّاسُ بِهِ، وَيَأْمَنُونَهُ عَلَيْهِ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ الْعَطَاءِ الَّذِي أَعْطَاهُ أَبُوهُ، فَلَيْسَ لأَبِيهِ أَنْ يَعْتَصِرَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، بَعْدَ أَنْ تَكُونَ عَلَيْهِ الدُّيُونُ[3].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی ئەو کەسەی دیارییەك یان بەخششێك دەدات بە مناڵەکەی کە صەدەقە نەبێت، ئەوەیە: بۆی هەیە بیگەڕێنێتەوە مادەم مناڵەکە قەرزی نوێی نەکردبێت کە بەتەما بێ بە هۆی بەخششەکە بیداتەوە

---

(١) ـ الاِعْتِصَارُ فِي الصَّدَقَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٠ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٥ في القضاء، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥١ في النحل والعطية، عن مالك به.





و خەڵکی دڵنیا کردبێتەوە بە هۆی ئەو بەخششەی باوکی پێی بەخشیوە، ئەوە بۆ باوکی نییە لە هیچ شتێك لەوە پەشیمان ببێتەوە و بیگەڕێنێتەوە، دوای ئەوەی لەسەر کوڕەکەی بۆتە قەرز.

**٢١٩٩- [فتوى]** قالَ مَالِكٌ ﷺ: أَوْ يُعْطِي الرَّجُلُ ابْنَهُ أَوِ ابْنَتَهُ الْمَالَ، فَتَنْكِحُ الْمَرْأَةُ الرَّجُلَ، إِنَّمَا تَنْكِحُهُ لِغِنَاهُ، وَلِلْمَالِ الَّذِي أَعْطَاهُ أَبُوهُ، فَيُرِيدُ أَنْ يَعْتَصِرَ ذَلِكَ الأَبُ، أَوْ يَتَزَوَّجُ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ قَدْ نَحَلَهَا أَبُوهَا النُّحْلَ، إِنَّمَا يَتَزَوَّجُهَا، وَيَرْفَعُ فِي صِدَاقِهَا لِغِنَاهَا وَمَالِهَا، وَمَا أَعْطَاهَا أَبُوهَا، ثُمَّ يَقُولُ الأَبُ: أَنَا أَعْتَصِرُ ذَلِكَ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَعْتَصِرَ مِنِ ابْنِهِ وَلاَ مِنِ ابْنَتِهِ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، إِذَا كَانَ عَلَى مَا وَصَفْتُ لَكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: یان کەسێك ماڵێك بە کوڕەکەی یان کچەکەی ببەخشێت، جا ئافرەتێك مێرد بە کوڕەکە بکات، لەبەر دەوڵەمەندییەکەی و لەبەر ئەو ماڵەی باوکی پێی داوە مێردی پێ کردووە، جا باوکی بیەوێ ئەو بەخششە بگەڕێنێتەوە، یان کوڕێك ئەو ئافرەتە بخوازێ کە باوکی بەخششی داوەتێ، بۆ ئەوە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتەکە کردووە و مارەیی بەرز کردۆتەوە بەهۆی دەوڵەمەندییەکەی و ماڵەکەی و بەخششی باوکیەوە، دواتر باوکەکە بڵێت: من بەخششەکە دەگەڕێنمەوە، ئەوە بۆی نییە بەخششەکە نە لە کوڕەکەی نە لە کچەکەی وەربگرێتەوە، ئەگەر بەو شێوەیە بوو کە باسم کرد.

## ٣٧- دادوەری دەربارەی بەخششی تەمەن (واتە کەسێك شتێکی پێ ببەخشرێت تا لە ژیاندا ماوە، دواتر بگەڕێندرێتەوە)[2]

**٢٢٠٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ، وَلِعَقِبِهِ، فَإِنَّهَا لِلَّذِي يُعْطَاهَا، لاَ تَرْجِعُ إِلَى الَّذِي أَعْطَاهَا أَبَدًا، لأَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٢ في النحل والعطية، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي الْعُمْرَى.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٣ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٦ في القضاء؛ والشيباني: ٨١١ في

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەخششێکی پێ بەخشرا بەوەی بۆ خۆی و منداڵەکانی بێت (بەوەی تا خۆی و منداڵەکانی لە ژیاندا ماون بۆ ئەوان بێت، جا دواتر دوای مردنیان بگەڕێندرێتەوە بۆ خانەوادەی بەخشەرەکە)، ئەوە هەر بۆ ئەو کەسە دەبێت کە پێی بەخشراوە، هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی بەخشیویەتی، (ئەبو سەلەمە گوتوویەتی): چونکە دەکا بەخششێکی بەخشیوە کە میراتی کەوتۆتە ناو (تازە دەبێتە میرات بۆ کەسوکاری پێبەخشراوەکە).

تێبینی: ئیمامی مالیك ﷺ وا لێکی داوەتەوە ئەو فەرموودەیە تەنها دەربارەی ئەوەیە کە بەخشین بۆ کەسێك ئەنجام دەدات و ناوی وەچەش دێنێت، ئەو کات بەخششەکە ناگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر تەنها بۆ کەسێك بوو تا دەمرێت، ئەو کات دەگەڕێتەوە.

**٢٢٠١**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ مَكْحُولاً الدِّمَشْقِيَّ يَسْأَلُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنِ الْعُمْرَى وَمَا يَقُولُ النَّاسُ فِيهَا؟ فَقَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ ﷺ: مَا أَدْرَكْتُ النَّاسَ إِلاَّ وَهُمْ عَلَى شُرُوطِهِمْ فِي أَمْوَالِهِمْ، وَفِيمَا أُعْطُوا(١).

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوێی لە مەکحولی دیمەشقی بووە پرسیاری لە قاسمی کوڕی موحەممەد کردووە دەربارەی عومرا (واتە ئەو بەخششەی دەبەخشرێتە کەسێك تا لە ژیاندا بێت، دوای مردنی بگەڕێندرێتەوە) کە ئاخۆ زانایان چییان دەربارەی گوتووە؟ قاسمی کوڕی موحەممەدیش ﷺ گوتی: نەگەیشتووم بە زانایان (لە هاوەڵان و تابیعییەکان) حەتمەن لەسەر مەرجەکانیان بوون لە سەروەت و سامانیان و لەوەی پێیان بەخشراوە (واتە بەخشەر چ مەرجێك دابنێت دەبێ جێبەجێ بکرێت).

---

البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ١٠٦٦؛ ومسلم: الهبات: ٢٠؛ والنسائي: ٣٧٤٥ في العمرى؛ والترمذي: ١٣٥٠ في الأحكام؛ وابن حبان: ٥١٣٧؛ والمنتقى لابن الجارود: ٩٨٦؛ وشرح معاني الآثار: ٥٨٦٩؛ والقابسي: ٢١، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٤ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٦أفي القضاء، عن مالك به.

٢٢٠٢- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْعُمْرَى تَرْجِعُ إِلَى الَّذِي أَعْمَرَهَا، إِذَا لَمْ يَقُلْ هِيَ لَكَ وَلِعَقِبِكَ[١].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: بابەتەكە لەلای ئێمە لەسەر ئەوەیە: شتە بەخشراوەكە (دوای مردنی پێبەخشراوەكە) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كەسەی بەخشیویەتی، ئەگەر نەیوتبێت بۆ تۆ و وەچەی تۆ بێت (چونكە ئەگەر وەچە بێتە ناو بابەتەكە ناگەڕێتەوە و دەبێتە میرات).

٢٢٠٣- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ وَرِثَ مِنْ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ دَارَهَا، قَالَ: وَكَانَتْ حَفْصَةُ ﷺ قَدْ أَسْكَنَتْ بِنْتَ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، مَا عَاشَتْ، فَلَمَّا تُوُفِّيَتْ بِنْتُ زَيْدٍ، قَبَضَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ الْمَسْكَنَ، وَرَأَى أَنَّهُ لَهُ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ خانووی حەفصەی كچی عومەری بەمیرات وەرگرت، گوتوویەتی: حەفصە ﷺ پێشتر كچی زەیدی كوڕی خەتتابی نیشتەجێ كردبوو لەناوی تا بژیێت، جا كاتێ كچی زەید وەفاتی كرد، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ خانووەكەی وەرگرتەوە و پێی وا بوو هی خۆیەتی.

### ٣٨- دادوەری و بڕیار دەربارەی دۆزینەوەی شتی ونبوو[٣]

٢٢٠٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا، وَإِلاَّ فَشَأْنَكَ بِهَا، قَالَ: فَضَالَّةُ الْغَنَمِ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ، قَالَ: فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ قَالَ: مَا لَكَ وَلَهَا، مَعَهَا سِقَاؤُهَا، وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ الْمَاءَ، وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٥ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٦ب في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٥٦ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٦ج في القضاء؛ والشيباني: ٨١٢ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ الْقَضَاءُ فِي اللُّقَطَةِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٥ في الرهون؛ والحدثاني: ٢٩٨ في القضاء؛ والشافعي: ١٠٨٨؛

واتە: لە زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێ كرد دەربارەی دۆزینەوەی شتی ونبوو، ئەویش فەرمووی: بزانە كیس و تورەكە و جزدانەكە چ جۆرێكە و پەتەكەی چییە (پارەكە و شتەكە چەندە و چۆنە)، دواتر ساڵێك بیناسێنە (بڵێ شتێكم دۆزیوەتەوە)، جا ئەگەر خاوەنەكەی هات (ئەوە بیدەرەوە)، ئەگەرنا چی لێ دەكەیت وای لێ بكە، گوتی: ئەدی مەڕ و بزنی ونبوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: یان بۆ تۆیە (تۆ هەڵیدەگریتەوە)، یان بۆ براكەتە (مسوڵمانێكی دیكە هەڵیدەگرێتەوە)، یان بۆ گورگە (دەیخوات و دەفەوتێت، كەواتە بیگرەوە)، گوتی: ئەی وشتری ونبوو؟ فەرمووی: چ كارت بەسەریەتی لە كاتێكدا كیسەی ئاوی پێیە (ئاو خەزن دەكات) وە پێڵاوی خۆی هەیە (دەتوانێت بە پێیە پان و بەهێزەكانی زۆر بڕوات)، خۆی دەچێتە سەر ئاو و لە درەخت دەخوات، تا خاوەنەكەی پێی دەگاتەوە (كەواتە مەیگرەوە).

**٢٢٠٥-** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَدْرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ نَزَلَ مَنْزِلَ قَوْمٍ بِطَرِيقِ الشَّامِ، فَوَجَدَ صُرَّةً فِيهَا ثَمَانُونَ دِينَارًا، فَذَكَرَهَا لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: عَرِّفْهَا عَلَى أَبْوَابِ الْمَسَاجِدِ، وَاذْكُرْهَا لِكُلِّ مَنْ يَأْتِي مِنَ الشَّامِ سَنَةً، فَإِذَا مَضَتِ السَّنَةُ، فَشَأْنَكَ بِهَا[1].

واتە: لە موعاوییەی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی بەدری جوهەنییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، باوكی هەواڵی پێ داوە بەوەی: (جارێكیان) لەلای خەڵكێك لایدا لە ڕێگای شام، جا كیسەیەكی دۆزییەوە هەشتا دیناری تێدا بوو، جا بۆ عومەری كوڕی خەتتابی ﷺ باس كرد، عومەریش ﷺ پێی گوت: لەبەر دەرگای مزگەوتەكان بیناسێنە (بڵێ مەبلەغە پارەیەكم دۆزیوەتەوە)، وە ساڵێك بۆ گشت كەسێك باسی بكە كە لە شامەوە دێت، جا كاتێ ساڵێك تێ پەڕی، چی لێ دەكەیت وای لێ بكە.

---

والبخاري: ٢٣٧٢ في المساقاة، وفي: ٢٤٢٩ في اللقطة؛ ومسلم: اللقطة: ١؛ وأبو داود: ١٧٠٥ في اللقطة؛ وابن حبان: ٤٨٨٩، وفي: ٤٨٩٨؛ والقابسي: ١٦٣، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٦ في الرهون؛ والحدثاني: ٢٩٩ في القضاء؛ والشافعي: ١٠٨٩، كلهم عن مالك به.





**٢٢٠٦-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ رَجُلاً وَجَدَ لُقَطَةً، فَجَاءَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، فَقَالَ لَهُ: إِنِّي وَجَدْتُ لُقَطَةً فَمَاذَا تَرَى فِيهَا؟ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄: عَرِّفْهَا، قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ، قَالَ: زِدْ، قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ ﵁: لاَ آمُرُكَ أَنْ تَأْكُلَهَا، وَلَوْ شِئْتَ لَمْ تَأْخُذْهَا[١].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك شتێکی ونبووی دۆزییەوە و هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ و پێی گوت: من شتێکی ونبووم دۆزیوەتەوە، جا چی دەڵێیت دەربارەی؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﵄ پێی گوت: بیناسێنە (بڵێ شتێکم دۆزیوەتەوە)، پیاوەکەش گوتی: ئەنجامم داوە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﵄ گوتی: زیاتری بکە، پیاوەکەش گوتی: ئەنجامم داوە، عەبدوڵڵا ﵁ گوتی: فەرمانت پێ ناکەم بیخۆیت، ئەگەر بتویستایە دەتتوانی هەڵینەگریتەوە (چونکە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ ﵄ ـ پێی باش نەبووە شتی ونبوو هەڵبگیرێتەوە).

## ٣٩- بڕیار و دادوەری دەربارەی بەکارهێنان و لەناوبردنی شتی دۆزراوە[٢]

**٢٢٠٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: سَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْعَبْدِ يَجِدُ اللُّقَطَةَ فَيَسْتَهْلِكُهَا، قَبْلَ أَنْ تَبْلُغَ الأَجَلَ الَّذِي أُجِّلَ فِي اللُّقَطَةِ، وَذَلِكَ سَنَةٌ، أَنَّهَا فِي رَقَبَتِهِ، إِمَّا أَنْ يُعْطِيَ سَيِّدُهُ ثَمَنَ مَا اسْتَهْلَكَ غُلاَمُهُ، وَإِمَّا أَنْ يُسَلِّمَ إِلَيْهِمْ غُلاَمَهُ، وَإِنْ أَمْسَكَهَا حَتَّى يَأْتِيَ الأَجَلُ الَّذِي أُجِّلَ فِي اللُّقَطَةِ ثُمَّ اسْتَهْلَكَهَا، كَانَتْ دَيْنًا عَلَيْهِ، يُتْبَعُ بِهِ، وَلَمْ تَكُنْ فِي رَقَبَتِهِ، وَلَمْ يَكُنْ عَلَى سَيِّدِهِ فِيهَا شَيْءٌ[٣].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی کۆیلە کە شتی ونبوو دەدۆزێتەوە و بەکاری دەهێنێت و نامێنێت، بەر لەوەی بگاتە ئەو کاتەی بۆ شتی ونبوو داندراوە، کە بریتییە لە ساڵێك، ئەوە لە ئەستۆیەتی، یان دەبێ گەورەکەی نرخی ئەو شتە بدات کە کۆیلەکەی

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٧ في الرهون؛ والحدثاني: ٢٩٩أفي القضاء؛ والشيباني: ٨٥١ في العتاق؛ والشافعي: ١٠٩٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي اسْتِهْلَاكِ اللُّقَطَةَ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٨ في الرهون، عن مالك به.

بەکاری هێناوە، یان دەبێ کۆیلەکەیان تەسلیم بکات، وە ئەگەر شتەکەی هەڵگرتبوو تا ئەو کاتەی بۆ شتی ونبوو داندراوە، دواتر بەکاری هێنابوو، ئەوە دەبێتە قەرز لەسەر کۆیلەکە، لێی وەردەگیرێتەوە (کاتێ ئازاد بوو)، ناکەوێتە ئەستۆی (بەوەی فەوری بیداتەوە)، وە هیچ شتێکیش تیایدا لەسەر گەورەکەی نییە.

## ٤٠- دادوەری و بڕیاردان دەربارەی ئاژەڵی ونبوو[1]

**٢٢٠٨-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ ثَابِتَ بْنَ الضَّحَّاكِ الأَنْصَارِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ وَجَدَ بَعِيرًا بِالْحَرَّةِ، فَعَقَلَهُ، ثُمَّ ذَكَرَهُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَأَمَرَهُ عُمَرُ ﷺ أَنْ يُعَرِّفَهُ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ ﷺ: إِنَّهُ قَدْ شَغَلَنِي عَنْ ضَيْعَتِي، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: أَرْسِلْهُ حَيْثُ وَجَدْتَهُ[2].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سابیتی کوڕی زەححاکی ئەنصاری ﷺ هەواڵی پێ داوە بەوەی: (جارێکیان) وشترێکی لە ناوچەی حەڕە دۆزییەوە و پەتی کردە مل و دواتر ئەوەی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گێڕایەوە، جا ئیمامی عومەر ﷺ فەرمانی پێ کرد سێ جار بیناسێنێت (بانگەوازی بۆ بکات)، جا سابیت ﷺ پێی گوت: ئەوە من لە ئیش و کاری زەوییەکەم دەکات، ئیمامی عومەریش ﷺ پێی گوت: کەواتە بەڕەڵای بکەوە لەو شوێنەی دۆزیوتەتەوە.

**٢٢٠٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ وَهُوَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْكَعْبَةِ: مَنْ أَخَذَ ضَالَّةً، فَهُوَ ضَالٌّ[3].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە کاتێکدا پشتی بە کەعبەوە دابوو گوتی: هەر کەسێك شتێکی ونبوو بدۆزێتەوە زامنە (دەبێ هەر کاتێ خاوەنەکەی هاتەوە بیداتەوە).

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الضَّوَالِّ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧٩ في الرهون؛ والحدثاني: ٣٠٠ في القضاء؛ والشيباني: ٨٥٢ في العتاق؛ وشرح معاني الآثار: ٦٠٧٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨٠ في الرهون؛ والحدثاني: ٣٠٠أفي القضاء؛ والشيباني: ٨٥٣ في العتاق، كلهم عن مالك به.

**٢٢١٠**- وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ يَقُولُ: كَانَتْ ضَوَالُّ الإِبِلِ فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ إِبِلاً مُؤَبَّلَةً تَنَاتَجُ، لاَ يَمَسُّهَا أَحَدٌ، حَتَّى إِذَا كَانَ زَمَانُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، أَمَرَ بِتَعْرِيفِهَا، ثُمَّ تُبَاعُ، فَإِذَا جَاءَ صَاحِبُهَا، أُعْطِيَ ثَمَنَهَا[١].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە، گوێی لە ئیبنو شیهاب بووە دەیگوت: وشتری ونبوو لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وەك وشتری دەستکەوتی جیهاد وا بوو بێچوویان لە یەکدی دەبوو، کەس دەستی لێ نەدەدان، تا بوو بە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ، فەرمانی کرد (لە ترسی کەسانی خیانەتکار هەڵبگیرێتەوە) و بناسێندرێت، دواتر بفرۆشرێت، جا کە خاوەنەکەی هات، پارەکەی پێ بدرێت.

## ٤١- صەدەقە و خێرکردنی زیندوو بۆ مردوو[٢]

**٢٢١١**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ بْنِ سَعِيدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ ﷺ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، فَحَضَرَتْ أُمَّهُ الْوَفَاةُ بِالْمَدِينَةِ، فَقِيلَ لَهَا: أَوْصِي، فَقَالَتْ: فِيمَ أُوصِي؟ إِنَّمَا الْمَالُ مَالُ سَعْدٍ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ يَقْدَمَ سَعْدٌ، فَلَمَّا قَدِمَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ ﷺ، ذُكِرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ سَعْدٌ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ يَنْفَعُهَا أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ، فَقَالَ سَعْدٌ ﷺ: حَائِطُ كَذَا وَكَذَا صَدَقَةٌ عَنْهَا، لِحَائِطٍ سَمَّاهُ[٣].

واتە: لە باپیری سەعدی کوڕی عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ لە یەکێك لە جەنگەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، جا دایکی لە مەدینە مردنیی گەیشتێ (لە سەرەمەرگدا بوو)، پێی گوترا: وەسییەت

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٤ في الجمعة؛ وفي: ٢٩٨١ في الرهون؛ والحدثاني: ٣٠٠ب في القضاء؛ والشيباني: ٨٥٠ في العتاق؛ وأبو داود: ٤٨٦٧ في الأدب، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صَدَقَةُ الْحَيِّ عَنِ الْمَيِّتِ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩٩ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣٠٩ في القضاء؛ والنسائي: ٣٦٥٠ في الوصايا؛ وابن حبان: ٣٣٥٤، كلهم عن مالك به.

بکە، ئەویش گوتی: وەسییەت لە چیدا بکەم؟ ماڵ ماڵی سەعدە (خۆ هی من نییە)، جا وەفاتی کرد بەر لەوەی سەعد بگەڕێتەوە، جا کاتێ سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ گەڕایەوە، ئەوەی بۆ باس کرا، سەعدیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا سوودی پێ دەگەیەنێ من خێر و صەدەقە لەجیاتی ئەو بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، جا سەعد ﷺ گوتی: فڵان بێستان و فڵان بێستان خێر و صەدەقە بێت بۆ ئەو، ناوی بێستانەکانی هێنان.

**٢٢١٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَأُرَاهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ، تَصَدَّقَتْ، أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ[1].**

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: دایکم لەناکاو مرد، جا پێم وایە ئەگەر (وێراگەیشتبا و) قسەی بکردبا، ئەوە (وەسییەتی) خێر و صەدەقەی دەکرد، جا ئایا خێر و صەدەقە لەبری ئەو بکەم (پاداشتەکەی بۆ دەچێت)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

**٢٢١٣- وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ مِنْ بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ تَصَدَّقَ عَلَى أَبَوَيْهِ بِصَدَقَةٍ، فَهَلَكَا، فَوَرِثَ ابْنُهُمَا الْمَالَ، وَهُوَ نَخْلٌ، فَسَأَلَ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: قَدْ أُجِرْتَ فِي صَدَقَتِكَ، وَخُذْهَا بِمِيرَاثِكَ[2].**

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم بەوەی پێی گەیشتووە: پیاوێك لە ئەنصارەکان لە نەوەی حاریسی کوڕی خەزرەج خێر و صەدەقەیەکی دا بە دایك و باوکی، دواتر دایك و باوکی مردن، جا دوو کوڕەکانی ماڵە صەدەقەکەیان بەمیرات بۆ خۆیان برد، کە بریتی بوو لە دارخورما، جا (پیاوە ئەنصارییەکە) پرسیاری ئەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پاداشت درایتەوە بە صەدەقە و خێرەکەت، وە میراتەکەشت (بەشی خۆت) ببە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٠ في الوصايا؛ والبخاري: ٢٧٦٠ في الوصايا؛ والنسائي: ٣٦٤٩ في الوصايا؛ وابن حبان: ٣٣٥٣؛ وأبو يعلى الموصلي: ٤٤٣٤؛ والقابسي: ٤٧١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠١ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١٠ في القضاء، عن مالك به.

## ١- فەرمانکردن بە وەسییەت[1]

**٢٢١٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَهُ شَيْءٌ يُوصَى فِيهِ، يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ، إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ عِنْدَهُ مَكْتُوبَةٌ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی شایستەی مرۆڤی مسوڵمانە (و حەق وایە ئەنجامی بدات) کاتێ شتێکی هەبێت بۆ ئەوەی وەسییەتی دەربارە بکات ئەوەیە دوو شەو زیاتر نەمێنێتەوە و بەسەریدا تێپەڕ نەبێت حەتمەن دەبێت وەسییەتەکەی لەلا نووسرابێت (لای خۆی دایبنابێت).

**٢٢١٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمُوصِيَ إِذَا أَوْصَى فِي صِحَّتِهِ، أَوْ مَرَضِهِ بِوَصِيَّةٍ فِيهَا عَتَاقَةُ رَقِيقٍ مِنْ رَقِيقِهِ، أَوْ غَيْرُ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ يُغَيِّرُ مِنْ ذَلِكَ مَا بَدَا لَهُ، وَيَصْنَعُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ حَتَّى يَمُوتَ، وَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يَطْرَحَ تِلْكَ الْوَصِيَّةَ أَو يُبْدِلَهَا فَعَلَ، إِلاَّ أَنْ يُدَبِّرَ مَمْلُوكًا، فَإِنْ دَبَّرَ فَلاَ سَبِيلَ إِلَى تَغْيِيرِ مَا دَبَّرَ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصَي فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ، إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ عِنْدَهُ مَكْتُوبَةٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَلَوْ كَانَ الْمُوصِي لاَ يَقْدِرُ عَلَى تَغْيِيرِ وَصِيَّتِهِ، وَلاَ مَا ذُكِرَ فِيهَا مِنَ الْعَتَاقَةِ، كَانَ كُلُّ مُوصٍ قَدْ حَبَسَ مَالَهُ الَّذِي أَوْصَى فِيهِ مِنَ الْعَتَاقَةِ وَغَيْرِهَا، وَقَدْ يُوصِي الرَّجُلُ فِي صِحَّتِهِ وَعِنْدَ سَفَرِهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَالأَمْرُ عِنْدَنَا الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، أَنَّهُ يُغَيِّرُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ غَيْرَ التَّدْبِيرِ[3].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: وەسییەتکار کاتێ وەسییەتێکی کرد لە حاڵەتی ساغ و سەلامەتیدا

---

(١) ـ الأَمْرُ بِالْوَصِيَّةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨٨ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣٠٥ في القضاء؛ والشيباني: ٧٣٤ في الفرائض؛ وابن حنبل: ٥٩٣٠؛ والبخاري: ٢٧٣٨ في الوصايا؛ والنسائي: ٣٦١٦ في الوصايا؛ والقابسي: ٢٤٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨٩ في الوصايا؛ وفي: ٢٩٩٠ في الوصايا؛ وفي: ٢٩٩١ في الوصايا، عن مالك به.

یان لە حاڵەتی نەخۆشیدا کە ئازادکردنی کۆیلەیەکی تیابوو لە کۆیلەکانی یان هەر وەسیێتێکی دیکە، ئەوە بۆی هەیە لە وەسییەتەکە بگۆڕێ چۆنی بۆ دەرکەوت چاکە، وە بۆی هەیە چۆنی بوویت ئەنجامی بدات تا دەمرێت (ئەو گۆڕانکارییە هەر دەمێنێت)، وە ئەگەر حەزی کرد ئەو وەسییەتە هەر نەهێڵێت یان بیگۆڕێت ئەوە بۆی هەیە ئەنجامی بدات، تەنها (لەو حاڵەتەدا) نەبێت کە کۆیلەیەك بە مودەببەڕ ئازاد بکات (واتە بڵێت دوای مردنی من فلان کۆیلە ئازاد بێت)، جا ئەگەر ئازادکردنی بەمودەببەڕ ئەنجام دا ئەوە هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ گۆڕینی، (ئەوەشی کە باسمان کرد گۆڕانکاری بەوەی گۆڕانکاری تێدا دەکرێت و دروستە) لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی شایستەی مرۆڤی مسوڵمانە و (حەق وایە ئەنجامی بدات) بەوەی شتێکی هەبێت بگونجێ وەسییەتی دەربارە بکات ئەوەیە دوو شەو زیاتر نەمێنێتەوە و بەسەریدا تێپەڕ نەبێت حەتمەن دەبێت وەسییەتەکەی لەلا نووسرابێت (لای خۆی داینابێت).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر وەسییەتکار توانای نەشکا بەسەر گۆڕینی وەسییەتەکەی و ئەوەی باس کراوە تیایدا لە ئازادکردن، ئەوە گشت وەسییەتکارێك ماڵەکەی خۆی دەگرێتەوە کە وەسییەتی تیادا کردووە لە ئازادکردن و شتی دیکە (ناهێڵێت جێبەجێ بکرێت، چونکە وەسییەت واجب نییە)، وە جاری وا هەیە مرۆڤ لە حاڵەتی ساغ و سەلامەتی و سەفەریشی وەسییەت دەکات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: (وەسییەتکار) چۆنی بوویت لە وەسییەت دەگۆڕێت تەنها کۆیلە ئازادکردنی چاوەڕوانکراو نەبێت (کە بڵێت: وەسییەت بێت دوای مردنی من فلان کۆیلە ئازاد بێت).

## ٢- دروستییەتی وەسییەتی كەسی بچووك و عەقڵلاواز و شێتی بەین بەینە و سەفیە و ماڵبەفیڕۆدەر[1]

**٢٢١٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ قِيلَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: إِنَّ هَاهُنَا غُلاَمًا يَفَاعًا لَمْ يَحْتَلِمْ مِنْ غَسَّانَ، وَوَارِثُهُ بِالشَّامِ، وَهُوَ ذُو مَالٍ، وَلَيْسَ لَهُ هَاهُنَا إِلاَّ ابْنَةُ عَمٍّ لَهُ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: فَلْيُوصِ لَهَا، قَالَ: فَأَوْصَى لَهَا بِمَالٍ، يُقَالَ لَهُ: بِئْرُ جُشَمٍ، قَالَ عَمْرُو بْنُ سُلَيْمٍ ﷺ: فَبِيعَ ذَلِكَ الْمَالُ بِثَلاَثِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ، وَابْنَةُ عَمِّهِ الَّتِي أَوْصَى لَهَا، هِيَ: أُمُّ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو بەكری كوڕی حەزمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە بەوەی: عەمری كوڕی سولەیمی زوڕقی ﷺ هەواڵی پێ داوە بەوەی بە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گوترا: هەرزەكارێكی هۆزی غەسان لێرە هەیە باڵغ نەبووە، میراتگرانیشی لە شامن، خۆیشی خاوەن سەروەتە و هیچ كەسیشی لێرە نییە تەنها كچە مامێكی نەبێت، ئیامی عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: با وەسێتی بۆ بكا (واتە بۆ كچە مامەكەی)، دەڵێ: جا وەسییەتی بە ماڵ و سەروەتێك بۆ كرد پێی دەگوترا: بیری جوشەم، عەمری كوڕی سولەیم ﷺ گوتوویەتی: جا (دواتر) ئەو سەروەتە بە سی هەزار درهەم فرۆشرا، كچە مامەكەشی كە وەسییەتی بۆ كردبوو دایكی عەمری كوڕی سولەیمی زوڕقی بوو (كە دایكی ئەو كەسەیە كە ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

**٢٢١٧-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّ غُلاَمًا مِنْ غَسَّانَ، حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ بِالْمَدِينَةِ، وَوَارِثُهُ بِالشَّامِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ فُلاَنًا يَمُوتُ أَفَيُوصِي؟ قَالَ: فَلْيُوصِ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: وَكَانَ الْغُلاَمُ ابْنَ عَشْرِ سِنِينَ أَوِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً، قَالَ: فَأَوْصَى بِبِئْرِ جُشَمٍ، فَبَاعَهَا أَهْلُهَا بِثَلاَثِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ[3].

---

(١) ـ جَوَازُ وَصِيَّةِ الصَّغِيرِ وَالضَّعِيفِ وَالْمُصَابِ وَالسَّفِيهِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩٢ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣٠٥أفي القضاء؛ والشيباني: ٧٣٥ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩٣ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣٠٦ في القضاء، عن مالك به.

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): هەرزەکار و نەوجەوانێکی هۆزی غەسان لە مەدینە کاتی مردنی هات و میراتگرەکانیشی لە شام بوون، جا ئەو بابەتە بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ باس کرا: پێی گوترا: فڵان خەریکە دەمرێت ئایا وەسییەت بکات؟ ئەویش گوتی: با وەسییەت بکات.

ئەبو بەکری کوڕی حەزم ﷺ گوتوویەتی: هەرزەکارەکە تەمەنی دە ساڵ یان دوازدە ساڵان بوو، دەڵێ: جا وەسییەتی بە بیری جوشەم کرد، (دواتر وەسییەت بۆکراوەکە) بە سی هەزار درهەم فرۆشتی.

**٢٢١٨-** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الضَّعِيفَ فِي عَقْلِهِ، وَالسَّفِيهَ، وَالْمُصَابَ الَّذِي يُفِيقُ أَحْيَانًا، تَجُوزُ وَصَايَاهُمْ، إِذَا كَانَ مَعَهُمْ مِنْ عُقُولِهِمْ، مَا يَعْرِفُونَ مَا يُوصُونَ بِهِ، فَأَمَّا مَنْ لَيْسَ مَعَهُ مِنْ عَقْلِهِ مَا يَعْرِفُ بِذَلِكَ مَا يُوصِي بِهِ، وَكَانَ مَغْلُوبًا عَلَى عَقْلِهِ، فَلاَ وَصِيَّةَ لَهُ[1].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: ئەو کەسەی عەقڵی لاوازە و (ئەو کەسەش کە) سەفیە و ماڵ بەفیڕۆدەرە و (ئەو کەسەش کە) شێتە هەندێ جار چاك دەبێتەوە، (ئەمانە گشتیان) وەسییەتەکانیان دروستە (بۆیان هەیە وەسییەت بکەن) ئەگەر بەوەندە عەقڵەی هەیانە بزانن وەسییەت بە چی دەکەن (واتا تەمییزیان هەبێ)، بەڵام هەرچی ئەو کەسەیە کە ئەوەندە عەقڵەی نەبێ بزانێ وەسییەتی بە چی کردووە و عەقڵەکەی (بەتەواوی) دەستی بەسەر داگیراوە و نەماوە، ئەوە وەسییەتی بۆ نییە (وەسییەتەکەی دانامەزرێت).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩٤ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣٠٦أفي القضاء، عن مالك به.

## ٣- وەسییەت لە سێیەك تێپەڕ ناکات[1]

**٢٢١٩-** عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعُودُنِي، عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ بَلَغَ بِي مِنَ الْوَجَعِ مَا تَرَى، وَأَنَا ذُو مَالٍ، وَلاَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَةٌ لِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ، فَقُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: لاَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللهِ، إِلاَّ أُجِرْتَ بِهَا، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَأُخَلَّفُ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ، فَتَعْمَلَ عَمَلاً صَالِحًا، إِلاَّ ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً وَرِفْعَةً، وَلَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ، وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللهُمَّ أَمْضِ لأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلاَ تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ بْنُ خَوْلَةَ، يَرْثِي لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَنْ مَاتَ بِمَكَّةَ[2].

واتە: لە عامیری کوڕی سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام سەردانی کردم، لە ساڵی حەجی ماڵئاواییدا، بەهۆی نەخۆشییەك کە لەسەری توند کردم، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشی و ئازارەکەم گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە دەیبینی، منیش خاوەن سەروەتم و کەسیش میراتم لێ ناگرێت تەنها یەك کچم نەبێت، جا ئایا دوو لەسەر سێی ماڵەکەم بکەم بە خێر و صەدەقە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، گوتم: کەواتە نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با سێیەك بێت، (هەرچەندە) سێیەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر میراتگرەکانت دوای خۆت بەدەوڵەمەندی و زەنگینی جێ بهێڵی، ئەوە زۆر چاکترە لەوەی دوای خۆت جێیان بهێڵیت بەهەژاری و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە، وە تۆ هیچ مەسرەفێك نییە کە ئەنجامی بدەیت (بۆ کەسە نزیکەکانت) حەتمەن خوا تیایدا پاداشتت دەداتەوە

---

(١) ـ الْوَصِيَّةُ فِي الثُّلُثِ لَا يَتَعَدَّى.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩٥ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣٠٧ في القضاء؛ والشيباني: ٧٣٦ في الفرائض؛ والبخاري: ١٢٩٥ في الجنائز؛ وابن حبان: ٦٠٢٦؛ وأبي يعلى الموصلي: ٨٣٤؛ والقابسي: ٦٨، كلهم عن مالك به.

هەتا ئەوەش کە دەیخەیتە ناو دەمی خێزانەکەشتەوە، دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا (بە هۆی نەخۆشییەوە لە مەککە) جێ دەمێنم دوای هاوەڵەکانم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (خۆ جێهان خراپ نییە) تۆ جێ بمێنیت و کردەوەی چاك ئەنجام بدەیت حەتمەن پلە و بەرزبوونەوە زیاد دەکەیت، وە ڕەنگە لە ژیاندا بمێنی تاوەکوو خەڵکانێك (لە مسوڵمانان) سوودت لێ وەربگرن و خەڵکی دیکەش (لە کافرەکان) بەهۆی تۆوە زیانیان پێ بگات، پەروەردگارا کۆچکردنەکە تەواو بکە بۆ هاوەڵەکانم و نەیانگەڕێنیتەوە بۆ دواوە (بەوەی ڕێگەی کۆچکردن بەر بدەن و بگەڕێنەوە سەر حاڵی پێش کۆچکردن)، بەڵام هەژار بریتی بوو لە سەعدی کوڕی خەولە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دڵتەنگ بوو لەبەر ئەوەی لە مەککە مرد.

**٢٢٢٠- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الرَّجُلِ يُوصِي بِثُلُثِ مَالِهِ لِرَجُلٍ، وَيَقُولُ: غُلَامِي يَخْدُمُ فُلَانًا مَا عَاشَ، ثُمَّ هُوَ حُرٌّ، فَيُنْظَرُ فِي ذَلِكَ، فَيُوجَدُ الْعَبْدُ ثُلُثَ مَالِ الْمَيِّتِ، قَالَ: فَإِنَّ خِدْمَةَ الْعَبْدِ تُقَوَّمُ، ثُمَّ يَتَحَاصَّانِ، يُحَاصُّ الَّذِي أُوصِيَ لَهُ بِالثُّلُثِ بِثُلُثِهِ، وَيُحَاصُّ الَّذِي أُوصِيَ لَهُ بِخِدْمَةِ الْعَبْدِ، بِمَا قُوِّمَ لَهُ مِنْ خِدْمَةِ الْعَبْدِ، فَيَأْخُذُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ خِدْمَةِ الْعَبْدِ، أَوْ مِنْ إِجَارَتِهِ، إِنْ كَانَتْ لَهُ إِجَارَةٌ، بِقَدْرِ حِصَّتِهِ، فَإِذَا مَاتَ الَّذِي جُعِلَتْ لَهُ خِدْمَةُ الْعَبْدِ مَا عَاشَ، عَتَقَ الْعَبْدُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی وەسییەت بۆ کەسێك دەکات بە سێیەکی ماڵەکەی (دەڵێت: سێیەکی ماڵەکەم بۆ فڵان بێت)، (دواتریش) بڵێت: وەسییەت بێت کۆیلەکەم خزمەتی فڵان بکات هەتا فڵان لە ژیاندا ماوە، جا سەیر کرا و بینرا کۆیلەکە سێیەکی ماڵی مردووەکەیە (کە وەسییەتی کردووە)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خزمەتی کۆیلەکە دەقرسێندرێت و دەخەمڵێندرێت، دواتر دوو کەسەکە هەر یەکە و پشکی خۆی دەبات (بەم شێوەیە): ئەو کەسەی وەسییەتی بە سێیەکی ماڵەکە بۆ کراوە سێیەکی بۆ دادەندرێت، ئەو کەسەش کە وەسییەتی بۆ کراوە بە خزمەتکردنی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩٧ في الوصايا، عن مالك به.

لەلایەن کۆیلەکە ئەوە ئەو ئەندازەیە دەبات کە بۆی خەمڵێندراوە لە خزمەتکردنی کۆیلەکە (دوای سێیەکەکە)، جا هەر یەکەیان پشکی خۆی بەگوێرەی خۆی لە خزمەتکردنی کۆیلەکە دەبات، یان لە بەکرێدانەکەی دەبات ئەگەر کرێی هەبوو، جا ئەگەر ئەو کەسە مرد کە وەسییەت کرابوو خزمەت بکرێت هەتا لە ژیاندا ماوە ئەوە کۆیلەکە ئازاد دەبێت.

٢٢٢١- **[فتوى]** قَالَ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الَّذِي يُوصِي فِي ثُلُثِهِ، فَيَقُولُ: لِفُلَانٍ كَذَا وَكَذَا، وَلِفُلَانٍ كَذَا وَكَذَا، يُسَمِّي مَالاً مِنْ مَالِهِ، فَيَقُولُ وَرَثَتُهُ: قَدْ زَادَ عَلَى ثُلُثِهِ: فَإِنَّ الْوَرَثَةَ يُخَيَّرُونَ بَيْنَ أَنْ يُعْطُوا أَهْلَ الْوَصَايَا وَصَايَاهُمْ، وَيَأْخُذُوا جَمِيعَ مَالِ الْمَيِّتِ، وَبَيْنَ أَنْ يَقْسِمُوا لأَهْلِ الْوَصَايَا ثُلُثَ مَالِ الْمَيِّتِ، فَيُسَلِّمُوا إِلَيْهِمْ ثُلُثَهُ، فَتَكُونُ حُقُوقُهُمْ فِيهِ إِنْ أَرَادُوا بَالِغًا مَا بَلَغَ[1].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی لە سێیەکی خۆی وەسییەت دەکات و دەڵێت: ئەوەندە و ئەوەندە بۆ فڵان بێت و ئەوەندە و ئەوەندەش بۆ فڵان بێت، ناوی چەند سەروەتێك لە سەروەتەکەی بێنێت، میراتگرەکانیشی بڵێن: لە سێیەك زیاتری داناوە، ئەوە (لەو حاڵەتەدا) میراتگران سەرپشکن لە نێوان ئەوەی سەروەتەکە بە خاوەنی وەسییەتەکان ببەخشن و گشت ماڵ و سەروەتی مردووەکە ببەن، وە لە نێوان ئەوەی تەنها سێیەکی سەروەتی مردووەکە لە نێوان خاوەن وەسییەتەکان دابەش بکەن و سێیەکەکەیان تەسلیم بکەن، (چونکە) مافی میراتگرانی تیایە ئەگەر ویستیان هەر ئەندازەیەك ڕێگە پێ بدەن دەتوانن (وە دەشتوانن لە سێیەك زیاتر ڕێگە پێ نەدەن).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩٨ في الوصايا، عن مالك به.

## ٤- بابەتی ئافرەتی دووگیان و کەسی نەخۆش و ئەو کەسەی ئامادەی جەنگ دەبێت دەربارەی سەروەتەکەیان (بۆ وەسییەت)[١]

٢٢٢٢- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﵀: سَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي وَصِيَّةِ الْحَامِلِ وَفِي قَضَايَاهَا فِي مَالِهَا وَمَا يَجُوزُ لَهَا، أَنَّ الْحَامِلَ كَالْمَرِيضِ، فَإِذَا كَانَ الْمَرَضُ الْخَفِيفُ، غَيْرُ الْمَخُوفِ عَلَى صَاحِبِهِ، فَإِنَّ صَاحِبَهُ يَصْنَعُ فِي مَالِهِ مَا يَشَاءُ، وَإِذَا كَانَ الْمَرَضُ الْمَخُوفُ عَلَيْهِ، لَمْ يَجُزْ لِصَاحِبِهِ شَيْءٌ إِلاَّ فِي ثُلُثِهِ، قَالَ: وَكَذَلِكَ الْمَرْأَةُ الْحَامِلُ أَوَّلُ حَمْلِهَا بِشْرٌ وَسُرُورٌ، وَلَيْسَ بِمَرَضٍ وَلاَ خَوْفٍ، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ:﴿ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾ هود، وَقَالَ:﴿ حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ ﴾ الأعراف.

قَالَ: فَالْمَرْأَةُ الْحَامِلُ إِذَا أَثْقَلَتْ، لَمْ يَجُزْ لَهَا قَضَاءٌ إِلاَّ فِي ثُلُثِهَا، فَأَوَّلُ الإِتْمَامِ سِتَّةُ أَشْهُرٍ، قَالَ اللهُ ﷻ فِي كِتَابِهِ:﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة، وَقَالَ: ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴿١٥﴾ ﴾ الأحقاف، فَإِذَا مَضَتْ لِلْحَامِلِ سِتَّةُ أَشْهُرٍ مِنْ يَوْمَ حَمَلَتْ، لَمْ يَجُزْ لَهَا قَضَاءٌ فِي مَالِهَا، إِلاَّ فِي الثُّلُثِ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەیگوت: باشترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی وەسییەتی ئافرەتی دووگیان و بڕیارە شەرعییەکان دەربارەی ماڵ و سەروەتەکەی و ئەوەی بۆی دروستە، ئەوەیە: ئافرەتی دووگیان (حوکمەکەی) وەك کەسی نەخۆش وایە، ئەگەر نەخۆشییەکە سووك بێت ترسی مردن لەسەر خاوەنەکەی نەبێت، ئەوە خاوەنەکەی چۆنی بووێت ئاوا لە ماڵەکەی دەکات، وە ئەگەر نەخۆشییەکە ترسی لەسەر بوو، ئەوە بۆ خاوەنەکەی دروست نییە (وەسییەت بکات) تەنها لە سێیەکی ماڵەکەی نەبێت، ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئافرەتی دووگیان بە هەمان شێوەیە، سەرەتای دووگیانی موژدە و خۆشییە، نەخۆشی و ترس بوونی نییە، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ لە

---

(١) ـ أَمْرُ الْحَامِلِ وَالْمَرِيضِ وَالَّذِي يَحْضُرُ الْقِتَالَ فِي أَمْوَالِهِمْ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٣ في الوصايا، عن مالك به.

پەرتووکەکەیدا دەفەرمووێ: ﴿فَبَشَّرۡنَـٰهَا بِإِسۡحَـٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَـٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾﴾ هود، واتە: [موژدەمان دا بە لەدایکبوونی ئیسحاق وە لە پاش ئیسحاق موژدەماندا بە لەدایکبوونی یەعقوب (کە دەبێتە کوڕی ئیسحاق)]، وە دەفەرمووێ: ﴿حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفًا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَـٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾﴾ الأعراف، واتە: [دووگیان بوو بەسووکی (واتە سەرەتای دووگیانی دەستی پێ کرد) ئینجا ماوەیەك تێ پەڕی و حەملەکەی قورس بوو، هەردووکیان (ژن و مێردەکە) لە خوا ﷻ پاڕانەوە سوێند بێت ئەگەر تۆ منداڵێکی چاك و تەواومان پێ بدەیت بێ گومان لە سوپاسگوزاران دەبین].

گوتوویەتی: جا ئافرەتی دووگیان کاتێ نەخۆشییەکەی سەخت بوو، بۆی دروست نییە بڕیار لەسەر سەروەتەکەی بدات تەنها لە سێیەکی نەبێت، جا سەرەتای سەختبوونی نەخۆشییەکەی شەش مانگییە، خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَـٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ ﴿٢٣٣﴾﴾ البقرة، واتە: [با دایکان دوو ساڵی تەواو شیر بدەن بە مناڵەکانیان]، وە فەرموویەتی: ﴿وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ ثَلَـٰثُونَ شَهۡرًاۚ ﴿١٥﴾﴾ الأحقاف، واتە: [(ماوەی) دووگیانبوون و لێکردنەوە لە شیر سی مانگە]، (کەواتە دوو ساڵی شیرپێدان لە سی مانگ بێتە دەرەوە شەش مانگ بۆ حەمل دەمێنێتەوە)، جا ئەگەر شەش مانگ بەسەر ئافرەتی دووگیاندا تێ پەڕی لەو ڕۆژەوەی حەملی پەیدا بووە، ئەوە بۆی نییە بڕیار لەسەر ماڵەکەی بدات تەنها لە سێیەك نەبێت.

**٢٢٢٣- [فتوى]** قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الرَّجُلِ يَحْضُرُ الْقِتَالَ: إِنَّهُ إِذَا زَحَفَ فِي الصَّفِّ لِلْقِتَالِ، لَمْ يَجُزْ لَهُ أَنْ يَقْضِيَ فِي مَالِهِ شَيْئًا، إِلاَّ فِي الثُّلُثِ، وَإِنَّهُ بِمَنْزِلَةِ الْحَامِلِ وَالْمَرِيضِ الْمَخُوفِ عَلَيْهِ، مَا كَانَ بِتِلْكَ الْحَالِ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی پیاوێك کە ئامادەی جەنگ بێت، گوتوویەتی: ئەگەر چووە ناو ڕیزەوە بۆ شەڕ، ئەوە بۆی دروست نییە هیچ بڕیارێك دەربارەی ماڵ و سەروەتەکەی دەربکات تەنها لە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٤ في الوصايا، عن مالك به.

سێیەكدا نەبێت، چونكە وەك ئافرەتی دووگیان و كەسی نەخۆش وایە كە ترسی لەسەر هەبێت بمرێت، مادەم لەو حاڵەتەدا بێت (واتە مادەم خەتەری لەسەر بێت).

### ٥- وەسییەتكردن و سەروەت و سامان كردنە موڵك بۆ میراتگر[١]

**٢٢٢٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي هَذِهِ الآيَةِ: إِنَّهَا مَنْسُوخَةٌ، قَوْلُ اللهِ ﷻ: ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ﴿١٨٠﴾﴾ البقرة، نَسَخَهَا مَا نَزَلَ مِنْ قِسْمَةِ الْفَرَائِضِ، فِي كِتَابِ اللهِ ﷻ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەم ئایەتە دەیگوت مەنسوخە ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ﴿١٨٠﴾﴾ البقرة، واتە: [ئەگەر سەروەتی لە پاش بەجێ ما با وەسییەت بۆ دایك و باوك و خزمە نزیكەكانی بكات]، ئایەتەكانی دابەشكردنی میرات نەسخیان كردەوە لە پەرتووكی خوادا ﷻ.

**٢٢٢٥- [فتوى]** قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: السُّنَّةُ الثَّابِتَةُ عِنْدَنَا الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا: أَنَّهُ لاَ تَجُوزُ وَصِيَّةٌ لِوَارِثٍ، إِلاَّ أَنْ يُجِيزَ لَهُ ذَلِكَ وَرَثَةُ الْمَيِّتِ، وَأَنَّهُ إِنْ أَجَازَ لَهُ بَعْضُهُمْ، وَأَبَى بَعْضٌ، جَازَ لَهُ حَقُّ مَنْ أَجَازَ مِنْهُمْ، وَمَنْ أَبَى، أَخَذَ حَقَّهُ مِنْ ذَلِكَ[٣].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ڕێبازی چەسپاو لەلای ئێمە كە ڕاجیایی تیا نییە لە وەسییەتدا ئەوەیە: وەسییەت بۆ میراتگر دروست نییە، تەنها لەو كاتە نەبێت كە میراتگرانی مردوو خۆیان مۆڵەت بدەن و جێبەجێی بكەن، جا ئەگەر هەندێكیان مۆڵەتیان پێ دا و هەندێكیشیان ڕەتیان كردەوە، ئەوە لە پشكی ئەوانەی ڕێگەیان داوە جێبەجێ دەكرێت و ئەوانەشی كە ڕەتیان كردۆتەوە حەقی خۆیان لە وەسییەتەكە وەردەگرن و (وەسییەتەكە بە ئەندازەی پشكی ئەوان ڕەت دەكرێتەوە و جێبەجێ ناكرێت).

---

(١) ـ الْوَصِيَّةُ لِلْوَارِثِ وَالْحِيَازَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٥ في الوصايا، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٦ في الوصايا، عن مالك به.





**٢٢٢٦- [فتوى]** قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الْمَرِيضِ الَّذِي يُوصِي فَيَسْتَأْذِنُ وَرَثَتَهُ فِي وَصِيَّتِهِ وَهُوَ مَرِيضٌ: لَيْسَ لَهُ مِنْ مَالِهِ إِلاَّ ثُلُثُهُ، فَيَأْذَنُونَ لَهُ أَنْ يُوصِيَ لِبَعْضِ وَرَثَتِهِ بِأَكْثَرَ مِنْ ثُلُثِهِ، إِنَّهُ لَيْسَ لَهُمْ أَنْ يَرْجِعُوا فِي ذَلِكَ، وَلَوْ جَازَ ذَلِكَ لَهُمْ، صَنَعَ كُلُّ وَارِثٍ ذَلِكَ، فَإِذَا هَلَكَ الْمُوصِي، أَخَذُوا ذَلِكَ لأَنْفُسِهِمْ، وَمَنَعُوهُ الْوَصِيَّةَ فِي ثُلُثِهِ، وَمَا أُذِنَ لَهُ بِهِ فِي مَالِهِ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو نەخۆشەی وەسییەت دەكات و مۆڵەت و ئیزن لە میراتگرەكانی وەردەگرێت لە وەسییەتەكەیدا، لە كاتێكدا نەخۆشە و لە ماڵەكەیدا بۆی نییە تەصەڕوف بكات جگە لە سێیەكی، جا مۆڵەتیان پێ دا بەوەی وەسییەت بۆ یەكێك لە میراتگران بكات بە زیاتر لە سێیەك، ئیمامی مالیك ﷺ دەیگوت: بۆیان نییە لەوە پەشیمان ببنەوە، چونكە ئەگەر بۆیان دروست بێت پەشیمان ببنەوە، ئەوە گشت میراتگرێك ئاوا دەكات، جا كاتێ وەسییەتكارەكە وەفاتی كرد شتەكە بۆ خۆیان دەبەن و لە سێیەكەكە و ئەوەشی كە مۆڵەتی دراوە لە ماڵەكەیدا مەحرومی دەكەن (ئەوەش نابێت، چونكە كاتێ مۆڵەتیان داوە لە كاتی نەخۆشی نیشانەی ئەوەیە لە ماڵی خۆشیان مۆڵەتیان پێ داوە كە نەخۆشییەكە ئاماژەیە بۆیان بەوەی ماڵەكە بۆ ئەوان بۆتە میرات).

**٢٢٢٧- [فتوى]** قَالَ: فَأَمَّا أَنْ يَسْتَأْذِنَ وَرَثَتَهُ فِي وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا لِوَارِثٍ فِي صِحَّتِهِ، فَيَأْذَنُونَ لَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَلْزَمُهُمْ، وَلِوَرَثَتِهِ أَنْ يَرُدُّوا ذَلِكَ إِنْ شَاؤُوا، وَذَلِكَ أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا كَانَ صَحِيحًا، كَانَ أَحَقَّ بِجَمِيعِ مَالِهِ، يَصْنَعُ فِيهِ مَا شَاءَ، إِنْ شَاءَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْ جَمِيعِهِ، خَرَجَ فَيَتَصَدَّقُ بِهِ، أَوْ يُعْطِيهِ مَنْ شَاءَ، وَإِنَّمَا يَكُونُ اسْتِئْذَانُهُ وَرَثَتَهُ جَائِزًا عَلَى الْوَرَثَةِ، إِذَا أَذِنُوا لَهُ حِينَ يُحْجَبُ عَنْهُ مَالُهُ، وَلاَ يَجُوزُ لَهُ شَيْءٌ إِلاَّ فِي ثُلُثِهِ، وَحِينَ هُمْ أَحَقُّ بِثُلُثَيْ مَالِهِ مِنْهُ، فَذَلِكَ حِينَ يَجُوزُ عَلَيْهِمْ أَمْرُهُمْ وَمَا أَذِنُوا لَهُ بِهِ، فَإِنْ سَأَلَ بَعْضَ وَرَثَتِهِ أَنْ يَهَبَ لَهُ مِيرَاثَهُ حِينَ تَحْضُرُهُ الْوَفَاةُ فَيَفْعَلُ، ثُمَّ لاَ يَقْضِي فِيهِ الْهَالِكُ شَيْئًا، فَإِنَّهُ رَدٌّ عَلَى مَنْ وَهَبَهُ، إِلاَّ أَنْ يَقُولَ لَهُ الْمَيِّتُ: فُلاَنٌ، لِبَعْضِ وَرَثَتِهِ ضَعِيفٌ، وَقَدْ أَحْبَبْتُ أَنْ تَهَبَ لَهُ مِيرَاثَكَ فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ جَائِزٌ إِذَا سَمَّاهُ الْمَيِّتُ لَهُ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٧ في الوصايا؛ وفي: ٣٠٠٨ في الوصايا، عن مالك به.

قَالَ: فَإِنْ وَهَبَ لَهُ مِيرَاثَهُ، ثُمَّ أَنْفَذَ الْهَالِكُ بَعْضَهُ وَبَقِيَ بَعْضٌ، فَهُوَ رَدٌّ عَلَى الَّذِي وَهَبَ، يَرْجِعُ إِلَيْهِ مَا بَقِيَ بَعْدَ وَفَاةِ الَّذِي أُعْطِيَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەوەیە کە مۆڵەت وەربگرێت لە میراتگرانی دەربارەی وەسییەتێکی بۆ میراتگرێك لە حاڵەتی ساغیدا و ئەوانیش مۆڵەتی بدەن، ئەوە لەسەریان ناچەسپێ، میراتگرانی بۆیان هەیە ئەوە ڕەت بکەنەوە ئەگەر بیانەوێت، لەبەر ئەوەی کاتێ کەسەکە ساغە، ئەوە خۆی شایستەترە بە گشت ماڵەکەی خۆی، چۆنی بووێت وای لێ دەکات، ئەگەر بیەوێت دەتوانێت لە گشت سەروەتەکەی خۆی بێتە دەرەوە و بیکات بە خێر و صەدەقە یان بیبەخشێت بە هەر کەسێك کە دەیەوێت، جا تەنها لەو کاتە مۆڵەتوەرگرتنەکەی جێبەجێ دەکرێت بەسەر میراتگرەکان و پەیوەست دەبن پێوەی، ئەگەر مۆڵەتیان پێ دا کاتێ ماڵەکەی قەدەغە دەکرێت و بڕیارەکانی جێبەجێ ناکرێت تەنها لە سێیەکەکەی نەبێت، کاتێ میراتگرەکان شایستەتر بن لە وەسییەتکارەکە بە دوو لەسەر سێی ماڵەکە، ئەوەش لەو کاتە دەبێت کە کارەکەی خۆیان و ئەوەی مۆڵەتیان پێ داوە لەسەریان جێبەجێ دەکرێت، جا ئەگەر نەخۆشەکە داوای لە یەکێك لە میراتگرانی کرد میراتی خۆی پێ ببەخشێت لەو کاتەی خەریکە دەمرێت، ئەویش ئەنجامی دا، دواتر مردووەکە هیچ بڕیاری دیکەی دەرنەکرد، ئەوە سەروەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی بەخشیویەتی، تەنها لەو کاتە نەبێت کە مردووەکە پێی بڵێت: بۆ فڵانە کەس بێت، بۆ یەکێك لە میراتگرانی لاواز، وە حەز دەکەم میراتەکەتی بەبەخشش بدەیتێ، ئەویش پێی بدات، ئەوە جێبەجێ دەکرێت ئەگەر مردووەکە ناوی کەسەکەی بۆ بهێنێت.

گوتوویەتی: ئەگەر میراتی خۆی پێ بەخشی، دواتر مردووەکە بڕیاری دەربارەی هەندێکی دەرکرد و هەندێك مایەوە، ئەوە ئەوەی ماوەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کردوویەتی بە دیاری دوای مردنی ئەو کەسەی پێی بەخشرا.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٧ في الوصايا؛ وفي: ٣٠٠٨ في الوصايا، عن مالك به.

٢٢٢٨- [فتوى] قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِيمَنْ أَوْصَى بِوَصِيَّةٍ، فَذَكَرَ أَنَّهُ قَدْ كَانَ أَعْطَى بَعْضَ وَرَثَتِهِ شَيْئًا لَمْ يَقْبِضْهُ، فَأَبَى الْوَرَثَةُ أَنْ يُجِيزُوا ذَلِكَ، فَإِنَّ ذَلِكَ يَرْجِعُ إِلَى الْوَرَثَةِ مِيرَاثًا عَلَى كِتَابِ اللهِ، لأَنَّ الْمَيِّتَ لَمْ يُرِدْ أَنْ يَقَعَ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ فِي ثُلُثِهِ، وَلاَ يُحَاصُّ أَهْلُ الْوَصَايَا فِي ثُلُثِهِ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ[1].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی وەسییەتێك دەکات و باسی ئەوە دەکات شتێکی داوەتە یەکێك لە میراتگرانی کە هێشتا وەرینەگرتووە و میراتگرەکانی دیکەش ڕازی نین ئەوە جێبەجێ بکەن، دەیگوت: ئەو شتە دەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەکان و دەبێتەوە میرات بەپێی میراتی قورئان، (وەسییەتەکە جێبەجێ ناکرێت) چونکە مردووەکە نەیویستووە ئەو شتە بکەوێتە ناو سێیەکەکەی (کە دوای مردنی بۆی هەیە)، خاوەنی وەسییەتەکان هیچ پشکێکیان بۆ نییە لە سێیەکەکەی.

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی پیاوی ژنانی و دەربارەی ئەو کەسەی شایستەترە بە منداڵ (کاتێ کێشەی لەسەر دروست دەبێ)[2]

٢٢٢٩- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ مُخَنَّثًا كَانَ عِنْدَ أُمِّ سَلَمَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يَسْمَعُ: يَا عَبْدَ اللهِ، إِنْ فَتَحَ اللهُ عَلَيْكُمُ الطَّائِفَ غَدًا، فَأَنَا أَدُلُّكَ عَلَى ابْنَةِ غَيْلاَنَ، فَإِنَّهَا تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ، وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَدْخُلَنَّ هَؤُلاَءِ عَلَيْكُمْ[3].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێکی ژنانی لەلای ئوممو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، جا لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ بوو (پیاوە ژنانییەکە) بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەیەی گوت: ئەی عەبدوڵڵا ئەگەر خوا تائیفی بۆ ڕزگار

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠٩ في الوصايا، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْمُؤَنَّثِ مِنَ الرِّجَالِ وَمَنْ أَحَقُّ بِالْوَلَدِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٧ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١١ب في القضاء، عن مالك به.

کردن، من کچەکەی غەیلانت پێ نیشان دەدەم، (زۆر سەرنجڕاکێشە) کە لەپێشەوە دێت بە چوار لۆچ دێت، وە لەدواوە بە هەشت لۆچ (واتە ئاوا قەڵەو و پڕ و سەرنجڕاکێشە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با ئەو جۆرە کەسانە نەیەنە لاتان.

**٢٢٣٠**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ رَحِمَهُ اللَّهُ يَقُولُ: كَانَتْ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَوَلَدَتْ لَهُ عَاصِمَ بْنَ عُمَرَ، ثُمَّ إِنَّهُ فَارَقَهَا، فَجَاءَ عُمَرُ رضي الله عنه قُبَاءً، فَوَجَدَ ابْنَهُ عَاصِمًا يَلْعَبُ بِفِنَاءِ الْمَسْجِدِ، فَأَخَذَ بِعَضُدِهِ، فَوَضَعَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ عَلَى الدَّابَّةِ، فَأَدْرَكَتْهُ جَدَّةُ الْغُلَامِ، فَنَازَعَتْهُ إِيَّاهُ، حَتَّى أَتَيَا أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رضي الله عنه، فَقَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: ابْنِي، وَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: ابْنِي، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: خَلِّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ، قَالَ: فَمَا رَاجَعَهُ عُمَرُ الْكَلَامَ.

قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا رَحِمَهُ اللَّهُ يَقُولُ: وَهَذَا الأَمْرُ الَّذِي آخُذُ بِهِ فِي ذَلِكَ[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە رَحِمَهُ اللَّهُ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە قاسمی کوڕی موحەممەد بوو دەیگوت: ئافرەتێکی ئەنصاری خێزانی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه بوو و عاصمی کوڕی عومەری لێ بوو، دواتر لێی جیا بۆیەوە (تەڵاقی دا)، جا (جارێکیان) ئیمامی عومەر رضي الله عنه چوو بۆ قوباء و عاصمی کوڕی بینی یاری دەکات لە حەوشەی مزگەوت، جا باسکی گرت و لە پێشی خۆی داینا لەسەر وڵاغ، جا داپیری منداڵەکە پێی گەیشت و کێشەی لەگەڵ کرد (بەوەی منداڵەکە هی عومەر نییە هی ئەوانە)، تا چوون بۆ لای ئیمامی ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه، ئیمامی عومەر رضي الله عنه گوتی: کوڕی منە، ئافرەتەکەش گوتی: کوڕی منە (واتە نەوەی منە)، ئیمامی ئەبو بەکریش رضي الله عنه گوتی: لێی بگەڕێ لە نێوان عومەر و داپیرە (کامیان هەڵبژێرێ بۆ ئەوە)، جا ئیمامی عومەر چیدی نەگەڕایەوە بۆ قسەکەی خۆی (ڕازی بوو بە حەق و دادوەری هەر چەندە تاڵیش بێ).

یەحیا رَحِمَهُ اللَّهُ گوتوویەتی: جا گوێم لە ئیمامی مالیك رَحِمَهُ اللَّهُ بوو دەیگوت: ئەوە بریتییە لەوەی وەردەگیرێ و کاری پێ دەکرێ دەربارەی ئەو بابەتە.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠١٦ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١١ في القضاء، عن مالك به.

## ٧- عەیب و زامنبوون لە کاڵادا[١]

**٢٢٣١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الرَّجُلِ يَبْتَاعُ السِّلْعَةَ مِنَ الْحَيَوَانِ أَوِ الثِّيَابِ أَوِ الْعُرُوضِ: فَيُوجَدُ ذَلِكَ الْبَيْعُ غَيْرَ جَائِزٍ فَيُرَدُّ وَيُؤْمَرُ الَّذِي قَبَضَ السِّلْعَةَ أَنْ يَرُدَّ إِلَى صَاحِبِهِ سِلْعَتَهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَلَيْسَ لِصَاحِبِ السِّلْعَةِ إِلاَّ قِيمَتُهَا يَوْمَ قُبِضَتْ مِنْهُ، وَلَيْسَ يَوْمَ يَرُدُّ ذَلِكَ إِلَيْهِ، وَذَلِكَ أَنَّهُ ضَمِنَهَا مِنْ يَوْمَ قَبَضَهَا، فَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ نُقْصَانٍ بَعْدَ ذَلِكَ، كَانَ عَلَيْهِ، فَبِذَلِكَ كَانَ نَمَاؤُهَا وَزِيَادَتُهَا لَهُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ يَقْبِضُ السِّلْعَةَ فِي زَمَانٍ هِيَ فِيهِ نَافِقَةٌ مَرْغُوبٌ فِيهَا، ثُمَّ يَرُدُّهَا فِي زَمَانٍ هِيَ فِيهِ سَاقِطَةٌ لاَ يُرِيدُهَا أَحَدٌ، فَيَقْبِضُ الرَّجُلُ السِّلْعَةَ مِنَ الرَّجُلِ، فَيَبِيعُهَا بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، أَوْ يُمْسِكُهَا وَثَمَنُهَا ذَلِكَ، ثُمَّ يَرُدُّهَا، وَإِنَّمَا ثَمَنُهَا دِينَارٌ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَذْهَبَ مِنْ مَالِ الرَّجُلِ بِتِسْعَةِ دَنَانِيرَ، أَوْ يَقْبِضُهَا مِنْهُ الرَّجُلُ فَيَبِيعُهَا بِدِينَارٍ، أَوْ يُمْسِكُهَا، وَإِنَّمَا ثَمَنُهَا دِينَارٌ، ثُمَّ يَرُدُّهَا وَقِيمَتُهَا يَوْمَ يَرُدُّهَا عَشَرَةُ دَنَانِيرَ، فَلَيْسَ عَلَى الَّذِي قَبَضَهَا أَنْ يَغْرَمَ لِصَاحِبِهَا مِنْ مَالِهِ تِسْعَةَ دَنَانِيرَ، إِنَّمَا عَلَيْهِ قِيمَةُ مَا قَبَضَ يَوْمَ قَبْضِهِ.

قَالَ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَنَّ السَّارِقَ إِذَا سَرَقَ السِّلْعَةَ، فَإِنَّمَا يُنْظَرُ إِلَى ثَمَنِهَا يَوْمَ سَرَقَهَا، فَإِنْ كَانَ يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ كَانَ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَإِنِ اسْتَأْخَرَ قَطْعُهُ إِمَّا فِي سِجْنٍ يُحْبَسُ فِيهِ، حَتَّى يُنْظَرَ فِي شَأْنِهِ، وَإِمَّا أَنْ يَهْرُبَ السَّارِقُ، ثُمَّ يُوجَدُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَلَيْسَ اسْتِئْخَارُ قَطْعِهِ بِالَّذِي يَضَعُ عَنْهُ حَدًّا قَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ يَوْمَ سَرَقَ، إِنْ رَخُصَتْ تِلْكَ السِّلْعَةُ بَعْدَ ذَلِكَ، وَلاَ بِالَّذِي يُوجِبُ عَلَيْهِ قَطْعًا لَمْ يَكُنْ وَجَبَ عَلَيْهِ يَوْمَ أَخَذَهَا، إِنْ غَلَتْ تِلْكَ السِّلْعَةُ بَعْدَ ذَلِكَ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی کاڵایەك لە ئاژەڵ یان پۆشاك یان کەلوپەل دەکڕێت و دەبینێت ئەو مامەڵە دروست نییە، جا دەگەڕێندرێتەوە و فەرمان دەکرێت بەو کەسەی کاڵاکەی وەرگرتووە کاڵاکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خاوەنی کاڵاکە جگە لە نرخی کاڵاکە لەو ڕۆژەی وەرگیراوە هیچی دیکەی بۆ نییە، نرخی ئەو ڕۆژە حیساب نییە کە کاڵاکەی بۆ دەگەڕێندرێتەوە، چونکە کڕیارەکە زامنی بووە لەو ڕۆژەی وەریگرتووە، دوای ئەوە هەر کەموکوڕییەکی بکەوێتە



ناو لەسەر (کڕیارەکە) خۆیەتی، هەر لەبەر ئەوەشە گەشە و زیادبوونەکەشی بۆ ئەوە، پیاو هەیە کاڵایەك وەردەگرێت لە زەمانێك کاڵاکە تیایدا بەرەواجە، دواتر لە زەمانێك دەیگەڕێنێتەوە کاڵاکە تیایدا بێرەواجە و کەس نایەوێ، (بۆ نموونە) کەسێك کاڵایەك لە کەسێك (دەکڕێت) و وەریدەگرێت و دەیفرۆشێتەوە بە دە دینار، یان لەلای خۆی دەیهێڵێتەوە لە کاتێکدا نرخەکەی ئاوایە (دە دینارە)، دواتر دەیگەڕێنێتەوە لە کاتێکدا نرخەکەی یەك دینارە (نرخی دابەزیوە)، بۆی نییە نۆ دیناری ئەو پیاوە لەناو ببات کە لێی کڕیوە (کە ئەو کات بە دە دینار بووە)، یان پیاوەکە لێی وەربگرێت و و بیفرۆشێت بە دینارێك یان لەلای خۆی بیهێڵێتەوە لە کاتێکدا نرخەکەی یەك دینارە، دواتر بیگەڕێنێتەوە لە کاتێکدا لەو ڕۆژەی دەیگەڕێنێتەوە نرخی دە دینارە، ئەوە ئەو کەسەی وەریگرتووە لەسەری نییە لە سەروەتی خۆی نۆ دینار بدات بە خاوەنی کاڵاکە، تەنها نرخی ئەو ڕۆژەی لەسەرە کە وەریگرتووە.

گوتوویەتی: ئەوەی ئەو بابەتە ڕوون دەکاتەوە ئەوەیە: دز کاتێ شتێك دەدزێت، سەیری نرخی شتەکە دەکرێت لەو ڕۆژەی دزیویەتی، ئەگەر دەستبڕینی تیا بوو ئەوە دەستبڕینی لەسەرە، هەرچەندە دەستبڕینەکەی دوا بکەوێت لە زیندانێك کە تیایدا بەند بکرێت تا سەیری حاڵەتەکەی بکرێت، یان (دوا بکەوێت بەوەی) دزەکە هەڵبێت، دواتر بگیرێت، ئەوە دواکەوتنی دەستبڕینەکەی ئەو سزایەی لەسەر لانادات کە لەسەری واجب بووە لەو ڕۆژەی دزی کردووە، ئەگەر کاڵایەکە دوای ئەوە هەرزان ببوو، وە سزای دەستبڕینیشی لەسەر واجب ناکات کە دەستبڕین واجب نەبوویێت لەو ڕۆژەی دزیویەتی، ئەگەر کاڵاکە نرخی گران بوو دوای ئەوەی ئەو دزی.




## ٨- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی دادوەری و ناپەسەندییەکەی[١]

**٢٢٣٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ ﷺ كَتَبَ إِلَى سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ ﷺ: أَنْ هَلُمَّ إِلَى الأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ سَلْمَانُ ﷺ: إِنَّ الأَرْضَ لاَ تُقَدِّسُ أَحَدًا، وَإِنَّمَا يُقَدِّسُ الإِنْسَانَ عَمَلُهُ، وَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّكَ جُعِلْتَ طَبِيبًا تُدَاوِي، فَإِنْ كُنْتَ تُبْرِئُ فَنَعِمَّا لَكَ، وَإِنْ كُنْتَ مُتَطَبِّبًا، فَاحْذَرْ أَنْ تَقْتُلَ إِنْسَانًا فَتَدْخُلَ النَّارَ. فَكَانَ أَبُو الدَّرْدَاءِ ﷺ، إِذَا قَضَى بَيْنَ اثْنَيْنِ، ثُمَّ أَدْبَرَا عَنْهُ نَظَرَ إِلَيْهِمَا، وَقَالَ: ارْجِعَا إِلَيَّ أَعِيدَا عَلَيَّ قِصَّتَكُمَا، مُتَطَبِّبٌ وَاللَّهِ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو دەرداء ﷺ بۆ سەلمانی فارسیی ﷺ نووسی: وەرە بۆ خاکی پیرۆز (شام)، سەلمانی فارسیش ﷺ بۆی نووسی: خاك کەس پیرۆز ناکات، بەڵکوو مرۆڤ بە کردەوەی خۆی پیرۆز دەبێت، وە پێم گەیشتووە بوویتەتە دکتۆر چارەسەر ئەنجام دەدەیت (واتە بوویتەتە دادوەر، بۆیە دەڵێت دکتۆر چونکە وەك دکتۆر شتێك چارەسەر دەکات، بەڵام چارەسەرەکەی ئەو بریتییە لە کێشەی مەعنەوی)، جا ئەگەر چارەسەر ئەنجام بدەیت ئەوە زۆر چاکە بۆت، (بەڵام) ئەگەر خۆت کردبێتە دکتۆر (واتە خۆت کردبێتە دادوەر و چارەسەریش نەزانیت)، ئەوە وریا بە و بترسە لەوەی مرۆڤێك بکوژیت و بچیتە دۆزەخ، جا ئەبو دەرداء کاتێ دادوەری لە نێوان دوو کەس ئەنجام دەدا و دواتر دوو کەسەکە پشتیان تێ دەکرد تا بڕۆن، سەیری دەکردن و دەیگوت: بگەڕێنەوە بۆ لام و چیرۆکەکەتانم بۆ دووبارە بکەنەوە، خۆی کردبوو بە پزیشك (بە دادوەر) سوێند بە خوا (بەبێ چارەسەر).

**٢٢٣٣-** [فتوى] قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: مَنِ اسْتَعَانَ عَبْدًا بِغَيْرِ إِذْنِ سَيِّدِهِ فِي شَيْءٍ لَهُ بَالٌ، وَلِمِثْلِهِ إِجَارَةٌ، فَهُوَ ضَامِنٌ لِمَا أَصَابَ الْعَبْدَ، إِنْ أُصِيبَ الْعَبْدُ بِشَيْءٍ، وَإِنْ سَلِمَ الْعَبْدُ، فَطَلَبَ سَيِّدُهُ إِجَارَتَهُ لِمَا عَمِلَ، فَذَلِكَ لِسَيِّدِهِ، وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا[٣].

---

(١) ـ جَامِعُ الْقَضَاءِ وَكَرَاهِيَتِهِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢٢ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١٣ في القضاء، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨٤ في الأقضية، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷀ بوو دەیگوت: هەر کەسێك کار بە کۆیلەیەك بکات بەبێ مۆڵەتی گەورەکەی لە شتێکدا کە جێی بایەخە و هاوشێوەی ئەو کارە کرێی بۆ هەیە، ئەوە زامنە لەوەی کۆیلەکە تووشی دەبێت ئەگەر تووشی شتێك بوو (شوێنێکی شکا یان مرد)، وە ئەگەر سەلامەت بوو و گەورەکەی داوای کرێی ئەو کارەی کرد کە کردوویەتی، ئەوە گەورەکەی ئەوەی بۆ هەیە، بابەتەکەش لای ئێمە ئاوایە.

**٢٢٣٤- [فتوى]** قَالَ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷀ يَقُولُ فِي الْعَبْدِ: يَكُونُ بَعْضُهُ حُرًّا وَبَعْضُهُ مُسْتَرَقًّا، إِنَّهُ يُوقَفُ مَالُهُ بِيَدِهِ، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُحْدِثَ فِيهِ شَيْئًا، وَلَكِنَّهُ يَأْكُلُ فِيهِ وَيَكْتَسِي بِالْمَعْرُوفِ، فَإِذَا هَلَكَ، فَمَالُهُ لِلَّذِي بَقِيَ لَهُ فِيهِ مِنَ الرِّقِّ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷀ بوو دەربارەی کۆیلە کە بەشێکی ئازاد بێت و بەشێکی کۆیلە بێت، دەیگوت: ماڵەکەی لەدەستی خۆی ڕادەگیرێ، بۆی نییە هیچی لێ بکات، بەڵکوو لێی دەخوات و پۆشاك بۆخۆی دەکات بە شێوازێکی چاك (بەبێ زیادەڕەوی)، جا کاتێ مرد، ماڵەکەی بۆ ئەو کەسەیە کە کۆیلایەتییەکەی ئەوی ماوە (کە بەشێکی هێشتا کۆیلەیە بۆ ئەو).

**٢٢٣٥- [فتوى]** قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷀ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْوَالِدَ يُحَاسِبُ وَلَدَهُ بِمَا أَنْفَقَ عَلَيْهِ مِنْ يَوْمِ يَكُونُ لِلْوَلَدِ مَالٌ، نَاضًّا كَانَ أَوْ عَرَضًا، إِنْ أَرَادَ الْوَالِدُ ذَلِكَ[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷀ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە باوك حیساب لەگەڵ منداڵەکەی دەکات لەو مەسرەفەی لێی دەکات لەو ڕۆژەوەی منداڵەکە سەروەتی پەیدا بووە، جا سەروەتەکە پارە و پول بێت یان زەوی، ئەگەر باوکەکە ئەوەی ویست.

**٢٢٣٦-** عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ دَلاَفٍ الْمُزَنِيِّ ﷀ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ جُهَيْنَةَ كَانَ يَسْبِقُ الْحَاجَّ، فَيَشْتَرِي الرَّوَاحِلَ، فَيُغْلِي بِهَا، ثُمَّ يُسْرِعُ السَّيْرَ، فَيَسْبِقُ الْحَاجَّ، فَأَفْلَسَ، فَرُفِعَ أَمْرُهُ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨٥ في الأقضية، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨٧ في الأقضية، عن مالك به.

إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَيُّهَا النَّاسُ، فَإِنَّ الأُسَيْفِعَ، أُسَيْفِعَ جُهَيْنَةَ رَضِيَ مِنْ دِينِهِ وَأَمَانَتِهِ، بِأَنْ يُقَالَ: سَبَقَ الْحَاجَّ، أَلاَ وَإِنَّهُ قَدْ دَانَ مُعْرِضًا، فَأَصْبَحَ قَدْ رِينَ بِهِ، فَمَنْ كَانَ لَهُ عَلَيْهِ دَيْنٌ، فَلْيَأْتِنَا بِالْغَدَاةِ، نَقْسِمُ مَالَهُ بَيْنَهُمْ، وَإِيَّاكُمْ وَالدَّيْنَ، فَإِنَّ أَوَّلَهُ هَمٌّ وَآخِرَهُ حَرْبٌ[1].

واتە: لە عومەری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی دەلافی موزەنییەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە هۆزی جوهەینییە هەبوو (ناوی ئوسەیفیع) بوو پێشی حاجییەکان دەکەوتەوە و وشتری چاکی (بەقەرز) دەکڕی و نرخی زۆری پێ دەدا، دواتر بەخێرایی دەڕۆیشت و پێشی حاجییەکان دەکەوتەوە، جا (بەهۆی ئەو قەرزانە) موفلیس بوو، جا بابەتەکەی بەرز کرایەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، ئیمامی عومەریش ﷺ ـ وتاری دا ـ گوتی: ئەی خەڵکینە، ئوسەیفیع، ئوسەیفیعی جوهەینییە خەڵك پێی (هەڵخەڵەتاوە) لە دین و ئەمانەتی ڕازی بوون بەوەی دەگوترێت: پێش حاجییان دەکەوێتەوە! بزانن (ئەوە دیندار نییە) هەر قەرزی کردووە و نەشیداوەتەوە و وای لێ هاتووە قەرز هەموو ماڵەکەی داگرتووە، جا کێ قەرزی لەلای ئەو هەیە با بەیانی بێت بۆ لامان، ماڵەکەی لە نێوانی خاوەنی قەرزەکان دابەش دەکەین، وە نەکەن (چیدی) خۆتان لە قەرز بدەن، چونکە قەرز سەرەتاکەی خەم و خەفەتە و کۆتاییەکەشی ڕووتبوونەوەی قەرزارەکەیە.

## ٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو شتەی کۆیلەکان تێکیدەدەن یان بریندار دەکەن[2]

**٢٢٣٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا فِي جِنَايَةِ الْعَبِيدِ، أَنَّ كُلَّ مَا أَصَابَ الْعَبْدُ مِنْ جُرْحٍ جَرَحَ بِهِ إِنْسَانًا، أَوْ شَيْءٍ اخْتَلَسَهُ، أَوْ حَرِيسَةٍ احْتَرَسَهَا، أَوْ ثَمَرٍ مُعَلَّقٍ، جَذَّهُ أَوْ أَفْسَدَهُ، أَوْ سَرِقَةٍ سَرَقَهَا لاَ قَطْعَ عَلَيْهِ فِيهَا، إِنَّ ذَلِكَ فِي رَقَبَةِ الْعَبْدِ، لاَ يَعْدُو ذَلِكَ الرَّقَبَةَ، قَلَّ ذَلِكَ أَوْ كَثُرَ، فَإِنْ شَاءَ سَيِّدُهُ أَنْ يُعْطِيَ قِيمَةَ مَا أَخَذَ غُلاَمُهُ، أَوْ أَفْسَدَ أَوْ عَقَلَ

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٥ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِيماَ أَفْسَدَ الْعَبِيدُ أَوْ جَرَحُوا.





مَا جَرَحَ، أَعْطَاهُ، وَأَمْسَكَ غُلَامَهُ، وَإِنْ شَاءَ أَنْ يُسْلِمَهُ أَسْلَمَهُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ شَيْءٌ غَيْرُ ذَلِكَ، فَسَيِّدُهُ فِي ذَلِكَ بِالْخِيَارِ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ڕێبازەکە لەلای ئێمە دەربارەی جینایەتی کۆیلەکان ئاوایە: گشت برینداریيەك کە کۆیلە ئەنجامی بدات لە بریندارکردنی مرۆڤێك، یان شتێك بڕفێنێت، یان بزن و مەڕ لە شاخ بدزێت، یان بەروبووم بەسەر دارەوە لێ بکاتەوە یان خراپی بکات، یان دزییەك بکات، (لە گشت ئەوانەدا) دەستبڕینی لەسەر نییە، (بەڵکوو) غەرامەی ئەو شتانە لە ئەستۆی کۆیلەکەیە، لە نرخی ئەستۆی خۆی تێ ناپەڕێت، (جیاوازی نییە) کەم بێت یان زۆر بێت، جا ئەگەر گەورەکەی ویستی نرخی ئەو شتە بدات کە کۆیلەکە بردوویەتی یان تێکیداوە یان خوێنبایی ئەوە بدات کە بریندارى کردووە، ئەوە دەیدات (بۆی دروستە)، وە ئەگەر بیەوێت تەسلیمی بکات ئەوە تەسلیمی دەکات، (بەڵام) هیچ شتێکی جگە لەوەی لەسەر نییە، گەورەکەی سەرپشکە دەربارەی ئەوە.

### ١٠- ئەوەی جێبەجێ دەبێت لە بەخششدا[1]

**٢٢٣٨-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: مَنْ نَحَلَ وَلَدًا لَهُ صَغِيرًا لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يَحُوزَ نُحْلَهُ، فَأَعْلَنَ ذَلِكَ لَهُ، وَأَشْهَدَ عَلَيْهَا، فَهِيَ جَائِزَةٌ، وَإِنْ وَلِيَهَا أَبُوهُ[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەخششێك بە منداڵێکی بچووکی خۆی ببەخشێت کە نەگەیشتۆتە ئەو تەمەنەی بەخشش وەربگرێت، جا باوکەکە ئەوەی بۆ ڕاگەیاند و شاهێدی لەسەر گرت، ئەوە جێبەجێ کراوە (دەبێ ئەنجام بدرێت)،

---

(١) ـ مَا يَجُوزُ مِنَ النُّحْلِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤١ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٣ في القضاء؛ والشيباني: ٨٠٦ في البيوع والتجارات والسلم؛ وفي: ٨١٠ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.




هەر چەندە باوکەکە خۆشی هێشتا سەرپەرشتی بەخششەکە بکات (واتە هێشتا مناڵەکە لەژێر بەڕێوەبردنی باوکی بێت).

**٢٢٣٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ مَنْ نَحَلَ ابْنًا لَهُ صَغِيرًا ذَهَبًا أَوْ وَرِقًا، ثُمَّ هَلَكَ وَهُوَ يَلِيهِ، إِنَّهُ لاَ شَيْءَ لِلابْنِ مِنْ ذَلِكَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الأَبُ عَزَلَهَا بِعَيْنِهَا، أَوْ دَفَعَهَا إِلَى رَجُلٍ وَضَعَهَا لابْنِهِ عِنْدَ ذَلِكَ الرَّجُلِ، فَإِنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَهُوَ جَائِزٌ لِلابْنِ**[1].

**(فەتوا)**: واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە: هەر کەسێك زێڕ یان زیو بە مناڵێکی بچووکی خۆی ببەخشێت، دواتر مناڵەکە بمرێت لە کاتێکدا باوکەکە هێشتا سەرپەرشتی دەکات، ئەوە هیچ بۆ کوڕەکە نییە لە بەخششەکە، تەنها لەو کاتە نەبێت باوکەکە شتەکە بەدیاریکراوی جیا بکاتەوە (بۆ کوڕەکە لە شتێکدا دایبنێت) یان بیدات بە پیاوێك تا بۆ کوڕەکەی هەڵی بگرێت، ئەگەر ئەوەی ئەنجام دا ئەوە بۆ کوڕەکە جێبەجێ دەبێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤٢ في النحل والعطية؛ والحدثاني: ٢٩٣أفي القضاء، عن مالك به.

## ١- هەر كەسێك پشكی خۆی ئازاد بكات لە كۆیلەیەك[1]

**٢٢٤٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ، قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ الْعَدْلِ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ[2].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك پشكی خۆی ئازاد بكات لە كۆیلەیەك (كە بەهاوبەشی عەبدی چەند كەسێك بێت)، وە ماڵ و سەروەتی بای ئەوەندە هەبێت بگاتە نرخی كۆیلەكە، ئەوە بە نرخێكی هاوسەنگ بەسەریدا دەنرخێندرێت و پشكی شەریك و هاوبەشەكان دەدات و كۆیلەكە بەسەر ئەو ئازاد دەبێت، وە ئەگەر ئەوەندە ماڵ و سەروەتەی نەبوو ئەوە (تەنها بەگوێرەی) پشكی خۆی ئازاد دەبێت.

**٢٢٤١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي الْعَبْدِ يُعْتِقُ سَيِّدُهُ مِنْهُ شِقْصًا، ثُلُثَهُ أَوْ رُبُعَهُ أَوْ نِصْفَهُ، أَوْ سَهْمًا مِنَ الأَسْهُمِ بَعْدَ مَوْتِهِ، أَنَّهُ لاَ يَعْتِقُ مِنْهُ إِلاَّ مَا أَعْتَقَ سَيِّدُهُ، وَسَمَّى مِنْ ذَلِكَ الشِّقْصِ، وَذَلِكَ أَنَّ عَتَاقَةَ ذَلِكَ الشِّقْصِ، إِنَّمَا وَجَبَتْ وَكَانَتْ بَعْدَ وَفَاةِ الْمَيِّتِ، وَأَنَّ سَيِّدَهُ كَانَ مُخَيَّرًا فِي ذَلِكَ مَا عَاشَ. فَلَمَّا وَقَعَ الْعِتْقُ لِلْعَبْدِ عَلَى سَيِّدِهِ الْمُوصِي، لَمْ يَكُنْ لِلْمُوصِي إِلاَّ مَا أَخَذَ مِنْ مَالِهِ، وَلَمْ يَعْتِقْ مَا بَقِيَ مِنَ الْعَبْدِ، لأَنَّ مَالَهُ قَدْ صَارَ لِغَيْرِهِ، فَكَيْفَ يَعْتِقُ مَا بَقِيَ مِنَ الْعَبْدِ عَلَى قَوْمٍ آخَرِينَ، لَيْسُوا هُمُ ابْتَدَؤُوا الْعَتَاقَةَ، وَلاَ أَثْبَتُوهَا، وَلاَ لَهُمُ الْوَلاَءُ، وَلاَ يَثْبُتُ لَهُمْ، وَإِنَّمَا صَنَعَ ذَلِكَ الْمَيِّتُ هُوَ الَّذِي أَعْتَقَ، وَأُثْبِتَ لَهُ الْوَلاَءُ، فَلاَ يُحْمَلُ ذَلِكَ فِي مَالِ غَيْرِهِ، إِلاَّ أَنْ يُوصِيَ بِأَنْ يَعْتِقَ مَا بَقِيَ مِنْهُ فِي مَالِهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَزِمٌ لِشُرَكَائِهِ وَوَرَثَتِهِ، وَلَيْسَ لِشُرَكَائِهِ أَنْ يَأْبَوْا ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَهُوَ فِي ثُلُثِ مَالِ الْمَيِّتِ، لأَنَّهُ لَيْسَ عَلَى وَرَثَتِهِ فِي ذَلِكَ ضَرَرٌ[3].

---

(١) ـ مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٥ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٠ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٨٤٠ في العتاق؛ والشافعي: ٩٤٧؛ وابن حنبل، ٣٩٧، وفي: ٥٩٢٠، وفي: ٦٤٥٣؛ والبخاري: ٢٥٢٢ في العتق؛ ومسلم: العتق: ١، وفي: الأيمان: ٤٧؛ وأبو داود: ٣٩٤٠ في العتاق؛ وابن ماجه: ٢٥٥٥ في الأحكام؛ وابن حبان: ٤٣١٦؛ والمنتقى لابن جارود: ٩٦٩؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٨٠٢؛ والقابسي: ٢٤٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٦ في العتق؛ وأبو مصعب الزهري: ٢٧٧٩ في المدبر، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی کۆیلە کە گەورەکەی بەشێکی ئازاد بکات، سێیەك یان چواریەك یان نیوە بێت، یان بەشێك لە چەند بەشێك، دوای مردنی، ئەوە ئازاد نابێت تەنها ئەو بەشە نەبێت کە گەورەکەی ئازادی کردووە و ناوی هێناوە، چونکە ئازادبوونی ئەو بەشە تەنها دوای مردنی واجب بووە، وە گەورەکەی سەرپشك بووە لەوەدا تا لە ژیاندا بووە، جا کاتێ ئازادبوون بۆ کۆیلەکە دامەزراوە لەسەر گەورە وەسییەتکارەکەی، بۆ وەسییەتکارەکە نەبووە تەنها ئەوەندە لە ماڵەکەی نەبێت کە وەریدەگرێت (کە بریتییە لە سێیەك)، (بۆیە) ئەوەی ماوە (لە کۆیلایەتی) لە کۆیلەکەدا ئازاد نابێت، چونکە ماڵەکەی بۆتە هی غەیری خۆی (بۆتە هی میراتگران)، چۆن دەبێ ئەوەی ماوە لە کۆیلایەتی کۆیلەکە بەسەر خەڵکانی دیکە ئازاد ببێت، ئەوان ئازادکردنیان ئەنجام نەداوە و جێگیریان نەکردووە و وەلائەکەشی بۆ ئەوان نییە و بۆ ئەوان دانامەزرێت، بەڵکوو مردووەکە ئازادی کردووە و وەلائەکە بۆ ئەو دامەزراوە، جا ئەوە ناخرێتە سەر سەروەتی غەیری ئەو، تەنها لەو کاتە نەبێت وەسییەت بکات ئەوەی ماوەتەوە لە کۆیلایەتی کۆیلەکەی ئازاد ببێت بە سێیەکی ماڵەکەی، ئەوەش واجبە بۆ شەریکەکانی و میراتگرەکانی و بۆ شەریکەکانی نییە ئەوەی بۆ جێبەجێ نەکەن، لە کاتێکدا ئەوە لە سێیەکی ماڵەکەیەتی، چونکە ئەوە زیانی نییە بۆ میراتگرەکانی.

**٢٢٤٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَوْ أَعْتَقَ رَجُلٌ ثُلُثَ عَبْدِهِ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَبَتَّ عِتْقَهُ عَتَقَ عَلَيْهِ كُلُّهُ فِي ثُلُثِهِ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَيْسَ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ يُعْتِقُ ثُلُثَ عَبْدِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ، لأَنَّ الَّذِي يُعْتِقُ ثُلُثَ عَبْدِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ، لَوْ عَاشَ رَجَعَ فِيهِ، وَلَمْ يَنْفُذْ عِتْقُهُ، وَأَنَّ الْعَبْدَ الَّذِي يَبِتُّ سَيِّدُهُ عِتْقَ ثُلُثِهِ فِي مَرَضِهِ، يَعْتِقُ عَلَيْهِ كُلُّهُ إِنْ عَاشَ، وَإِنْ مَاتَ أُعْتِقَ عَلَيْهِ فِي ثُلُثِهِ، وَذَلِكَ أَنَّ أَمْرَ الْمَيِّتِ جَائِزٌ فِي ثُلُثِهِ، كَمَا أَنَّ أَمْرَ الصَّحِيحِ جَائِزٌ فِي مَالِهِ كُلِّهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر سێیەکی کۆیلەکەی ئازاد بکات لە کاتێکدا نەخۆشە، جا ئازادکردنەکەی بڕاندەوە، ئەوە تێکڕای کۆیلەکە ئازاد دەبێت




لە سێیەکی ماڵەکەی، چونکە ئەوە وەکوو ئەو کەسە نییە کە سێیەکی کۆیلەکەی ئازاد دەکات دوای مردنی (کە بڵێت: دوای مردنی من سێیەکی ئەو کۆیلەیەم ئازاد بێت)، چونکە ئەو کەسەی سێیەکی کۆیلەکەی ئازاد دەکات دوای مردنی، ئەگەر بژیێت و نەمرێت دەگەڕێتەوە و ئازادبوونەکەی جێبەجێ ناکرێت، وە ئەو کۆیلەیەی گەورەکەی سێیەکی ئازادکردنی دەبڕێنێتەوە لە حاڵەتی نەخۆشییەکەی، ئەوە کۆی کۆیلەکەی بەسەردا ئازاد دەبێت ئەگەر بژیێت و نەمرێت، وە ئەگەر بمرێت، ئەوە لە سێیەکی ماڵەکەی بەسەریدا ئازاد دەبێت (جا بەشی تەواوی ئازادبوونەکەی بکات یان نا)، (ئەو جیاوازییەش لەبەر ئەوەیە) چونکە کاروباری مردوو لە سێیەکی سەروەتەکەی جێبەجێ دەکرێت (چونکە مافی میراتگرانیشی تیایە)، بەڵام کاروباری کەسی ساغ لە گشت ماڵەکەی جێبەجێ دەکرێت (چونکە بابەتی میرات بوونی نییە).

## ٢- مەرجدانان لە ئازادکردندا[١]

**٢٢٤٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ أَعْتَقَ عَبْدًا لَهُ فَبَتَّ عِتْقَهُ، حَتَّى تَجُوزَ شَهَادَتُهُ وَتَتِمَّ حُرْمَتُهُ، وَيَثْبُتَ مِيرَاثُهُ، فَلَيْسَ لِسَيِّدِهِ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا يَشْتَرِطُ عَلَى عَبْدِهِ مِنْ مَالٍ أَوْ خِدْمَةٍ، وَلاَ يَحْمِلَ عَلَيْهِ شَيْئًا مِنَ الرِّقِّ، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ الْعَدْلِ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَهُوَ إِذَا كَانَ لَهُ الْعَبْدُ خَالِصًا أَحَقُّ بِاسْتِكْمَالِ عَتَاقَتِهِ، وَلاَ يَخْلِطُهَا بِشَيْءٍ مِنَ الرِّقِّ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك کۆیلەیەکی خۆی ئازاد بکات و بەتەواوی (لەلایەن خۆیەوە) ئازادی بکات، تا وای لێ دێت شاهێدییەکەی جێبەجێ دەبێت و حوڕمەتەکەی کامڵ دەبێت و میراتی دادەمەزرێت، ئەوە بۆ

---

(١) ـ الشَّرْطُ فِي الْعِتْقِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٨ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢١أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٩ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢١ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

گەورەكەی نییە ئەو مەرجانەی لەسەر دابنێت كە بۆ كۆیلەكانی دایدەنێت لە سەروەت و خزمەتكردن، وە نابێ هیچ شتێكی كۆیلایەتی لەسەر دابنێت و تەكلیفی لێ بكات، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك پشكی خۆی ئازاد بكات لە كۆیلەیەك (كە بە هاوبەشی عەبدی چەند كەسێك بێت)، ئەوە بە نرخێكی هاوسەنگ بەسەریدا دەنرخێندرێت و پشكی شەریك و هاوبەشەكان دەدات و كۆیلەكە بەسەر ئەو ئازاد دەبێت.

ئیمامی مالیك ؒ گوتوویەتی: ئەگەر كۆیلەكە تەنها هی خۆی بێت و (بەشێكی ئازاد بكات) ئەوە شایستەترە ئازادبوونەكەی تەواو بكات و نابێ لەگەڵ هیچ شتێكی كۆیلایەتی تێكەڵی بكات.

## ٣- ئەو كەسەی كۆمەڵە كۆیلەیەك ئازاد دەكات كە ماڵ و سەروەتی نییە جگە لە كۆیلەكان[١]

**٢٢٤٤**- عَنِ الْحَسَنِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ، وَعَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، أَنَّ رَجُلاً فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَعْتَقَ عَبِيدًا لَهُ سِتَّةً عِنْدَ مَوْتِهِ، فَأَسْهَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَهُمْ، فَأَعْتَقَ ثُلُثَ تِلْكَ الْعَبِيدِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ؒ: وَبَلَغَنِي أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِذَلِكَ الرَّجُلِ مَالٌ غَيْرُهُمْ[٣].

واتە: لە حەسەنی كوڕی ئەبو حەسەنی بەصری و موحەممەدی كوڕی سیرینەوە گێڕدراوەتەوە (گوتویانە): پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی مردنی شەش كۆیلەی خۆی ئازاد كردن، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (دوای ئەوەی كردنی بە سێ كۆمەڵە) تیروپشكی لە نێوان كردن و سێیەكی كۆیلەكانی ئازاد كرد.

---

(١) ـ مَنْ أَعْتَقَ رَقِيقًا لَا يَمْلِكُ مَالًا غَيْرَهُمْ.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٠ في العتق؛ وفي: ٢٧٢١ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٢ في المكاتب والمدبر؛ وفي: ٤٢٢أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم گەیشتووە ئەو پیاوە هیچ ماڵ و سەروەتی دیکەی نەبووە جگە لە کۆیلەکان.

**٢٢٤٥- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً فِي إِمَارَةِ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ ﷺ، أَعْتَقَ رَقِيقًا لَهُ، كُلَّهُمْ جَمِيعًا، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ، فَأَمَرَ أَبَانُ بْنُ عُثْمَانَ ﷺ، بِتِلْكَ الرَّقِيقِ، فَقُسِمَتْ أَثْلاَثًا، ثُمَّ أَسْهَمَ عَلَى أَيِّهِمْ يَخْرُجُ سَهْمُ الْمَيِّتِ، فَيَعْتِقُونَ، فَوَقَعَ السَّهْمُ عَلَى أَحَدِ الأَثْلاَثِ، فَعَتَقَ الثُّلُثُ الَّذِي وَقَعَ عَلَيْهِ السَّهْمُ**[1].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە کاتی کاربەدەستی ئەبانی کوڕی عوسمان ﷺ گشت کۆیلەکانی خۆی بەیەکەوە ئازاد کردبوو، هیچ ماڵ و سەروەتیشی نەبوو جگە لە کۆیلەکان، جا ئەبانی کوڕی عوسمان ﷺ فەرمانی کرد دەربارەی کۆیلەکان و دابەشکران بۆ سێ بەش، دواتر تیروپشکی کرد کامیان پشکی مردووەکە دەرچوو ئازاد دەبوون، جا تیروپشکەکە کەوتە سەر یەکێك لە سێ بەشەکە، جا ئەو سێیەکە ئازاد بوو کە تیروپشکەکەی کەوتە سەر.

## ٤- بڕیاری شەرعی دەربارەی ماڵ و سەروەتی کۆیلە کاتێ ئازاد دەکرێ[2]

**٢٢٤٦- حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: مَضَتِ السُّنَّةُ أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا أُعْتِقَ تَبِعَهُ مَالُهُ**[3].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ بۆی باس کردم گوێی لێی بووە دەیگوت: ڕێبازەکە وا هاتووە کاتێ کۆیلە ئازاد کرا ماڵەکەشی لەگەڵیەتی.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٢ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٢ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٢) ـ الْقَضَاءُ فِي مَالِ الْعَبْدِ إِذَا عَتَقَ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٣ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٣ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

**٢٢٤٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا أُعْتِقَ تَبِعَهُ مَالُهُ: أَنَّ الْمُكَاتَبَ إِذَا كُوتِبَ تَبِعَهُ مَالُهُ، وَإِنْ لَمْ يَشْتَرِطْهُ، وَذَلِكَ أَنَّ عَقْدَ الْكِتَابَةِ هُوَ عَقْدُ الْوَلاَءِ، إِذَا تَمَّ ذَلِكَ، وَلَيْسَ مَالُ الْعَبْدِ وَالْمُكَاتَبِ بِمَنْزِلَةِ مَا كَانَ لَهُمَا مِنْ وَلَدٍ، إِنَّمَا أَوْلاَدُهُمَا بِمَنْزِلَةِ رِقَابِهِمَا، لَيْسُوا بِمَنْزِلَةِ أَمْوَالِهِمَا، لأَنَّ السُّنَّةَ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا: أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا أُعْتِقَ تَبِعَهُ مَالُهُ وَلَمْ يَتْبَعْهُ وَلَدُهُ، وَأَنَّ الْمُكَاتَبَ إِذَا كُوتِبَ تَبِعَهُ مَالُهُ وَلَمْ يَتْبَعْهُ وَلَدُهُ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنَّ الْعَبْدَ وَالْمُكَاتَبَ إِذَا أَفْلَسَا، أُخِذَتْ أَمْوَالُهُمَا وَأُمَّهَاتُ أَوْلاَدِهِمَا، وَلَمْ تُؤْخَذْ أَوْلاَدُهُمَا، لأَنَّهُمْ لَيْسُوا بِأَمْوَالٍ لَهُمَا[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا بِيعَ وَاشْتَرَطَ الَّذِي ابْتَاعَهُ مَالَهُ، لَمْ يَدْخُلْ وَلَدُهُ فِي مَالِهِ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا جَرَحَ أُخِذَ هُوَ وَمَالُهُ، وَلَمْ يُؤْخَذْ وَلَدُهُ[٤].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی ڕوونی دەكاتەوە كە كۆیلە كاتێ ئازاد دەكرێتماڵەكەی لەگەڵی دەڕوات، ئەوەیە: كۆیلەی نووسراوپێدراو كاتێ موكاتەبەی لەگەڵ دەكرێ ماڵەكەشی لەگەڵیەتی، هەرچەندە كۆیلەكە خۆیشی ئەوە بە مەرج نەگرێت، چونكە گرێبەستی كیتابەت بریتییە لە گرێبەستی وەلاء ، كاتێ تەواو دەبێت، جا ماڵی كۆیلە و موكاتەبەلەگەڵكراو وەك ئەوە نییە كە منداڵیان هەبێت (منداڵەكانیان وەك ماڵ حیساب ناكرێت)، بەڵكوو منداڵەكانیان وەك خودی خۆیانن، وەك ماڵ و سەروەتیان نین، چونكە ئەو ڕێبازەی ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: كۆیلە كاتێ ئازاد دەكرێت ماڵەكەی شوێنی دەكەوێت و منداڵەكەی شوێنی ناكەوێت، وە كۆیلەی موكاتەبەلەگەڵكراو (نووسراوپێدراو) كاتێ موكاتەبەی لەگەڵ دەكرێت (ئەویشیان) ماڵەكەی شوێنی دەكەوێت و منداڵەكەی شوێنی ناكەوێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٤ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٣أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٥ في العتق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٦ في العتق، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٧ في العتق، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوەی بە هەمان شێوە ڕوونی دەکاتەوە ئەوەیە: کۆیلە و نووسراوپێدراو کاتێ موفلیس دەبن، ماڵ و سەروەت و دایکی مناڵەکانیان دەبردرێت، (بەڵام) مناڵەکانیان نابردرێت، چونکە مناڵەکان سەروەتی ئەوان نین.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوەی بە هەمان شێوە ڕوونی دەکاتەوە ئەوەیە: کۆیلە کاتێ دەفرۆشرێت و کڕیارەکە ماڵی کۆیلەکەش بە مەرج دەگرێت (بەوەی پێی بدرێت)، مناڵەکانی ناخرێنە ناو (چوارچێوەی) ماڵ و سەروەتەکەی.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوەی بە هەمان شێوە ڕوونی دەکاتەوە ئەوەیە: کۆیلە کاتێ جینایەتێکی برینداری ئەنجام دەدات خۆی و ماڵەکەی دەبردرێن و مناڵەکانی نابردرێن.

## ٥- ئازادبوونی ئافرەتی کۆیلەی مناڵبوو لە خاوەنەکەی و بابەتی جۆراوجۆری بڕیاری شەرعی دەربارەی ئازادکردن[١]

**٢٢٤٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ قَالَ: أَيُّمَا وَلِيدَةٍ وَلَدَتْ مِنْ سَيِّدِهَا، فَإِنَّهُ لاَ يَبِيعُهَا وَلاَ يَهَبُهَا وَلاَ يُوَرِّثُهَا، وَهُوَ يَسْتَمْتِعُ مِنْهَا، فَإِذَا مَاتَ فَهِيَ حُرَّةٌ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ گوتی: هەر ئافرەتێکی کۆیلە مناڵی لە گەورەکەی ببێت، ئەوە نابێ بیفرۆشێت و بیکاتە دیاری و بیکاتە میرات، (بەڵکوو) تەنها خۆی جیماعی لەگەڵ دەکات، کاتێکیش مرد ئافرەتەکە ئافرەتی ئازادە (کۆیلە نییە).

**٢٢٤٩-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ أَتَتْهُ وَلِيدَةٌ قَدْ ضَرَبَهَا سَيِّدُهَا بِنَارٍ أَوْ أَصَابَهَا بِهَا، فَأَعْتَقَهَا[٣].

---

(١) ـ عِتْقُ أُمَّهَاتِ الْأَوْلَادِ وَجَامِعُ الْقَضَاءِ فِي الْعَتَاقَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٨ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٤ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٧٩٩ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه الحدثاني: ٤٢٤أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئافرەتێکی کۆیلە هاتووە بۆ لای، کە گەورەکەی بە شتی ئاگرین لێی دابوو یان ئاگری پێوە نابوو، ئیمامی عومەر ﷺ ئازادی کرد (واتە بڕیاری ئازادکردنی دەرکرد بەسەر گەورەکەی).

**٢٢٥٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ تَجُوزُ عَتَاقَةُ رَجُلٍ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ يُحِيطُ بِمَالِهِ، وَأَنَّهُ لاَ تَجُوزُ عَتَاقَةُ الْغُلاَمِ، حَتَّى يَحْتَلِمَ أَوْ يَبْلُغَ مَبْلَغَ الْمُحْتَلِمِ، وَأَنَّهُ لاَ تَجُوزُ عَتَاقَةُ الْمُوَلَّى عَلَيْهِ فِي مَالِهِ، وَإِنْ بَلَغَ الْحُلُمَ حَتَّى يَلِيَ مَالَهُ**[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە (بڕیاری) ئازادکردنی کۆیلە جێبەجێ ناکرێت بۆ کەسێك قەرزی لەسەر بێت بەشێوەیەك هەموو ماڵەکەی داگرتبێت، وە (بڕیاری) ئازادکردی کۆیلە بۆ منداڵ جێبەجێ ناکرێت تا ئیحتیلامی دەبێت یان دەگات بە تەمەنی ئیحتیلام، وە (بڕیاری) ئازادکردنی ئەو کەسەی ماڵەکەی سەرپەرشتی دەکرێت لەلایەن کەسانی دیکەوە جێبەجێ ناکرێت هەرچەندە ئیحتیلامی بوو بێت، تا خۆی سەرپەرشتی ماڵەکەی دەکەوێتە دەست (بەهۆی پەیدابوونی ژیرییەوە).

### ٦- ئەوەی دروستە لە کۆیلەئازادکردنی واجبدا[2]

**٢٢٥١- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْحَكَمِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ جَارِيَةً لِي كَانَتْ تَرْعَى غَنَمًا لِي، فَجِئْتُهَا، وَقَدْ فُقِدَتْ شَاةٌ مِنَ الْغَنَمِ، فَسَأَلْتُهَا عَنْهَا، فَقَالَتْ: أَكَلَهَا الذِّئْبُ، فَأَسِفْتُ عَلَيْهَا، وَكُنْتُ مِنْ بَنِي آدَمَ، فَلَطَمْتُ وَجْهَهَا، وَعَلَيَّ رَقَبَةٌ، أَفَأُعْتِقُهَا؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيْنَ اللهُ؟ فَقَالَتْ: فِي السَّمَاءِ، فَقَالَ: مَنْ أَنَا؟ فَقَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَعْتِقْهَا**[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢٩ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٤ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَجُوزُ مِنَ الْعِتْقِ فِي الرِّقَابِ الْوَاجِبَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣٠ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٥ في المكاتب والمدبر؛ والقابسي: ٤٨٥، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عومەری کوڕی حەکەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جارییەیەکی من ئاژەڵەکانی منی دەلەوەڕاند (شوانەتی بۆ دەکردم)، جا چووم بۆ لای لە کاتێکدا بزنێك دیار نەمابوو، منیش پرسیارم لێ کرد، ئەویش گوتی: گورگ خواردوویەتی، منیش لێی توڕە بووم و مرۆڤم (خۆم بۆ نەگیرا) و شەقێکم لە ڕوخساری دا، جا ئازادکردنی کۆیلەیەکم لەسەر بێت (بەهۆی ئەو تاوانەی کردم) جا ئایا ئازادکردنی ئەو جارییەیە واجبەکە جێبەجێ دەکات (کە بەڵێنم داوە کۆیلەیەك ئازاد بکەم)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ بە جارییەکەی فەرموو: خوای پەروەردگار شەئنی چۆنە؟ ئەویش گوتی: لە ئاسمانە (واتە شەئنی بەرزە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من کێم؟ گوتی: تۆ پێغەمبەری خوایت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئازادی بکە (دیارە بڕوادارە).

**٢٢٥٢-** عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِجَارِيَةٍ لَهُ سَوْدَاءَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ عَلَيَّ عِتْقَ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ، فَإِنْ كُنْتَ تَرَاهَا مُؤْمِنَةً أُعْتِقُهَا، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَشْهَدِينَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: أَتَشْهَدِينَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: أَتُوقِنِينَ بِالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَعْتِقْهَا[1].

واتە: لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك لە ئەنصارییەکان جارییەیەکی ڕەشپێستی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادکردنی کۆیلەیەکی بڕوادارم لەسەرە، جا ئەگەر پێت وایە ئەو جارییەیە بڕوادارە ئەوە ئازادی دەکەم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە جارییەکەی فەرموو: ئایا شاهێدی دەدەی بەوەی هیچ پەروەردگارێکی بەحەق نییە تەنها الله نەبێ؟ گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا شاهێدی دەدەی بەوەی موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئایا بڕوای تەواوت هەیە بە زیندووبوونەوە دوای مردن؟ گوتی: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئازادی بکە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣١ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٦ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

**٢٢٥٣-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ الرَّجُلِ تَكُونُ عَلَيْهِ رَقَبَةٌ، هَلْ يُعْتِقُ فِيهَا ابْنَ زِنًا؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁: نَعَمْ، ذَلِكَ يُجْزِئُهُ[١].

واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ بۆی باس كردم كە لە مەقبورییەوە پێی گەیشتووە گوتوویەتی: ئەبو هورەیرە ﵁ پرسیاری لێ كرا دەربارەی ئەو كەسەی ئازادكردنی كۆیلەیەكی لەسەر واجبە، ئایا مناڵی زینا (زۆڵ) ئازاد بكات (دروستە)؟ ئەبو هورەیرە ﵁ گوتی: بەڵێ، بەری دەكەوێ (واجبەكەی دێتە جێ).

**٢٢٥٤-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ ﵁، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ تَكُونُ عَلَيْهِ رَقَبَةٌ، هَلْ يَجُوزُ لَهُ أَنْ يُعْتِقَ وَلَدَ زِنًا؟ قَالَ: نَعَمْ، ذَلِكَ يُجْزِئُ عَنْهُ[٢].

واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ بۆی باس كردم لە فەزاڵەی كوڕی عوبەیدی ئەنصارییەوە ﵁ كە یەكێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ (لەوەوە) پێی گەیشتووە كە پرسیاری لێ كراوە دەربارەی ئەو كەسەی ئازادكردنی كۆیلەیەكی لەسەر واجب بووە (بە هۆی بابەتێكی شەرعی كە ئەو كەفارەتەی بۆ داندراوە)، جا ئایا بۆی حیسابە ئەگەر كۆیلەیەكی منالی زینا (زۆڵ) ئازاد بكات؟ گوتی: بەڵێ، بەری دەكەوێ (واجبەكەی جێبەجێ دەبێ).

### ٧- ئەوەی دروست نییە لە كۆیلەئازادكردنی واجبدا[٣]

**٢٢٥٥-** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ سُئِلَ عَنِ الرَّقَبَةِ الْوَاجِبَةِ هَلْ تُشْتَرَى بِشَرْطٍ؟ فَقَالَ: لَا[٤].

واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ بۆی باس كردم پێی گەیشتووە بەوەی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ پرسیاری لێ كرا دەربارەی ئازادكردنی

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣٢ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٦أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الْعِتْقِ فِي الرِّقَابِ الْوَاجِبَةِ.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣٤ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٧ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

كۆیلە بۆ واجب (نەك بۆ سوننەت و خێر)، ئایا بە مەرج (واتە مەرجی ئازادكردنی) دەكڕدرێت؟ گوتی: نەخێر.

**٢٢٥٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الرِّقَابِ الْوَاجِبَةِ، أَنَّهُ لاَ يَشْتَرِيهَا الَّذِي يُعْتِقُهَا فِيمَا وَجَبَ عَلَيْهِ بِشَرْطٍ عَلَى أَنْ يُعْتِقَهَا، لأَنَّهُ إِذَا فَعَلَ ذَلِكَ، فَلَيْسَتْ بِرَقَبَةٍ تَامَّةٍ، لأَنَّهُ يَضَعُ مِنْ ثَمَنِهَا لِلَّذِي يَشْتَرِطُ مِنْ عِتْقِهَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووم دەربارەی ئازادكردنی واجب، بەوەی ئەو كەسەی دەیكڕێت بۆ ئازادكردنی بۆ بابەتێك كە لەسەری بۆتە واجب نابێ بە مەرجی ئازادكردنی بیكڕێت، چونكە ئەگەر وا بكات، ئەوە كۆیلەیەكی كامڵ نییە، چونكە فرۆشیارەكە نرخەكەی كەمتر دەكاتەوە بۆ ئەو كەسەی بە مەرجی ئازادكردن دەیكڕێت (تا ئەویش پاداشتی پێ بگات، كەواتە ئەو بابەتەی قۆستۆتەوە بۆ مامەڵە، بەوەش كۆیلەیەكی كڕیوە نرخی خۆی پێ نەدراوە).

**٢٢٥٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَشْتَرِيَ الرَّقَبَةَ فِي التَّطَوُّعِ وَيَشْتَرِطَ أَنَّهُ يُعْتِقَهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كێشە نییە بۆ خێر و پاداشت كۆیلە بكڕێت و مەرج دابنێت بەوەی ئازادی دەكات (تا بەهەرزانی پێی بدەن).

**٢٢٥٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا سَمِعْتُ فِي الرِّقَابِ الْوَاجِبَةِ، أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ أَنْ يُعْتَقَ فِيهَا نَصْرَانِيٌّ وَلاَ يَهُودِيٌّ، وَلاَ يُعْتَقُ فِيهَا مُكَاتَبٌ، وَلاَ مُدَبَّرٌ، وَلاَ أُمُّ وَلَدٍ، وَلاَ مُعْتَقٌ إِلَى سِنِينَ، وَلاَ أَعْمَى، وَلاَ بَأْسَ أَنْ يُعْتَقَ النَّصْرَانِيُّ وَالْيَهُودِيُّ وَالْمَجُوسِيُّ تَطَوُّعًا، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾ ﴾ محمد، فَالْمَنُّ الْعَتَاقَةُ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣٥ في العتق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣٦ في العتق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣٧ في العتق؛ وفي: ٢٧٣٨ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٧أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی کۆیلەئازادکردنی واجب ئەوەیە: دروست نییە لە ئازادکردنی واجبدا نە کۆیلەی گاور و نە کۆیلەی جوولەکە ئازاد بکرێت، وە نە کۆیلەی نووسراوپێدراو و نە کۆیلەی چاوەڕوانکراو و نە جارییەی منداڵبوو لە گەورەکەی و نە کۆیلەی ئازادکراو دوای چەند ساڵێك و نە کۆیلەی کوێر دروست نییە، (بەڵام) لە ئازادکردنی خێر و سوننەتدا کێشە نییە کۆیلەی گاور و جوولەکە و مەجووسی ئازاد بکرێت، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا فەرموویەتی: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً ۝٤﴾محمد، واتە: [یان بەمنەت و چاکە ئازادیان بکەن یان بەفیدیە و وەرگرتنی بریتی] (المن)، بریتییە لە ئازادکردن.

٢٢٥٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا الرِّقَابُ الْوَاجِبَةُ الَّتِي ذَكَرَ اللهُ فِي الْكِتَابِ، فَإِنَّهُ لاَ يُعْتَقُ فِيهَا إِلاَّ رَقَبَةٌ مُؤْمِنَةٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کۆیلانەی بۆ واجبێك ئازاد دەکرێن کە خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا باسی کردوون، هیچ کۆیلەیەکیان تیادا ئازاد ناکرێت تەنها کۆیلەی باوەڕدار نەبێت (ئەگەرنا واجبەکە نایەتە جێ).

٢٢٦٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ فِي إِطْعَامِ الْمَسَاكِينِ فِي الْكَفَّارَاتِ، لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُطْعَمَ فِيهَا إِلاَّ الْمُسْلِمُونَ، وَلاَ يُطْعَمُ فِيهَا أَحَدٌ عَلَى غَيْرِ دِينِ الإِسْلاَمِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە دەربارەی خواردندان بە هەژاران بۆ کەفارەتەکان، نابێ خواردن بدرێت بە هیچ کەسێك جگە لە هەژاری مسوڵمانان، وە هیچ کەسێك خواردنی پێ نادرێت کە لەسەر دینێکی جگە لە ئیسلام بێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣٩ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٧ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

## ٨- ئازادکردنی کۆیلە بۆ مردوو[1]

**٢٢٦١-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ أُمَّهُ أَرَادَتْ أَنْ تُوصِيَ، ثُمَّ أَخَّرَتْ ذَلِكَ إِلَى أَنْ تُصْبِحَ، فَهَلَكَتْ، وَقَدْ كَانَتْ هَمَّتْ بِأَنْ تُعْتِقَ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَقُلْتُ لِلْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ: أَيَنْفَعُهَا أَنْ أُعْتِقَ عَنْهَا، فَقَالَ الْقَاسِمُ ﷺ: إِنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: إِنَّ أُمِّي هَلَكَتْ، فَهَلْ يَنْفَعُهَا أَنْ أُعْتِقَ عَنْهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ[2].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو عەمرەی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): دایکم ویستی وەسییەت بکات، دواتر دوای خست تا بەیانی دەکاتەوە، جا مرد (نەیتوانی وەسییەتەکە بکات)، دەیویست کۆیلەیەك ئازاد بکات، جا عەبدوڕڕەحمان گوتی: بە قاسمی کوڕی موحەممەدم گوت: ئایا سوودی پێ دەگات بەوەی من کۆیلەی بۆ ئازاد بکەم؟ قاسم ﷺ گوتی: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: دایکم مردووە، ئایا سوودی پێ دەگات کۆیلەی بۆ ئازاد بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

**٢٢٦٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: تُوُفِّيَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ فِي نَوْمٍ نَامَهُ، فَأَعْتَقَتْ عَنْهُ عَائِشَةُ ﷺ، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، رِقَابًا كَثِيرَةً.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[3].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر لە خەودا وەفاتی کرد، جا عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ (کە خوشکیەتی) کۆیلەی زۆری بۆ ئازاد کرد (تا پاداشتەکە بگات بە عەبدوڕڕەحمان).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویستترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم لەو بارەیەوە (بەوەی ئازادکردنی کۆیلە بۆ مردوو دروستە).

---

(١) ـ عِتْقُ الْحَيِّ عَنِ الْمَيِّتِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٠ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٨ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤١ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٨أفي المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٨٤٢ في العتاق، كلهم عن مالك به.

## ٩- دەربارەی گەورەیی ئازادکردنی کۆیلە و دەربارەی ئازادکردنی ئافرەتی کۆیلەی زیناکار و مناڵی زینا[١]

**٢٢٦٣**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الرِّقَابِ أَيُّهَا أَفْضَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَغْلاَهَا ثَمَنًا، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا[٢].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا کام کۆیلە بۆ ئازادکردن چاکترینە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گرانترینیان و ناوازەترینیان لەلای خاوەنەکانیان.

**٢٢٦٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ أَعْتَقَ وَلَدَ زِنًا وَأُمَّهُ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێردراوەتەوە بەوەی مناڵی زینا و دایکەکەی ئازاد کردووە.

## ١٠- وەلاء چوون بۆ ئەو کەسەی ئازادکردنی ئەنجام داوە[٤]

**٢٢٦٥**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَتْ بَرِيرَةُ فَقَالَتْ: إِنِّي كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ، عَدَدْتُهَا وَيَكُونَ لِي وَلاَؤُكِ فَعَلْتُ، فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا، فَقَالَتْ لَهُمْ ذَلِكَ، فَأَبَوْا عَلَيْهَا، فَجَاءَتْ مِنْ عِنْدِ أَهْلِهَا وَرَسُولُ اللهِ ﷺ جَالِسٌ، فَقَالَتْ لِعَائِشَةَ ﵂: إِنِّي قَدْ عَرَضْتُ عَلَيْهِمْ ذَلِكَ، فَأَبَوْا عَلَيَّ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْوَلاَءُ لَهُمْ، فَسَمِعَ ذَلِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَهَا، فَأَخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ ﵂، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خُذِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلاَءَ، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، فَفَعَلَتْ عَائِشَةُ ﵂، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي النَّاسِ، فَحَمِدَ اللهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ رِجَالٍ

---

(١) ـ فَضْلُ عِتْقِ الرِّقَابِ وَعِتْقِ الزَّانِيَةِ وَابْنِ الزِّنَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٢ في العتق؛ والحدثاني: ٤٢٩ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٣ في العتق؛ والشيباني: ٨٤١ في العتاق، عن مالك به.

(٤) ـ مَصِيرُ الْوَلاَءِ لِمَنْ أَعْتَقَ.

يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ؟ مَا كَانَ مِنْ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِئَةَ شَرْطٍ، قَضَاءُ اللهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللهِ أَوْثَقُ، وَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ[1].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: بەریرە هات و گوتی: من موکاتەبەم لەگەڵ خاوەنەکەم کردووە لەسەر نۆ ئۆقیە، لە هەر ساڵێك ئۆقیەیەك، جا یارمەتیم بدە، عائیشەش ﵂ گوتی: ئەگەر خاوەنەکەت ڕازی بن پارەکەی تۆیان بۆ بژێرم و وەلائەکەشت بۆ من بێت ئەوە وا دەکەم، جا بەریرە چوو بۆ لای خانەوادەی خاوەنەکەی و ئەوەی پێ گوتن، ئەوانیش ڕازی نەبوون، جا لە لای خاوەنەکەی هاتەوە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، بەریرە بە عائیشەی ﵂ گوت: من ئەوەم پێشنیار کرد بۆ خاوەنەکانم، ئەوانیش ڕازی نەبوون تەنها بەوە نەبێت وەلائەکە بۆ ئەوان بێت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێبیستی ئەوە بوو و پرسیاری لە عائیشە کرد (کە ئاخۆ مەسەلە چییە)، عائیشەش ﵂ هەواڵی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیکڕە و ئەگەر مەرجیان دانا وەلائەکە بۆ ئەوان بێت خۆت بێدەنگ بکە (چونکە مەرجەکەیان هەڵوەشاوەیە و کاری پێ ناکرێ)، چونکە وەلاء تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات، جا عائیشە ﵂ ئەنجامی دا، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خەڵکی هەڵسایەوە و ستاییشی خوای پەروەردگاری کرد و بەجوانی باسی کرد دواتر فەرمووی: أما بعد، ئەوە چییە خەڵکانێك مەرجی وا دادەنێن لە پەرتووکی خوای پەروەردگار جێگەی نابێتەوە؟! هەر مەرجێك لە پەرتووکی خوا ﷻ جێگەی نەبێتەوە باتڵ و هەڵوەشاوەیە، هەرچەندە سەد مەرجیش بێت، بڕیاردانی خوای پەروەردگار حەقە، وە مەرجی خوای پەروەردگار تۆکمەترە، وەلاء تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٤ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٠ في المكاتب والمدبر؛ والشافعي: ٨٤٨؛ وفي: ٩٩٩؛ والبخاري: ٢١٦٨ في البيوع، وفي: ٢٧٢٩ في الشروط؛ وابن حبان: ٤٣٢٥؛ وأبو يعلى الموصلي: ٤٤٢٥؛ وشرح معاني الآثار: ٥٦٥٤؛ والقابسي: ٤٧٠، كلهم عن مالك به.

**٢٢٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ جَارِيَةً تُعْتِقُهَا، فَقَالَ أَهْلُهَا: نَبِيعُكِهَا عَلَى أَنَّ وَلاَءَهَا لَنَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: لاَ يَمْنَعُكِ ذَلِكَ، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ ویستی جارییەیەك بکڕێت تا ئازادی بکات، خاوەنەکەشی گوتی: پێت دەفرۆشین بەو مەرجەی وەلائەکەی بۆ ئێمە بێت، ئەویش ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە ڕێگریت لێ ناکات، وەلاء تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات (مەرجەکە هیچ بەهای نییە).

**٢٢٦٧-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ تَسْتَعِينُ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَصُبَّ لَهُمْ ثَمَنَكِ صَبَّةً وَاحِدَةً وَأُعْتِقَكِ فَعَلْتُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ لأَهْلِهَا، فَقَالُوا: لاَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَنَا وَلاَؤُكِ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: فَزَعَمَتْ عَمْرَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ ذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ[2].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): بەریرە هات یارمەتی عائیشەی دەدا، جا عائیشە ﵂ گوتی: ئەگەر خانەوادەی خاوەنەکەت حەز بکەن بە جارێك پارەی نرخی تۆیان پێ بدەم و ئازادت بکەم ئەوە وا دەکەم، بەریرەش ئەوەی باس کرد بۆ خانەوادەی خاوەنەکەی، ئەوانیش گوتیان: نەخێر، تەنها لەو حاڵەتە نەبێت کە وەلائەکەت بۆ ئێمە بێت.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٥ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣١ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٧٩٨ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٩٩٧؛ وفي: ١٥٦١؛ وابن حنبل: ٥٩٢٩، وفي: ٦٤٥٢؛ والبخاري: ٢١٦٩ في البيوع، وفي: ٢٥٦٢ في المكاتب، وفي: ٦٧٥٢ في الفرائض، وفي: ٦٧٥٧ في الفرائض؛ ومسلم: العتق: ٥؛ والنسائي: ٤٦٤٤ في البيوع؛ وأبو داود: ٢٩١٥ في الفرائض؛ وشرح معاني الآثار: ٥٦٤٨؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣٦٢٧٨ في الرد على أبي حنيفة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٦ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣١في المكاتب والمدبر؛ وفي: ٤٣٢ في المكاتب والمدبر؛ والشافعي: ١٥٦٢؛ والبخاري: ٢٥٦٤ في المكاتب؛ وابن حبان: ٤٣٢٦؛ وشرح معاني الآثار: ٥٦٤٩، كلهم عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: یەحیای كوڕی سەعید ﵀ گوتی: عەمرە گوتی: عائیشە ﵂ ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیكڕە و ئازادی بكە، وەلاء بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی دەكات.

**٢٢٦٨**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خواﷺ نەهی كردووە لە فرۆشتنی وەلاء و كردنە دیاری[٢].

**٢٢٦٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الْعَبْدِ يَبْتَاعُ نَفْسَهُ مِنْ سَيِّدِهِ، عَلَى أَنَّهُ يُوَالِي مَنْ شَاءَ: إِنَّ ذَلِكَ لاَ يَجُوزُ، وَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً أَذِنَ لِمَوْلاَهُ أَنْ يُوَالِيَ مَنْ شَاءَ، مَا جَازَ ذَلِكَ، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَنَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ، فَإِذَا جَازَ لِسَيِّدِهِ أَنْ يَشْتَرِطَ ذَلِكَ لَهُ، أَوْ يَأْذَنَ لَهُ أَنْ يُوَالِيَ مَنْ شَاءَ، فَتِلْكَ الْهِبَةُ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو كۆیلەیەی خۆی لە گەورەكەی دەكڕێتەوە لەسەر ئەوەی وەلائەكەی بدات بە هەر كەسێك كە خۆی بیەوێت، گوتوویەتی: ئەوە دروست نییە، بەڵكوو وەلاء بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی كردووە، وە ئەگەر پیاوێك مۆڵەت بە كۆیلەكەی بدات وەلاء بدات بە هەر كەسێك كە خۆی بیەوێت، ئەوە هەر دروست نییە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەلاء بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی دەكات، وە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە فرۆشتن و كردنە دیاری وەلاء ، جا ئەگەر دروست بێت بۆ گەورەكەی لەوەدا

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٧ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٣ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٧٩٧ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ١٠٨٧؛ والنسائي: ٤٦٥٨ في البيوع؛ والقابسي: ٢٨٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: واتە نەهی كردووە لە فرۆشتن و كردنە دیاری ئەو سوودانەی بۆ كەسی ئازادكاری كۆیلەكە هەیە بەسەر كۆیلە ئازادكراوەكەوە، وەك ئەوەی كاتێ كۆیلەكە دەمرێت و خزم و كەسی نییە ئەوە میراتەكەی دەدرێت بە ئازادكارەكەی.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٨ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٣أفي المكاتب والمدبر؛ والدارمي: ٢٥٧٢ في البيوع، كلهم عن مالك به.

مەرجی بۆ دابنێت یان مۆڵەتی پێ بدات لەوەی وەلاء بدات بە هەر کەسێك کە خۆی بیەوێن، ئەوە کردنە دیارییە.

## ١١- ڕاکێشانی وەلاء لەلایەن کۆیلەوە (بۆ خاوەنەکەی) کاتێ ئازاد دەبێت[1]

**٢٢٧٠**- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ الزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ ﷺ اشْتَرَى عَبْدًا، فَأَعْتَقَهُ، وَلِذَلِكَ الْعَبْدِ بَنُونَ مِنِ امْرَأَةٍ حُرَّةٍ، فَلَمَّا أَعْتَقَهُ الزُّبَيْرُ قَالَ: هُمْ مَوَالِيَّ، وَقَالَ: مَوَالِي أُمِّهِمْ، بَلْ هُمْ مَوَالِينَا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، فَقَضَى عُثْمَانُ لِلزُّبَيْرِ بِوَلَائِهِمْ[2].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ کۆیلەیەکی کڕی و ئازادی کرد، ئەو کۆیلەیەش چەند کوڕێکی هەبوون لە ئافرەتێکی ئازادکراو، جا کاتێ زوبەیر کۆیلەکەی ئازاد کرد گوتی: کوڕەکان کۆیلەی من بوون و (وەلائیان بۆ منە)، ئازادکەرانی دایکیشیان گوتیان: بەڵکوو کۆیلەی ئێمە بوون و (وەلائیان بۆ ئێمەیە)، جا کێشەکەیان برد بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ جا ئیمامی عوسمان بڕیاری وەلائی بۆ زوبەیر دا.

**٢٢٧١**- وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ سُئِلَ عَنْ عَبْدٍ لَهُ وَلَدٌ مِنِ امْرَأَةٍ حُرَّةٍ، لِمَنْ وَلَاؤُهُمْ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: إِنْ مَاتَ أَبُوهُمْ وَهُوَ عَبْدٌ لَمْ يُعْتَقْ، فَوَلَاؤُهُمْ لِمَوَالِي أُمِّهِمْ[3].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم پێی گەیشتووە بەوەی سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ پرسیاری لێ کراوە دەربارەی کۆیلەیەك کە منداڵی لە ئافرەتێکی ئازادکراو هەیە، ئایا وەلائەکە بۆ کێیە (بۆ ئازادکەری باوکیەتی یان بۆ ئازادکەری دایکیەتی)؟ سەعید ﷺ گوتی: ئەگەر باوکیان مردووە لە کاتێکدا

---

(١) ـ جَرُّ الْعَبْدِ الْوَلَاءَ إِذَا أُعْتِقَ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤٩ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٤ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٠ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٤أفي المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٧٣٢ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

هێشتا کۆیلە بووە و ئازاد نەکراوە، ئەوە مناڵەکان وەلائەکەیان بۆ ئازادکەرانی دایکیانە.

**٢٢٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَثَلُ ذَلِكَ وَلَدُ الْمُلاَعَنَةِ مِنَ الْمَوَالِي يُنْسَبُ إِلَى مَوَالِي أُمِّهِ، فَيَكُونُونَ هُمْ مَوَالِيَهُ، إِنْ مَاتَ وَرِثُوهُ، وَإِنْ جَرَّ جَرِيرَةً، عَقَلُوا عَنْهُ، فَإِنِ اعْتَرَفَ بِهِ أَبُوهُ أُلْحِقَ بِهِ، وَصَارَ وَلاَؤُهُ إِلَى مَوَالِي أَبِيهِ، وَكَانَ مِيرَاثُهُ لَهُمْ، وَعَقْلُهُ عَلَيْهِمْ، وَيُجْلَدُ أَبُوهُ الْحَدَّ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: منالّی ئافرەتی مولاعەنەلەگەڵکراو (حوکمەکەی بە هەمان شێوەیە) دەربارەی ئافرەتی کۆیلەی ئازادکراو کە منالّەکە بدرێتە پاڵ ئازادکەرانی دایکی (باوکی حاشای لێ کردبێت کوڕی ئەوە، پێی وا بێ هی زینایە)، (لەو کاتەدا) ئازادکەرانی دایکی خاوەنی وەلائی منالّەکەن، ئەگەر مرد میراتی لێ دەگرن، وە ئەگەر جینایەتێکی کرد خوێنبایی لەجیاتی دەدەن، جا ئەگەر باوکی دانی بەوەدا نا کە منالّی خۆیەتی (هی زینا نییە) ئەوە نەسەبەکەی دەلکێندرێت بەوەوە و منالّەکە وەلائەکەی بۆ ئازادکەرانی باوکی دەچێت و میراتەکەی بۆ ئەوانە و خوێنباییەکەشی لەسەر ئەوانە (ئەگەر جینایەتێك ئەنجام بدات)، باوکەکەشی قامچی بوختانی لێ دەدرێت (چونکە کاتی خۆی مولاعەنەی کردووە لەسەر ئەوەی دایکی ئەو منالّە زینای کردووە، ئێستا کە دان بەوەدا دەنێت منالّی خۆیەتی دیارە پێشتر بوختانی کردووە).

**٢٢٧٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الْمَرْأَةُ الْمُلاَعِنَةُ مِنَ الْعَرَبِ، إِذَا اعْتَرَفَ زَوْجُهَا الَّذِي لاَعَنَهَا بِوَلَدِهَا، صَارَ بِمِثْلِ هَذِهِ الْمَنْزِلَةِ، إِلاَّ أَنَّ بَقِيَّةَ مِيرَاثِهِ، بَعْدَ مِيرَاثِ أُمِّهِ وَإِخْوَتِهِ لأُمِّهِ، لِعَامَّةِ الْمُسْلِمِينَ مَا لَمْ يُلْحَقْ بِأَبِيهِ، وَإِنَّمَا وَرَّثَ وَلَدُ الْمُلاَعَنَةِ الْمُوَالاَةَ مَوَالِيَ أُمِّهِ، قَبْلَ أَنْ يَعْتَرِفَ بِهِ أَبُوهُ، لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لَهُ نَسَبٌ وَلاَ عَصَبَةٌ، فَلَمَّا ثَبَتَ نَسَبُهُ صَارَ إِلَى عَصَبَتِهِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها ئافرەتی ئازادی مولاعەنە لەگەڵکراو بە هەمان شێوەیە، کاتێ مێردەکەی بەهۆی منالّەکەی مولاعەنەی لەگەڵ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٣ في العتق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٤ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٥أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

دەکات (بەوەی ئەو منالّە هی ئەو نییە و هی زینایە)، وەك ئەوە وایە (کە پێشتر باس کرا)، تەنها ئەوە نەبێت: ئەو میراتەی دەمێنێتەوە دوای میراتی دایکی و خوشك و براکانی دایکی، بۆ کۆی مسوڵمانانە مادەم نەسەبەکەی نەلکێندراوە بە باوکی، جا کە منالّی ئافرەتی مولاعەنەلەگەڵکراو میراتەکەی بۆ خزمانی دایکیەتی، تەنها پێش ئەو کاتەیە کە باوکی دان بەوەدا دەنێت بەوەی منالّی ئەوە، چونکە نەسەب و عەصەبەی نییە، جا کاتێ نەسەبەکەی دامەزرا میراتەکەی بۆ عەصەبەکانی (واتە خزمانی باوکی) دەچێت.

**٢٢٧٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي وَلَدِ الْعَبْدِ مِنِ امْرَأَةٍ حُرَّةٍ، وَأَبُو الْعَبْدِ حُرٌّ: أَنَّ الْجَدَّ أَبَا الْعَبْدِ يَجُرُّ وَلاَءَ وَلَدِ ابْنِهِ الأَحْرَارِ مِنِ امْرَأَةٍ حُرَّةٍ، يَرِثُهُمْ مَا دَامَ أَبُوهُمْ عَبْدًا، فَإِنْ عَتَقَ أَبُوهُمْ، رَجَعَ الْوَلاَءُ إِلَى مَوَالِيهِ، وَإِنْ مَاتَ وَهُوَ عَبْدٌ، كَانَ الْمِيرَاثُ وَالْوَلاَءُ لِلْجَدِّ، وَلَوْ أَنَّ الْعَبْدَ كَانَ لَهُ ابْنَانِ حُرَّانِ، فَمَاتَ أَحَدُهُمَا، وَأَبُوهُ عَبْدٌ، جَرَّ الْجَدُّ أَبُو الأَبِ، الْوَلاَءَ وَالْمِيرَاثَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی منالّی پیاوی کۆیلە لە ئافرەتێکی ئازاد، لە کاتێکدا باوکی کۆیلەکە ئازادە، گوتوویەتی: باپیر، باوکی کۆیلەکە وەلائی نەوە ئازادەکانی لە ئافرەتێکی ئازادەوە بۆ خۆی ڕادەکێشێت، ئەو میراتیان لێ دەگرێت (نەك باوکیان)، مادەم باوکیان هێشتا کۆیلە بێت، جا کاتێ باوکیان ئازاد بوو، وەلائەکە دەگەڕێتەوە بۆ خزمانی ئەو، وە ئەگەر مرد لە کاتێکدا هەر کۆیلە بوو، ئەوە میرات و وەلائەکە بۆ باپیرەکەیە، وە ئەگەر کۆیلەکە دوو کوڕی ئازادی هەبوون و یەکێکیان مرد لە کاتێکدا باوکی کۆیلەیە، ئەوە باپیرەکە، باوکی باوك، وەلاء و میراتەکە بۆ خۆی ڕادەکێشێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٢ في العتق؛ وفي: ٢٧٥٥ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٤ب في المكاتب والمدبر؛ والحدثاني: ٤٣٦ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

**٢٢٧٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الأَمَةِ تُعْتَقُ وَهِيَ حَامِلٌ، وَزَوْجُهَا مَمْلُوكٌ، ثُمَّ يَعْتِقُ زَوْجُهَا، قَبْلَ أَنْ تَضَعَ حَمْلَهَا أَوْ بَعْدَ مَا تَضَعُ: إِنَّ وَلاَءَ مَا كَانَ فِي بَطْنِهَا لِلَّذِي أَعْتَقَ أُمَّهُ، لأَنَّ ذَلِكَ الْوَلَدَ قَدْ كَانَ أَصَابَهُ الرِّقُّ قَبْلَ أَنْ تُعْتَقَ أُمُّهُ، وَلَيْسَ هُوَ بِمَنْزِلَةِ الَّذِي تَحْمِلُ بِهِ أُمُّهُ بَعْدَ الْعَتَاقَةِ، لأَنَّ الَّذِي تَحْمِلُ بِهِ أُمُّهُ بَعْدَ الْعَتَاقَةِ إِذَا أُعْتِقَ أَبُوهُ جَرَّ وَلاَءَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئافرەتی کۆیلە کە ئازاد بکرێت لە کاتێکدا دووگیانە، مێردەکەشی کۆیلە بێت دواتر مێردەکەی ئازاد ببێت پێش ئەوەی حەملەکەی دابنێت یان دوای ئەوەی حەملەکەی دادەنێت، گوتوویەتی: وەلائی ئەو منداڵەی لە سکیەتی بۆ ئەو کەسەیە کە دایکی ئازاد کردووە، چونکە منداڵەکە کۆیلایەتی تووش بووە بەر لەوەی دایکی ئازاد بکرێت، جا ئەوە وەکوو ئەو منداڵە نییە دایکی بەو دووگیان بێت دوای ئازادبوون، چونکە ئەو منداڵەی دایکی بەو دووگیان دەبێت دوای ئازادبوون، باوکەکەی وەلائەکەی بۆ خۆی ڕادەکێشێت کاتێ ئازاد دەکرێت.

**٢٢٧٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْعَبْدِ يَسْتَأْذِنُ سَيِّدَهُ أَنْ يُعْتِقَ عَبْدًا لَهُ، فَيَأْذَنَ لَهُ سَيِّدُهُ: إِنَّ وَلاَءَ الْعَبْدِ الْمُعْتَقِ لِسَيِّدِ الْعَبْدِ، لاَ يَرْجِعُ وَلاَؤُهُ إِلَى سَيِّدِهِ الَّذِي أَعْتَقَهُ وَإِنْ عَتَقَ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کۆیلەیەی داوای مۆڵەت دەکات لە گەورەکەی بەوەی کۆیلەیەکی خۆی ئازاد بکات و گەورەکەشی مۆڵەتی دەدات، گوتوویەتی: وەلائی کۆیلە ئازادکراوەکە بۆ گەورەی کۆیلەکەیە (چونکە ئەو گەورەی ئازادکەرەکەشە)، وەلائەکەی ناگەڕێتەوە بۆ ئەو گەورەیەی ئازادی کردووە هەرچەندە ئازادی کردبێ (چونکە خۆی کۆیلەی گەورەکەیەتی و ئازادکردنەکە هی ئەوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٦ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٦أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٧ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٦ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

## ١٢- میراتی وەلاء [١]

**٢٢٧٧**- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ الْعَاصِيَ بْنَ هِشَامٍ هَلَكَ، وَتَرَكَ بَنِينَ لَهُ ثَلاَثَةً، اثْنَانِ لأُمٍّ، وَرَجُلٌ لِعَلَّةٍ، فَهَلَكَ أَحَدُ اللَّذَيْنِ لأُمٍّ، وَتَرَكَ مَالاً وَمَوَالِيَ، فَوَرِثَهُ أَخُوهُ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ، مَالَهُ وَوَلاَءَ مَوَالِيهِ، ثُمَّ هَلَكَ الَّذِي وَرِثَ الْمَالَ وَوَلاَءَ الْمَوَالِي، وَتَرَكَ ابْنَهُ وَأَخَاهُ لأَبِيهِ، فَقَالَ ابْنُهُ: قَدْ أَحْرَزْتُ مَا كَانَ أَبِي أَحْرَزَ مِنَ الْمَالِ وَوَلاَءِ الْمَوَالِي، وَقَالَ أَخُوهُ: لَيْسَ كَذَلِكَ، إِنَّمَا أَحْرَزْتَ الْمَالَ، وَأَمَّا وَلاَءُ الْمَوَالِي، فَلاَ، أَرَأَيْتَ لَوْ هَلَكَ أَخِي الْيَوْمَ، أَلَسْتُ أَرِثُهُ أَنَا؟ فَاخْتَصَمَا إِلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، فَقَضَى لأَخِيهِ بِوَلاَءِ الْمَوَالِي[٢].

واتە: لە عەبدولمەلیكی كوڕی ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حاریسی كوڕی هیشامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عاصی كوڕی هیشام مرد و سێ مناڵی دوای خۆی جێ هێشت، دوویان لە یەك دایك بوون، یەكێكی دیكەش لە دایكێكی دیكە بوو، جا یەكێك لەو دووانە مرد كە لە یەك دایك بوون، سەروەت و كۆیلەی ئازادكراوی دوای خۆی جێ هێشت، جا برای لە باوك و دایكی میراتی سەروەت و وەلائی لێ گرت، دواتر ئەوەی سەروەت و وەلائی بە میرات وەرگرتبوو مرد، كوڕ و برایەكەی لە باوكی دوای خۆی جێ هێشت، جا كوڕەكەی گوتی: من ئەوە بەدەست دێنم كە باوكم بەدەستی هێنا لە سەروەت و وەلائی كۆیلە ئازادكراوەكان، برای مردووەكەش گوتی: بەو شێوەیە نییە، تەنها ماڵەكە بۆ تۆیە، بەڵام هەرچی وەلائی كۆیلە ئازادكراوەكانە نەخێر، چی دەڵێی ئەگەر برام ئەوڕۆ بمردبا ئایا من میراتم لێ نەدەگرت؟ جا كێشەكەیان برد بۆ لای عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ، ئەویش بڕیاری وەلائی كۆیلە ئازادكراوەكانی بۆ برای مردووەكە دا.

---

(١) ـ مِيَرَاثُ الْوَلاَءِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٨ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٧ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٧٣٠ في الفرائض؛ والشافعي: ١٠٠٠، كلهم عن مالك به.

**٢٢٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَبُوهُ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا عِنْدَ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، فَاخْتَصَمَ إِلَيْهِ نَفَرٌ مِنْ جُهَيْنَةَ، وَنَفَرٌ مِنْ بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، وَكَانَتِ امْرَأَةٌ مِنْ جُهَيْنَةَ عِنْدَ رَجُلٍ مِنْ بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، يُقَالُ لَهُ: إِبْرَاهِيمُ بْنُ كُلَيْبٍ، فَمَاتَتِ الْمَرْأَةُ، وَتَرَكَتْ مَالاً وَمَوَالِيَ، فَوَرِثَهَا ابْنُهَا وَزَوْجُهَا، ثُمَّ مَاتَ ابْنُهَا، فَقَالَ وَرَثَتُهُ: لَنَا وَلاَءُ الْمَوَالِي، قَدْ كَانَ ابْنُهَا أَحْرَزَهُ، فَقَالَ الْجُهَنِيُّونَ: لَيْسَ كَذَلِكَ، إِنَّمَا هُمْ مَوَالِي صَاحِبَتِنَا، فَإِذَا مَاتَ وَلَدُهَا فَلَنَا وَلاَؤُهُمْ، وَنَحْنُ نَرِثُهُمْ، فَقَضَى أَبَانُ بْنُ عُثْمَانَ لِلْجُهَنِيِّينَ بِوَلاَءِ الْمَوَالِي[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش باوکی هەواڵی پێ داوە بەوەی (جارێکیان) لەلای ئەبانی کوڕی عوسمان بووە، جا چەند کەسێك لە هۆزی جوهەینە و چەند کەسێك لە نەوەی حاریسی کوڕی خەزرەج کێشەی خۆیان هێنا بۆ لای، کە ئافرەتێکی جوهەینە لەلای پیاوێکی نەوەی حاریسی کوڕی خەزرەج بوو و خێزانی بوو، پیاوەکە پێی دەگوترا: ئیبراهیمی کوڕی کولەیب، جا ئافرەتەکە مردبوو و سەروەت و کۆیلەی ئازادکراوی جێ هێشتبوو، جا کوڕەکەی و مێردەکەی میراتەکەیان لێ گرت، دواتر کوڕەکەشی مرد، جا میراتگرانی کوڕەکە گوتیان: وەلائی کۆیلە ئازادکراوەکان کە کوڕەکە وەریگرتبوو بۆ ئێمەیە، جوهەینییەکانیش گوتیان: بەو شێوەیە نییە، ئەوان ئازادکراوی ئافرەتەکەی ئێمەن، ئەگەر کوڕەکەی بمرێت وەلائی ئازادکراوەکان بۆ ئێمەیە و ئێمە بە میرات دەگرین، جا ئەبانی کوڕی عوسمان ﷺ بڕیاری پێدانی وەلائی ئازادکراوەکانی بۆ جوهەینییەکان دا.

**٢٢٧٩-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ قَالَ فِي رَجُلٍ هَلَكَ وَتَرَكَ بَنِينَ لَهُ ثَلاَثَةً، وَتَرَكَ مَوَالِيَ أَعْتَقَهُمْ هُوَ عَتَاقَةً، ثُمَّ إِنَّ الرَّجُلَيْنِ مِنْ بَنِيهِ هَلَكَا، وَتَرَكَا أَوْلاَدًا، فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷺ: يَرِثُ الْمَوَالِيَ الْبَاقِي مِنَ الثَّلاَثَةِ، فَإِذَا هَلَكَ هُوَ، فَوَلَدُهُ وَوَلَدُ إِخْوَتِهِ فِي وَلاَءِ الْمَوَالِي، شَرَعٌ، سَوَاءٌ[2].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٥٩ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٨ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٧٣١ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٠ في العتق؛ والحدثاني: ٤٣٨أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەربارەی پیاوێك کە بمرێت و سێ کوڕی دوای خۆی جێ هێشتبێت، وە چەندین کۆیلەشی دوای خۆی جێ هێشتبوون کە ئەو ئازادی کردوون، دواتر دوو لە کوڕەکانی دەمرن و مناڵ دوای خۆیان جێ دەهێڵن، سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ گوتوویەتی: ئەو کوڕەی لە سێ کوڕەکان ماوەتەوە میرات لە کۆیلە ئازادکراوەکان دەگرێت، جا ئەگەر خۆیشی مرد، ئەوە مناڵەکانی خۆی و مناڵەکانی براکانی لە وەلائی کۆیلە ئازادکراوەکان وەکوو یەکن (لە یەك ئاستن، گشتیان میراتیان لێ دەگرن).

## ١٣- میراتی کۆیلەی سائیبە و وەلائی ئەو کەسەی کۆیلەی جوولەکە و گاور ئازاد دەکات[1]

**٢٢٨٠-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنِ السَّائِبَةِ؟ فَقَالَ: يُوَالِي مَنْ شَاءَ، فَإِنْ مَاتَ وَلَمْ يُوَالِ أَحَدًا، فَمِيرَاثُهُ لِلْمُسْلِمِينَ وَعَقْلُهُ عَلَيْهِمْ[2].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی کۆیلەی سائیبە (بریتییە لەو بەندەیەی خاوەنەکەی پێی دەڵێت: برۆ تۆ ئازاد بوویت و هیچمان لە نێوان نەما و میراتەکەشت و وەلائەکەشتم ناوێت)؟ گوتی: وەلائەکەی دەدات بە هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت، جا ئەگەر مرد و وەلائی نەدا بە کەس، ئەوە میراتەکەی بۆ مسوڵمانانە خوێنبایی جینایەتەکەشی لەسەر مسوڵمانانە.

**٢٢٨١-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا سُمِعَ فِي السَّائِبَةِ: أَنَّهُ لاَ يُوَالِي أَحَدًا، وَأَنَّ مِيرَاثَهُ لِلْمُسْلِمِينَ وَعَقْلَهُ عَلَيْهِمْ[3].

---

(١) ـ مِيرَاثُ السَّائِبَةِ وَوَلَاءُ مَنْ أَعْتَقَ الْيَهُودِيَّ وَالنَّصْرَانِيَّ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦١ في العتق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري، ٢٧٦٣ في العتق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی کۆیلەی سائیبە ئەوەیە: وەلائەکەی نادات بە کەس، میراتەکەشی بۆ مسوڵمانانە و خوێنبایی جینایەتەکەشی لەسەر مسوڵمانانە.

**٢٢٨٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْيَهُودِيِّ وَالنَّصْرَانِيِّ يُسْلِمُ عَبْدُ أَحَدِهِمَا، فَيُعْتِقُهُ قَبْلَ أَنْ يُبَاعَ عَلَيْهِ: إِنَّ وَلاَءَ الْعَبْدِ الْمُعْتَقِ لِلْمُسْلِمِينَ، وَإِنْ أَسْلَمَ الْيَهُودِيُّ، أَوِ النَّصْرَانِيُّ بَعْدَ ذَلِكَ، لَمْ يَرْجِعْ إِلَيْهِ الْوَلاَءُ أَبَدًا.

قَالَ: وَلَكِنْ إِذَا أَعْتَقَ الْيَهُودِيُّ أَوِ النَّصْرَانِيُّ عَبْدًا عَلَى دِينِهِمَا، ثُمَّ أَسْلَمَ الْمُعْتَقُ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ الْيَهُودِيُّ أَوِ النَّصْرَانِيُّ الَّذِي أَعْتَقَهُ، ثُمَّ أَسْلَمَ الَّذِي أَعْتَقَهُ، رَجَعَ إِلَيْهِ الْوَلاَءُ، لأَنَّهُ قَدْ كَانَ ثَبَتَ لَهُ الْوَلاَءُ يَوْمَ أَعْتَقَهُ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ كَانَ لِلْيَهُودِيِّ، أَوِ النَّصْرَانِيِّ وَلَدٌ مُسْلِمٌ، وَرِثَ مَوَالِيَ أَبِيهِ الْيَهُودِيِّ، أَوِ النَّصْرَانِيِّ، إِذَا أَسْلَمَ الْمَوْلَى الْمُعْتَقُ، قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ الَّذِي أَعْتَقَهُ، وَإِنْ كَانَ الْمُعْتَقُ حِينَ أُعْتِقَ مُسْلِمًا، لَمْ يَكُنْ لِوَلَدِ النَّصْرَانِيِّ، أَوِ الْيَهُودِيِّ الْمُسْلِمَيْنِ مِنْ وَلاَءِ الْعَبْدِ الْمُسْلِمِ شَيْءٌ، لأَنَّهُ لَيْسَ لِلْيَهُودِيِّ، وَلاَ لِلنَّصْرَانِيِّ وَلاَءٌ، فَوَلاَءُ الْعَبْدِ الْمُسْلِمِ لِجَمَاعَةِ الْمُسْلِمِينَ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی جوولەکە و گاور کە کۆیلەکەیان مسوڵمان بێت و خاوەنەکەی (کە جوولەکەیە یان گاورە) ئازادی بکات پێش ئەوەی بفرۆشرێت، گوتوویەتی: وەلائی کۆیلە ئازادکراوەکە بۆ مسوڵمانانە، وە ئەگەر خاوەنە جوولەکەکە یان گاورەکەش دوای (ئازادکردنی کۆیلە مسوڵمانەکە) بوو بە مسوڵمان، هەر وەلائەکەی بۆ ناگەڕێتەوە هەرگیز.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵام ئەگەر جوولەکە یان گاور کۆیلەیەکیان ئازاد کرد کە لەسەر دینی ئەوان بوو، دواتر کۆیلە ئازادکراوەکە بوو بە مسوڵمان بەر لەوەی جوولەکەکە یان گاورەکەی ئازادی کردووە ببێت بە مسوڵمان، دواتر ئەو کەسەی ئازادی کردووە بوو بە مسوڵمان، ئەوە وەلائەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، چونکە هەر لەو ڕۆژەی ئازادی کردووە وەلائی بۆ دامەزراوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٤ في العتق، عن مالك به.




ئیمامی مالیك رحمه الله گوتوویەتی: وە ئەگەر جوولەکە یان گاور کوڕێکی مسوڵمانیان هەبوو، ئەوە کوڕەکە میراتی کۆیلە ئازادکراوەکانی باوکە جوولەکە یان گاورەکەی دەگرێت، ئەگەر کۆیلەکە بوو بە مسوڵمان بەر لەوەی ئەو کەسە ببێت بە مسوڵمان کە ئازادی کردووە، وە ئەگەر ئازادکراوەکە کاتێ ئازاد کرا مسوڵمان بوو، ئەوە هیچ وەلائێکی کۆیلەی مسوڵمان بۆ کوڕە مسوڵمانەکەی کەسە گاورەکە یان جوولەکەکە نییە (چونکە وەلائەکە بۆ باوکیان دانامەزرێت تا بۆ ئەو بمێنێتەوە)، چونکە وەلاء بۆ جوولەکە و گاور نییە، کەواتە وەلائی کۆیلەی مسوڵمان بۆ کۆمەڵی مسوڵمانانە.



# پەرتووکی

# کۆیلەی نووسراوپێدراو[1]



---

(١) ـ كِتَابُ الْمُكَاتَبِ.

## ١- بڕیاری شەرعی دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو[١]

**٢٢٨٣-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: الْمُكَاتَبُ عَبْدٌ، مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ شَيْءٌ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: کۆیلەی نووسراوپێدراو هەر کۆیلەیە مادەم بەشێك و شتێك لە پارەی کڕینەوەی خۆی لەسەر مابێت (واتە تا کۆتا دیناری کڕینەوەی خۆی نەدات ئازاد نابێت).

**٢٢٨٤-** أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ كَانَا يَقُولَانِ الْمُكَاتَبُ عَبْدٌ، مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ شَيْءٌ[٣].

واتە: عوڕوەی کوڕی زوبەیر و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ دەیانگوت: کۆیلەی نووسراوپێدراو هەر کۆیلەیە مادەم بەشێك و شتێك لە پارەی کڕینەوەی خۆی لەسەر مابێت.

**٢٢٨٥-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ رَأْيِي[٤].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە بۆچوونی منیشە.

**٢٢٨٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ هَلَكَ الْمُكَاتَبُ، وَتَرَكَ مَالاً أَكْثَرَ مِمَّا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ، وَلَهُ وَلَدٌ وُلِدُوا فِي كِتَابَتِهِ، أَوْ كَاتَبَ عَلَيْهِمْ، وَرِثُوا مَا بَقِيَ مِنَ الْمَالِ بَعْدَ قَضَاءِ كِتَابَتِهِ[٥].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو مرد و ماڵ و سەروەتی دوای خۆی جێ هێشت و ماڵەکەش زیاتر بوو لەوەی لەسەری مابۆیەوە لە پارەی خۆکڕینەوەی و مناڵیشی هەبوون و مناڵەکانی لە کاتی نووسراوپێدانەکەی

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي الْمُكَاتَبِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٦ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٥ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٨٥٧ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع ضعيف.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٧ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٥أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٥) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٨ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٥ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

لەدایك ببوون، یان عەقدی کڕینەوەی ئەوانیشی کردبوو، ئەوە منداڵەکانی دوای دانەوەی پارەی کڕینەوەی خۆی ئەو ماڵەی ماوەتەوە بە میرات دەیبەن.

**٢٢٨٧-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ قَيْسٍ الْمَكِّيِّ ﷺ، أَنَّ مُكَاتَبًا كَانَ لِابْنِ الْمُتَوَكِّلِ، هَلَكَ بِمَكَّةَ، وَتَرَكَ عَلَيْهِ بَقِيَّةً مِنْ كِتَابَتِهِ، وَدُيُونًا لِلنَّاسِ، وَتَرَكَ ابْنَتَهُ، فَأَشْكَلَ عَلَى عَامِلِ مَكَّةَ الْقَضَاءُ فِيهِ، فَكَتَبَ إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ ﷺ يَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ الْمَلِكِ: أَنِ ابْدَأْ بِدُيُونِ النَّاسِ، ثُمَّ اقْضِ مَا بَقِيَ مِنْ كِتَابَتِهِ، ثُمَّ اقْسِمْ مَا بَقِيَ مِنْ مَالِهِ بَيْنَ ابْنَتِهِ وَمَوْلَاهُ[1].

واتە: لە حومەیدی کوڕی قەیسی مەکییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کۆیلەیەکی نووسراوپێدراو کە هی ئیبنو موتەوەکیل بوو لە مەککە مرد و هەندێك لە پارەی کیتابەت و خۆکڕینەوەکەی خۆی لەسەر مابوو لەگەڵ هەندێك لە قەرزی خەڵکی، جا کاربەدەستی مەککە ئیشکالی بۆ دروست بوو (نەیزانی چۆن حوکم بدات، نەیزانی ئەو میراتەی هەیەتی ئاخۆ بیدات بە خزمەکانی یان بە خاوەن قەرزەکان یان پارەی خۆکڕینەوەکەی پێ تەواو بکات)، جا نووسراوی بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان کرد (کە ئەو کات خەلیفە بوو) پرسیاری لێ کرد لەو بارەیەوە، عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوانیش ﷺ بۆی نووسی: بە قەرزی خەڵك دەست پێ بکە (سەرەتا قەرزی خەڵك بدەرەوە)، دواتر ئەو پارەی ماوە لە خۆکڕینەوەکەی بیدەرەوە (بە خاوەنی کۆیلەکە، با تەواو ئازاد بێت)، دواتر ئەوەی مایەوە لە سەروەت و سامانەکە دابەشی بکە لە نێوان کچەکەی و ئازادکەرەکەی (واتە نیوەی بۆ کچەکەی بێت و نیوەشی بۆ ئازادکەرەکەی بێت).

**٢٢٨٨-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لَيْسَ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ أَنْ يُكَاتِبَهُ إِذَا سَأَلَهُ ذَلِكَ، وَلَمْ أَسْمَعْ أَنَّ أَحَدًا مِنَ الأَئِمَّةِ أَكْرَهَ رَجُلاً عَلَى أَنْ يُكَاتِبَ عَبْدَهُ، وَقَدْ سَمِعْتُ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ إِذَا سُئِلَ عَنْ ذَلِكَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ﴿٣٣﴾﴾ النور، يَتْلُو هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا ﴿٢﴾﴾ المائدة، ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَوٰةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ ﴿١٠﴾﴾ الجمعة.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٩ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٥ج في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٨٥٨ في العتاق، كلهم عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَإِنَّمَا ذَلِكَ أَمْرٌ أَذِنَ اللهُ ﷻ فِيهِ لِلنَّاسِ، وَلَيْسَ بِوَاجِبٍ عَلَيْهِمْ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە سەید و گەورەی کۆیلە لەسەری واجب نییە عەقدی کیتابەت و نووسراوپێدان لەگەڵ کۆیلەکەی بکات کاتێ کۆیلەکەی داوای لێ دەکات، وە گوێبیستیش نەبووم هیچ لە پێشەوایان کەسیان ناچار کردبێت عەقدی کیتابەت و نووسراوپێدان لەگەڵ کۆیلەکەی بکات، جا لە هەندێك لە زانایانم گوێ لێ بووە کاتێ پرسیاریان لێ کراوە دەربارەی ئەو بابەتە و پێیان گوتراوە (چۆن واجب نییە؟) لە کاتێکدا خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا دەفەرموێ:﴿ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ﴿٣٣﴾ ﴾ النور، (بە صیغەی فەرمان دەفەرموێ): [کیتابەتیان لەگەڵ بکەن ئەگەر چاکەتان تێدا بینین]، زاناکانیش (تا وەڵامیان بدەنەوە و پێیان بڵێن هەموو ئەمر و فەرمانێك لە قورئان بۆ واجببوون نییە) ئەم دوو ئایەتەیان دەخوێندەوە: ﴿ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا ﴿٢﴾ ﴾ المائدة، واتە: [کاتێ لەژێر ئیحرام چوونەدەر و حەڵاڵ بوونەوە ڕاو بکەن]، ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَوٰةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ ﴿١٠﴾ ﴾ الجمعة، واتە: [جا کاتێك نوێژی هەینی تەواو بوو ئیدی بڵاو ببنەوە بەسەر زەوی و داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بکەن]، (جا کە ئەو دوو ئایەتە بە صیغەی فەرمان هاتوون مانای وا نییە ڕاوکردن دوای ئیحرامشکاندن و ڕۆیشتن لە مزگەوت دوای تەواوبوونی نوێژی هەینی واجب بێت، ئایەتەکەی کیتابەتیش بەهەمان شێوە).

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بەڵکوو ئەوە تەنها و تەنها بابەتێکە خوای پەروەردگار ﷻ مۆڵەتی خەڵکی داوە تیایدا، بەڵام لەسەریان واجب نییە (کەواتە عەقدی کیتابەت لە ئایەتەکەدا تەنها دروست و ڕەوایەتی پێ دراوە، بە بەڵگەی فەرموودەش کە هاندان و پاداشتی بۆ دیاری کراوە حوکمی سوننەت وەردەگرێ، کەواتە واجب نییە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠٠ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٦ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

٢٢٨٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وسَمِعْتُ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُ فِي قَوْلِ اللهِ ﷻ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ النور، إِنَّ ذَلِكَ أَنْ يُكَاتِبَ الرَّجُلُ غُلاَمَهُ، ثُمَّ يَضَعُ عَنْهُ مِنْ آخِرِ كِتَابَتِهِ شَيْئًا مُسَمًّى.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَأَدْرَكْتُ عَمَلَ النَّاسِ عَلَى ذَلِكَ عِنْدَنَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە یەكێك لە زانایان بوو دەربارەی وتەی خوای پەروەردگار ﷻ كە لە پەرتووكەكەیدا (دەربارەی كۆیلە) دەفەرمووێ: ﴿ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ النور، واتە: [بەشێك لەوماڵەیان بدەنێ كە خوا پێی داون]، زاناكە دەیگوت: ئەوە بریتییە لەوەی مرۆڤ عەقدی كیتابەت و نووسراوپێدان لەگەڵ كۆیلەكەی بكات، دواتر لە پارەدانی كۆتایی شتێكی دیاریكراوی لێ خۆش بێت (ئەوە مانای ئایەتەكەیە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووبم لە زانایان (لەو بارەیەوە)، وە كرداری خەڵكیم لەسەر ئەو بنەمایە بینیوە لەلای خۆمان.

٢٢٩٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَاتَبَ غُلاَمًا لَهُ عَلَى خَمْسَةٍ وَثَلاَثِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ، ثُمَّ وَضَعَ عَنْهُ مِنْ آخِرِ كِتَابَتِهِ خَمْسَةَ آلاَفِ دِرْهَمٍ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم گەیشتووە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ ڕازی بوو بەوەی كۆیلەیەكی ئەو خۆی لێ بكڕێتەوە بە سی و پێنج هەزار درهەم، دواتر لە كۆتاییدا پێنج هەزار درهەمی لەسەر لابرد و لێی خۆش بوو.

٢٢٩١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمُكَاتَبَ إِذَا كَاتَبَهُ سَيِّدُهُ تَبِعَهُ مَالُهُ، وَلَمْ يَتْبَعْهُ وَلَدُهُ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُمْ فِي كِتَابَتِهِ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠١ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٦ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠٢ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٦أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠٣ في المكاتب، عن مالك به.



(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە: کۆیلەی نووسراوپێدراو کاتێ گەورەکەی کیتابەتی لەگەڵ دەکات و ڕازییە خۆی بکڕێتەوە، ئەوە ماڵەکەی شوێنی دەکەوێت (ماڵەکەشی دەبێتە موڵکی خۆی)، بەڵام مناڵەکانی شوێنی ناکەون و لەگەڵ عەقدەکە حیساب ناکرێن، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە بە مەرجیان بگرێت لە کیتابەت و کڕینەوەکەی خۆیدا.

**٢٢٩٢- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الْمُكَاتَبِ يُكَاتِبُهُ سَيِّدُهُ، وَلَهُ جَارِيَةٌ بِهَا حَبَلٌ مِنْهُ لَمْ يَعْلَمْ بِهِ، هُوَ وَلاَ سَيِّدُهُ يَوْمَ كِتَابَتِهِ: فَإِنَّهُ لاَ يَتْبَعُهُ ذَلِكَ الْوَلَدُ، لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ دَخَلَ فِي كِتَابَتِهِ، وَهُوَ لِسَيِّدِهِ، فَأَمَّا الْجَارِيَةُ، فَإِنَّهَا لِلْمُكَاتَبِ، لأَنَّهَا مِنْ مَالِهِ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە گەورەکەی کیتابەتی لەگەڵ بکات و کۆیلەکەش جارییەیەکی هەبێت و دووگیان بێت بە کۆیلەکە و کۆیلەکە و گەورەکەشی لە ڕۆژی کیتابەتەکە نەزانن دووگیانە، دەیگوت: ئەو مناڵە شوێن کۆیلەکە ناکەوێت (نابێتە هی کۆیلەکە)، چونکە نەچۆتە چوارچێوەی کیتابەتەکەوە، بۆیە بۆ گەورەکەیەتی، بەڵام هەرچی جارییەکەیە بۆ کۆیلەکەیە، چونکە موڵکی خۆیەتی.

**٢٢٩٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ وَرِثَ مُكَاتَبًا مِنِ امْرَأَتِهِ هُوَ وَابْنُهَا: إِنَّ الْمُكَاتَبَ إِنْ مَاتَ قَبْلَ أَنْ يَقْضِيَ كِتَابَتَهُ، اقْتَسَمَا مِيرَاثَهُ عَلَى كِتَابِ اللهِ، وَإِنْ أَدَّى كِتَابَتَهُ ثُمَّ مَاتَ، فَمِيرَاثُهُ لاِبْنِ الْمَرْأَةِ، لَيْسَ لِلزَّوْجِ مِنْ مِيرَاثِهِ شَيْءٌ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك کە کۆیلەیەکی نووسراوپێدراو بە میرات لە خێزانەکەی بگرێت (خێزانەکەشی) کوڕێکی هەبێت، گوتوویەتی: ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە مردبوو بەر لەوەی پارەی نووسراوپێدران و خۆکڕینەوەکەی خۆی تەواو بدات، ئەوە مێردەکە و کوڕەکە میراتەکەی بەپێی پەرتووکی خوا بۆ خۆیان دابەش دەکەن (چارەکێك بۆ مێردەکەیە و ئەوەی دیکەش

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠٤ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠٤ في المكاتب، عن مالك به.




بۆ کوڕەکەیە)، بەڵام ئەگەر پارەی نووسراوپێدان و خۆکڕینەوەی خۆی تەواو دابوو ئینجا مرد، ئەوە میراتەکەی گشتی بۆ کوڕی ئافرەتەکەیە (چونکە کۆیلەکە موڵکی ئافرەتەکە نەماوە، بەڵام کوڕەکەی چونکە میراتگری ئازادکەرە بە ناوی وەلاء میراتەکە دەبات)، هیچ لە میراتەکەی بۆ مێردەکە نییە.

**٢٢٩٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يُكَاتِبُ عَبْدَهُ، قَالَ: يُنْظَرُ فِي ذَلِكَ، فَإِنْ كَانَ إِنَّمَا أَرَادَ الْمُحَابَاةَ لِعَبْدِهِ، وَعُرِفَ ذَلِكَ مِنْهُ بِالتَّخْفِيفِ عَنْهُ، فَلاَ يَجُوزُ ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ إِنَّمَا كَاتَبَهُ عَلَى وَجْهِ الرَّغْبَةِ وَطَلَبِ الْمَالِ، وَابْتِغَاءِ الْفَضْلِ وَالْعَوْنِ عَلَى كِتَابَتِهِ، فَذَلِكَ جَائِزٌ لَهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کۆیلەیەی کیتابەتی لەگەڵ کراوە بەوەی خۆی بکڕێتەوە چوو کیتابەتی لەگەڵ کۆیلەکەی خۆی کرد، گوتوویەتی: سەیری ئەو بابەتە دەکرێ، ئەگەر تەنها مەبەستی لێخۆشبوون و ئاسانکاری بێت بۆ کۆیلەکەی خۆی و ئەوەی لێ زانرا بەهۆی لەسەر سوککردنی کیتابەتەکە، ئەوە بۆی دروست نییە، وە ئەگەر کیتابەتی لەگەڵ کردبوو بۆ دەستخستنی ماڵ و سەروەت و تەماحی زیادە و یارمەتی پەیداکردن بۆ کیتابەت و کڕینەوەی خۆی، ئەوە بۆی دروستە.

**٢٢٩٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ وَطِئَ مُكَاتَبَةً لَهُ: إِنَّهَا إِنْ حَمَلَتْ فَهِيَ بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَتْ كَانَتْ أُمَّ وَلَدٍ، وَإِنْ شَاءَتْ قَرَّتْ عَلَى كِتَابَتِهَا، فَإِنْ لَمْ تَحْمِلْ، فَهِيَ عَلَى كِتَابَتِهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی جیماع لەگەڵ ئافرەتێکی کۆیلەی نووسراوپێدراو دەکات، گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتەکە دووگیان بێت (بەهۆی ئەو جیماعەوە)، ئەوە سەرپشکە، ئەگەر حەز بکات دەتوانێ ببێتە (ئوم وەلەد) دایکی مناڵبوو لە گەورەکەی، وە ئەگەر حەزیش بکات دەتوانێ لەسەر کیتابەتەکەی و خۆکڕینەوەکەی بمێنێتەوە، وە ئەگەر دووگیان نەبوو، ئەوە لەسەر کیتابەت و خۆکڕینەوەکەی دەمێنێتەوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠٦ في المكاتب، عن مالك به.




**٢٢٩٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي الْعَبْدِ يَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ: إِنَّ أَحَدَهُمَا لاَ يُكَاتِبُ نَصِيبَهُ مِنْهُ، أَذِنَ لَهُ بِذَلِكَ صَاحِبُهُ أَوْ لَمْ يَأْذَنْ، إِلاَّ أَنْ يُكَاتِبَاهُ جَمِيعًا، لأَنَّ ذَلِكَ يَعْقِدُ لَهُ عِتْقًا، وَيَصِيرُ إِذَا أَدَّى الْعَبْدُ مَا كُوتِبَ عَلَيْهِ، إِلَى أَنْ يَعْتِقَ نِصْفُهُ، وَلاَ يَكُونُ عَلَى الَّذِي كَاتَبَ بَعْضَهُ، أَنْ يَسْتَتِمَّ عِتْقَهُ، فَذَلِكَ خِلاَفٌ لِمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ الْعَدْلِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی کۆیلە کە لە نێوان دوو کەسدا بێت (کۆیلەی دوو کەس بێت بەشەریکی): یەکێکیان عەقدی نووسراوپێدانی بۆ نەکات لە پشکی خۆی (ئەوە لەسەری واجب نییە عەقدی بۆ بکات و ئەویش پشکەکەی خۆی بفرۆشێتە کۆیلەکە)، (جا جیاوازی نییە) مۆڵەتی بە شەریکەکەی دابێت یان مۆڵەتی نەدابێت، تەنها لەو کاتە نەبێت کە هەردووکیان بەیەکەوە عەقدی خۆکڕینەوەی بۆ بکەن (ئەو کات جێبەجێ دەبێت)، چونکە (ئەگەر بڵێین بەتەنها بە ڕازیبوونی یەکێکیان دروستە) ئەوە وای لێ دێت کۆیلەکە پارەی نووسراوپێدرانی خۆی دەدات تا نیوەی ئازاد بێت و ئەو کەسەش کە نووسراوپێدانی کردووە بۆ بەشەکەی خۆی لەسەری واجب نییە ئازادکردنەکەی تەواو بکات و پشکەکەی دیکە بکڕێتەوە (کەواتە ئازاد نابێت و ئامانجەکە نەپێکرا)، جا ئەوە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پشکی خۆی ئازاد کرد لە کۆیلەیەك، ئەوە پشکەکەی دیکەی بەسەر دەخەمڵێندرێ و دەبێ پشکەکەی دیکەش بکڕێتەوە و بەتەواوی ئازادی بکات (بەڵام ئەوە دەربارەی ئازادکردنی یەکجارەکییە بەبێ خۆکڕینەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە باسی دەکەین بابەتی خۆکڕینەوەیە، لێرەدا شەریکەکە لەسەری واجب نییە پشکەکەی دیکە بکڕێتەوە).

**٢٢٩٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَإِنْ جَهِلَ ذَلِكَ حَتَّى يُؤَدِّيَ الْمُكَاتَبُ أَوْ قَبْلَ أَنْ يُؤَدِّيَ، رَدَّ إِلَيْهِ الَّذِي كَاتَبَهُ، مَا قَبَضَ مِنَ الْمُكَاتَبِ، فَاقْتَسَمَهُ هُوَ وَشَرِيكُهُ عَلَى قَدْرِ حِصَصِهِمَا، وَبَطَلَتْ كِتَابَتُهُ، وَكَانَ عَبْدًا لَهُمَا عَلَى حَالِهِ الأُولَى.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٠٩ في المكاتب، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر شەریکەکە نەیزانی (شەریکەکەی دیکەی عەقدی خۆکڕینەوەی لەگەڵ کۆیلەکەیان کردووە) تا کۆیلە نووسراوپێدراوەکە پارەی خۆکڕینەوەکەی خۆی دا یان بەر لە پارەدان، ئەوە ئەو شەریکەی عەقدی خۆکڕینەوەی لەگەڵ کردووە دەبێت ئەو پارەی لە کۆیلەکەی وەرگرتووە بیدات بە شەریکەکەی دیکەشی، جا دەبێ لەگەڵ شەریکەکەی بەشی بکات بەپێی پشکەکانیان و عەقدی خۆکڕینەوەکەش هەڵدەوەشێتەوە و هەر کۆیلەی هەردووکیانە وەك جاران.

**٢٢٩٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي مُكَاتَبٍ بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَأَنْظَرَهُ أَحَدُهُمَا بِحَقِّهِ الَّذِي عَلَيْهِ، وَأَبَى الآخَرُ أَنْ يُنْظِرَهُ: فَاقْتَضَى الَّذِي أَبَى أَنْ يُنْظِرَهُ بَعْضَ حَقِّهِ، ثُمَّ مَاتَ الْمُكَاتَبُ وَتَرَكَ مَالاً، لَيْسَ فِيهِ وَفَاءٌ مِنْ كِتَابَتِهِ، قَالَ مَالِكٌ: يَتَحَاصَّانِ بِقَدْرِ مَا بَقِيَ لَهُمَا عَلَيْهِ، يَأْخُذُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِقَدْرِ حِصَّتِهِ، فَإِنْ تَرَكَ الْمُكَاتَبُ فَضْلاً عَنْ كِتَابَتِهِ، أَخَذَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَا بَقِيَ مِنَ الْكِتَابَةِ، وَكَانَ مَا بَقِيَ بَيْنَهُمَا بِالسَّوَاءِ، فَإِنْ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ، وَقَدِ اقْتَضَى الَّذِي لَمْ يُنْظِرْهُ أَكْثَرَ مِمَّا اقْتَضَى صَاحِبُهُ، كَانَ الْعَبْدُ بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ، وَلاَ يَرُدُّ عَلَى صَاحِبِهِ فَضْلَ مَا اقْتَضَى، لأَنَّهُ إِنَّمَا اقْتَضَى الَّذِي لَهُ بِإِذْنِ صَاحِبِهِ، وَإِنْ وَضَعَ عَنْهُ أَحَدُهُمَا الَّذِي لَهُ، ثُمَّ اقْتَضَى صَاحِبُهُ بَعْضَ الَّذِي لَهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ عَجَزَ، فَهُوَ بَيْنَهُمَا، وَلاَ يَرُدُّ الَّذِي اقْتَضَى عَلَى صَاحِبِهِ شَيْئًا، لأَنَّهُ إِنَّمَا اقْتَضَى الَّذِي لَهُ عَلَيْهِ، وَذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ الدَّيْنِ لِلرَّجُلَيْنِ بِكِتَابٍ وَاحِدٍ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ، فَيُنْظِرُهُ أَحَدُهُمَا وَيَشِحُّ الآخَرُ، فَيَقْتَضِي بَعْضَ حَقِّهِ، ثُمَّ يُفْلِسُ الْغَرِيمُ، فَلَيْسَ عَلَى الَّذِي اقْتَضَى أَنْ يَرُدَّ شَيْئًا مِمَّا أَخَذَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە نووسراوپێدراوی دوو کەس بێت و یەکێکیان (لە مەوعیدی خۆی زیاتر) چاوەڕێی بکات لەو مافەی لەسەریەتی (کە بریتییە لە پارەی خۆکڕینەوەکە)، ئەوەی دیکەشیان ڕازی نەبوو زیاتر چاوەڕێی بکات: جا ئەو کەسەی ڕازی نەبوو زیاتر چاوەڕێی بکات هەندێ پارەی وەرگرتبۆیەوە، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە مرد و سەروەتێکی وای دوای خۆی جێ هێشت بەشی پارەی نووسراوپێدانەکەی نەدەکرد، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دوو کەسەکە هەر یەکەیان چەندی لەسەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١١ في المكاتب، عن مالك به.



کۆیلەکە ماوە بەگوێرەی ئەو ئەندازەیە ماڵەکە بەش دەکەن، هەر یەکەیان بە ئەندازەی پشکی خۆی وەردەگرێت، وە ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە سامانی زیاتری جێ هێشت لە نرخی نووسراوپێدرانەکە، ئەوە هەر یەکەیان چەندی لەسەر کۆیلەکە ماوە لە پارەی نووسراوپێدانەکە ئەوەندە وەردەگرێت، ئەوەیشی دوای وەرگرتنی پارەی نووسراوپێدانەکە دەمێنێتەوە بەگوێرەی پشکەکانیان لە نێوانی خۆیان دابەشی دەکەن، جا ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانی خۆی بدات لە کاتێکدا ئەو کەسەی زیاتر چاوەڕوانی نەدەکرد زیاتری وەرگرتبۆیەوە لە کەسەکەی دیکە، ئەوە کۆیلەکە بەنیوەییە لە نێوانیاندا (ئەگەر پێشتر لە نێوانیان بەنیوەیی بووبێ)، وە ئەو زیادەیەی وەریگرتووە (لە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە) نایگەڕێنێتەوە بۆ کەسەکەی دیکە، چونکە ئەو کەسەی زیاتری وەرگرتۆتەوە لە بەرانبەرەکەی بە مۆڵەتی بەرانبەرەکەی بووە، جا ئەگەر یەکێکیان لە هەندێ پارەی نووسراوپێدانەکەی خۆی لە کۆیلەکە خۆش بێ، دواتر کەسەکەی دیکە هەندێ لەو پارەی لەسەر کۆیلەکە هەیەتی وەریگرتەوە، دواتر کۆیلەکە نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانەکەی خۆی بدات، ئەوە کۆیلەکە لە نێوانی هەردووکیانە و دەبێتەوە کۆیلەی هەردووکیان و ئەو کەسەشی کە بەشێك لە پارەکەی وەرگرتۆتەوە هیچ بۆ هاوڕێکەی ناگەڕێنێتەوە، چونکە ماڵی خۆی وەرگرتۆتەوە کە لەسەر کۆیلەکە هەیبووە، جا ئەو بابەتە وەك بابەتی قەرز وایە کە هی دوو کەس بێت لە یەك شتدا لەسەر یەك پیاو و یەکێکیان زیاتر چاوەڕێی بکات و یەکێکیان ڕازی نەبێت (زیاتر چاوەڕێی بکات) جا هەندێ لە مافەکەی خۆی وەرگرێتەوە و دواتر قەرزارەکە موفلیس و مایەپووچ بێت، ئەوە ئەو کەسەی هەندێك لە مافەکەی خۆی وەرگرتۆتەوە هیچ ناگەڕێنێتەوە (بۆ هاوڕێکەی دیکەی) لەوەی وەریگرتووە.

## ٢- زامنیکردن لە گرێبەستی نووسراوپێداندا[1]

**٢٢٩٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ العَبِيدَ إِذَا كُوتِبُوا جَمِيعًا كِتَابَةً وَاحِدَةً، فَإِنَّ بَعْضَهُمْ حُمَلاَءُ عَنْ بَعْضٍ، وَإِنَّهُ لاَ يُوضَعُ عَنْهُمْ لِمَوْتِ أَحَدِهِمْ شَيْءٌ، فَإِنْ قَالَ أَحَدُهُمْ: قَدْ عَجَزْتُ، وَأَلْقَى بِيَدَيْهِ، فَإِنَّ لأَصْحَابِهِ أَنْ يَسْتَعْمِلُوهُ فِيمَا يُطِيقُ مِنَ الْعَمَلِ، وَيَتَعَاوَنُونَ بِذَلِكَ فِي كِتَابَتِهِمْ، حَتَّى يَعْتِقَ بِعِتْقِهِمْ إِنْ عَتَقُوا، أَوْ يَرِقَّ بِرِقِّهِمْ إِنْ رَقُّوا[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو بابەتە لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە: بەوەی ئەگەر کۆمەڵە کۆیلەیەك بەیەکەوە یەك عەقدی نووسراوپێدانیان بۆ بکرێت، ئەوە هەندێکیان زامنی ئەوانەی دیکەن، وە هیچ لە نرخی نووسراوپێدانەکە کەم نابێتەوە بە مردنی یەکێکیان، جا ئەگەر یەکێکیان گوتی: من ناتوانم (پارەی نووسراوپێدانەکە بدەم) و دەستی بەخۆیدا بەردایەوە، ئەوە بۆ خاوەنەکانی هەیە بەکاری بێنن لەو شتانەی لە توانایدا هەیە و بەو جۆرە یارمەتییان بدەن لە نووسراوپێدانیان (تا ئەویش بەژدار بێ لەگەڵ گشت کۆیلەکانی دیکە بۆ پەیداکردنی پارەی خۆکڕینەوەکە)، تا ئەو کۆیلەیەش ئازاد بێ لەگەڵ ئازادبوونی ئەوانی دیکە ئەگەر ئەوان ئازاد بوون (بە هۆی پەیداکردنی پارەی نووسراوپێدانەکە)، یان تا لەگەڵ ئەوانی دیکە بەکۆیلەیی بمێنێتەوە ئەگەر ئەوان بەکۆیلەیی مانەوە (بەهۆی پەیدانەکردنی پارەی نووسراوپێدانەکە).

**٢٣٠٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا كَاتَبَهُ سَيِّدُهُ، لَمْ يَنْبَغِ لِسَيِّدِهِ أَنْ يَتَحَمَّلَ لَهُ بِكِتَابَةِ عَبْدِهِ أَحَدٌ، إِنْ مَاتَ الْعَبْدُ أَوْ عَجَزَ، وَلَيْسَ هَذَا مِنْ سُنَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِنْ تَحَمَّلَ رَجُلٌ لِسَيِّدِ الْمُكَاتَبِ بِمَا عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ، ثُمَّ اتَّبَعَ ذَلِكَ سَيِّدُ الْمُكَاتَبِ، قِبَلَ الَّذِي تَحَمَّلَ لَهُ، أَخَذَ مَالَهُ بَاطِلاً، لاَ هُوَ ابْتَاعَ الْمُكَاتَبَ، فَيَكُونَ مَا أُخِذَ مِنْهُ مِنْ ثَمَنِ شَيْءٍ هُوَ لَهُ، وَلاَ الْمُكَاتَبُ عَتَقَ، فَيَكُونَ فِي ثَمَنِ حُرْمَةٍ ثَبَتَتْ لَهُ، فَإِنْ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ رَجَعَ إِلَى سَيِّدِهِ، وَكَانَ عَبْدًا مَمْلُوكًا لَهُ، وَذَلِكَ أَنَّ الْكِتَابَةَ لَيْسَتْ بِدَيْنٍ ثَابِتٍ، فَيُتَحَمَّلُ لِسَيِّدِ الْمُكَاتَبِ بِهَا، إِنَّمَا هِيَ شَيْءٌ، إِنْ أَدَّاهُ الْمُكَاتَبُ عَتَقَ، وَإِنْ مَاتَ الْمُكَاتَبُ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، لَمْ يُحَاصَّ

---

(١) ـ الْحَمَالَةُ فِي الْكِتَابَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١٢ في المكاتب، عن مالك به.

الْغُرَمَاءَ سَيِّدُهُ بِكِتَابَتِهِ، وَكَانَ الْغُرَمَاءُ أَوْلَى بِذَلِكَ مِنْ سَيِّدِهِ، وَإِنْ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ لِلنَّاسِ، رُدَّ عَبْدًا مَمْلُوكًا لِسَيِّدِهِ، وَكَانَتْ دُيُونُ النَّاسِ فِي ذِمَّةِ الْمُكَاتَبِ، لاَ يَدْخُلُونَ مَعَ سَيِّدِهِ فِي شَيْءٍ مِنْ ثَمَنِ رَقَبَتِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: کۆیلە کاتێ گەورەکەی گرێبەستی نووسراوپێدانی لەگەڵ دەکات بۆ گەورەکەی دروست نییە کەس بکاتە زامن بۆ نووسراوپێدانی کۆیلەکەی، بەوەی ئەگەر کۆیلەکەی بمرێت یان نەیتوانی پارەکە بدات (کەسە زامنەکە پارەکە بدات)، ئەوە لە ڕێبازی مسوڵمانان ناوەشێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێك خۆی بکاتە زامن بۆ گەورەی کۆیلەکە لەو پارەی لەسەر کۆیلەکەیە بەهۆی نووسراوپێدانی دواتر گەورەی کۆیلەکە (دوای مردنی کۆیلەکە یان دوای دەسەوسانی لە پارەدان) بچێتە لای ئەو کەسەی خۆی کردۆتە زامن و (پارەکە لەو وەربگرێت)، ئەوە ماڵی کەسەکەی بەباتڵ وەرگرتووە، (چونکە پارەی چی بدات) نە کۆیلە نووسراوپێدراوەکەی کڕیوە تا ئەوەی لێی وەردەگیرێت ببێتە پارەی شتێك کە هی گەورەکە بووە، وە نە کۆیلەکەش ئازاد بووە تا ببێتە پارەی حوڕمەتێك (کە بریتییە لە ئازادکردن) کە هی ئەو بووە (ئەو شتانە ڕووی نەداوە)، جا ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو نەیتوانی پارەکە بدات دەگەڕێتەوە بۆ گەورەکەی و دەبێتەوە کۆیلەی ئەو (وەك جاران)، لەبەر ئەوەی گرێبەستی نووسراوپێدان قەرزی ئەستۆ نییە تا زامنی بۆ بکرێت بۆ گەورەی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە، (بەڵکوو) تەنها بابەتێکە ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو پارەکەی خۆی دا ئەوە ئازاد دەبێت، وە ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو مرد و قەرزی (خەڵکی) لەسەر بوو، ئەوە گەورەکەی خاوەنی قەرزەکان بەژداری پێ ناکات لە دانی پارەی نووسراوپێدانەکە کە قەرزارەکان لەپێشتریشن لە گەورەکەی بە کۆیلەکە (چونکە قەرزیان لەسەریەتی)، وە ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانی خۆی بدات و قەرزی خەڵکیشی لەسەر بوو، ئەوە دەبێتەوە کۆیلە بۆ گەورەکەی خۆی و قەرزی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١٣ في المكاتب، عن مالك به.

خەڵكیش دەكەوێتە ئەستۆی كۆیلە نووسراوپێدراوەكە (لێی وەردەگرنەوە دوای ئازادبوونی)، وە (بە هیچ جۆرێك خاوەنی قەرزەكان) لەگەڵ گەورەكەی بەژدار نابن لە پارەی كۆیلایەتییەكە.

**٢٣٠١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا كَاتَبَ الْقَوْمُ جَمِيعًا كِتَابَةً وَاحِدَةً، وَلاَ رَحِمَ بَيْنَهُمْ يَتَوَارَثُونَ بِهَا، فَإِنَّ بَعْضَهُمْ حُمَلاَءُ عَنْ بَعْضٍ، لاَ يَعْتِقُ بَعْضُهُمْ دُونَ بَعْضٍ، حَتَّى يُؤَدُّوا الْكِتَابَةَ كُلَّهَا، فَإِنْ مَاتَ أَحَدٌ مِنْهُمْ وَتَرَكَ مَالاً هُوَ أَكْثَرُ مِنْ جَمِيعِ مَا عَلَيْهِمْ، أُدِّيَ عَنْهُمْ جَمِيعُ مَا عَلَيْهِمْ، وَكَانَ فَضْلُ الْمَالِ لِسَيِّدِهِ، وَلَمْ يَكُنْ لِمَنْ كَاتَبَ مَعَهُ مِنْ فَضْلِ الْمَالِ شَيْءٌ، وَيَتْبَعُهُمُ السَّيِّدُ بِحِصَصِهِمِ الَّتِي بَقِيَتْ عَلَيْهِمْ مِنَ الْكِتَابَةِ الَّتِي قُضِيَتْ مِنْ مَالِ الْهَالِكِ، لأَنَّ الْهَالِكَ إِنَّمَا كَانَ حَمِيلاً عَنْهُمْ، فَعَلَيْهِمْ أَنْ يُؤَدُّوا مَا عَتَقُوا بِهِ مِنْ مَالِهِ، وَإِنْ كَانَ لِلْمُكَاتَبِ الْهَالِكِ وَلَدٌ حُرٌّ لَمْ يُولَدْ فِي الْكِتَابَةِ، وَلَمْ يُكَاتَبْ عَلَيْهِ، لَمْ يَرِثْهُ، لأَنَّ الْمُكَاتَبَ لَمْ يُعْتَقْ حَتَّى مَاتَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر كۆمەڵە كەسێكی كۆیلە بەیەكەوە یەك گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ كرا و خزمایەتی میراتگرتنیان لە نێوان نەبوو، ئەوە زامنی یەكدیین، هەندێك ئازاد نابن بەبێ ئەوانی دیكە تا گشت پارەی نووسراوپێدانەكە دەدەن، جا ئەگەر یەكێكیان مرد و سەروەتێكی جێ هێشت زیاتر بوو لەوەی گشتیان بەیەكەوە لەسەریانە (كە بریتییە لە پارەی نووسراوپێدانەكەیان)، ئەوە بۆ هەموویان دەدرێت گشت ئەوەی لەسەریانە، سەروەتە زیادەكەش بۆ گەورەكەیەتی و هیچ لە زیادەكە بۆ ئەو كەسانە نییە كە لەگەڵ ئەودا گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ كراوە، وە گەورەكە پشكی هەر یەك لەوان لە پارەی نووسراوپێدانەكە (لە كۆیلەكانی دیكە) وەردەگرێتەوە (دوای ئازادبوونیان و پارەپەیداكردنیان) كە لە سەروەتی كۆیلە مردووەكە درابوو، (جا كە پارەی ئەوانی دیكەش لە كۆیلە مردووەكە وەرگیرا) لەبەر ئەوە بوو چونكە كۆیلە مردووەكە زامنی ئەوانی دیكەیە، دەبێ ئەوانیش ئەو پارەیە بدەنەوە كە پێی ئازاد بوون لە ماڵی كۆیلە مردووەكە، جا ئەگەر كۆیلە مردووەكە منداڵێكی هەبوو (بەڵام) لە سەردەمی نووسراوپێداندا لەدایك نەبیوو و گرێبەستی نووسراوپێدانی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١٤ في المكاتب؛ وفي: ٢٨٤٥ في المكاتب، عن مالك به.

بۆ نەکرابوو، میراتی لێ ناگرێت، چونکە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە ئازاد نەبووە تا ئەو کاتەی مردووە.

## ٣- پێشخستنی ئازادبوون بە پارەی کاش[١] لە نووسراوپێداندا[٢]

**٢٣٠٢- أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تُقَاطِعُ مُكَاتَبِيهَا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ[٣].**

واتە: ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ ئازادبوونی کۆیلە نووسراوپێدراوەکانی خۆی پێش دەخست بە (وەرگرتنی) زێڕ و زیوی کاش.

**٢٣٠٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي الْمُكَاتَبِ يَكُونُ بَيْنَ الشَّرِيكَيْنِ، فَإِنَّهُ لاَ يَجُوزُ لأَحَدِهِمَا أَنْ يُقَاطِعَهُ عَلَى حِصَّتِهِ، إِلاَّ بِإِذْنِ شَرِيكِهِ، وَذَلِكَ أَنَّ الْعَبْدَ وَمَالَهُ بَيْنَهُمَا، فَلاَ يَجُوزُ لأَحَدِهِمَا أَنْ يَأْخُذَ شَيْئًا مِنْ مَالِهِ إِلاَّ بِإِذْنِ شَرِيكِهِ، وَلَوْ قَاطَعَهُ أَحَدُهُمَا دُونَ صَاحِبِهِ، ثُمَّ حَازَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَاتَ الْمُكَاتَبُ وَلَهُ مَالٌ، أَوْ عَجَزَ، لَمْ يَكُنْ لِمَنْ قَاطَعَهُ شَيْءٌ مِنْ مَالِهِ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ أَنْ يَرُدَّ مَا قَاطَعَهُ عَلَيْهِ وَيَرْجِعَ حَقُّهُ فِي رَقَبَتِهِ، وَلَكِنْ مَنْ قَاطَعَ مُكَاتَبًا بِإِذْنِ شَرِيكِهِ، ثُمَّ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ، فَإِنْ أَحَبَّ الَّذِي قَاطَعَهُ أَنْ يَرُدَّ الَّذِي أَخَذَ مِنْهُ مِنَ الْقِطَاعَةِ، وَيَكُونُ عَلَى نَصِيبِهِ مِنْ رَقَبَةِ الْمُكَاتَبِ، كَانَ ذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ مَاتَ الْمُكَاتَبُ وَتَرَكَ مَالاً اسْتَوْفَى الَّذِي بَقِيَتْ لَهُ الْكِتَابَةُ حَقَّهُ الَّذِي بَقِيَ لَهُ عَلَى الْمُكَاتَبِ مِنْ مَالِهِ، ثُمَّ كَانَ مَا بَقِيَ مِنْ مَالِ الْمُكَاتَبِ بَيْنَ الَّذِي قَاطَعَهُ وَبَيْنَ شَرِيكِهِ عَلَى قَدْرِ حِصَصِهِمَا فِي الْمُكَاتَبِ، وَإِنْ كَانَ أَحَدُهُمَا قَاطَعَهُ طوتماسَكَ صَاحِبُهُ بِالْكِتَابَةِ، ثُمَّ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ، قِيلَ لِلَّذِي قَاطَعَهُ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تَرُدَّ عَلَى صَاحِبِكَ نِصْفَ الَّذِي أَخَذْتَ، وَيَكُونُ الْعَبْدُ بَيْنَكُمَا شَطْرَيْنِ، وَإِنْ أَبَيْتَ فَجَمِيعُ الْعَبْدِ لِلَّذِي تَمَسَّكَ بِالرِّقِّ خَالِصًا[٤].**

---

(١) ـ تێبینی: پێشخستنی ئازادبوون ئەوەیە گەورەی کۆیلەی نووسراوپێدراو بە کەمتر لەو پارە و شتومەکە ڕازی بێت لەسەر ئەوەی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بەکاش پارە و شتەکەی پێ بدات و بەر لە کاتی خۆی ئازاد ببێت.

(٢) ـ الْقِطَاعَةُ فِي الْكِتَابَةِ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١٦ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٣أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١٧ في المكاتب، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە دەربارەی كۆیلەی نووسراوپێدراو كە لە نێوان دوو شەریك و هاوبەشدا بێت ئەوەیە: بۆ هیچ یەكێكیان دروست نییە ئازادكردنەكە پێش بخەن بە پارەی كاش تەنها بە مۆڵەتی شەریكەكەی نەبێت، لەبەر ئەوەی كۆیلەكە و ماڵەكەی لە نێوانی هەردووكیانە بەشەریكایەتی، بۆیە بۆ هیچ كامیان دروست نییە هیچ لە ماڵی كۆیلەكە وەربگرێت تەنها بە مۆڵەتی شەریكەكەی دیكەی نەبێت، جا ئەگەر یەكێكیان گرێبەستی پێشخستنی بە پارەی كاش بۆ كرد بەبێ ئەوەی دیكەیان، دواتر وەریگرت، دواتر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە مرد و ماڵ و سەروەتی هەبوو، یان (نەمرد بەڵام) نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانەكەی بدات، ئەوە ئەو كەسەی گرێبەستی پێشخستنی بە پارەی كاش بۆ كردووە هیچی بۆ نییە لە ماڵەكەی، وە بۆشی نییە ئەوە بگەڕێنێتەوە كە وەریگرتووە و مافی خۆی وەربگرێتەوە لە خودی ئەو پشكەی هەیەتی لە كۆیلەكە، بەڵام هەر كەسێك گرێبەستی پێشخستنی بە پارەی كاش بۆ كۆیلەكەی كرد بە مۆڵەتی شەریكەكەی، دواتر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانەكەی بدات، ئەوە ئەو كەسەی گرێبەستی پێشخستنی بە پارەی كاش بۆ كردووە ئەگەر حەزی كرد ئەوەی لە گرێبەستی پێشخستنەكە وەریگرتووە بیگەڕێنێتەوە و لەسەر پشكی خۆی بمێنێتەوە لە خودی كۆیلەكە، ئەوەی بۆ هەیە، وە ئەگەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە مرد و ماڵێكی وای جێ هێشت بەشی ئەو كەسەی دەكرد كە پارەی نووسراوپێدانەكەی لەسەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە مابوو لە ماڵەكەیدا، دواتر ئەوەی دەمێنێتەوە لە ماڵ و سەروەتی كۆیلە نووسراوپێدراوەكە لە نێوان ئەو كەسەی گرێبەستی پێشخستنی كردووە و لە نێوان شەریكەكەی دابەش دەكرێت بەگوێرەی پشكی خۆیان لە كۆیلە نووسراوپێدراوەكە، جا ئەگەر یەكێكیان گرێبەستی پێشخستنی كرد بەرانبەرەكەشی دەستی بە نووسراوپێدانەكەوە گرت (پێشخستنی بۆ نەكرد)، دواتر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە نەیتوانی پارەكە بدات، ئەوە بەو كەسە دەگوترێت كە گرێبەستی پێشخستنی بۆ كردووە: ئەگەر حەز دەكەیت نیوەی ئەوەی وەرتگرتووە بۆ شەریكەكەت بگەڕێنەوە و كۆیلەكە بەنیوەیی دەبێتەوە هی هەردووكتان، وە



ئەگەر ڕازیش نەبوویت ئەوە کۆیلەکە گشتی بەتەنها بۆ ئەو کەسەیە کە دەستی بە کۆیلەکەوە گرتووە (و گرێبەستی پێشخستنی بۆ نەکردووە).

**٢٣٠٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، فَيُقَاطِعُهُ أَحَدُهُمَا بِإِذْنِ صَاحِبِهِ، ثُمَّ يَقْتَضِي الَّذِي تَمَسَّكَ بِالرِّقِّ مِثْلَ مَا قَاطَعَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ ثُمَّ يَعْجِزُ الْمُكَاتَبُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَهُوَ بَيْنَهُمَا، لأَنَّهُ إِنَّمَا اقْتَضَى الَّذِي لَهُ عَلَيْهِ، وَإِنِ اقْتَضَى أَقَلَّ مِمَّا أَخَذَ الَّذِي قَاطَعَهُ، ثُمَّ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ، فَأَحَبَّ الَّذِي قَاطَعَهُ أَنْ يَرُدَّ عَلَى صَاحِبِهِ نِصْفَ مَا تَفَضَّلَهُ بِهِ، وَيَكُونُ الْعَبْدُ بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ، فَذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ أَبَى، فَجَمِيعُ الْعَبْدِ لِلَّذِي لَمْ يُقَاطِعْهُ، وَإِنْ مَاتَ الْمُكَاتَبُ وَتَرَكَ مَالاً، فَأَحَبَّ الَّذِي قَاطَعَهُ أَنْ يَرُدَّ عَلَى صَاحِبِهِ نِصْفَ مَا تَفَضَّلَهُ بِهِ، وَيَكُونُ الْمِيرَاثُ بَيْنَهُمَا، فَذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي تَمَسَّكَ بِالْكِتَابَةِ قَدْ أَخَذَ مِثْلَ مَا قَاطَعَ عَلَيْهِ شَرِيكُهُ، أَوْ أَفْضَلَ، فَالْمِيرَاثُ بَيْنَهُمَا بِقَدْرِ مِلْكِهِمَا، لأَنَّهُ إِنَّمَا أَخَذَ حَقَّهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە بەشەریکایەتی لە نێوان دوو کەسدا بێت، جا یەکێکیان بە مۆڵەتی شەریکەکەی گرێبەستی پێشخستنی بۆ بکات، دواتر ئەو کەسەی دەستی بە کۆیلایەتییەکەوە گرتووە (و ئازادبوونی بۆ پێش نەخستووە) بەئەندازەی ئەو کەسە پارەی وەرگرتبۆیەوە کە ئازادبوونی بە پارەی کاش بۆ پێش خستووە، یان زیاتر لەو ئەندازەیەی وەرگرت، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە نەتوانێت پارەی نووسراوپێدانەکە بەتەواوی بدات، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کۆیلەکە دەبێتەوە هی هەردووکیان، چونکە ئەو کەسەی مافی نووسراوپێدانی لەسەر هەیە کە وەریگرتۆتەوە هەرچەندە کەمتریشی وەرگرتبێتەوە لەو کەسەی بەکاش پارەی پێشخستنی وەرگرتووە، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە نەیتوانیوە پارەی نووسراوپێدانەکە بەتەواوی بدات، جا ئەو کەسەی ئازادبوونی بۆ پێش خستووە بە وەرگرتنی پارەی کاش ئەگەر ویستی نیوەی لەوەی زیادی وەرگرتووە لەبەرانبەرەکەی بیدات بەو و کۆیلەکە بەنیوەیی ببێتە هی هەردووکیان، ئەوەی بۆ هەیە، وە ئەگەر ڕازی نەبوو، ئەوە کۆیلەکە بەتەواوی بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادبوونی بۆ پێش نەخستووە، وە ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو

---

[illegible]

مرد و ماڵ و سەروەتی جێ هێشت، وە ئەو کەسەی ئازادبوونی بۆ پێش خستووە پێی باش بوو نیوەی لەو زیادەیەی وەریگرتووە بیدات بە شەریکەکەی و میراتی کۆیلەکە بۆ هەردووکیان بێت، ئەوەشی بۆ هەیە، وە ئەگەر ئەو کەسەی دەستی گرتووە بە نووسراوپێدانەکە (و ئازادبوونی بۆ پێش نەخستووە) هەمان ئەندازەی ئەو کەسەی وەرگرتبوو کە ئازادبوونی بۆ کۆیلەکە پێش خستووە یان زیاتری وەرگرتبوو، ئەوە میراتەکە دەبێتە هی هەردووکیان بەگوێرەی خاوەندارییەتی هەر یەکەیان، چونکە تەنها مافی خۆی وەرگرتووە (بەرانبەرەکەی ناتوانێ ناڕەزایی هەبێ).

**٢٣٠٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، فَيُقَاطِعُ أَحَدُهُمَا عَلَى نِصْفِ حَقِّهِ بِإِذْنِ صَاحِبِهِ، ثُمَّ يَقْبِضُ الَّذِي تَمَسَّكَ بِالرِّقِّ أَقَلَّ مِمَّا قَاطَعَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ، ثُمَّ يَعْجِزُ الْمُكَاتَبُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنْ أَحَبَّ الَّذِي قَاطَعَ الْعَبْدَ أَنْ يَرُدَّ عَلَى صَاحِبِهِ نِصْفَ مَا تَفَضَّلَهُ بِهِ، كَانَ الْعَبْدُ بَيْنَهُمَا شَطْرَيْنِ، وَإِنْ أَبَى أَنْ يَرُدَّ فَلِلَّذِي تَمَسَّكَ بِالرِّقِّ حِصَّةُ صَاحِبِهِ الَّذِي كَانَ قَاطَعَ عَلَيْهِ الْمُكَاتَبَ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنَّ الْعَبْدَ يَكُونُ بَيْنَهُمَا شَطْرَيْنِ، فَيُكَاتِبَانِهِ جَمِيعًا، ثُمَّ يُقَاطِعُ أَحَدُهُمَا الْمُكَاتَبَ عَلَى نِصْفِ حَقِّهِ بِإِذْنِ صَاحِبِهِ، وَذَلِكَ الرُّبُعُ مِنْ جَمِيعِ الْعَبْدِ، ثُمَّ يَعْجِزُ الْمُكَاتَبُ، فَيُقَالُ لِلَّذِي قَاطَعَهُ: إِنْ شِئْتَ فَارْدُدْ عَلَى صَاحِبِكَ نِصْفَ مَا فَضَلْتَهُ بِهِ، وَيَكُونُ الْعَبْدُ بَيْنَكُمَا شَطْرَيْنِ، وَإِنْ أَبَى كَانَ لِلَّذِي تَمَسَّكَ بِالْكِتَابَةِ رُبُعُ صَاحِبِهِ الَّذِي قَاطَعَ الْمُكَاتَبَ عَلَيْهِ خَالِصًا، وَكَانَ لَهُ نِصْفُ الْعَبْدِ، فَذَلِكَ ثَلَاثَةُ أَرْبَاعِ الْعَبْدِ، وَكَانَ لِلَّذِي قَاطَعَ رُبُعُ الْعَبْدِ، لأَنَّهُ أَبَى أَنْ يَرُدَّ ثَمَنَ رُبُعِهِ الَّذِي قَاطَعَ عَلَيْهِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە بەشەریکایەتی لە نێوان دوو کەسدا بێ و یەکێکیان بە مۆڵەتی شەریکەکەی ئازادبوونی بەنیوەی بە پارەی کاش بۆ پێش بخات، دواتر ئەو کەسەی دەستی بە کۆیلایەتییەکەوە گرتووە و ئازادبوونی بۆ پێش نەخستووە کەمتر وەربگرێت

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١٩ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٠ في المكاتب، عن مالك به.

لەو کەسەی ئازادبوونی بۆ پێش خستووە، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە چیدی نەتوانێت پارەکە بدات، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئەو کەسەی ئازادبوونی کۆیلەکەی پێش خستووە حەزی کرد نیوەی زیادەکە بۆ شەریکەکەی بگەڕێنێتەوە، ئەوە کۆیلەکە بەنیوەیی دەبێتە هی هەردووکیان، وە ئەگەر ڕازی نەبوو بیگەڕێنێتەوە ئەوە پشکی ئەویش بۆ ئەو کەسەیە کە دەستی بە کۆیلایەتی کۆیلەکەوە گرتووە و ئازادبوونی بۆ پێش نەخستووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە ئاوایە: کۆیلەکە بەنیوەیی هی هەردووکیان بێت و بەیەکەوە گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ کردبێ، دواتر یەکێکیان بە مۆڵەتی شەریکەکەی بۆ پارەی کاش ئازادبوونی بۆ پێش خستبێ لەسەر نیوەی مافەکەی خۆی، کە دەکاتە چارەگی کۆیلەکە، دواتر کۆیلەکە نەتوانێت پارەی نووسراوپێدانەکە بدات، ئەوە بەو کەسە دەگوترێت کە ئازادبوونی بۆ پێش خستووە: ئەگەر دەتەوێت نیوەی زیادەکە بگەڕێنەوە بۆ شەریکەکەت و کۆیلەکە بەنیوەیی دەبێتە هی هەردووکتان، وە ئەگەر ڕازی نەبوو ئەوە ئەو چارەگەی شەریکەکەی دیکەش بۆ ئەو شەریکەیە کە دەستی بە کۆیلایەتی کۆیلەکەوە گرتووە و کۆیلەکە بەتەنها بۆ ئەوە، چونکە پێشتر نیوەی کۆیلەکە بۆ ئەو بووە، کە بریتی بووە لە سێ لەسەر چواری کۆیلەکە، وە چارەگێکیش هی ئەو کەسە بووە کە ئازادبوونی بۆ پێش خستووە (ئەویش دەبێتەوە هی ئەو کەسەی ئازادبوونی پێش نەخستووە)، چونکە ڕازی نەبووە لە چارەگەکە بگەڕێنێتەوە کە پێشخستنەکەی لەسەر کردووە.

**٢٣٠٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يُقَاطِعُهُ سَيِّدُهُ فَيَعْتِقُ، وَيَكْتُبُ عَلَيْهِ مَا بَقِيَ مِنْ قَطَاعَتِهِ دَيْنًا عَلَيْهِ، ثُمَّ يَمُوتُ الْمُكَاتَبُ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ لِلنَّاسِ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنَّ سَيِّدَهُ لاَ يُحَاصُّ غُرَمَاءَهُ بِالَّذِي عَلَيْهِ مِنْ قَطَاعَتِهِ، وَلِغُرَمَائِهِ أَنْ يُبَدَّؤُوا عَلَيْهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە گەورەکەی زوتر ڕێی بدات ئازاد بێت بە وەرگرتنی پارەی نەقد و ئەوەی لەسەری

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢١ في المكاتب، عن مالك به.

مابێتەوە بەقەرز لەسەری بنووسێت (واتە بەشێکی پارەکەی بدات و ئازاد بێت، ئەوەی دەشمێنێتەوە بەقەرز لە گەردنی بێت)، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بمرێت و قەرزی خەڵکی لەسەر بێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گەورەکەی لەگەڵ خاوەن قەرزەکان بەژدار نابێت لەو پارەیەی بۆ خاتری زوو ئازادبوون لەسەری مابۆیەوە و کەوتبۆیە سەری، وە خاوەن قەرزەکان پێشخستنیان بۆ هەیە بەسەر گەورەکەی (سەرەتا قەرزی قەرزارەکان دەدرێتەوە، ئەوان لەپێشترن).

**٢٣٠٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ لِلْمُكَاتَبِ أَنْ يُقَاطِعَ سَيِّدَهُ إِذَا كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ لِلنَّاسِ، فَيَعْتِقُ وَيَصِيرُ لاَ شَيْءَ لَهُ، لأَنَّ أَهْلَ الدَّيْنِ أَحَقُّ بِمَالِهِ مِنْ سَيِّدِهِ، فَلَيْسَ ذَلِكَ بِجَائِزٍ لَهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ کۆیلەی نووسراوپێدراو نییە لەپێناو زوو ئازادبوون پارەی کاش بدات بە گەورەکەی ئەگەر قەرزی خەڵکی لەسەر بێت، جا بەهۆی ئەوەوە ئازاد ببێت و وای لێ بێت هیچی نەبێت (تا پارەی قەرزارەکانی بداتەوە)، چونکە خاوەن قەرزەکان لە گەورەی کۆیلەکە لەپێشترن بە سەروەتی کۆیلەکە، جا (بۆیە) ئەوەی بۆ دروست نییە.

**٢٣٠٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يُكَاتِبُ عَبْدَهُ، ثُمَّ يُقَاطِعُهُ بِالذَّهَبِ، فَيَضَعُ عَنْهُ مِمَّا عَلَيْهِ مِنَ الْكِتَابَةِ، عَلَى أَنْ يُعَجِّلَ لَهُ مَا قَاطَعَهُ عَلَيْهِ، أَنَّهُ لَيْسَ بِذَلِكَ بَأْسٌ، وَإِنَّمَا كَرِهَ ذَلِكَ مَنْ كَرِهَهُ، لأَنَّهُ أَنْزَلَهُ بِمَنْزِلَةِ الدَّيْنِ يَكُونُ لِلرَّجُلِ عَلَى الرَّجُلِ إِلَى أَجَلٍ، فَيَضَعُ عَنْهُ وَيَنْقُدُهُ، وَلَيْسَ هَذَا مِثْلَ الدَّيْنِ، إِنَّمَا كَانَتْ قَطَاعَةُ الْمُكَاتَبِ سَيِّدَهُ عَلَى أَنْ يُعْطِيَهُ مَالاً، فِي أَنْ يَتَعَجَّلَ الْعِتْقَ فَيَجِبُ لَهُ الْمِيرَاثُ، وَالشَّهَادَةُ، وَالْحُدُودُ، وَتَثْبُتُ لَهُ حُرْمَةُ الْعَتَاقَةِ، وَلَمْ يَشْتَرِ دَرَاهِمَ بِدَرَاهِمَ، وَلاَ ذَهَبًا بِذَهَبٍ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ، مَثَلُ رَجُلٍ قَالَ لِغُلاَمِهِ: ائْتِنِي بِكَذَا وَكَذَا دِينَارًا وَأَنْتَ حُرٌّ، فَوَضَعَ عَنْهُ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنْ جِئْتَنِي بِأَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ، فَأَنْتَ حُرٌّ، فَلَيْسَ هَذَا دَيْنًا ثَابِتًا، وَلَوْ كَانَ دَيْنًا ثَابِتًا، لَحَاصَّ بِهِ السَّيِّدُ غُرَمَاءَ الْمُكَاتَبِ إِذَا مَاتَ أَوْ أَفْلَسَ، فَدَخَلَ مَعَهُمْ فِي مَالِ مُكَاتَبِهِ[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٢ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٣ في المكاتب، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی گرێبەستی نووسراوپێدان بۆ کۆیلەکەی دەکات دواتر ئازادبوونی پێش دەخات بە وەرگرتنی زێڕ بەکاش و هەندێکی لەسەر لادەبات بۆ ئەوەی ئەو پارەیەی بۆ پێش بخات و بەکاش پێی بدات کە لەسەری ڕێك کەوتوون، ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە کێشەی تیا نییە، جا ئەو کەسەی پێی دروست نییە (وەك ئیبنو عومەر ﵄) لەبەر ئەوەیەتی وەك قەرزێك حیسابی بۆ کردووە کە کەسێك قەرزی لەسەر کەسێك هەبێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، جا هەندێکی لەسەر لاببات و بەنەقد وەریبگرێتەوە (پێش کاتەکە)، (بەڵام) ئەو بابەتە وەك قەرز نییە، (بەڵکوو) گرێبەستی پێشخستنی ئازادبوونی کۆیلەی نووسراوپێدراو لەگەڵ گەورەکەی لەسەر ئەوەی سەروەتێکی بداتێ بۆ ئەوەیە ئازادبوون خێرا بکات و میرات و شاهێدی و سزا شەرعییەکانی بۆ دابمەزرێت و حورمەتی ئازادبوونی بۆ دابمەزرێت، خۆ درهەمی بە درهەم نەکڕیوە وە زێڕی بە زێڕ نەکڕیوە، بەڵکوو نموونەی ئەوە وەك نموونەی کەسێك وایە بە کۆیلەکەی بڵێت: ئەوەندە و ئەوەندە دینارەم بۆ بێنە و تۆ ئازادیت، (دواتر) هەندێك لەوەی لەسەر لاببات و بڵێت: ئەگەر کەمتریشم (بەکاش) بۆ بێنی ئەوە تۆ ئازادی، جا ئەوە قەرزێکی ڕاستەقینە و جێگیر نییە، ئەگەر قەرزی جێگیر بووایە، ئەوە دەبوو گەورەکە بەشدار بووایە لەگەڵ خاوەنی قەرزەکانی کۆیلەکە کاتێ کۆیلە نووسراوپێدراوەکە دەمرێت یان ئیفلاس دەکات و مایەپووچ دەبێت، دەبوو لەگەڵیان بەژدار بووایە لە ماڵی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە (کەچی بەژدار نابێ و خاوەن قەرزەکان پێش دەخرێن).

## ٤- زامداری و بریندارکردن دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو[1]

**٢٣٠٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الْمُكَاتَبِ يَجْرَحُ الرَّجُلَ جَرْحًا يَقَعُ فِيهِ الْعَقْلُ عَلَيْهِ: أَنَّ الْمُكَاتَبَ إِنْ قَوِيَ عَلَى أَنْ يُؤَدِّيَ عَقْلَ ذَلِكَ الْجَرْحِ مَعَ كِتَابَتِهِ، أَدَّاهُ، وَكَانَ عَلَى كِتَابَتِهِ، فَإِنْ لَمْ يَقْوَ عَلَى ذَلِكَ، فَقَدْ عَجَزَ عَنْ كِتَابَتِهِ، وَذَلِكَ، أَنَّهُ يَنْبَغِي أَنْ يُؤَدِّيَ عَقْلَ

---

(١) ـ جِرَاحُ الْمُكَاتَبِ.

ذَلِكَ الْجَرْحِ قَبْلَ الْكِتَابَةِ، فَإِنْ هُوَ عَجَزَ عَنْ أَدَاءِ عَقْلِ ذَلِكَ الْجَرْحِ خُيِّرَ سَيِّدُهُ، فَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يُؤَدِّيَ عَقْلَ ذَلِكَ الْجَرْحِ، فَعَلَ وَأَمْسَكَ غُلَامَهُ، وَصَارَ عَبْدًا مَمْلُوكًا، وَإِنْ شَاءَ أَنْ يُسَلِّمَ الْعَبْدَ إِلَى الْمَجْرُوحِ أَسْلَمَهُ، وَلَيْسَ عَلَى السَّيِّدِ أَكْثَرُ مِنْ أَنْ يُسَلِّمَ عَبْدَهُ»[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە کەسێك زامدار و بریندار بکات خوێنبایی بکەوێتە سەر ئەوەیە: ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە توانای هەبوو خوێنبایی ئەو زامدارکردنە و پارەی نووسراوپێدانەکەی بدات، ئەوە دەبێ بیدات و لەسەر نووسراوپێدانی خۆی دەمێنێتەوە، وە ئەگەر توانای ئەوەی نەبوو (واتە توانای نەبوو پارەی بریندارکردنەکە و نووسراوپێدانەکەی بدات)، ئەوە دەکا نەیتوانیوە پارەی نووسراوپێدانەکەی بدات، لەبەر ئەوەی دەبێ پارەی برینەکە بدات بەر لە پارەی نووسراوپێدانەکە، جا ئەگەر نەیتوانی خوێنبایی برینەکەش بدات، ئەوە گەورەکەی سەرپشك دەکرێت: ئەگەر حەز بکات خۆی خوێنبایی برینەکە بدات، ئەوە وا دەکات و کۆیلەکە بۆ خۆی دەهێڵێتەوە و دەبێتەوە کۆیلەی جاران، وە ئەگەر حەزیش بکات کۆیلەکە بدات بە بریندارکراوەکە، ئەوە تەسلیمی دەکات و گەورەکە لەوە زیاتری لەسەر نییە کاتێ کۆیلەکە تەسلیم بکات.

٢٣١٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْقَوْمِ يُكَاتَبُونَ جَمِيعًا، فَيَجْرَحُ أَحَدُهُمْ جَرْحًا فِيهِ عَقْلٌ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ جَرَحَ مِنْهُمْ جَرْحًا فِيهِ عَقْلٌ، قِيلَ لَهُ وَلِلَّذِينَ مَعَهُ فِي الْكِتَابَةِ، أَدُّوا جَمِيعًا عَقْلَ ذَلِكَ الْجَرْحِ، فَإِنْ أَدَّوْا ثَبَتُوا عَلَى كِتَابَتِهِمْ، وَإِنْ لَمْ يُؤَدُّوا فَقَدْ عَجَزُوا، وَيُخَيَّرُ سَيِّدُهُمْ، فَإِنْ شَاءَ أَدَّى عَقْلَ ذَلِكَ الْجَرْحِ، وَرَجَعُوا عَبِيدًا لَهُ جَمِيعًا، وَإِنْ شَاءَ أَسْلَمَ الْجَارِحَ وَحْدَهُ، وَرَجَعَ الآخَرُونَ عَبِيدًا لَهُ جَمِيعًا، بِعَجْزِهِمْ عَنْ أَدَاءِ عَقْلِ ذَلِكَ الْجَرْحِ الَّذِي جَرَحَ صَاحِبُهُمْ»[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆمەڵە کۆیلەیەك کە بەیەکەوە یەك گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ بکرێت و یەکێکیان جینایەتی زامدارکردن ئەنجام بدات کە خوێنبایی تیا بێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٤ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٥ في المكاتب، عن مالك به.

لەوان زامدارییەك ئەنجام بدات خوێنبایی تیا بێت، بەو کەسە و ئەوانی دیکەش دەگوترێت: هەمووتان بەیەکەوە خوێنبایی زامدارییەکە بدەن، جا ئەگەر دایان ئەوە لەسەر گرێبەستی نووسراوپێدانەکەیان دەمێننەوە، وە ئەگەر نەیدەن دەکا نەیانتوانیوە و گەورەکەیان سەرپشك دەکرێت، ئەگەر ویستی خۆی خوێنبایی زامدارییەکە دەدات و گشتیان دەبنەوە کۆیلەی ئەو (نووسراوپێدانەکە نامێنێت)، وە ئەگەر ویستیشی دەتوانێ کۆیلە زامدارکەرەکە بەتەنها تەسلیمی خاوەن زامەکە بکات (ئەوە ئەنجامی دەدات و) کۆیلە نووسراوپێدراوەکانی دیکە گشتیان دەبنەوە کۆیلەی خۆی بەهۆی نەتوانینیان بۆ دانی خوێنبایی ئەو زامدارییەی کە هاورێکەیان ئەنجامی داوە.

**٢٣١١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمُكَاتَبَ إِذَا أُصِيبَ بِجَرْحٍ يَكُونُ لَهُ فِيهِ عَقْلٌ، أَوْ أُصِيبَ أَحَدٌ مِنْ وَلَدِ الْمُكَاتَبِ الَّذِينَ مَعَهُ فِي كِتَابَتِهِ، فَإِنَّ عَقْلَهُمْ عَقْلُ الْعَبِيدِ فِي قِيمَتِهِمْ، وَأَنَّ مَا أُخِذَ لَهُمْ مِنْ عَقْلِهِمْ يُدْفَعُ إِلَى سَيِّدِهِمِ الَّذِي لَهُ الْكِتَابَةُ، وَيُحْسَبُ ذَلِكَ لِلْمُكَاتَبِ فِي آخِرِ كِتَابَتِهِ، فَيُوضَعُ عَنْهُ مَا أَخَذَ سَيِّدُهُ مِنْ دِيَةِ جَرْحِهِ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنَّهُ كَأَنَّهُ كَاتَبَهُ عَلَى ثَلاَثَةِ آلاَفِ دِرْهَمٍ، وَكَانَ دِيَةُ جَرْحِهِ الَّذِي أَخَذَ سَيِّدُهُ أَلْفَ دِرْهَمٍ، فَإِذَا أَدَّى الْمُكَاتَبُ إِلَى سَيِّدِهِ أَلْفَيْ دِرْهَمٍ، فَهُوَ حُرٌّ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ أَلْفَ دِرْهَمٍ، وَكَانَ الَّذِي أَخَذَ مِنْ دِيَةِ جَرْحِهِ أَلْفَ دِرْهَمٍ، فَقَدْ عَتَقَ، وَإِنْ كَانَ عَقْلُ جَرْحِهِ أَكْثَرَ مِمَّا بَقِيَ عَلَى الْمُكَاتَبِ، أَخَذَ سَيِّدُ الْمُكَاتَبِ مَا بَقِيَ مِنْ كِتَابَتِهِ، وَعَتَقَ، وَكَانَ مَا فَضَلَ بَعْدَ أَدَاءِ كِتَابَتِهِ لِلْمُكَاتَبِ، وَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يُدْفَعَ إِلَى الْمُكَاتَبِ شَيْءٌ مِنْ دِيَةِ جَرْحِهِ، فَيَأْكُلَهُ، وَيَسْتَهْلِكَهُ، فَإِنْ عَجَزَ، رَجَعَ إِلَى سَيِّدِهِ أَعْوَرَ أَوْ مَقْطُوعَ الْيَدِ أَوْ مَعْضُوبَ الْجَسَدِ، وَإِنَّمَا كَاتَبَهُ سَيِّدُهُ عَلَى مَالِهِ وَكَسْبِهِ، وَلَمْ يُكَاتِبْهُ عَلَى أَنْ يَأْخُذَ ثَمَنَ وَلَدِهِ، وَلاَ مَا أُصِيبَ مِنْ عَقْلِ جَسَدِهِ، فَيَأْكُلَهُ، وَيَسْتَهْلِكَهُ، وَلَكِنْ عَقْلُ جِرَاحَاتِ الْمُكَاتَبِ وَوَلَدِهِ الَّذِينَ وُلِدُوا فِي كِتَابَتِهِ، أَوْ كَاتَبَ عَلَيْهِمْ، يُدْفَعُ إِلَى سَيِّدِهِ، وَيُحْسَبُ ذَلِكَ لَهُ فِي آخِرِ كِتَابَتِهِ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٦ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٧ في المكاتب، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی هیچ ڕاجیاییەکی تیا نییە لەلای ئێمە ئەوەیە: کۆیلەی نووسراوپێدراو ئەگەر تووشی برینێك و زامدارییەك بوو خوێنبایی تیا بوو یان یەکێك لە منداڵەکانی کۆیلەی نووسراوپێدراو زامدار بوو لەوانەی لەگەڵ خۆیانن لە نووسراوپێداندا، ئەوە خوێنباییەکەیان بریتییە لە خوێنبایی کەسی کۆیلە بەگوێرەی نرخەکەی، وە ئەوەی بۆیان وەردەگیرێ لە خوێنباییەکەیان دەدرێت بەو گەورەیەیان کە گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ کردوون و لە کۆتاییدا بۆ کۆیلە نووسراوپێدراوەکان حیساب دەکرێت و ئەوەندەیان لەسەر لادەچێت کە گەورەکەیان وەریگرتووە لە خوێنبایی زامداری و برینەکەیان.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە ئاوایە: وا دانێ کۆیلەکە گرێبەستی لەسەر سێ هەزار درهەم بۆکراوە، خوێنبایی برینەکەشی کە گەورەکەی وەریگرتووە هەزار درهەم بێت، جا کە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە دوو هەزار درهەمی دا بە گەورەکەی، ئەوە ئازاد دەبێت، مادەم هەزار درهەمی نووسراوپێدانی لەسەر ماوە و ئەوەی لە خوێنباییەکەشی وەرگیراوە هەزار درهەمە، ئەوە ئازاد دەبێت، وە ئەگەر خوێنبایی برینەکەی زیاتر بوو لەوەی لەسەری ماوە لە پارەی نووسراوپێدانەکە، ئەوە گەورەی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە ئەو ئەندازەیە وەردەگرێت کە لە پارەی نووسراوپێدانەکە ماوە و ئازاد دەبێت، ئەوەی دەشمێنێتەوە دوای دانی پارەی نووسراوپێدانەکە بۆ کۆیلە نووسراوپێدراوەکەیە، وە نابێ هیچ لە پارەی خوێنبایی زامداری کۆیلەکە بدرێت بە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە تا بیخوات و لەناوی ببات، جا ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوە زامدارەکە نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانەکە بدات بە گەورەکەی، ئەوە بۆ گەورەکەی دەگەڕێتەوە بە کوێری یان دەستبڕاوی یان جەستەبڕاوی، جا گەورەکەی کە گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ کردووە تەنها لە ماڵەکەی و کەسابەتەکەی بۆی کردووە، نووسراوپێدانی بۆ نەکردووە لەسەر ئەوەی پارەی منداڵی کۆیلەکە وەربگرێت وە بۆ ئەوەش نییە پارەی خوێنبایی زامداری جەستەی کۆیلەکە وەربگرێت و بیخوات و لەناوی ببات، بەڵکوو پارەی خوێنبایی زامداری کۆیلەی نووسراوپێدراو و ئەوانەی لەناو و دوای گرێبەستی نووسراوپێدان لەدایك دەبن لە کۆیلەکان یان منداڵی ئەوانن و لەگەڵ




ئەوان گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ دەکرێت، پارەکە دەدرێت بە گەورەکەی و لە کۆتایی نووسراوپێدانەکە بۆ کۆیلەکە حیساب دەکرێت (تا ئازاد بێت، واتە ڕاستە پارەکە دەدرێت بە گەورەکەی بەڵام بۆ کۆیلەکان حیسابە).

## ٥- فرۆشتنی کۆیلەی نووسراوپێدراو[١]

**٢٣١٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا سَمِعَ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي مُكَاتَبَ الرَّجُلِ: أَنَّهُ لاَ يَبِيعُهُ إِذَا كَانَ كَاتَبَهُ بِدَنَانِيرَ أَوْ دَرَاهِمَ، إِلاَّ بِعَرْضٍ مِنَ الْعُرُوضِ يُعَجِّلُهُ وَلاَ يُؤَخِّرُهُ، لأَنَّهُ إِذَا أَخَّرَهُ كَانَ دَيْنًا بِدَيْنٍ، وَقَدْ نُهِيَ عَنِ الْكَالِئِ بِالْكَالِئِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووە دەربارەی کەسێك کە کۆیلەی نووسراوپێدراوی کەسێك دەکڕێت ئەوەیە: نابێ (گەورەکەی) بیفرۆشێت ئەگەر گرێبەستی نووسراوپێدانی لەسەر وەرگرتنی دینار و درهەم (واتە زێڕ و زیو) بۆ کردبوو، (بەڵکوو فرۆشتنەکەی دروستە) تەنها بە کاڵایێك لە کاڵاکان بێت بەحازری و نەیکاتە قەرز، چونکە ئەگەر دوای خست و کردیە قەرز ئەوە دەبێتە قەرز بە قەرز، لە کاتێکدا حەڕام کراوە و نەهی کراوە لە فرۆشتنی قەرز بە قەرز.

**٢٣١٣- [فتوى]** قَالَ: وَإِنْ كَاتَبَ الْمُكَاتَبَ سَيِّدُهُ بِعَرْضٍ مِنَ الْعُرُوضِ مِنَ الإِبِلِ أَوِ الْبَقَرِ أَوِ الْغَنَمِ أَوِ الرَّقِيقِ، فَإِنَّهُ يَصْلُحُ لِلْمُشْتَرِي أَنْ يَشْتَرِيَهُ بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ أَوْ عَرْضٍ مُخَالِفٍ لِلْعُرُوضِ الَّتِي كَاتَبَهُ سَيِّدُهُ عَلَيْهَا، يُعَجِّلُ ذَلِكَ وَلاَ يُؤَخِّرُهُ[٣].

(فەتوا): واتە: ئەگەر کۆیلەی نووسراوپێدراو گرێبەستی نووسراوپێدانی لەگەڵ گەورەکەی بە کاڵایێك لە کاڵاکان کردبوو وەك: وشتر یان مانگا یان مەڕ و بزن یان کۆیلە، ئەوە بۆ کڕیار دروستە بە زێڕ و زیو و کاڵای جیاواز لەو کاڵایەی

---

(١) ـ بَيْعُ الْمُكَاتَبِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٨ في المكاتب، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢٨ في المكاتب، عن مالك به.





گەورەكەی گرێبەستی لەسەر كردووە بیكڕێت، (بەڵام) دەبێ بەحازری شتەكەی بداتێ و دوای نەخات نەیكاتە قەرز.

**٢٣١٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الْمُكَاتَبِ: أَنَّهُ إِذَا بِيعَ كَانَ أَحَقَّ بِاشْتِرَاءِ كِتَابَتِهِ مِمَّنِ اشْتَرَاهَا، إِذَا قَوِيَ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَى سَيِّدِهِ الثَّمَنَ الَّذِي بَاعَهُ بِهِ نَقْدًا، وَذَلِكَ أَنَّ اشْتِرَاءَهُ نَفْسَهُ عَتَاقَةٌ، وَأَنَّ الْعَتَاقَةَ تُبَدَّأُ عَلَى مَا كَانَ مَعَهَا مِنَ الْوَصَايَا، وَإِنْ بَاعَ بَعْضُ مَنْ كَاتَبَ الْمُكَاتَبَ نَصِيبَهُ مِنْهُ، فَبَاعَ نِصْفَ الْمُكَاتَبِ أَوْ ثُلُثَهُ أَوْ رُبُعَهُ أَوْ سَهْمًا مِنْ أَسْهُمِ الْمُكَاتَبِ، فَلَيْسَ لِلْمُكَاتَبِ فِيمَا بِيعَ مِنْهُ شُفْعَةٌ، وَذَلِكَ أَنَّهُ يَصِيرُ بِمَنْزِلَةِ الْقَطَاعَةِ، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُقَاطِعَ بَعْضَ مَنْ كَاتَبَهُ إِلاَّ بِإِذْنِ شُرَكَائِهِ، وَأَنَّ مَا بِيعَ مِنْهُ لَيْسَتْ لَهُ بِهِ حُرْمَةٌ تَامَّةٌ، وَأَنَّ مَالَهُ مَحْجُوزٌ عَنْهُ، وَأَنَّ اشْتِرَاءَهُ بَعْضَهُ يُخَافُ عَلَيْهِ مِنْهُ الْعَجْزُ لِمَا يَذْهَبُ مِنْ مَالِهِ، وَلَيْسَ ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ اشْتِرَاءِ الْمُكَاتَبِ نَفْسَهُ كَامِلاً، إِلاَّ أَنْ يَأْذَنَ لَهُ مَنْ بَقِيَ لَهُ فِيهِ كِتَابَةٌ، فَإِنْ أَذِنُوا لَهُ كَانَ أَحَقَّ بِمَا بِيعَ مِنْهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاكترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی كۆیلەی نووسراوپێدراو ئەوەیە: ئەگەر نووسراوپێدانەكەی فرۆشرا ئەوە كۆیلەكە لەپێشترە لەو كەسەی كڕیویەتی ئەگەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە توانای هەبوو بەكاش و نەقد ئەو پارەیە بدات بە گەورەكەی كە پێی فرۆشتووە، لەبەر ئەوەی خۆكڕینەوەی خۆی ئازادبوونە (شەریعەتیش دەیەوێ ئازاد ببێت)، وە ئازادبوونیش بەسەر وەسییەت پێش دەخرێت (ئەگەر وەسییەت هەبێت)، وە ئەگەر یەكێك لەوانەی نووسراوپێدانی لە بەشی خۆی بۆ كۆیلەیەك كردبوو، جا نیوە یان سێیەك یان چواریەك یان پشكێك لە پشكەكانی كۆیلە نووسراوپێدراوەكەی فرۆشت، ئەوە كۆیلە نووسراوپێدراوەكە شوفعەی بۆ نییە لەو بەشەی فرۆشراوە (ناتوانێ وەریبگرێتەوە)، لەبەر ئەوەی وەك پێشخستنی ئازادبوونە بە پارەی كاش، وە بۆی نییە گرێبەستی پێشخستنی ئازادبوونی بە پارەی كاش بۆ بكات تەنها بە مۆڵەتی شەریك و هاوبەشەكانی نەبێت، وە ئەو بەشەی لێی فرۆشراوە حورمەت و ئازادی تەواوی بۆ نییە و ماڵەكەشی دەستی بەسەردا گیراوە و خۆكڕینەوەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣٠ في المكاتب، عن مالك به.

بەشێکیش ترسی ئەوەی هەیە دواتر نەتوانێت پارەی نووسراوپێدانەکە بدات چونکە ماڵەکەی دەڕوات، وە ئەو بابەتە وەك ئەوە نییە کۆیلەی نووسراوپێدراو خۆی بەتەواوی بکڕێتەوە (ئەو بابەتە جیاوازە، کەواتە خۆکڕینەوە لە بەشێکدا دروست نییە)، تەنها لەو کاتە نەبێت ئەو کەسانەی نووسراوپێدانیان لەسەری ماوە مۆڵەتی پێ بدەن، جا ئەگەر مۆڵەتیان پێ دا ئەوە کۆیلەکە خۆی شایستەتر و لەپێشترە بەو بەشەی فرۆشراوە (دەتوانێ خۆی بکڕێتەوە).

**٢٣١٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ يَحِلُّ بَيْعُ نَجْمٍ مِنْ نُجُومِ الْمُكَاتَبِ، وَذَلِكَ أَنَّهُ غَرَرٌ، إِنْ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ بَطَلَ مَا عَلَيْهِ، وَإِنْ مَاتَ أَوْ أَفْلَسَ وَعَلَيْهِ دُيُونٌ لِلنَّاسِ، لَمْ يَأْخُذِ الَّذِي اشْتَرَى نَجْمَهُ بِحِصَّتِهِ مَعَ غُرَمَائِهِ شَيْئًا، وَإِنَّمَا الَّذِي اشْتَرَى نَجْمًا مِنْ نُجُومِ الْمُكَاتَبِ بِمَنْزِلَةِ سَيِّدِ الْمُكَاتَبِ، فَسَيِّدُ الْمُكَاتَبِ لاَ يُحَاصُّ بِكِتَابَةِ غُلاَمِهِ غُرَمَاءَ الْمُكَاتَبِ، وَكَذَلِكَ الْخَرَاجُ أَيْضًا يَجْتَمِعُ لَهُ عَلَى غُلاَمِهِ، فَلاَ يُحَاصُّ بِمَا اجْتَمَعَ لَهُ مِنَ الْخَرَاجِ غُرَمَاءَ غُلاَمِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: دروست و حەڵاڵ نییە بەشێك لە بەشی دیاریکراو و کاتبۆداندراوی کۆیلەی نووسراوپێدراو بفرۆشرێت، لەبەر ئەوەی غەرەڕ و نادیاری تیایە، (چونکە) ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانەکە بدات ئەوە ئەو مامەڵەیە بەتاڵ دەبێتەوە، وە ئەگەر مرد یان موفلیس و مایەپووچ بوو و قەرزی خەڵکیشی لەسەر بوو، ئەوە ئەو کەسەی بەشی دیاریکراو و کاتبۆداندراوی کڕیوە هیچ لە پشکی خۆی پێ وەرناگیرێت لەگەڵ خاوەنی قەرزەکان، (چونکە) ئەو کەسەی بەشێك لە بەشەکانی کۆیلەی نووسراوپێدراوی کڕیوە وەك گەورەی نووسراوپێدراو وایە، گەورەی کۆیلەی نووسراوپێدراویش بەشی خۆی لە نووسراوپێدان وەرناگرێت لەگەڵ خاوەنی قەرزەکانی سەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە، وەرگرتنی باجی ڕۆژانە و مانگانەش لە کۆیلەکە لەلایەن گەورەکەی هەمان حوکمی هەیە، ناتوانێت وەریبگرێت لەگەڵ خاوەنی قەرزەکانی سەر کۆیلەکەی (ئەگەر کۆیلەکەی قەرزدار بوو).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣١ في المكاتب، عن مالك به.




**٢٣١٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ بَأْسَ بِأَنْ يَشْتَرِيَ الْمُكَاتَبُ كِتَابَتَهُ بِعَيْنٍ أَوْ عَرْضٍ مُخَالِفٍ لِمَا كُوتِبَ بِهِ مِنَ الْعَيْنِ أَوِ الْعَرْضِ أَوْ غَيْرِ مُخَالِفٍ، مُعَجَّلٍ أَوْ مُؤَخَّرٍ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: کێشە نییە بەوەی کۆیلەی نووسراوپێدراو نووسراوپێدانەکەی خۆی بە پارەیەکی کانزایی یان کاڵایێك بکڕێتەوە کە جیاواز بێت لەو شتەی گرێبەستەکەی لەسەر کراوە لە پارەی کانزایی یان کاڵا، یان بە شتێك کە جیاواز نەبێت (هەر دروستە)، چ بەحازری بێت چ بەقەرز (چونکە وەك قەرزی جێگیر نییە).

**٢٣١٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الْمُكَاتَبِ يَهْلِكُ، وَيَتْرُكُ أُمَّ وَلَدٍ وَوَلَدًا لَهُ صِغَارًا مِنْهَا، أَوْ مِنْ غَيْرِهَا، فَلاَ يَقْوَوْنَ عَلَى السَّعْيِ، وَيُخَافُ عَلَيْهِمُ الْعَجْزُ عَنْ كِتَابَتِهِمْ، قَالَ: تُبَاعُ أُمُّ وَلَدِ أَبِيهِمْ، إِذَا كَانَ فِي ثَمَنِهَا مَا يُؤَدَّى بِهِ عَنْهُمْ جَمِيعُ كِتَابَتِهِمْ، أُمَّهُمْ كَانَتْ أَوْ غَيْرَ أُمِّهِمْ، يُؤَدَّى عَنْهُمْ وَيَعْتِقُونَ، لأَنَّ أَبَاهُمْ كَانَ لاَ يَمْنَعُ بَيْعَهَا، إِذَا خَافَ الْعَجْزَ عَنْ كِتَابَتِهِ، فَهَؤُلاَءِ إِذَا خِيفَ عَلَيْهِمُ الْعَجْزُ، بِيعَتْ أُمُّ وَلَدِ أَبِيهِمْ، فَيُؤَدَّى عَنْهُمْ ثَمَنُهَا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي ثَمَنِهَا مَا يُؤَدَّى عَنْهُمْ، وَلَمْ تَقْوَ هِيَ وَلاَ هُمْ عَلَى السَّعْيِ، رَجَعُوا جَمِيعًا رَقِيقًا لِسَيِّدِهِمْ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە بمرێت و خێزانی خۆی و مناڵی بچووکی ئافرەتەکە یان هی غەیری ئافرەتەکە دوای خۆی جێ بهێڵێت کە توانای هەوڵ و کارکردنیان نەبێت و ترس هەبێت نەتوانن پارەی نووسراوپێدانەکەیان بدەن و خۆیان ئازاد بکەن، گوتوویەتی: دایکی مناڵی پیاوەکە دەفرۆشرێت ئەگەر نرخەکەی پارەی نووسراوپێدانی گشتیانی پێ بدرێت، دایکیان بێت یان دایکی ئەسڵیان نەبێت، بۆیان دەدرێت و ئازاد دەبن، چونکە (هەبوونی) باوکیان ڕێگر نەبوو لە فرۆشتنی ئافرەتەکە (مناڵەکانیش بە هەمان شێوەی باوکیانن، ڕێگر نابن لە فرۆشتنی ئافرەتەکە)، ئەگەر ترسا پارەی نووسراوپێدانەکەیان پێ نەدرێت، چونکە ئەوانە کاتێ ترس هەیە نەتوانن دایکی مناڵی پیاوەکە دەفرۆشرێت و بە پارەکەی پارەی نووسراوپێدانەکەیان دەدرێت، جا ئەگەر نرخەکەی پارەکەی ئەوانی پێ نەدەدرا (کەمتر بوو) و ئافرەتەکەش توانای کارکردنی نەبوو، ئەوە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣٣ في المكاتب، عن مالك به.

گشتیان دەبنەوە کۆیلەی گەورەکەیان (نووسراوپێدانەکە هەڵدەوەشێتەوە).

**٢٣١٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الَّذِي يَبْتَاعُ كِتَابَةَ الْمُكَاتَبِ، ثُمَّ يَهْلِكُ الْمُكَاتَبُ قَبْلَ أَنْ يُؤَدِّيَ كِتَابَتَهُ: أَنَّهُ يَرِثُهُ الَّذِي اشْتَرَى كِتَابَتَهُ، وَإِنْ عَجَزَ فَلَهُ رَقَبَتُهُ، وَإِنْ أَدَّى الْمُكَاتَبُ كِتَابَتَهُ إِلَى الَّذِي اشْتَرَاهَا وَعَتَقَ، فَوَلاَؤُهُ لِلَّذِي عَقَدَ كِتَابَتَهُ، لَيْسَ لِلَّذِي اشْتَرَى كِتَابَتَهُ مِنْ وَلاَئِهِ شَيْءٌ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی نووسراوپێدانی کۆیلەیەك دەکڕێتەوە، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە دەمرێت بەر لەوەی پارەی نووسراوپێدانەکەی بدات، ئەوە ئەو کەسەی نووسراوپێدانەکەی کڕیوەتەوە میراتی لێ دەگرێت، وە ئەگەر (نەمرد، بەڵام) نەیتوانی پارەی نووسراوپێدانەکە بدات (کە کەسەکە کڕیویەتەوە)، ئەوە خودی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە دەبێتە کۆیلەی کەسەکە، وە ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە پارەی نووسراوپێدانەکەی دایەوە بەو کەسەی کە کڕیویەتی و ئازاد بوو، ئەوە وەلائەکەی (میرات و بابەتی پەیوەست بە وەلائی) بۆ ئەو کەسەیە کە گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ کردووە، هیچ لە وەلائەکە بۆ ئەو کەسە نییە کە نووسراوپێدانەکەی کڕیوەتەوە.

## ٦- هەوڵ و کۆششی کۆیلەی نووسراوپێدراو[2]

**٢٣١٩-** أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ، سُئِلاَ عَنْ رَجُلٍ كَاتَبَ عَلَى نَفْسِهِ وَعَلَى بَنِيهِ ثُمَّ مَاتَ، هَلْ يَسْعَى بَنُو الْمُكَاتَبِ فِي كِتَابَةِ أَبِيهِمْ أَمْ هُمْ عَبِيدٌ؟ فَقَالاَ: بَلْ يَسْعَوْنَ فِي كِتَابَةِ أَبِيهِمْ، وَلاَ يُوضَعُ عَنْهُمْ لِمَوْتِ أَبِيهِمْ شَيْءٌ[3].

واتە: عورِوەی کوڕی زوبەیر و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ پرسیاریان لێ کرا دەربارەی کەسێك کە گرێبەستی نووسراوپێدان بۆ خۆی و کوڕەکانی بکات، دواتر بمرێت، ئایا کوڕەکانی کار دەکەن و هەوڵ دەدەن بۆ نووسراوپێدانەکەی باوکیان

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣٤ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ سَعْيُ الْمُكَاتَبِ.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣٥ في المكاتب؛ وفي: ٢٨٣٦ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٣ب في المكاتب والمدبر؛ وفي: ٤٤٣ج في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٨٥٩ في العتاق، كلهم عن مالك به.





یان کوڕەکان بە کۆیلە حیسابن (و گرێبەستەکە هەڵوەشاوەیە)؟ گوتیان: (نەخێر هەڵنەوەشاوەتەوە) بەڵکوو هەوڵ و کۆشش دەکەن بۆ نووسراوپێدانەکەی باوکیان و لەسەریان هەڵناگیرێ بەهۆی مردنی باوکیان.

**٢٣٢٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ كَانُوا صِغَارًا لاَ يُطِيقُونَ السَّعْيَ، لَمْ يُنْتَظَرْ بِهِمْ أَنْ يَكْبَرُوا، وَكَانُوا رَقِيقًا لِسَيِّدِ أَبِيهِمْ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْمُكَاتَبُ تَرَكَ مَا يُؤَدَّى بِهِ عَنْهُمْ نُجُومُهُمْ، إِلَى أَنْ يَتَكَلَّفُوا السَّعْيَ، فَإِنْ كَانَ فِيمَا تَرَكَ مَا يُؤَدَّى عَنْهُمْ، أُدِّيَ ذَلِكَ عَنْهُمْ، وَتُرِكُوا عَلَى حَالِهِمْ، حَتَّى يَبْلُغُوا السَّعْيَ، فَإِنْ أَدَّوْا عَتَقُوا، وَإِنْ عَجَزُوا رَقُّوا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر هاتو منداڵەکان بچووك بوون نەیاندەتوانی کار و کۆشش بکەن، ئەوە چاوەڕوانیان ناکرێ تا گەورە ببن، (بەڵکوو) دەبنەوە کۆیلە بۆ گەورەی باوکیان، تەنها لەو کاتە نەبێت کە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە (واتە باوکیان) سەروەتێکی وای جێ هێشتبێ کە بتوانرێ باج و کولفەی منداڵەکانی پێ بدرێت تا گەورە دەبن و تەکلیفی کۆششیان لێ دەکرێت، جا ئەگەر ئەوەی جێی هێشتبوو بەشی دەکردن ئەوە بۆیان دەدرێت و وەك خۆیان دەهێڵرێنەوە (نووسراوپێدانەکە هەڵناوەشێتەوە) تا دەگەن بە تەمەنی کار و کۆشش، جا ئەگەر دوای ئەوە پارەی خۆیان دا ئەوە ئازاد دەبن، ئەگەر نەشیانتوانی ئەوە دەبنەوە کۆیلە.

**٢٣٢١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يَمُوتُ وَيَتْرُكُ مَالاً لَيْسَ فِيهِ وَفَاءٌ لِلْكِتَابَةِ، وَيَتْرُكُ وَلَدًا مَعَهُ فِي كِتَابَتِهِ وَأُمَّ وَلَدٍ، فَأَرَادَتْ أُمُّ وَلَدِهِ أَنْ تَسْعَى عَلَيْهِمْ: إِنَّهُ يُدْفَعُ إِلَيْهَا الْمَالُ، إِذَا كَانَتْ مَأْمُونَةً عَلَى ذَلِكَ، قَوِيَّةً عَلَى السَّعْيِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ قَوِيَّةً عَلَى السَّعْيِ، وَلاَ مَأْمُونَةً عَلَى الْمَالِ، لَمْ تُعْطَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، وَرَجَعَتْ هِيَ وَوَلَدُ الْمُكَاتَبِ رَقِيقًا لِسَيِّدِ الْمُكَاتَبِ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کۆیلە نووسراوپێدراوەی دەمرێت و سەروەتێك دوای خۆی جێ دێڵێت بەشی پارەی نووسراوپێدانەکە ناکات، وە منداڵێك و دایکی منداڵەکە لەگەڵ نووسراوپێدانی خۆی جێ دێڵێت، جا دایکی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣٥ في المكاتب؛ وفي: ٢٨٣٦ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٣ب في المكاتب والمدبر؛ وفي: ٤٤٣ج في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٨٥٩ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣٧ في المكاتب، عن مالك به.




مناڵەکەی دەیەوێت کار و کۆششیان بۆ بکات، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ماڵ و سەروەتەکە دەدرێت بە ئافرەتەکە ئەگەر جێی متمانە بوو و هێزی هەبوو بۆ کار و کۆششکردن، بەڵام ئەگەر بەهێز نەبوو بۆ کۆششکردن و جێی دڵنیایی نەبوو بۆ سەروەت و پارە، ئەوە هیچ لە پارەکەی پێ نادرێت و ئافرەتەکە و مناڵی نووسراوپێدراوەکەش دەبنەوە کۆیلەی گەورەی نووسراوپێدراوە مردووەکە.

**٢٣٢٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا كَاتَبَ الْقَوْمُ جَمِيعًا كِتَابَةً وَاحِدَةً، وَلاَ رَحِمَ بَيْنَهُمْ، فَعَجَزَ بَعْضُهُمْ وَسَعَى بَعْضُهُمْ حَتَّى عَتَقُوا جَمِيعًا، فَإِنَّ الَّذِينَ سَعَوْا يَرْجِعُونَ عَلَى الَّذِينَ عَجَزُوا بِحِصَّةِ مَا أَدَّوْا عَنْهُمْ، لأَنَّ بَعْضَهُمْ حُمَلاَءُ عَنْ بَعْضٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کۆمەڵە کۆیلەیەك بەیەکەوە یەك گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ کرا و هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتییان لە نێوان نەبوو، جا هەندێکیان نەیانتوانی پشکی خۆیان بەدەست بێنن و پارەی خۆیان پەیدا بکەن، هەندێکیشیان هەوڵیان دا (پارەی گشتیان پەیدا کرد) تا بەیەکەوە گشتیان ئازاد بوون، ئەوە ئەو کەسانەی هەوڵیان داوە و پارەیان داوە ئەوە بۆ وەرگرتنەوەی ئەو پارەی داویانە دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو کەسانەی نەیانتوانیوە پشکی خۆیان بەدەست بێنن، چونکە زامنی یەکدین.

## ٧- ئازادبوونی کۆیلەی نووسراوپێدراو کاتێ پێش هاتنی کاتی خۆی ئەو پارەیە دەدات کە لەسەریەتی[٢]

**٢٣٢٣-** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَغَيْرَهُ يَذْكُرُونَ، أَنَّ مُكَاتَبًا كَانَ لِلْفُرَافِصَةِ بْنِ عُمَيْرٍ الْحَنَفِيِّ، وَأَنَّهُ عَرَضَ عَلَيْهِ أَنْ يَدْفَعَ إِلَيْهِ جَمِيعَ مَا عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ، فَأَبَى الْفُرَافِصَةُ، فَأَتَى الْمُكَاتَبُ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ، وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَدَعَا مَرْوَانُ الْفُرَافِصَةَ، فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ ذَلِكَ، فَأَبَى، فَأَمَرَ مَرْوَانُ بِذَلِكَ الْمَالِ أَنْ يُقْبَضَ مِنَ الْمُكَاتَبِ، فَيُوضَعَ فِي بَيْتِ الْمَالِ، وَقَالَ لِلْمُكَاتَبِ: اذْهَبْ فَقَدْ عَتَقْتَ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ الْفُرَافِصَةُ قَبَضَ الْمَالَ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣٩ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ عِتْقُ الْمُكَاتَبِ إِذَا أَدَّى مَا عَلَيْهِ قَبْلَ مَحِلِّهِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤٠ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٤ في المكاتب والمدبر،

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم بەوەی گوێی لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمان و جگە لەویش بووە باسیان کردووە بەوەی کۆیلەیەکی نووسراوپێدراوی فوڕافیصەی کوڕی عومەیری حەنەفی پێشنیاری بۆ فوڕافیصە کرد بەوەی گشت ئەو پارەیەی لەسەریەتی بۆ نووسراوپێدان پێی بدات، فوڕافیصەش ڕازی نەبوو، جا کۆیلە نووسراوپێدراوەکە هات بۆ لای مەڕوانی کوڕی حەکەم لە کاتێکدا گەورەی مەدینە بوو، جا بابەتەکەی بۆ باس کرد، مەڕوانیش فوڕافیصەی بانگ کرد و پێی گوت با پارەکەت بەیەکەوە بداتێ، ئەویش ڕازی نەبوو، جا مەڕوانی کوڕی حەکەم فەرمانی کرد پارەکە لە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە وەربگیرێت و لە خەزێنەی مسوڵمانان (بەیتولمال) دابندرێت و بە کۆیلە نووسراوپێدراوەکەشی گوت: بڕۆ تۆ ئازاد بوویت، جا کاتێ فوڕافیصە ئەوەی بینی پارەکەی وەرگرت و ڕازی بوو.

**٢٣٢٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمُكَاتَبَ إِذَا أَدَّى جَمِيعَ مَا عَلَيْهِ مِنْ نُجُومِهِ قَبْلَ مَحِلِّهَا، جَازَ ذَلِكَ لَهُ، وَلَمْ يَكُنْ لِسَيِّدِهِ أَنْ يَأْبَى ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَذَلِكَ أَنَّهُ يَضَعُ عَنِ الْمُكَاتَبِ بِذَلِكَ كُلَّ شَرْطٍ أَوْ خِدْمَةٍ أَوْ سَفَرٍ، لأَنَّهُ لاَ تَتِمُّ عَتَاقَةُ رَجُلٍ وَعَلَيْهِ بَقِيَّةٌ مِنْ رِقٍّ، وَلاَ تَتِمُّ حُرْمَتُهُ، وَلاَ تَجُوزُ شَهَادَتُهُ، وَلاَ يَجِبُ مِيرَاثُهُ، وَلاَ أَشْبَاهُ هَذَا مِنْ أَمْرِهِ، وَلاَ يَنْبَغِي لِسَيِّدِهِ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَيْهِ خِدْمَةً بَعْدَ عَتَاقَتِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە کۆیلەی نووسراوپێدراو کاتێ گشت ئەو نرخ و پارەیەی پێش هاتنی کاتی خۆی دا کە لە قستی نووسراوپێداندا لەسەریەتی، ئەوەی بۆ دروستە و بۆ گەورەکەشی نییە ڕەتی بکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو بابەتە گشت مەرج و خزمەت و سەفەرێکی لەسەر لادەبات، چونکە ئازادبوونی کەسێك تەواو نابێت لە کاتێکدا هەندێك لە کۆیلایەتی لەسەر مابێت، وە حورمەتی ئازادبوونیشی تەواو نابێت و شاهێدی و گەواهیدانیشی دروست نابێت و میراتیشی بۆ دانامەزرێت و شتانی لەو جۆرەشی

---

کلهم عن مالك به.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤١ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٤أفي المكاتب والمدبر، عن مالك به.





بۆ نابێت، وە بۆ گەورەکەی دروست نییە مەرجی خزمەتێکی لەسەر دابنێت دوای ئازادبوونی.

**٢٣٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي مُكَاتَبٍ مَرِضَ مَرَضًا شَدِيدًا، فَأَرَادَ أَنْ يَدْفَعَ نُجُومَهُ كُلَّهَا إِلَى سَيِّدِهِ، لأَنْ يَرِثَهُ وَرَثَةٌ لَهُ أَحْرَارٌ، وَلَيْسَ مَعَهُ فِي كِتَابَتِهِ وَلَدٌ لَهُ، قَالَ مَالِكٌ: ذَلِكَ جَائِزٌ لَهُ، لأَنَّهُ تَتِمُّ بِذَلِكَ حُرْمَتُهُ، وَتَجُوزُ شَهَادَتُهُ، وَيَجُوزُ اعْتِرَافُهُ بِمَا عَلَيْهِ مِنْ دُيُونِ النَّاسِ، وَتَجُوزُ وَصِيَّتُهُ، وَلَيْسَ لِسَيِّدِهِ أَنْ يَأْبَى ذَلِكَ عَلَيْهِ بِأَنْ يَقُولَ فَرَّ مِنِّي بِمَالِهِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كۆیلەیەكی نووسراوپێدراو كە نەخۆش بكەوێت بەنەخۆشییەكی توند، جا بیەوێ گشت قیستەكەی بە یەك جار بدات بە گەورەكەی، تا (ئازاد بێت بۆ ئەوەی ئەگەر لەو نەخۆشییە مرد) خزمە ئازادەكانی میراتی لێ بگرن، مناڵی خۆشی لەگەڵ نەبوو لە نووسراوپێدانەكەدا، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆی دروستە (قستەكە بە یەك جار بدات)، چونكە بەوە حورمەتی ئازادبوونی تەواو دەبێت و شاهێدی و گەواهیدانی وەردەگیرێ و دانپێدانانی وەردەگیرێت دەربارەی قەرزی خەڵكی (ئەگەر بڵێت قەرزی فلانم لەسەرە)، وە وەسییەتی جێبەجێ دەبێت، وە بۆ گەورەكەی نییە ئەوە ڕەت بكاتەوە بەوەی بڵێت بە ماڵ و سەروەتەوە لەدەستم هەڵات (ئەوە نابێتە بەهانە و پارەكە هی خۆیەتی).

### ٨- میراتی كۆیلەی نووسراوپێدراو كاتێ ئازاد دەبێت[٢]

**٢٣٢٦-** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ سُئِلَ عَنْ مُكَاتَبٍ كَانَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَأَعْتَقَ أَحَدُهُمَا نَصِيبَهُ، فَمَاتَ الْمُكَاتَبُ وَتَرَكَ مَالاً كَثِيراً، فَقَالَ: يُؤَدَّى إِلَى الَّذِي تَمَاسَكَ بِكِتَابَتِهِ الَّذِي بَقِيَ لَهُ، ثُمَّ يَقْتَسِمَانِ مَا بَقِيَ بِالسَّوِيَّةِ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤٢ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ مِيرَاثُ الْمُكَاتَبِ إِذَا عَتَقَ.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤٣ في المكاتب؛ والحدثاني: ٤٤٤ب في المكاتب والمدبر، عن مالك به.




واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم پێی گەیشتووە بەوەی سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ پرسیاری لێ کراوە دەربارەی کۆیلەیەکی نووسراوپێدراو کە نووسراوپێدراوی دوو کەس بێت و یەکێکیان پشکی خۆی ئازاد بکات و کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بمرێت و سەروەتێکی خۆی دوای خۆی جێ بهێڵێت، گوتوویەتی: ئەو کەسەی دەستی بە نووسراوپێدانی خۆیەوە گرتووە و لێی خۆش نەبووە، ئەوە ئەو ئەندازەیە وەردەگرێتەوە کە لەسەر کۆیلەکە ماوە، دواتر هەر یەکەیان بەپێی پشکەکانیان لە نێوانی خۆیان زیادەکە دابەش دەکەن.

**٢٣٢٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا كَاتَبَ الْمُكَاتَبُ فَعَتَقَ، فَإِنَّمَا يَرِثُهُ أَوْلَى النَّاسِ بِمَنْ كَاتَبَهُ مِنَ الرِّجَالِ يَوْمَ تُوُفِّيَ الْمُكَاتَبُ مِنْ وَلَدٍ أَوْ عَصَبَةٍ.

(فەتوا):واتە:ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی:ئەگەر کۆیلە گرێبەستی نووسراوپێدانی کرد و ئازاد بوو، ئەوە نزیکترین کەس لەو کەسەی گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ کردووە میراتی لێ دەگرێت لە پیاوان لە کوڕ و عەصەبە، لەو ڕۆژەی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە مردووە.

**٢٣٢٨- [فتوى]** قَالَ: وَهَذَا أَيْضًا فِي كُلِّ مَنْ أُعْتِقَ، فَإِنَّمَا مِيرَاثُهُ لأَقْرَبِ النَّاسِ مِمَّنْ أَعْتَقَهُ مِنْ وَلَدٍ أَوْ عَصَبَةٍ مِنَ الرِّجَالِ يَوْمَ يَمُوتُ الْمُعْتَقُ بَعْدَ أَنْ يَعْتِقَ وَيَصِيرَ مَوْرُوثًا بِالْوَلاَءِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەمە دەربارەی گشت کەسێکە کە ئازاد بکرێت، بەوەی میراتەکەی بۆ نزیکترین کەسە لەو کەسەی ئازادی کردووە، لە مناڵ و عەصەبە لە پیاوان، لەو ڕۆژەی ئازادکراوەکە دەمرێت دوای ئەوەی ئازاد دەکرێت و دەبێتە میراتلێگیراو بە وەلاء .

**٢٣٢٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الإِخْوَةُ فِي الْكِتَابَةِ بِمَنْزِلَةِ الْوَلَدِ إِذَا كُوتِبُوا جَمِيعًا كِتَابَةً وَاحِدَةً، إِذَا لَمْ يَكُنْ لأَحَدٍ مِنْهُمْ وَلَدٌ كَاتَبَ عَلَيْهِمْ، أَوْ وُلِدُوا فِي كِتَابَتِهِ، فَإِنَّ الإِخْوَةَ يَتَوَارَثُونَ، فَإِنْ كَانَ لأَحَدٍ مِنْهُمْ وَلَدٌ وُلِدُوا فِي كِتَابَتِهِ، أَوْ كَاتَبَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ هَلَكَ أَحَدُهُمْ وَتَرَكَ مَالاً أُدِّيَ عَنْهُمْ جَمِيعُ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ كِتَابَتِهِمْ وَعَتَقُوا، وَكَانَ فَضْلُ الْمَالِ بَعْدَ ذَلِكَ لِوَلَدِهِ دُونَ إِخْوَتِهِ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤٤ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤٧ في المكاتب، عن مالك به.




(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: برا لە بابەتی نووسراوپێدان وەك منالٌ وایە کاتێ یەك گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ دەکرێت، یان لەناو زەمانی نووسراوپێداندا لەدایك دەبن، برایەکان میرات لە یەکدی دەگرن، جا ئەگەر یەکێك لە براکان منالٌێکی هەبوو لە سەردەمی نووسراوپێداندا لەدایك ببوو، یان نووسراوپێدانی بۆ کردبوو، دواتر بمرێت و سەروەت جێ بهێڵێت، ئەوە گشت ئەو پارەی لەسەریانە لە نووسراوپێداندا بۆیان دەدرێت و ئازاد دەبن، (ئەگەر زیادیش بوو) سەروەتە زیادەکە دوای ئەوە بۆ منالٌەکەیەتی نەك براکانی.

## ٩- مەرجدانان بۆ کۆیلەی نووسراوپێدراو[١]

**٢٣٣٠- [فتوى]** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ كَاتَبَ عَبْدَهُ بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، وَاشْتَرَطَ عَلَيْهِ فِي كِتَابَتِهِ سَفَرًا أَوْ خِدْمَةً أَوْ ضَحِيَّةً: إِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ سَمَّى بِاسْمِهِ، ثُمَّ قَوِيَ الْمُكَاتَبُ عَلَى أَدَاءِ نُجُومِهِ كُلِّهَا قَبْلَ مَحِلِّهَا، قَالَ: إِذَا أَدَّى نُجُومَهُ كُلَّهَا وَعَلَيْهِ هَذَا الشَّرْطُ، عَتَقَ، فَتَمَّتْ حُرْمَتُهُ، وَنُظِرَ إِلَى مَا شَرَطَ عَلَيْهِ مِنْ خِدْمَةٍ أَوْ سَفَرٍ أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، مِمَّا يُعَالِجُهُ هُوَ بِنَفْسِهِ، فَذَلِكَ مَوْضُوعٌ عَنْهُ، لَيْسَ لِسَيِّدِهِ فِيهِ شَيْءٌ، وَمَا كَانَ مِنْ ضَحِيَّةٍ أَوْ كِسْوَةٍ أَوْ شَيْءٍ يُؤَدِّيهِ، فَإِنَّمَا هُوَ بِمَنْزِلَةِ الدَّنَانِيرِ وَالدَّرَاهِمِ، يُقَوَّمُ ذَلِكَ عَلَيْهِ، فَيَدْفَعُهُ مَعَ نُجُومِهِ، وَلاَ يَعْتِقُ، حَتَّى يَدْفَعَ ذَلِكَ مَعَ نُجُومِهِ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم دەربارەی کەسێك کە گرێبەستی نووسراوپێدان لەسەر زێڕ یان زیو بۆ کۆیلەی خۆی بکات و لە نووسراوپێدانەکەیدا مەرجی سەفەر یان خزمەت یان سەربڕینی ئاژەڵێکی لەسەر دابنێت، هەر شتێك لەوانە (بە دیاریکردن و) بە ناوی خۆی ناوی هێنا، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە توانای پەیدابوو لەسەر دانی گشت قیستەکان بەر لە کاتی خۆی، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر گشت قیستەکانی دا و ئەو مەرجەشی لەسەر بوو ئازاد دەبێت و حورمەتی ئازادبوونەکەی کامڵ و

---

(١) ـ الشَّرْطُ فِي الْمُكَاتَبِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤٨ في المكاتب، عن مالك به.

تەواو دەبێت و سەیری ئەوە دەکرێت کە لەسەری کردووە بە مەرج لە خزمەت و سەفەر و شتی ئاوا، لەو شتانەی بە جەستەیی ئەنجام دەدرێن، ئەوە لەسەری لابراوە و ئەنجامیان نادات، گەورەکەی هیچی بۆ نییە تیایدا، وە ئەوەی کە بریتییە لە قوربانی یان پۆشاك یان پێدانی شتێك، ئەوە وەك دینار و درهەم وایە (پارە حیسابە)، بەسەریدا دەنرخێندرێت، دەبێ لەگەڵ قیستەکە پارەی ئەو مەرجانەش بدات و ئازاد نابێت تا ئەوەش دەدات لەگەڵ قیستەکە.

**٢٣٣١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ: أَنَّ الْمُكَاتَبَ بِمَنْزِلَةِ عَبْدٍ أَعْتَقَهُ سَيِّدُهُ بَعْدَ خِدْمَةِ عَشْرِ سِنِينَ، فَإِذَا هَلَكَ سَيِّدُهُ الَّذِي أَعْتَقَهُ قَبْلَ عَشْرِ سِنِينَ، فَإِنَّ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ خِدْمَتِهِ لِوَرَثَتِهِ، وَكَانَ وَلاَؤُهُ لِلَّذِي عَقَدَ عِتْقَهُ وَلِوَلَدِهِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الْعَصَبَةِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە کە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: کۆیلەی نووسراوپێدراو وەك کۆیلەیەك وایە گەورەکەی ئازادی بکات دوای دە ساڵ خزمەت (واتە بڵێت دوای دە ساڵ خزمەت ئازاد بیت)، جا کە گەورەکەی مرد بەر لە دە ساڵەکە، ئەوە چەندی ماوە لە خزمەتەکە بۆ میراتگرانیەتی، وەلائەکەشی بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی کردووە و وە بۆ مناڵەکانی ئازادکەرەکەیە لە پیاوان یان بۆ عەصەبەیەتی لە پیاوان.

**٢٣٣٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِطُ عَلَى مُكَاتَبِهِ أَنَّكَ لاَ تُسَافِرُ وَلاَ تَنْكِحُ وَلاَ تَخْرُجُ مِنْ أَرْضِي إِلاَّ بِإِذْنِي، فَإِنْ فَعَلْتَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ بِغَيْرِ إِذْنِي، فَمَحْوُ كِتَابَتِكَ بِيَدِي، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ مَحْوُ كِتَابَتِهِ بِيَدِهِ إِنْ فَعَلَ الْمُكَاتَبُ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، وَلْيَرْفَعْ سَيِّدُهُ ذَلِكَ إِلَى السُّلْطَانِ، وَلَيْسَ لِلْمُكَاتَبِ أَنْ يَنْكِحَ وَلاَ يُسَافِرَ وَلاَ يَخْرُجَ مِنْ أَرْضِ سَيِّدِهِ، إِلاَّ بِإِذْنِهِ، اشْتَرَطَ ذَلِكَ أَوْ لَمْ يَشْتَرِطْهُ، وَذَلِكَ أَنَّ الرَّجُلَ يُكَاتِبُ عَبْدَهُ بِمِئَةِ دِينَارٍ، وَلَهُ أَلْفُ دِينَارٍ أَوْ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، فَيَنْطَلِقُ فَيَنْكِحُ الْمَرْأَةَ، فَيُصْدِقُهَا الصَّدَاقَ الَّذِي يُجْحِفُ بِمَالِهِ، وَيَكُونُ فِيهِ عَجْزُهُ، فَيَرْجِعُ إِلَى سَيِّدِهِ عَبْدًا لاَ مَالَ لَهُ، أَوْ يُسَافِرُ فَتَحِلُّ نُجُومُهُ وَهُوَ غَائِبٌ، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُ، وَلاَ عَلَى ذَلِكَ كَاتَبَهُ، وَذَلِكَ بِيَدِ سَيِّدِهِ، إِنْ شَاءَ أَذِنَ لَهُ فِي ذَلِكَ، وَإِنْ شَاءَ مَنَعَهُ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤٩ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥٠ في المكاتب؛ وفي: ٢٨٥١ في المكاتب، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە مەرج لەسەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکەی دادەنێ بەوەی نابێ سەفەر بکەیت و نابێ هاوسەرگیری بکەیت و نابێ لە زەوی من بچیتە دەرەوە تەنها بە مۆڵەتی من نەبێت، جا ئەگەر شتێك لەوانە بەبێ مۆڵەتی من ئەنجام بدەیت ئەوە هەڵوەشاندنەوەی نووسراوپێدانەکەت بە دەستی منە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: سڕینەوە و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی نووسراوپێدانەکەی بە دەست نییە ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە شتێك لەوانەی ئەنجام دا، (بەڵکوو) با گەورەکەی بابەتەکە بکاتە شکات و بەرزی بکاتەوە بۆ لای کاربەدەست، وە بۆ کۆیلە نووسراوپێدراوەکەش نییە نە هاوسەرگیری بکات و نە سەفەر بکات و نە لە زەوی گەورەکەی بچێتە دەرەوە تەنها بە مۆڵەتی ئەو نەبێ، (جا چون یەکە) ئەوە بە مەرج دابنێ یان بە مەرجی دانەنێ، لەبەر ئەوەی (بۆ نموونە) گەورەکە گرێبەستی نووسراوپێدان بە سەد دینار بۆ کۆیلەکەی دەکات و کۆیلەکە هەزار دینار و زیاتری هەیە، جا دەچێ هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك دەکات و مارەییەکی بۆ دادەنێ سەروەتەکەی لەناو دەبات ئەوەش نەتوانین و دەسەوسانی دروست دەکات بۆ دانی پارەی نووسراوپێدانەکە و (لە کۆتاییدا) دەگەڕێتەوە لای گەورەکەی بەکۆیلەیی لە کاتێکدا هیچ سەروەتێکی نییە، یان سەفەر دەکات و کاتی قیستەکەی دێت و تێ دەپەڕێت لە کاتێکدا خۆی غائیبە، جا کەواتە ئەوەی بۆ نییە و گەورەکەی لەسەر ئەوە گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ نەکردووە، ئەو شتانە بەدەست گەورەکەیەتی، ئەگەر ویستی مۆڵەتی پێ دەدات، ئەگەر ویستیشی ڕێگری لێ دەکات.

## ١٠- وەلائی کۆیلەی نووسراوپێدراو کاتێ کۆیلەکەی خۆی ئازاد دەکات[1]

**٢٣٣٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ الْمُكَاتَبَ إِذَا أَعْتَقَ عَبْدَهُ، إِنَّ ذَلِكَ غَيْرُ جَائِزٍ لَهُ، إِلاَّ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ فَإِنْ أَجَازَ ذَلِكَ سَيِّدُهُ لَهُ، ثُمَّ عَتَقَ الْمُكَاتَبُ كَانَ وَلاَؤُهُ لِلْمُكَاتَبِ، وَإِنْ مَاتَ الْمُكَاتَبُ قَبْلَ أَنْ يُعْتَقَ كَانَ وَلاَءُ الْمُعْتَقِ لِسَيِّدِ الْمُكَاتَبِ، وَإِنْ مَاتَ الْمُعْتَقُ قَبْلَ أَنْ يُعْتَقَ الْمُكَاتَبُ وَرِثَهُ سَيِّدُ الْمُكَاتَبِ[2].

---

(١) ـ وَلاَءُ الْمُكَاتَبِ إِذَا أَعْتَقَ عَبْدَهُ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥٢ في المكاتب، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كۆیلەی نووسراوپێدراو كاتێ كۆیلەكەی خۆی ئازاد دەكات (ئەگەر كۆیلەكە كۆیلەی هەبوو)، ئەوە بۆی دروست نییە، تەنها بە مۆڵەتی گەورەكەی نەبێت، جا ئەگەر گەورەكەی ڕێی پێ دا، دواتر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە ئازاد بوو ئەوە وەلائەكەی بۆ كۆیلە نووسراوپێدراوە ئازادەكەیە، وە ئەگەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە مرد بەر لەوەی ئازاد بێت ئەوە وەلائی كۆیلە ئازادكراوەكە بۆ گەورەی كۆیلە نووسراوپێدراوەكەیە، وە ئەگەر كۆیلە ئازادكراوەكە مرد بەر لەوەی كۆیلە نووسراوپێدراوەكە ئازاد بێت ئەوە گەورەی كۆیلە نووسراوپێدراوەكە میراتی لێ دەگرێت.

**٢٣٣٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ أَيْضًا لَوْ كَاتَبَ الْمُكَاتَبُ عَبْدًا، فَعَتَقَ الْمُكَاتَبُ الآخَرُ قَبْلَ سَيِّدِهِ الَّذِي كَاتَبَهُ، فَإِنَّ وَلاَءَهُ لِسَيِّدِ الْمُكَاتَبِ، مَا لَمْ يَعْتِقِ الْمُكَاتَبُ الأَوَّلُ الَّذِي كَاتَبَهُ، فَإِنْ عَتَقَ الَّذِي كَاتَبَهُ، رَجَعَ إِلَيْهِ وَلاَءُ مُكَاتَبِهِ الَّذِي كَانَ عَتَقَ قَبْلَهُ، وَإِنْ مَاتَ الْمُكَاتَبُ الأَوَّلُ قَبْلَ أَنْ يُؤَدِّيَ، أَوْ عَجَزَ عَنْ كِتَابَتِهِ، وَلَهُ وَلَدٌ أَحْرَارٌ لَمْ يَرِثُوا وَلاَءَ مُكَاتَبِ أَبِيهِمْ، لأَنَّهُ لَمْ يَثْبُتْ لأَبِيهِمُ الْوَلاَءُ، وَلاَ يَكُونُ لَهُ الْوَلاَءُ حَتَّى يَعْتِقَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە ئەگەر كۆیلەی نووسراوپێدراو نووسراوپێدان بۆ كۆیلەیەكی خۆی بكات و كۆیلە نووسراوپێدراوە دووەمەكە پێش گەورەكەی خۆی ئازاد بێت كە گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ كردووە، ئەوە وەلائەكەی بۆ گەورەی كۆیلە نووسراوپێدراوەكەیە مادەم كۆیلە نووسراوپێدراوەكەی یەكەم ئازاد نەبووە، جا ئەگەر ئەو كۆیلەیە ئازاد بوو كە نووسراوپێدانی بۆ كۆیلەی خۆی كردووە، ئەوە وەلائەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كۆیلەیەی گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ كردووە و بەر لەو ئازاد بووە، وە ئەگەر نووسراوپێدراوی یەكەم بەر لەوەی پارەی نووسراوپێدانی خۆی بدات مرد، یان نەیتوانی پارەكە بدات و مناڵی ئازادیشی هەبوون، ئەوە میرات نابەن لە كۆیلەی نووسراوپێدراوی باوكیان، چونكە وەلاء بۆ باوكیان دانەمەزراوە و وەلائی بۆ نابێت تا ئازاد دەبێت (ئازادیش نەبووە كەواتە بۆی نابێت).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥٣ في المكاتب، عن مالك به.

**٢٣٣٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، فَيَتْرُكُ أَحَدُهُمَا لِلْمُكَاتَبِ الَّذِي لَهُ عَلَيْهِ، وَيَشِحُّ الآخَرُ، ثُمَّ يَمُوتُ الْمُكَاتَبُ وَيَتْرُكُ مَالاً، قَالَ مَالِكٌ: يَقْضِي الَّذِي لَمْ يَتْرُكْ لَهُ شَيْئًا مَا بَقِيَ لَهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَقْتَسِمَانِ الْمَالَ كَهَيْئَتِهِ لَوْ مَاتَ عَبْدًا، لأَنَّ الَّذِي صَنَعَ لَيْسَ بِعَتَاقَةٍ، وَإِنَّمَا تَرَكَ مَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ وَتَرَكَ مُكَاتَبًا، وَتَرَكَ بَنِينَ رِجَالاً وَنِسَاءً، ثُمَّ أَعْتَقَ أَحَدُ الْبَنِينَ نَصِيبَهُ مِنَ الْمُكَاتَبِ، إِنَّ ذَلِكَ لاَ يُثْبِتُ لَهُ مِنَ الْوَلاَءِ شَيْئًا، وَلَوْ كَانَتْ عَتَاقَةً لَثَبَتَ الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ مِنْهُمْ مِنْ رِجَالِهِمْ وَنِسَائِهِمْ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنَّهُمْ إِذَا أَعْتَقَ أَحَدُهُمْ نَصِيبَهُ ثُمَّ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ، لَمْ يُقَوَّمْ عَلَى الَّذِي أَعْتَقَ نَصِيبَهُ مَا بَقِيَ مِنَ الْمُكَاتَبِ، وَلَوْ كَانَتْ عَتَاقَةً قُوِّمَ عَلَيْهِ، حَتَّى يَعْتِقَ فِي مَالِهِ، كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ الْعَدْلِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ[٢].

قَالَ: وَمِمَّا يبَيِّنُ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنَّ مِنْ سُنَّةِ الْمُسْلِمِينَ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا، أَنَّ مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي مُكَاتَبٍ، لَمْ يُعْتَقْ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ وَلَوْ عَتَقَ عَلَيْهِ، كَانَ الْوَلاَءُ لَهُ دُونَ شُرَكَائِهِ.

قَالَ: وَمِمَّا يُبَيِّنُ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنَّ مِنْ سُنَّةِ الْمُسْلِمِينَ: أَنَّ الْوَلاَءَ لِمَنْ عَقَدَ الْكِتَابَةَ، وَأَنَّهُ لَيْسَ لِمَنْ وَرِثَ سَيِّدَ الْمُكَاتَبِ مِنَ النِّسَاءِ مِنْ وَلاَءِ الْمُكَاتَبِ، وَإِنْ أَعْتَقْنَ نَصِيبَهُنَّ شَيْءٌ، إِنَّمَا وَلاَؤُهُ لِوَلَدِ سَيِّدِ الْمُكَاتَبِ الذُّكُورِ، أَوْ عَصَبَتِهِ مِنَ الرِّجَالِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە (بەشەریکایەتی) لە نێوان دوو کەسدا بێت، جا یەکێکیان پارەی نووسراوپێدانەکەی بۆ کۆیلە نووسراوپێدراوەکە واز لێ هێنا (گوتی وەریناگرم)، ئەوەی دیکەشیان ڕازی نەبوو (بۆ بەشەکەی خۆی)، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە دەمرێت و سەروەت جێ دێڵێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەسەی بەشی خۆی بۆ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥٤ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥٦ في المكاتب، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥٧ في المكاتب، عن مالك به.

جێ نەهێشتووە چەندی لەسەر ماوە وەریدەگرێتەوە، دواتر سەروەتەکە دابەش دەکەن وەك ئەوەی کۆیلەیەك مردبێ، چونکە ئەوەی کەسەکە کردوویەتی لە لێخۆشبوونی پارەکەی خۆی ئەوە ئازادبوون نییە، تەنها وازی لەو مافە هێناوە کە لەسەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە هەیەتی.

ئیمامی مالیك ﷀ گوتوویەتی: ئەوەی ئەو بابەتە ڕوون دەکاتەوە ئەوەیە: ئەگەر کەسێك بمرێت و کۆیلەیەکی نووسراوپێدراو و منالّی کوڕ و کچ جێ بهێلّێت، دواتر یەکێك لە منالّەکان پشکی خۆی لە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە ئازاد بکات، ئەوە هیچی لە وەلاء بۆ دانامەزرێت (چونکە ئەوە ئازادکردن نییە لێخۆشبوونە)، جا ئەگەر ئازادکردن بووایە ئەوە وەلاء بۆ ئەو کەسە دادەمەزرا کە ئازادی کردووە لە پیاو و ئافرەتەکان (بەلّام ئەوە تەنها لێخۆشبوونە لە پارە، نەك ئازادکردن).

ئیمامی مالیك ﷀ گوتوویەتی: وە ئەوەی دیسان ئەو بابەتە ڕوون دەکاتەوە ئەوەیە: ئەگەر یەکێك لە منالّەکانی مردووەکە پشکەکەی خۆی ئازاد بکات (بلّێت من پارەکەی لێ وەرناگرم)، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە نەتوانێت پارەی ئەوانی دیکە بدات، ئەوە ئەوەی ماوەتەوە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە نانرخێندرێت بەسەر ئەو کەسەی پشکەکەی خۆی ئازاد کردووە لە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە (تا بیکڕێتەوە و بەتەواوی ئازادی بکات)، (چونکە) ئەگەر ئازادکردن بووایە بەسەریدا دەنرخێندرا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پشکی هاوبەشی خۆی ئازاد بکات لە کۆیلەیەکدا، ئەوە کۆیلەکەی بە نرخێکی گونجاو بەسەردا دەنرخێندرێت (دەبێ بەتەواوی بیکڕێتەوە و ئازادی بکات)، جا ئەگەر پارە و سەروەتی نەبوو ئەوە هەر ئەو بەشە ئازاد دەبێت کە ئازادی کردووە.

ئیمامی مالیك ﷀ گوتوویەتی: وە ئەوەی دیسان ئەو بابەتە ڕوون دەکاتەوە ئەوەیە: یەکێك لە ڕێبازی مسولّمانان کە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: هەر کەسێك بەشێکی هاوبەشی خۆی لە کۆیلەیەکی نووسراوپێدراو ئازاد بکات، ئەوە لە مالّی کەسەکە بەتەواوی ئازاد ناکرێت، ئەگەر بەتەواوی بەسەریدا ئازاد بکرایە ئەوە وەلائەکەی بۆ ئەو دەبوو بەتەنها بەبێ شەریکەکانی.

ئیمامی مالیك  گوتوویەتی: وە ئەوەی دیسان ئەو بابەتە ڕوون دەكاتەوە ئەوەیە: یەكێك لە ڕێبازی مسوڵمانان ئەوەیە: وەلاء بۆ ئەو كەسەیە كە گرێبەستی نووسراوپێدان ئەنجام دەدات، لە كاتێكدا ئەو ئافرەتەی میرات لە گەورەكە دەگرێت وەلائی كۆیلە نووسراوپێدراوەكەی بۆ نییە، هەرچەندە ئافرەتەكان پشكی خۆشیان ئازاد كردبێ، بەڵكوو وەلائەكەی بۆ منالی گەورەكەیە لە كوڕەكان یان بۆ عەصەبەی پیاوە (كەواتە ئەگەر ئازادكردن بووایە ئافرەتیش بۆی هەبوو وەلاءْ وەربگرێت كەچی بۆی نییە).

## ١١- ئەوەی دروست نییە لە ئازادكردنی كۆیلەی نووسراوپێدراو[١]

**٢٣٣٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ : إِذَا كَانَ الْقَوْمُ جَمِيعًا فِي كِتَابَةٍ وَاحِدَةٍ، لَمْ يُعْتِقْ سَيِّدُهُمْ أَحَدًا مِنْهُمْ دُونَ مُؤَامَرَةِ أَصْحَابِهِ الَّذِينَ مَعَهُ فِي الْكِتَابَةِ وَرِضًا مِنْهُمْ، وَإِنْ كَانُوا صِغَارًا، فَلَيْسَ مُؤَامَرَتُهُمْ بِشَيْءٍ، وَلاَ يَجُوزُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ[٢].

قَالَ: وَذَلِكَ أَنَّ الرَّجُلَ رُبَّمَا كَانَ يَسْعَى عَلَى جَمِيعِ الْقَوْمِ، وَيُؤَدِّي عَنْهُمْ كِتَابَتَهُمْ لِتَتِمَّ بِهِ عَتَاقَتُهُمْ، فَيَعْمِدُ السَّيِّدُ إِلَى الَّذِي يُؤَدِّي عَنْهُمْ، وَبِهِ نَجَاتُهُمْ مِنَ الرِّقِّ، فَيُعْتِقُهُ، فَيَكُونُ ذَلِكَ عَجْزًا لِمَنْ بَقِيَ مِنْهُمْ، وَإِنَّمَا أَرَادَ بِذَلِكَ الْفَضْلَ وَالزِّيَادَةَ لِنَفْسِهِ، فَلاَ يَجُوزُ ذَلِكَ عَلَى مَنْ بَقِيَ مِنْهُمْ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ، وَهَذَا أَشَدُّ الضَّرَرِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك  گوتوویەتی: ئەگەر كۆمەڵە كۆیلەیەك لە یەك گرێبەستی نووسراوپێداندا بوون، ئەوە گەورەكەیان نابێ كەس ئازاد بكات بەبێ پرس و ڕاوێژكردن و ڕەزامەندی ئەو هاوەڵانەی كە لەگەڵین لە نووسراوپێدانەكەدا، وە ئەگەر كۆیلەكان بچووك بوون ئەوە پرس و ڕاوێژكردن پێیان حیسابی بۆ ناكرێ و نابێ كۆیلە ئازادكردنەكەیان بەسەردا جێبەجێ بكرێت.

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنْ عِتْقِ الْمُكَاتَبِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥٩ في المكاتب، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەبەر ئەوەی ڕەنگە ئەو کەسەی ئازاد دەکرێت کار و کۆشش بۆ گشتیان بکات و پارەی نووسراوپێدانی گشتیان بدات تا بەهۆیەوە ئازاد بین، جا گەورەکەی بەئەنقەست دەست بۆ ئەوەیان ببات کە پارەی ئەوانی پێ دەدرێت و ڕزگاربوونیان لە کۆیلایەتی بەهۆی ئەوەوە دەبێت، جا بیەوێ ئازادی بکات تا ببێتە دەسەوسان بۆ ئەوانەی دەمێننەوە، تەنها مەبەستیشی بەوە پارەی زیاتر بێت بۆ خۆی، جا ئەوە دروست نییە و ڕێگەپێدراو نییە بەوەی بەسەر ئەوانەی دیکەدا جێبەجێ بکرێت لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێ نە زیان بدرێت و نە زیانیش بە زیان وەڵام بدرێتەوە، ئەو بابەتەش توندترین و زۆرترین زیانە (کەواتە دروست نییە).

**٢٣٣٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْعَبِيدِ يُكَاتَبُونَ جَمِيعًا: إِنَّ لِسَيِّدِهِمْ أَنْ يُعْتِقَ مِنْهُمُ الْكَبِيرَ الْفَانِيَ، وَالصَّغِيرَ الَّذِي لاَ يُؤَدِّي وَاحِدٌ مِنْهُمَا شَيْئًا، وَلَيْسَ عِنْدَ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَوْنٌ وَلاَ قُوَّةٌ فِي كِتَابَتِهِمْ، فَذَلِكَ جَائِزٌ لَهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆمەڵە کۆیلەیەك کە بەیەکەوە یەك گرێبەستی نووسراوپێدانیان بۆ بکرێ گوتوویەتی: گەورەکەیان بۆی هەیە پیر و بەتەمەن و بچووکەکەیان کە هیچیان ناتوانن هیچ پارە کۆ بکەنەوە و بیدەن و هیچیان یارمەتیدەر و هێزی نییە بۆ دانی پارەی نووسراوپێدانەکە (بۆ گەورەکە هەیە ئەو دووانە) ئازاد بکات و ئەوەی بۆ دروستە.

## ١٢- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی ئازادبوونی کۆیلەی نووسراوپێدراو و دایکی منداڵەکەی[٢]

**٢٣٣٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُكَاتِبُ عَبْدَهُ، ثُمَّ يَمُوتُ الْمُكَاتَبُ وَيَتْرُكُ أُمَّ وَلَدٍ، وَقَدْ بَقِيَتْ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ بَقِيَّةٌ، وَيَتْرُكُ وَفَاءً بِمَا عَلَيْهِ: إِنَّ أُمَّ وَلَدِهِ أَمَةٌ مَمْلُوكَةٌ حِينَ لَمْ يُعْتَقِ الْمُكَاتَبُ حَتَّى مَاتَ، وَلَمْ يَتْرُكْ وَلَدًا، فَيُعْتَقُونَ بِأَدَاءِ مَا بَقِيَ، فَتُعْتَقُ أُمُّ وَلَدِ أَبِيهِمْ بِعِتْقِهِمْ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦١ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي عِتْقِ الْمُكَاتَبِ وَأُمِّ وَلَدِهِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦٢ في المكاتب، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە گرێبەستی نووسراوپێدان بۆ کۆیلەکەی دەکات، دواتر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە دەمرێت و دایکی منداڵ جێ دێڵێت، لە کاتێکدا هەندێك لە پارەی نووسراوپێدانەکەی لەسەر ماوە و سەروەتیشی بای ئەوە جێ هێشتووە ئەوەی لەسەری ماوە لە نووسراوپێدانەکە پێی بدرێتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دایکی منداڵەکەی هەر بەکۆیلەیی دەمێنێتەوە کاتێ کۆیلە نووسراوپێدراوەکە ئازاد نەکرابێت تا مردووە و منداڵیشی جێ نەهێشتبێت، (جا هەر بەکۆیلەیی دەمێنێتەوە تەنها لەو کاتە نەبێت کە پیاوەکە منداڵی هەبێت) و ئازاد بین بەهۆی دانی ئەو پارەیەی لەسەریان ماوە، (ئەو کات) دایکی منداڵەکان بەهۆی ئازادبوونی ئەوان ئازاد دەبێت.

**٢٣٣٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يُعْتِقُ عَبْدًا لَهُ أَوْ يَتَصَدَّقُ بِبَعْضِ مَالِهِ، وَلَمْ يَعْلَمْ بِذَلِكَ سَيِّدُهُ حَتَّى عَتَقَ الْمُكَاتَبُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَنْفُذُ ذَلِكَ عَلَيْهِ وَلَيْسَ لِلْمُكَاتَبِ أَنْ يَرْجِعَ فِيهِ، فَإِنْ عَلِمَ سَيِّدُ الْمُكَاتَبِ قَبْلَ أَنْ يَعْتِقَ الْمُكَاتَبُ، فَرَدَّ ذَلِكَ وَلَمْ يُجِزْهُ، فَإِنَّهُ إِنْ عَتَقَ الْمُكَاتَبُ وَذَلِكَ فِي يَدِهِ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ أَنْ يُعْتِقَ ذَلِكَ الْعَبْدَ، وَلاَ أَنْ يُخْرِجَ تِلْكَ الصَّدَقَةَ إِلاَّ أَنْ يَفْعَلَ ذَلِكَ طَائِعًا مِنْ عِنْدِ نَفْسِهِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە کۆیلەیەکی خۆی ئازاد بکات یان هەندێك لە ماڵەکەی بکاتە صەدەقە و خێر، گەورەکەشی نەزانێت تا ئەو کاتەی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە ئازاد دەبێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت و بۆ کۆیلە نووسراوپێدراوەکە نییە تیایدا پەشیمان بێتەوە، وە ئەگەر گەورەی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە زانی بەر لەوەی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە ئازاد ببێت، جا ڕەتی کردەوە و جێبەجێی نەکرد، ئەوە ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکەش ئازاد بێت لە کاتێکدا کۆیلەکە لەدەست گەورەکە بێت ئەوە لەسەری نییە کۆیلەکە ئازاد بکات و صەدەقە و خێرەکە دەربکات و ئەنجامی بدات مەگەر بە خۆشی خۆی ئەنجامی بدات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦٣ في المكاتب، عن مالك به.

## ١٣- وەسییەت دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو[١]

**٢٣٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا سَمِعْتُ فِي الْمُكَاتَبِ يُعْتِقُهُ سَيِّدُهُ عِنْدَ الْمَوْتِ: أَنَّ الْمُكَاتَبَ يُقَامُ عَلَى هَيْئَتِهِ تِلْكَ، الَّتِي لَوْ بِيعَ كَانَ ذَلِكَ الثَّمَنَ الَّذِي يَبْلُغُ، فَإِنْ كَانَتِ الْقِيمَةُ أَقَلَّ مِمَّا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ الْكِتَابَةِ، وُضِعَ ذَلِكَ فِي ثُلُثِ الْمَيِّتِ، وَلَمْ يُنْظَرْ إِلَى عَدَدِ الدَّرَاهِمِ الَّتِي بَقِيَتْ عَلَيْهِ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَوْ قُتِلَ لَمْ يَغْرَمْ قَاتِلُهُ إِلاَّ قِيمَتَهُ يَوْمَ قَتْلِهِ، وَلَوْ جُرِحَ لَمْ يَغْرَمْ جَارِحُهُ إِلاَّ دِيَةَ جَرْحِهِ يَوْمَ جَرَحَهُ، وَلاَ يُنْظَرُ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ إِلَى مَا كُوتِبَ عَلَيْهِ مِنَ الدَّنَانِيرِ وَالدَّرَاهِمِ، لأَنَّهُ عَبْدٌ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ شَيْءٌ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ أَقَلَّ مِنْ قِيمَتِهِ، لَمْ يُحْسَبْ فِي ثُلُثِ الْمَيِّتِ إِلاَّ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ، وَذَلِكَ، أَنَّهُ إِنَّمَا تَرَكَ الْمَيِّتُ لَهُ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ، فَصَارَتْ وَصِيَّةً أَوْصَى بِهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ، أَنَّهُ لَوْ كَانَتْ قِيمَةُ الْمُكَاتَبِ أَلْفَ دِرْهَمٍ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْ كِتَابَتِهِ إِلاَّ مِئَةُ دِرْهَمٍ، فَأَوْصَى سَيِّدُهُ لَهُ بِالْمِئَةِ دِرْهَمٍ الَّتِي بَقِيَتْ عَلَيْهِ، حُسِبَتْ لَهُ فِي ثُلُثِ سَيِّدِهِ، فَصَارَ حُرًّا بِهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە گەورەکەی لە کاتی مردن ئازادی دەکات ئەوەیە: کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، کە ئەگەر بفرۆشرێت نرخەکەی دەگاتە چەند، جا ئەگەر نرخەکەی کەمتر بوو لەوەی لەسەری ماوە لە پارەی نووسراوپێدانەکە، ئەوە لە سێیەکی ماڵی مردووەکە حیساب دەکرێت و سەیری ژمارەی ئەو درهەمانە ناکرێت کە لەسەری ماوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر بکوژرێ بکوژەکە هیچ نادات تەنها نرخەکەی نەبێت بەپێی نرخی ڕۆژی کوشتنەکە، وە ئەگەر بریندار بکرێت بریندارکەرەکە هیچ نادات تەنها خوێنبایی برینەکەی نەبێت بەپێی خوێنبایی ڕۆژی برینەکە (کەواتە لەو حاڵەتانە نرخی کۆیلەکە تەواو حیساب دەکرێت، واتە تەنها ئەو نرخە حیساب ناکرێت کە لە نووسراوپێدانەکە لەسەری ماوە)، وە سەیری هیچ شتێك ناکرێت لەوەی گرێبەستی نووسراوپێدانی

---

(١) ـ الْوَصِيَّةُ فِي الْمُكَاتَبِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦٤ في المكاتب، عن مالك به.

لەسەر کراوە لە دینار و درهەم، چونکە هەر کۆیلە حیسابە هەتا ئەو کاتەی شتێك لە پارەی نووسراوپێدانەکەی لەسەر مابێ، وە ئەگەر ئەوەی لەسەری ماوە لە نووسراوپێدانەکەی کەمتر بوو لە نرخی خۆی، ئەوە لە سێیەکی ماڵی مردووەکە حیساب ناکرێت تەنها بەئەندازەی ئەوە نەبێت کە لەسەری ماوە لە پارەی نووسراوپێدانەکە، لەبەر ئەوەی مردووەکە تەنها ئەوەی بۆ جێ هێشتووە کە لەسەری ماوە لە پارەی نووسراوپێدانەکە، جا ئەوە بۆتە وەسییەتەکە کە وەسییەتی بۆ کردووە (واتە وەسییەتەکەی بۆ ئەوە بووە ئازاد ببێت، جا کە بە کەمتر لە سێیەك ئازاد دەبێت ئەوە هەر ئەوەندەی پێ دەدرێت و ناکرێتە سێیەك).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە ئاوایە: ئەگەر نرخی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە هەزار دینار بێ و هیچ لە پارەی نووسراوپێدانەکەی لەسەر نەمابێ تەنها سەت درهەم نەبێ، گەورەکەشی وەسییەتی بەو سەت درهەمە بۆ کردبێ کە لەسەری ماوە، ئەوە لە سێیەکی ماڵی گەورەکەی حیساب دەکرێت و پێی ئازاد دەبێت.

**٢٣٤١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ كَاتَبَ عَبْدَهُ عِنْدَ مَوْتِهِ: إِنَّهُ يُقَوَّمُ عَبْدًا، فَإِنْ كَانَ فِي ثُلُثِهِ سَعَةٌ لِثَمَنِ الْعَبْدِ جَازَ لَهُ ذَلِكَ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنْ تَكُونَ قِيمَةُ الْعَبْدِ أَلْفَ دِينَارٍ، فَيُكَاتِبُهُ سَيِّدُهُ عَلَى مِائَتَيْ دِينَارٍ عِنْدَ مَوْتِهِ، فَيَكُونُ ثُلُثُ مَالِ سَيِّدِهِ أَلْفَ دِينَارٍ، فَذَلِكَ جَائِزٌ لَهُ، وَإِنَّمَا هِيَ وَصِيَّةٌ أَوْصَى لَهُ بِهَا فِي ثُلُثِهِ، فَإِنْ كَانَ السَّيِّدُ قَدْ أَوْصَى لِقَوْمٍ بِوَصَايَا، وَلَيْسَ فِي الثُّلُثِ فَضْلٌ عَنْ قِيمَةِ الْمُكَاتَبِ، بُدِئَ بِالْمُكَاتَبِ، لأَنَّ الْكِتَابَةَ عَتَاقَةٌ، وَالْعَتَاقَةُ تُبَدَّأُ عَلَى الْوَصَايَا، ثُمَّ تُجْعَلُ تِلْكَ الْوَصَايَا فِي كِتَابَةِ الْمُكَاتَبِ يَتْبَعُونَهُ بِهَا، وَيُخَيَّرُ وَرَثَةُ الْمُوصِي، فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ يُعْطُوا أَهْلَ الْوَصَايَا وَصَايَاهُمْ كَامِلَةً، وَتَكُونُ كِتَابَةُ الْمُكَاتَبِ لَهُمْ، فَذَلِكَ لَهُمْ، وَإِنْ أَبَوْا وَأَسْلَمُوا الْمُكَاتَبَ وَمَا عَلَيْهِ إِلَى أَهْلِ الْوَصَايَا، فَذَلِكَ لَهُمْ، لأَنَّ الثُّلُثَ صَارَ فِي الْمُكَاتَبِ، وَلأَنَّ كُلَّ وَصِيَّةٍ أَوْصَى بِهَا أَحَدٌ، فَقَالَ الْوَرَثَةُ: الَّذِي أَوْصَى بِهِ صَاحِبُنَا أَكْثَرُ مِنْ ثُلُثِهِ، وَقَدْ أَخَذَ مَا لَيْسَ لَهُ، قَالَ: فَإِنَّ وَرَثَتَهُ يُخَيَّرُونَ، فَيُقَالُ لَهُمْ: قَدْ أَوْصَى صَاحِبُكُمْ بِمَا قَدْ عَلِمْتُمْ، فَإِنْ أَحْبَبْتُمْ أَنْ تُنَفِّذُوا ذَلِكَ لأَهْلِهِ عَلَى مَا أَوْصَى بِهِ الْمَيِّتُ، وَإِلاَّ فَأَسْلِمُوا أَهْلَ الْوَصَايَا ثُلُثَ مَالِ الْمَيِّتِ كُلِّهِ.

قَالَ: فَإِنْ أَسْلَمَ الْوَرَثَةُ الْمُكَاتَبَ إِلَى أَهْلِ الْوَصَايَا، كَانَ لأَهْلِ الْوَصَايَا مَا عَلَيْهِ مِنَ الْكِتَابَةِ، فَإِنْ أَدَّى الْمُكَاتَبُ مَا عَلَيْهِ مِنَ الْكِتَابَةِ، أَخَذُوا ذَلِكَ فِي وَصَايَاهُمْ عَلَى قَدْرِ حِصَصِهِمْ، وَإِنْ عَجَزَ الْمُكَاتَبُ كَانَ عَبْدًا لأَهْلِ الْوَصَايَا، لاَ يَرْجِعُ إِلَى أَهْلِ الْمِيرَاثِ، لأَنَّهُمْ تَرَكُوهُ حِينَ خُيِّرُوا، وَلأَنَّ أَهْلَ الْوَصَايَا حِينَ أُسْلِمَ إِلَيْهِمْ ضَمِنُوهُ، فَلَوْ مَاتَ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ عَلَى الْوَرَثَةِ شَيْءٌ، وَإِنْ مَاتَ الْمُكَاتَبُ قَبْلَ أَنْ يُؤَدِّيَ كِتَابَتَهُ وَتَرَكَ مَالاً هُوَ أَكْثَرُ مِمَّا عَلَيْهِ، فَمَالُهُ لأَهْلِ الْوَصَايَا، وَإِنْ أَدَّى الْمُكَاتَبُ مَا عَلَيْهِ، عَتَقَ، وَرَجَعَ وَلاَؤُهُ إِلَى عَصَبَةِ الَّذِي عَقَدَ كِتَابَتَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە لە کاتی مردن گرێبەستی نووسراوپێدان بۆ کۆیلەکەی دەکات گوتوویەتی: کۆیلەکە دەنرخێندرێت، جا ئەگەر سێیەکی ماڵەکە بەشی نرخی کۆیلەکەی کرد، ئەوە بۆی جێبەجێ دەکرێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە ئاوایە: (بۆ نموونە) نرخی کۆیلەکە هەزار دینار بێت و گەورەکەشی لە کاتی مردنی لەسەر دوو سەت دینار گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ بکات و سێیەکی ماڵی گەورەکەشی هەزار دینار بێت، ئەوە (لە سێیەکەکەی) بۆ جێبەجێ دەکرێت، چونکە ئەوە وەسییەتێکە لە سێیەکی ماڵەکەی کردوویەتی، جا ئەگەر گەورەکە (جگە لە نووسراوپێدراوەکە) وەسییەتی بۆ کۆمەڵە خەڵکێك کرد و سێیەکەکەش زیاتر نەبوو لە نرخی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە، ئەوە سەرەتا بە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە دەست پێ دەکرێت، چونکە نووسراوپێدان ئازادکردنە، ئازادکردنیش بەر لە وەسییەت دەست پێ دەکرێت، دواتر ئەو وەسییەتانە دەخرێتە ناو نووسراوپێدانی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە لەوێوە داوای دەکەن، جا میراتگرانی وەسییەتکارەکە سەرپشکن: ئەگەر حەزیان کرد وەسییەتەکان بەتەواوی بدەنە ئەوانەی وەسییەتیان بۆ کراوە و نووسراوپێدانی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بۆ خۆیان بێت، ئەوەیان بۆ هەیە، وە ئەگەر ڕازی نەبوون و کۆیلە نووسراوپێدراوەکەیان تەسلیمی خاوەن وەسییەتەکان کرد، ئەوەشیان بۆ هەیە، چونکە سێیەکەکە کەوتۆتە ناو کۆیلە نووسراوپێدراوەکە، وە لەبەر ئەوەی هەر وەسییەتێك کە کەسێك بیکات و میراتگران بڵێن: ئەوەی خزمەکەمان وەسییەتی پێ کردووە زیاترە لە سێیەکی ماڵەکەی و سەروەتێکی بردووە هی خۆی نییە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی:

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦٦ في المكاتب؛ وأبو مصعب الزهري، ٢٨٧١ في المكاتب، كلهم عن مالك به.

میراتگرانی سەرپشكن و پێیان دەگوترێت: خزمەكەتان وەسییەتی بەوە كردووە كە خۆتان دەیزانن، جا ئەگەر حەز دەكەن بۆ خاوەنی وەسییەتەكان ئەوە جێبەجێ بكەن كە مردووەكە وەسییەتی پێ كردووە ئەوە ئەنجامی بدەن، ئەگەرنا تەواوی سێیەكی ماڵی مردووەكە تەسلیمی خاوەن وەسییەتەكان بكەن.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر میراتگرەكان كۆیلە نووسراوپێدراوەكەیان تەسلیمی خاوەن وەسییەتەكان كرد، ئەوە خاوەن وەسییەتەكان ئەو پارەیان بۆ هەیە كە لەسەر كۆیلەكە ماوە لە نووسراوپێدانەكەی، جا ئەگەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە ئەو پارەی دا كە لەسەری مابوو، ئەوە خاوەنی وەسییەتەكان هەر یەكە و بەگوێرەی پشكی وەسییەتەكەی لە پارەكە وەردەگرێ، جا ئەگەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە نەیتوانی پارەكە بدات، ئەوە دەبێتە كۆیلەی خاوەن وەسییەتەكان و ناگەڕێتەوە بۆ خاوەن میراتەكان، چونكە ئەوان خۆیان وازیان لە كۆیلەكە هێنا كاتێ سەرپشك كران، وە لەبەر ئەوەی خاوەنی وەسییەتەكان زامنی بوون كاتێ تەسلیمیان كرا، جا ئەگەر بمردبا خاوەنی وەسییەتەكان هیچیان بۆ نەبوو لەسەر میراتگران، وە ئەگەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە مرد بەر لەوەی پارەی نووسراوپێدانەكەی بدات و سەروەتێكیشی جێ هێشت زیاتر بوو لەوەی لەسەریەتی، ئەوە ماڵەكەی بۆ خاوەن وەسییەتەكانە، وە ئەگەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكە ئەو پارەیەی دا كە لەسەری ماوە، ئەوە ئازاد دەبێت، وەلائەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ عەصەبەی ئەو كەسەی گرێبەستی نووسراوپێدانی بۆ كردووە.

**٢٣٤٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يَكُونُ لِسَيِّدِهِ عَلَيْهِ عَشَرَةُ آلَافِ دِرْهَمٍ، فَيَضَعُ عَنْهُ عِنْدَ مَوْتِهِ أَلْفَ دِرْهَمٍ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُقَوَّمُ الْمُكَاتَبُ فَيُنْظَرُ كَمْ قِيمَتُهُ، فَإِنْ كَانَتْ قِيمَتُهُ أَلْفَ دِرْهَمٍ، فَالَّذِي وُضِعَ عَنْهُ عُشْرُ الْكِتَابَةِ، وَذَلِكَ فِي الْقِيمَةِ مِئَةُ دِرْهَمٍ، وَهُوَ عُشْرُ الْقِيمَةِ، فَيُوضَعُ عَنْهُ عُشْرُ الْكِتَابَةِ، فَيَصِيرُ ذَلِكَ إِلَى عُشْرِ الْقِيمَةِ نَقْدًا، وَإِنَّمَا ذَلِكَ كَهَيْئَتِهِ لَوْ وُضِعَ عَنْهُ جَمِيعُ مَا عَلَيْهِ، وَلَوْ فَعَلَ ذَلِكَ لَمْ يُحْسَبْ فِي ثُلُثِ مَالِ الْمَيِّتِ، إِلاَّ قِيمَةُ الْمُكَاتَبِ أَلْفُ دِرْهَمٍ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي وُضِعَ عَنْهُ نِصْفُ الْكِتَابَةِ، حُسِبَ فِي ثُلُثِ مَالِ الْمَيِّتِ نِصْفُ الْقِيمَةِ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرَ، فَهُوَ عَلَى هَذَا الْحِسَابِ[1].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦٨ في المكاتب، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كۆیلەی نووسراوپێدراو كە دە هەزار درهەمی گەورەكەی لەسەر بێ و گەورەكەی لە كاتی مردنیدا هەزار درهەمی لەسەر لابیا، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كۆیلە نووسراوپێدراوەكە دەنرخێندرێت و سەیر دەكرێت نرخەكەی چەندە، جا ئەگەر نرخەكەی هەزار درهەم بوو، كەواتە ئەوەی لەسەری لادراوە بریتییە لە دەیەكی نووسراوپێدانەكە، كە لە نرخەكەیدا بریتییە لە سەت درهەم كە دەیەكی نرخەكەیەتی (چونكە نرخەكەی هەزار دینار بوو)، كەواتە دەیەكی نووسراوپێدانەكەی لەسەر لادەبرێ كە دەكاتە دەیەكی قیمەتەكەی بەنەقدی و كاش، جا ئەوە بەو جۆر و حیسابەیە ئەگەر هەموو پارەكەشی لەسەر لابیا، جا ئەگەر ئەوەی كرد (گشت دە هەزارەكەی لەسەر لابرد) ئەوە لە گشت سێیەكی ماڵی مردووەكە حیساب ناكرێت تەنها بای نرخی كۆیلەكە نەبێت كە بریتییە لە هەزار درهەم، وە ئەگەر نیوەی نووسراوپێدانەكەی لەسەر لابرد (كە بریتییە لە پێنج هەزار درهەم)، ئەوە لە سێیەكەكە نیوەی نرخی كۆیلەكە حیساب دەكرێت، وە ئەگەر لە سێیەك كەمتر بوو یان زیاتر بوو ئەوە هەر بەو گوێرەیە حیساب دەكرێت.

**٢٣٤٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا وَضَعَ الرَّجُلُ عَنْ مُكَاتَبِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ أَلْفَ دِرْهَمٍ مِنْ عَشَرَةِ آلاَفِ دِرْهَمٍ، وَلَمْ يُسَمِّ أَنَّهَا مِنْ أَوَّلِ كِتَابَتِهِ أَوْ مِنْ آخِرِهَا، وُضِعَ عَنْهُ مِنْ كُلِّ نَجْمٍ عُشْرُهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر گەورەكە لە كاتی مردنی هەزار درهەمی لە دە هەزار درهەم لەسەر كۆیلە نووسراوپێدراوەكەی هەڵگرت و باسی نەكرد لێخۆشبوونی ئەو هەزارە لە سەرەتادا بێت یان لە كۆتایی، ئەوە لە هەر قیستێك دەیەك لادەبرێت (واتە هەزارەكە بەسەر گشت قیستەكان دابەش دەكرێت).

**٢٣٤٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا وَضَعَ الرَّجُلُ عَنْ مُكَاتَبِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ أَلْفَ دِرْهَمٍ مِنْ أَوَّلِ كِتَابَتِهِ أَوْ مِنْ آخِرِهَا، وَكَانَ أَصْلُ الْكِتَابَةِ عَلَى ثَلاَثَةِ آلاَفِ دِرْهَمٍ، قُوِّمَ الْمُكَاتَبُ قِيمَةَ النَّقْدِ، ثُمَّ قُسِمَتْ تِلْكَ الْقِيمَةُ، فَجُعِلَ لِتِلْكَ الأَلْفِ الَّتِي مِنْ أَوَّلِ الْكِتَابَةِ حِصَّتُهَا مِنْ تِلْكَ الْقِيمَةِ بِقَدْرِ قُرْبِهَا مِنَ الأَجَلِ وَفَضْلِهَا، ثُمَّ الأَلْفُ الَّتِي تَلِي الأَلْفَ الأُولَى بِقَدْرِ فَضْلِهَا أَيْضًا، ثُمَّ الأَلْفُ الَّتِي تَلِيهَا بِقَدْرِ فَضْلِهَا أَيْضًا، حَتَّى يُؤْتَى عَلَى آخِرِهَا، تَفْضُلُ كُلُّ أَلْفٍ بِقَدْرِ مَوْضِعِهَا فِي تَعْجِيلِ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦٩ في المكاتب، عن مالك به.

الأَجَلِ وَتَأْخِيرِهِ؛ لأَنَّ مَا اسْتَأْخَرَ مِنْ ذَلِكَ كَانَ أَقَلَّ فِي الْقِيمَةِ، ثُمَّ يُوضَعُ فِي ثُلُثِ الْمَيِّتِ قَدْرُ مَا أَصَابَ تِلْكَ الأَلْفَ مِنَ الْقِيمَةِ عَلَى تَفَاضُلِ ذَلِكَ، إِنْ قَلَّ أَوْ كَثُرَ، فَهُوَ عَلَى هَذَا الْحِسَابِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك لە کاتی مردنیدا هەزار درهەمی لادا لەسەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکەی لە سەرەتا یان لە کۆتایی، گرێبەستی نووسراوپێدانەکەش لەسەر سێ هەزار درهەم ئەنجام درابوو، ئەوە کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بە پارەی نەقد و کاش دەنرخێندرێت، دواتر ئەو نرخە دابەش دەکرێت و هەزار درهەمی یەکەم پشکی خۆی پێ دەدرێت لە نرخی کۆیلەکە بەئەندازەی نزیکیی لە دانی کاتی پارەکە و زیادەی پارەکە، دواتر ئەو هەزارەی دوای هەزاری یەکەم دێت بە هەمان شێوە بەئەندازەی زیادەکەی، دواتر ئەو هەزارەی دوای هەزاری دووەم دێت بە هەمان شێوە بەئەندازەی زیادەکەی، تا کۆتایی دێت، هەر هەزارێك دەبێ بەگوێرەی شوێنی زوو دان و درەنگ دان زیاد بکات، چونکە ئەوەی دوا دەخرێت نرخەکەی کەمترە، دواتر بەئەندازەی ئەوەی هەزارەکە بەری دەکەوێت لە نرخی کۆیلەکە لە سێیەکی مردووەکە دەدرێت بەپێی زۆری و کەمی، ئەگەر زۆر بوو یان کەم بوو هەر بەو گوێرەیە.

**٢٣٤٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ أَوْصَى لِرَجُلٍ بِرُبُعِ مُكَاتَبٍ لَهُ وَأَعْتَقَ رُبُعَهُ، فَهَلَكَ الرَّجُلُ، ثُمَّ هَلَكَ الْمُكَاتَبُ وَتَرَكَ مَالاً كَثِيراً أَكْثَرَ مِمَّا بَقِيَ عَلَيْهِ، قَالَ مَالِكٌ: يُعْطَى وَرَثَةُ السَّيِّدِ وَالَّذِي أَوْصَى لَهُ بِرُبُعِ الْمُكَاتَبِ، مَا بَقِيَ لَهُمْ عَلَى الْمُكَاتَبِ، ثُمَّ يَقْتَسِمُونَ مَا فَضَلَ، فَيَكُونُ لِلْمُوصَى لَهُ بِرُبُعِ الْمُكَاتَبِ ثُلُثُ مَا فَضَلَ بَعْدَ أَدَاءِ الْكِتَابَةِ، وَلِوَرَثَةِ سَيِّدِهِ الثُّلُثَانِ، وَذَلِكَ أَنَّ الْمُكَاتَبَ عَبْدٌ، مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ كِتَابَتِهِ شَيْءٌ، فَإِنَّمَا يُورَثُ بِالرِّقِّ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە وەسییەت بۆ کەسێك دەکات بە چواریەکی کۆیلە نووسراوپێدراوەکەی و بە ئازادبوونی چواریەکیشی، جا پیاوەکە بمرێت، دواتریش کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بمرێت و سەروەتێکی زۆر دوای خۆی جێ بهێڵێت کە زیاتر بێت لەوەی لەسەریەتی، ئیمامی مالیك

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧٠ في المكاتب، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧٢ في المكاتب؛ وفي: ٢٨٧٣ في المكاتب، عن مالك به.

ﷺ گوتوویەتی: میراتگرانی گەورەکە و ئەو کەسەش کە وەسییەتی بۆکراوە بە چواریەك لەو پارەیەیان پێ دەدرێت کە لەسەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە مابوو، دواتر ئەوەی زیاد بوو دابەشی دەکەن، جا ئەو کەسەی وەسییەتی بە چواریەکی کۆیلە نووسراوپێدراوەکە بۆ کراوە سێیەکی زیادەکەی بۆ هەیە دوای جێبەجێکردنی پارەی نووسراوپێدانەکە، وە بۆ میراتگرانی گەورەکەش دوو لەسەر سێ هەیە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کۆیلەی نووسراوپێدراو هەر کۆیلەیە تا شتێك لە پارەی نووسراوپێدانی لەسەر مابێ، جا بە (ڕێگەی) کۆیلایەتی میراتی لێ دەگیرێت.

٢٣٤٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي مُكَاتَبٍ أَعْتَقَهُ سَيِّدُهُ عِنْدَ الْمَوْتِ قَالَ: إِنْ لَمْ يَحْمِلْهُ ثُلُثُ الْمَيِّتِ عَتَقَ مِنْهُ قَدْرُ مَا حَمَلَ الثُّلُثُ، وَيُوضَعُ عَنْهُ مِنَ الْكِتَابَةِ قَدْرُ ذَلِكَ، إِنْ كَانَ عَلَى الْمُكَاتَبِ خَمْسَةُ آلاَفِ دِرْهَمٍ، وَكَانَتْ قِيمَتُهُ أَلْفَيْ دِرْهَمٍ نَقْدًا، وَيَكُونُ ثُلُثُ الْمَيِّتِ أَلْفَ دِرْهَمٍ، عَتَقَ نِصْفُهُ وَيُوضَعُ عَنْهُ شَطْرُ الْكِتَابَةِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو کە گەورەکەی لە کاتی مردن ئازادی دەکات، گوتوویەتی: ئەگەر لە سێیەکی ماڵەکەی جێگای نەدەبۆیەوە، ئەوە بەگوێرەی سێیەکی ماڵەکەی ئازاد دەبێت و بەو ئەندازەیە پارەی نووسراوپێدانەکەی لەسەر لادەچێ، (بۆ نموونە): ئەگەر کۆیلە نووسراوپێدراوەکە پێنج هەزار درهەمی لەسەر بوو و خۆیشی نرخەکەی دوو هەزار درهەمی کاش بوو و سێیەکی ماڵی مردووەکەش هەزار درهەم بوو، ئەوە نیوەی ئازاد دەبێت و نیوەی پارەی نووسراوپێدانەکەی لەسەر لادەبرێت.

٢٣٤٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ قَالَ فِي وَصِيَّتِهِ: غُلاَمِي فُلاَنٌ حُرٌّ، وَكَاتِبُوا فُلاَنًا، تُبَدَّأُ الْعَتَاقَةُ عَلَى الْكِتَابَةِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە لە وەسییەتەکەی گوتبێتی: فڵان کۆیلەم ئازاد بێت و گرێبەستی ئازادبوونیش بۆ فڵان کۆیلە بکەن، گوتوویەتی: ئازادکردن (ی ڕاستەوخۆ) پێش دەخرێت بەسەر گرێبەستی ئازادکردن و نووسراوپێدانی ئازادکردن.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧٤ في المكاتب، عن مالك به.



# پەرتووكی

# كۆیلەی چاوەڕوانكراو[1]



---

(١) ـ كِتَابُ الْمُدَبَّرِ.

## ١- بڕیاری شەرعی دەربارەی مناڵی کۆیلەی چاوەڕوانکراو[١]

**٢٣٤٨- [فتوى]** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَنْ دَبَّرَ جَارِيَةً لَهُ، فَوَلَدَتْ أَوْلاَدًا بَعْدَ تَدْبِيرِهِ إِيَّاهَا، ثُمَّ مَاتَتِ الْجَارِيَةُ قَبْلَ الَّذِي دَبَّرَهَا: إِنَّ وَلَدَهَا بِمَنْزِلَتِهَا، قَدْ ثَبَتَ لَهُمْ مِنَ الشَّرْطِ مِثْلُ الَّذِي ثَبَتَ لَهَا، وَلاَ يَضُرُّهُمْ هَلاَكُ أُمِّهِمْ، فَإِذَا مَاتَ الَّذِي كَانَ دَبَّرَهَا فَقَدْ عَتَقُوا، إِنْ وَسِعَهُمُ الثُّلُثُ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم گوتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی جارییەیەکی خۆی بەچاوەڕوانکراوی ئازاد دەکات (بەوەی دوای مردنی خۆی کۆیلەکەی ئازاد ببێت)، جا چەند مناڵێکی ببێت دوای بڕیاردانی ئازادکردنی بەچاوەڕوانکراوی، دواتر جارییەکە بمرێت پێش ئەو کەسەی بەچاوەڕوانکراوی ئازادی کردووە، گوتوویەتی: مناڵەکانی ئافرەتەکە وەك ئافرەتەکە وان، ئەو مەرجەیان بۆ دادەمەزرێ کە بۆ دایکی دامەزرابوو (کە بریتی بوو لە ئازادبوونی دوای مردنی گەورەکەی)، جا مردنی دایکیان زەرەریان پێ ناگەیەنێ (لە بابەتی ئازادبوونیان)، کەواتە ئەگەر ئەو کەسە مرد کە دایکی ئازاد کردووە بە مەرجی چاوەڕوانی، ئەوە مناڵەکان ئازاد دەبن ئەگەر لە سێیەکی سەروەتی گەورەکەیان جێگەیان ببێتەوە.

**٢٣٤٩- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: كُلُّ ذَاتِ رَحِمٍ فَوَلَدُهَا بِمَنْزِلَتِهَا، إِنْ كَانَتْ حُرَّةً فَوَلَدَتْ بَعْدَ عِتْقِهَا، فَوَلَدُهَا أَحْرَارٌ، وَإِنْ كَانَتْ مُدَبَّرَةً، أَوْ مُكَاتَبَةً، أَوْ مُعْتَقَةً إِلَى سِنِينَ، أَوْ مُخْدَمَةً، أَوْ بَعْضَهَا حُرًّا، أَوْ مَرْهُونَةً، أَوْ أُمَّ وَلَدٍ، فَوَلَدُ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ عَلَى مِثَالِ حَالِ أُمِّهِ، يَعْتِقُونَ بِعِتْقِهَا وَيَرِقُّونَ بِرِقِّهَا[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گشت ئافرەتێکی مناڵبوو مناڵەکانی وەك خۆیەتی، ئەگەر ئازاد ببێت و مناڵی ببێت دوای ئازادکردن، ئەوە مناڵەکانی

---

(١) ـ الْقَضَاءُ فِي وَلَدِ الْمُدَبَّرِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٥ في المدبر، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٦ في المدبر، عن مالك به.

ئازادن، وە ئەگەر بەچاوەڕوانکراوی ئازاد کرا (بەوەی دوای مردنی گەورەکەی ئازاد ببێت) یان بەنووسراوپێدراوی ئازاد کرا (بەوەی پارە پەیدا بکات و خۆی بکڕێتەوە) یان بەوەی بەڵێنی پێ درا دوای چەند ساڵی دیکە ئازاد ببێت یان بە مەرجی خزمەتکردنی کەسێك ئازاد ببێت یان بەشێکی ئازاد بکرێت یان کرابێتە ڕەهن یان منالی لە گەورەکەی بووبێت، ئەوە منالی هەر یەکێك لەوانە وەك دایکیان وان، ئازاد دەبن بە ئازادبوونی دایکیان، وە دەبنە کۆیلە بەهۆی بوونەکۆیلەی دایکیان.

**٢٣٥٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي مُدَبَّرَةٍ دُبِّرَتْ وَهِيَ حَامِلٌ وَلَمْ يَعْلَمْ سَيِّدُهَا بِحَمْلِهَا: إِنَّ وَلَدَهَا بِمَنْزِلَتِهَا، وَإِنَّمَا ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ رَجُلٍ أَعْتَقَ جَارِيَةً لَهُ وَهِيَ حَامِلٌ، وَلَمْ يَعْلَمْ بِحَمْلِهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَالسُّنَّةُ فِيهَا: أَنَّ وَلَدَهَا يَتْبَعُهَا وَيَعْتِقُ بِعِتْقِهَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی چاوەڕوانکراو کە دووگیانە و گەورەکەی بە دووگیانییەکەی نەزانیوە، گوتوویەتی: منالی ئافرەتەکە وەك ئافرەتەکە وایە، ئەو بابەتە وەك ئەوە وایە پیاوێك جارییەکەی خۆی ئازاد بکات لە کاتێکدا جارییەکە دووگیان بێت و گەورەکەی بە دووگیانییەکەی نەزانیبێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازەکە دەربارەی ئەو بابەتە ئاوایە: منالی ئافرەتەکە شوێن ئافرەتەکە دەکەوێت و بە ئازادبوونی ئافرەتەکە ئازاد دەبێت.

**٢٣٥١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً ابْتَاعَ جَارِيَةً وَهِيَ حَامِلٌ، فَالْوَلِيدَةُ وَمَا فِي بَطْنِهَا لِمَنِ ابْتَاعَهَا، اشْتَرَطَ ذَلِكَ الْمُبْتَاعُ أَوْ لَمْ يَشْتَرِطْهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَحِلُّ لِلْبَائِعِ أَنْ يَسْتَثْنِيَ مَا فِي بَطْنِهَا، لأَنَّ ذَلِكَ غَرَرٌ، يَضَعُ مِنْ ثَمَنِهَا، وَلاَ يَدْرِي أَيَصِلُ ذَلِكَ إِلَيْهِ أَمْ لاَ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ مَا لَوْ بَاعَ جَنِينًا فِي بَطْنِ أُمِّهِ، وَذَلِكَ لاَ يَحِلُّ لَهُ، لأَنَّهُ غَرَرٌ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەهەمان شێوە: ئەگەر پیاوێك جارییەیەك بکڕێت لە کاتێکدا دووگیانە، ئەوە ئافرەتەکە و ئەو منالەشی کە لە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٧ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٨ في المدبر، عن مالك به.




سکیدایە بۆ ئەو کەسەیە کە ئافرەتەکەی کڕیوە، (چون یەکە) کڕیارەکە ئەوە بە مەرج دابنێت یان بە مەرجی دانەنێت (هەر دەبێتە هی ئەو)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: حەڵاڵ و دروست نییە بۆ فرۆشیارەکە منالەکەی ناو سکی ئافرەتە کۆیلەکە جیا بکاتەوە (لە فرۆشتندا)، چونکە ئەوە مامەڵەی نادیارە، لە نرخی ئافرەتەکە کەم دەکاتەوە (بە کەمتر دەیفرۆشێت بەهۆی جیاکردنەوەی منالەکە لە مامەڵەکەدا)، ناشزانیٚ ئایا پێی دەگات یان نا (واتە نازانیٚ کە ئاخۆ بەزیندوویی پێی دەگات یان نا)، جا ئەو بابەتە وەك ئەوە وایە کۆرپەلەیەك لە سکی دایکی بە جیا بفرۆشێت، جا ئەوەی بۆ حەڵاڵ نییە، چونکە مامەڵەی نادیارە (کەواتە بە هیچ شێوەیەك جیاکردنەوەی کۆرپەلەی ناو سك دروست نییە لە مامەڵەدا).

**٢٣٥٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي مُكَاتَبٍ أَوْ مُدَبَّرٍ ابْتَاعَ أَحَدُهُمَا جَارِيَةً، فَوَطِئَهَا، فَحَمَلَتْ مِنْهُ وَوَلَدَتْ، قَالَ: وَلَدُ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ جَارِيَتِهِ بِمَنْزِلَتِهِ، يَعْتِقُونَ بِعِتْقِهِ، وَيَرِقُّونَ بِرِقِّهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِذَا أُعْتِقَ هُوَ، فَإِنَّمَا أُمُّ وَلَدِهِ مَالٌ مِنْ مَالِهِ، يُسَلَّمُ إِلَيْهِ إِذَا أُعْتِقَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو و کۆیلەی چاوەڕوانکراو کە یەکێك لەوان جارییەیەك بکڕن و جیماعی لەگەڵ بکەن و جارییەکە حەملی لیٚ پەیدا ببێت و منالی ببێت، گوتوویەتی: جارییەی هەردووکیان حوکمیان وەك خۆیانە، ئازاد دەبن بە ئازادبوونی پیاوە کۆیلەکانیان، وە دەبن بە کۆیلە بەهۆی بەکۆیلەبوونی پیاوەکانیان.

## ٢- بابەتی جۆراوجۆر لەوەی هاتووە دەربارەی کۆیلەی چاوەڕوانکراو[2]

**٢٣٥٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي مُدَبَّرٍ قَالَ لِسَيِّدِهِ: عَجِّلْ لِي الْعِتْقَ، وَأُعْطِيكَ خَمْسِينَ دِينَارًا مُنَجَّمَةً عَلَيَّ، فَقَالَ سَيِّدُهُ: نَعَمْ، أَنْتَ حُرٌّ، وَعَلَيْكَ خَمْسُونَ دِينَارًا، تُؤَدِّي إِلَيَّ كُلَّ عَامٍ عَشَرَةَ دَنَانِيرَ، فَرَضِيَ بِذَلِكَ الْعَبْدُ، ثُمَّ هَلَكَ السَّيِّدُ بَعْدَ ذَلِكَ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٩ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي التَّدْبِيرِ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: يَثْبُتُ لَهُ الْعِتْقُ، وَصَارَتِ الْخَمْسُونَ دِينَارًا دَيْنًا عَلَيْهِ، وَجَازَتْ شَهَادَتُهُ، وَثَبَتَتْ حُرْمَتُهُ، وَمِيرَاثُهُ، وَحُدُودُهُ، وَلاَ يَضَعُ عَنْهُ مَوْتُ سَيِّدِهِ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ الدَّيْنِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی كۆیلەی چاوەڕوانكراو كە بە گەورەكەی بڵێت: ئازادكردنم پێش بخە، منیش پەنجا دینارت پێ دەدەم با ببێتە قیست لەسەرم، گەورەكەشی بڵێت: باشە ڕازیم، تۆ ئازادیت و پەنجا دینارت لەسەرە، هەر ساڵێك دە دینار بدە (تا تەواو دەبێت)، دواتر دوای یەك ڕۆژ یان دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ گەورەكەی بمرێت.

ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی حاڵەتی ئەو كۆیلەیە گوتوویەتی: ئازادبوونی بۆ جێبەجێ دەبێت و، پەنجا دینارەكەش دەبێتە قەرز لەسەری و شاهێدیشی قبووڵە، وە حورمەت و میرات و سزا شەرعییەكانی بۆ دادەمەزرێت (قابیلی ئەو شتانە دەبێت كە كەسی ئازاد دەگرێتەوە)، وە مردنی گەورەكەی هیچ لە قەرزەكەی لەسەر لانادات (واتە نابێ بڵێت من پێشتر ئازادكراوی چاوەڕوانكراو بووم ئێستاش گەورەكەم مردووە پارە نادەم، نەخێر، چونكە بەر لە مردنی گەورەكەی بابەتەكەی گۆڕاوە).

**٢٣٥٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي رَجُلٍ دَبَّرَ عَبْدًا لَهُ، فَمَاتَ السَّيِّدُ، وَلَهُ مَالٌ حَاضِرٌ وَمَالٌ غَائِبٌ، فَلَمْ يَكُنْ فِي مَالِهِ الْحَاضِرِ مَا يَخْرُجُ فِيهِ الْمُدَبَّرُ، قَالَ: يُوقَفُ الْمُدَبَّرُ بِمَالِهِ، وَيُجْمَعُ خَرَاجُهُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ مِنَ الْمَالِ الْغَائِبِ، فَإِنْ كَانَ فِيمَا تَرَكَ سَيِّدُهُ، مِمَّا يَحْمِلُهُ الثُّلُثُ، عَتَقَ بِمَالِهِ، وَبِمَا جُمِعَ مِنْ خَرَاجِهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيمَا تَرَكَ سَيِّدُهُ مَا يَحْمِلُهُ، عَتَقَ مِنْهُ قَدْرُ الثُّلُثِ، وَتُرِكَ مَالُهُ فِي يَدَيْهِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مـالیك ﵀ دەربارەی ئەو كەسەی كۆیلەیەك بە چاوەڕوانكراوی ئازاد دەكات و گەورەكە دەمرێت، لە كاتێكدا سەروەت و ماڵی بەردەست و غائیبی هەیە، جا نەكرێت لە ماڵە بەردەستەكە كۆیلەكە ئازاد بكرێت

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧٠ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧١ في المدبر، عن مالك به.

(بەشی ئەوە نەكات)، گوتوویەتی: ئازادكردنی كۆیلەكە ڕادەگیرێت لەسەر ماڵ و سەروەتەكە و گشت سەروەتی گەورەكە كۆ دەكرێتەوە تا دەربكەوێت لە ماڵە غائیبەكە (كە ئاخۆ بەشی ئازادكردن دەكات یان نا)، جا ئەگەر لەو سەروەتەی كە گەورەكەی دوای خۆی جێی هێشتووە سێیەك دەرچوو (بۆ كۆیلەئازادكردنەكە)، ئەوە بەهۆی ماڵ و سەروەتەكەوە ئازاد دەبێت، وە ئەگەر لەوەی گەورەكەی جێی هێشتووە جێی نەبۆیەوە (نرخی كۆیلەكە لە سێیەكی ماڵەكە زیاتر بوو)، ئەوە سێیەكی كۆیلەكە ئازاد دەبێت و ماڵەكەشی لەدەستی خۆی دەهێڵدرێتەوە و وازی لێ دەهێنرێت.

### ٣- وەسییەت دەربارەی ئازادكردنی كۆیلە بەچاوەڕوانكراوی[1]

**٢٣٥٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ كُلَّ عَتَاقَةٍ أَعْتَقَهَا رَجُلٌ، فِي وَصِيَّةٍ أَوْصَى بِهَا فِي صِحَّةٍ أَوْ مَرَضٍ: أَنَّهُ يَرُدُّهَا مَتَى شَاءَ، وَيُغَيِّرُهَا مَتَى شَاءَ، مَا لَمْ يَكُنْ تَدْبِيراً، فَإِذَا دَبَّرَ، فَلاَ سَبِيلَ لَهُ إِلَى رَدِّ مَا دَبَّرَ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: هەر ئازادكردنێك كە كەسێك ئەنجامی بدات لە وەسییەتدا لە حاڵەتی ساغیدا یان لە حاڵەتی نەخۆشیدا، گوتوویەتی: هەر كاتێك بیەوێت بابەتەكە ڕەت دەكاتەوە، وە هەر كاتێكیش بیەوێ دەیگۆڕێت، مادەم ئازادكردنی چاوەڕوانكراو نەبێت، چونكە ئەگەر كۆیلەی بەچاوەڕوانكراوی ئازاد كرد، ئەوە هیچ ڕێگەیەكی بۆ نییە بۆ ڕەتكردنەوەی ئەو كۆیلەی ئازادی كردووە بەچاوەڕوانكراوی.

**٢٣٥٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ وَلَدٍ وَلَدَتْهُ أَمَةٌ، أُوصِيَ بِعِتْقِهَا وَلَمْ تُدَبَّرْ، فَإِنَّ وَلَدَهَا لاَ يَعْتِقُونَ مَعَهَا إِذَا عَتَقَتْ، وَذَلِكَ أَنَّ سَيِّدَهَا يُغَيِّرُ وَصِيَّتَهُ إِنْ شَاءَ، وَيَرُدُّهَا مَتَى شَاءَ، وَلَمْ تَثْبُتْ لَهَا عَتَاقَةٌ، وَإِنَّمَا هِيَ بِمَنْزِلَةِ رَجُلٍ قَالَ لِجَارِيَتِهِ: إِنْ بَقِيَتْ عِنْدِي فُلاَنَةُ حَتَّى أَمُوتَ، فَهِيَ حُرَّةٌ.

---

(١) ـ الْوَصِيَّةُ فِي التَّدْبِيرِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧٢ في المدبر، عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ أَدْرَكَتْ ذَلِكَ، كَانَ لَهَا ذَلِكَ، وَإِنْ شَاءَ قَبْلَ ذَلِكَ، بَاعَهَا وَوَلَدَهَا، لأَنَّهُ لَمْ يُدْخِلْ وَلَدَهَا فِي شَيْءٍ مِمَّا جَعَلَ لَهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر منالێك کە ئافرەتی کۆیلە بوویێتی، ئافرەتەکەش وەسییەتی دەربارە کرابێت بۆ ئازادبوون نەك ئازادبوونی چاوەڕوانکراو (مدبر)، ئەوە منالەکانی لەگەڵی ئازاد نابن کاتێ دایکەکە ئازاد دەبێت، ئەوەش لەبەر ئەوەی گەورەکەی بۆی هەیە وەسییەتەکەی بگۆڕێت ئەگەر بیەوێ، وە هەر کاتێك بیەوێ دەتوانێت بیگەڕێنێتەوە وە ئازادبوونی بۆ دانەمەزراوە، ئەو بابەتە وەك ئەوە وایە پیاوێك بە جارییەکەی خۆی بڵێت: ئەگەر فلانە ئافرەتە کۆیلەیەم لەلا مایەوە تا دەمرم ئەوە ئازاد بێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتەکە بەوە گەیشت (واتە لەلای مایەوە تا گەورەکەی مرد)، ئەوە ئازادبوونەکەی بۆ هەیە، وە ئەگەر گەورەکەی پێش مردنی ویستی دەتوانێت ئافرەتەکە و منالەکانی بفرۆشێت، چونکە منالەکانی نەکەوتوونەتە ناو ئەو شتەی بۆ ئافرەتەکە قەراری دابوو (کە بریتیبوو لە ئازادبوونی).

**٢٣٥٧- [فتوى]** قَالَ: وَالْوَصِيَّةُ فِي الْعَتَاقَةِ مُخَالِفَةٌ لِلتَّدْبِيرِ، فَرَقَ بَيْنَ ذَلِكَ مَا مَضَى مِنَ السُّنَّةِ، قَالَ: وَلَوْ كَانَتِ الْوَصِيَّةُ بِمَنْزِلَةِ التَّدْبِيرِ، كَانَ كُلُّ مُوصٍ لاَ يَقْدِرُ عَلَى تَغْيِيرِ وَصِيَّتِهِ، وَمَا ذُكِرَ فِيهَا مِنَ الْعَتَاقَةِ، وَكَانَ قَدْ حَبَسَ عَلَيْهِ مِنْ مَالِهِ مَا لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَنْتَفِعَ بِهِ[2].

(فەتوا):واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وەسییەتکردن دەربارەی ئازادکردن جیاوازە لە ئازادکردنی چاوەڕوانکراو، سوننەتی پێشینە جیای کردۆتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر وەسییەتی ئازادکردن وەکوو ئازادکردنی چاوەڕوانکراو بووایە، ئەوە هیچ وەسییەتکارێك نەیدەتوانی وەسییەتەکەی و ئەوەی باس کراوە لە ئازادکردن بیگۆڕێت، بەوەشماڵەکەی خۆی لەسەر قەدەغە دەبوو نەیدەتوانی سوودی لێ وەربگرێت (ئەوەش حەرەجی زۆر دروست دەکات، بۆیە بابەتەکە بەم شێوەیە نییە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧٢ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧٣ في المدبر، عن مالك به.

٢٣٥٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَبَّرَ رَقِيقًا لَهُ جَمِيعًا، فِي صِحَّتِهِ وَلَيْسَ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ، قَالَ: إِنْ كَانَ دَبَّرَ بَعْضَهُمْ قَبْلَ بَعْضٍ، بُدِئَ بِالأَوَّلِ فَالأَوَّلِ، حَتَّى يَبْلُغَ الثُّلُثَ، وَإِنْ كَانَ دَبَّرَهُمْ جَمِيعًا فِي مَرَضِهِ، فَقَالَ: فُلاَنٌ حُرٌّ، وَفُلاَنٌ حُرٌّ، وَفُلاَنٌ حُرٌّ، فِي كَلاَمٍ وَاحِدٍ، إِنْ حَدَثَ بِي فِي مَرَضِي هَذَا حَدَثُ مَوْتٍ، أَوْ دَبَّرَهُمْ جَمِيعًا فِي كَلِمَةٍ وَاحِدَةٍ، تَحَاصُّوا فِي الثُّلُثِ، وَلَمْ يُبَدَّأْ أَحَدٌ مِنْهُمْ قَبْلَ صَاحِبِهِ، وَإِنَّمَا هِيَ وَصِيَّةٌ، وَإِنَّمَا لَهُمُ الثُّلُثُ، يُقْسَمُ بَيْنَهُمْ بِالْحِصَصِ، ثُمَّ يَعْتِقُ مِنْهُمُ الثُّلُثُ بَالِغًا مَا بَلَغَ، قَالَ: وَلاَ يُبَدَّأُ أَحَدٌ مِنْهُمْ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ كُلُّهُ فِي مَرَضِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی گشت کۆیلەکانی بە چاوەڕوانکراوی ئازاد دەکات (بەوەی دوای مردنی ئەو ببن بە کەسی ئازاد)، سەروەت و ماڵی دیکەشی نەبێت جگە لەوان، گوتوویەتی: ئەگەر هەندێکیانی پێش هەندێکیان ئازاد کردبێت بەچاوەڕوانکراوی، ئەوە لە یەکەمەکانەوە دەست پێ دەکرێت تا دەگاتە سێیەکی ماڵەکە (ئەوانە ئازاد دەبن کە لە سێیەکی ماڵەکە جێگەیان دەبێتەوە)، وە ئەگەر گشتیانی بەچاوەڕوانکراوی ئازاد کردبوو لە حاڵەتی نەخۆشیدا لەناو یەك وتەدا گوتبووی: فڵان و فڵان و فڵان ئازاد بن ئەگەر لەو نەخۆشییەم مردم، یان گشتیانی بە یەك وشە بەچاوەڕوانکراوی ئازاد کرد، ئەوە گشتیان لە سێیەکدا پشك دەبەن و کەس پێشی ئەوەی دیکە دەستی پێ ناکرێت (بەوەی یەکێکیان ئازادبوونی بەربکەوێت و ئەوانی دیکەش بێبەش ببن)، چونکە ئەوە وەسییەتە، ئەوانیش تەنها سێیەکیان بۆ هەیە، (بۆیە) بە پشك لە نێوانیان دابەش دەکرێت، دواتر لە سێیەکەکە ئازادبوونیان بەردەکەوێت جا بگات بە هەر چەندێك، گوتوویەتی: کەس سەرەتا دەست پێ ناکرێت ئەگەر گشت ئەوە لە حاڵەتی نەخۆشیدا ڕووی دابێت.

٢٣٥٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ دَبَّرَ غُلاَمًا لَهُ، فَهَلَكَ السَّيِّدُ وَلاَ مَالَ لَهُ، إِلاَّ الْعَبْدُ الْمُدَبَّرُ، وَلِلْعَبْدِ مَالٌ، قَالَ: يُعْتَقُ ثُلُثُ الْمُدَبَّرِ، وَيُوقَفُ مَالُهُ بِيَدَيْهِ[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧٦ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧٧ في المدبر، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی كە كۆیلەیەكی خۆی بەچاوەڕوانكراوی ئازاد دەكات و گەورەكەی دەمرێت و هیچ سەروەتێكی نییە جگە لە كۆیلە چاوەڕوانكراوەكە، كۆیلەكەش سەروەت و سامانی هەبێت، گوتوویەتی: سێیەكی كۆیلە چاوەڕوانكراوەكە ئازاد دەبێت (كەواتە بەتەواوی ئازاد نابێت)، وە ماڵ و سەروەتەكەش لە دەستی كۆیلەكە دەهێڵرێتەوە.

**٢٣٦٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي مُدَبَّرٍ كَاتَبَهُ سَيِّدُهُ، فَمَاتَ السَّيِّدُ وَلَمْ يَتْرُكْ مَالاً غَيْرَهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُعْتَقُ مِنْهُ ثُلُثُهُ، وَيُوضَعُ عَنْهُ ثُلُثُ كِتَابَتِهِ، وَيَكُونُ عَلَيْهِ ثُلُثَاهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كۆیلەی چاوەڕوانكراو كە گەورەكەی نووسراوی لەگەڵ بكات (بەوەی ڕازی بووە بابەتەكەی بگۆڕێت لە كۆیلەی چاوەڕوانكراو بۆ كۆیلەی نووسراوپێدراو بەوەی خۆی بكڕێتەوە)، جا (دوای ئەو مامەڵەیە) گەورەكە بمرێت و هیچ سەروەتێك جێ نەهێڵێت جگە لە كۆیلەكە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كۆیلەكە سێیەكی ئازاد دەبێت و سێیەكی پارەی كڕینەوەی خۆیشی لەسەر لادەبرێت و دوو لەسەر سێی پارەی كڕینەوەی خۆیشی دەكەوێتە سەر.

**٢٣٦١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ أَعْتَقَ نِصْفَ عَبْدٍ لَهُ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَبَتَّ عِتْقَ نِصْفِهِ، أَوْ بَتَّ عِتْقَهُ كُلَّهُ، وَقَدْ كَانَ دَبَّرَ عَبْدًا لَهُ آخَرَ قَبْلَ ذَلِكَ، قَالَ: يُبَدَّأُ بِالْمُدَبَّرِ قَبْلَ الَّذِي أَعْتَقَهُ وَهُوَ مَرِيضٌ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَيْسَ لِلرَّجُلِ أَنْ يَرُدَّ مَا دَبَّرَ، وَلاَ أَنْ يَتَعَقَّبَهُ بِأَمْرٍ يَرُدُّهُ بِهِ، فَإِذَا عَتَقَ الْمُدَبَّرُ، فَلْيَكُنْ مَا بَقِيَ مِنَ الثُّلُثِ فِي الَّذِي أَعْتَقَ شَطْرَهُ، حَتَّى يَسْتَتِمَّ بِهِ عِتْقُهُ كُلُّهُ، فِي ثُلُثِ مَالِ الْمَيِّتِ، فَإِنْ لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ فَضْلَ الثُّلُثِ، عَتَقَ مِنْهُ مَا بَلَغَ فَضْلَ الثُّلُثِ، بَعْدَ عِتْقِ الْمُدَبَّرِ الأَوَّلِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك كە نیوەی كۆیلەیەكی خۆی ئازاد دەكات لە كاتێكدا خۆی لە حاڵەتی نەخۆشیدایە، جا یەكلایی كردەوە نیوەی ئازاد بێت، یان یەكلایی كردەوە گشتی ئازاد بێت، لە كاتێكدا كۆیلەیەكی دیكەشی پێشی ئەو كۆیلەیە بەچاوەڕوانكراوی ئازاد كردبوو، گوتوویەتی: سەرەتا بەو كۆیلە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٧٨ في المدبر، عن مالك به.

چاوەڕوانكراوە دەست پێ دەكرێت كە ئازادكراوە پێشی ئەو كۆیلە ئازادكراوەی حاڵەتی نەخۆشی، لەبەر ئەوەی بۆ كەس نییە ئەو كۆیلە چاوەڕوانكراوە بگەڕێنێتەوە كە بڕیاری ئازادكردنی بۆ دەركردووە، وە ناشبێ بەدوای دەرچەیەكدا بگەڕێ بۆ گەڕاندنەوەی، جا كە كۆیلەی چاوەڕوانكراوی یەكەم ئازاد بوو، با ئەوەی دەمێنێتەوە لە سێیەك بۆ ئەو كۆیلەیە حیساب بكرێت كە نیوەی ئازاد كراوە، تا بەتەواوی ئازاد دەبێت لە سێیەكی ماڵی مردووەكەدا، جا ئەگەر ئەوەی لە سێیەكدا دەمێنێتەوە بەشی ئازادكردنی گشتی یان نیوەی نەكرد، ئەوە بای ئەوەندە ئازاد دەكرێت كە لە سێیەك ماوەتەوە دوای ئازادكردنی كۆیلەی چاوەڕوانكراوی یەكەم.

## ٤- جیماعكردنی پیاو لەگەڵ ئافرەتە كۆیلەكەی خۆی كاتێ بەچاوەڕوانكراوی ئازادی دەكات[1]

**٢٣٦٢-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ دَبَّرَ جَارِيَتَيْنِ لَهُ، فَكَانَ يَطَؤُهُمَا وَهُمَا مُدَبَّرَتَانِ[2].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دوو جارییەی خۆی بەچاوەڕوانكراوی ئازاد كردن (بەوەی دوای مردنی ئەو ئازاد ببن)، جا جیماعیشی لەگەڵ دەكردن لە كاتێكدا ئازادكراوی چاوەڕوانكراویش بوون.

**٢٣٦٣-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا دَبَّرَ الرَّجُلُ جَارِيَتَهُ، فَإِنَّ لَهُ أَنْ يَطَأَهَا، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَبِيعَهَا وَلاَ يَهَبَهَا، وَوَلَدُهَا بِمَنْزِلَتِهَا[3].

واتە: سەعیدی كوڕی موسەیەب ﷺ دەیگوت: ئەگەر پیاو جارییەكەی خۆی بەچاوەڕوانكراوی ئازاد كرد، ئەوە بۆی هەیە جیماعی لەگەڵ بكات، بەڵام بۆی نییە نە بیفرۆشێت و نە بیكاتە دیاری، مناڵی ئافرەتەكەش وەك ئافرەتەكە وایە (ئەوانیش نابێ بفرۆشرێن و بكرێنە دیاری).

---

(١) ـ مَسُّ الرَّجُلِ وَلِيدَتَهُ إِذَا دَبَّرَهَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨٠ في المدبر؛ والحدثاني: ٤٤١ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨١ في المدبر؛ والحدثاني: ٤٤١ أ في المكاتب والمدبر؛ والشيباني: ٨٤٤ في العتاق، كلهم عن مالك به.

## ٥- فرۆشتنی كۆیلەی چاوەڕوانكراو[١]

**٢٣٦٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي الْمُدَبَّرِ: أَنَّ صَاحِبَهُ لاَ يَبِيعُهُ، وَلاَ يُحَوِّلُهُ عَنْ مَوْضِعِهِ الَّذِي وَضَعَهُ فِيهِ، وَأَنَّهُ إِنْ رَهِقَ سَيِّدَهُ دَيْنٌ، فَإِنَّ غُرَمَاءَهُ لاَ يَقْدِرُونَ عَلَى بَيْعِهِ، مَا عَاشَ سَيِّدُهُ، فَإِنْ مَاتَ سَيِّدُهُ وَلاَ دَيْنَ عَلَيْهِ، فَهُوَ فِي ثُلُثِهِ، لأَنَّهُ اسْتَثْنَى عَلَيْهِ عَمَلَهُ مَا عَاشَ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَخْدُمَهُ حَيَاتَهُ، ثُمَّ يُعْتِقَهُ عَلَى وَرَثَتِهِ، إِذَا مَاتَ مِنْ رَأْسِ مَالِهِ، وَإِنْ مَاتَ سَيِّدُ الْمُدَبَّرِ، وَلاَ مَالَ لَهُ غَيْرُهُ، عَتَقَ ثُلُثُهُ، وَكَانَ ثُلُثَاهُ لِوَرَثَتِهِ، فَإِنْ مَاتَ سَيِّدُ الْمُدَبَّرِ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ يُحِيطُ بِالْمُدَبَّرِ، بِيعَ فِي دَيْنِهِ، لأَنَّهُ إِنَّمَا يَعْتِقُ فِي الثُّلُثِ، قَالَ: فَإِنْ كَانَ الدَّيْنُ لاَ يُحِيطُ إِلاَّ بِنِصْفِ الْعَبْدِ، بِيعَ نِصْفُهُ لِلدَّيْنِ، ثُمَّ عَتَقَ ثُلُثُ مَا بَقِيَ بَعْدَ الدَّيْنِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو حوكمەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە دەربارەی كۆیلەی چاوەڕوانكراو ئەوەیە: خاوەنەكەی نابێ بیفرۆشێت و ناشبێ لەو شوێنە بیگوازێتەوە كە لێی داناوە، وە ئەگەر قەرز گەورەكەی داپۆشی و لەسەری كەڵەكە بوو و گشت سەروەتەكەی گرتەوە، ئەوە خاوەنی قەرزەكان ناتوانن كۆیلە چاوەڕوانكراوەكە بفرۆشن مادەم گەورەكەی زیندوو بێت، جا ئەگەر گەورەكەی مرد و هیچ قەرزی لەسەر نەمابوو، ئەوە كۆیلەكە تەنها لە چوارچێوەی سێیەكی ماڵەكەی ئازاد دەبێت، چونكە ئەو كاركردنی كۆیلەكەی بۆخۆی جیا كردبۆیەوە (تا مرد ئازادی نەكرد تا خزمەتی خۆی پێ بكات)، جا بۆی نییە تا ماوە خزمەتی خۆی پێ بكات و دواتریش (دوای مردنی خۆی) بەسەر میراتگران ئازادی بكات لە سەرمایەی گشتی (چونكە ئێستا ماڵ و سەروەتەكە بۆتە هی میراتگران و لە سێیەك زیاتر مافی ئەوی تیا نەماوە)، وە ئەگەر گەورەی كۆیلە چاوەڕوانكراوەكە مرد، لە كاتێكدا هیچ سەروەتێكی جگە لەوی نەبوو، ئەوە سێیەكی كۆیلەكە ئازاد دەبێت و دوو لەسەر سێشی بۆ میراتگرانە، وە ئەگەر گەورەی كۆیلە چاوەڕوانكراوەكە مرد، لە كاتێكدا قەرزی لەسەر بوو و قەرزەكە كۆیلەكەشی گرتبۆیەوە، ئەوە كۆیلەكە بۆ قەرزەكە دەفرۆشرێت، چونكە بەس لە

---

(١) ـ بَيْعُ الْمُدَبَّرِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨٣ في المدبر، عن مالك به.

سێیەك ئازاد دەكرێت (كابراش هیچی نەماوە تا سێیەكی هەبێت)، گوتوویەتی: وە ئەگەر قەرزەكە گشت كۆیلەكەی دانەگرتبێ تەنها نیوە نەبێت، ئەوە نیوەی كۆیلەكە دەفرۆشرێت، دواتر سێیەكی ئەوەی ماوەتەوە (لە نیوە نەفرۆشراوەكە) ئازاد دەبێت.

**٢٣٦٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَجُوزُ بَيْعُ الْمُدَبَّرِ، وَلاَ يَجُوزُ لأَحَدٍ أَنْ يَشْتَرِيَهُ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِيَ الْمُدَبَّرُ نَفْسَهُ مِنْ سَيِّدِهِ، فَيَكُونُ ذَلِكَ جَائِزًا لَهُ، أَوْ يُعْطِيَ أَحَدٌ سَيِّدَ الْمُدَبَّرِ مَالاً، وَيُعْتِقُهُ سَيِّدُهُ الَّذِي دَبَّرَهُ، فَذَلِكَ يَجُوزُ لَهُ أَيْضًا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَوَلاَؤُهُ لِسَيِّدِهِ الَّذِي دَبَّرَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فرۆشتنی كۆیلەی چاوەڕوانكراو دروست نییە، وە بۆ كەسیش دروست نییە بیكڕێت، تەنها كڕینەوەی خۆی نەبێت لە گەورەكەی، بۆ ئەو دروستە، یان كەسێك سەروەتێك بدات بە گەورەی كۆیلە چاوەڕوانكراوەكە و گەورەكەشی ڕاستەوخۆ ئازادی بكات، بۆ ئەو كەسەش دروستە بە هەمان شێوە (چونكە لە بەرژەوەندی كۆیلەكەدایە و ئازادبوونی بۆ پێش دەخات).

ئیمـامـی مـــالیك ﷺ گوتوویەتی: وەلائەكەشی بۆ ئەو گەورەیەیــەتی كە بەچاوەڕوانكراوی ئازادی كردووە.

**٢٣٦٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَجُوزُ بَيْعُ خِدْمَةِ الْمُدَبَّرِ، لأَنَّهُ غَرَرٌ، إِذْ لاَ يُدْرَى كَمْ يَعِيشُ سَيِّدُهُ، فَذَلِكَ غَرَرٌ لاَ يَصْلُحُ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فرۆشتنی خزمەتی كۆیلەی چاوەڕوانكراو دروست نییە، چونكە بریتییە لە مامەڵەی نادیار، نازانرێت گەورەكەی چەند دەژێت (تا خزمەتی ئەو ماوەیە بفرۆشێت بە كەسێكی دیكە)، بۆیە مامەڵەی نادیارە دروست نییە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨٤ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨٥ في المدبر، عن مالك به.

٢٣٦٧- **[فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْعَبْدِ يَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، فَيُدَبِّرُ أَحَدُهُمَا حِصَّتَهُ: إِنَّهُمَا يَتَقَاوَمَانِهِ، فَإِنِ اشْتَرَاهُ الَّذِي دَبَّرَهُ، كَانَ مُدَبَّرًا كُلُّهُ، وَإِنْ لَمْ يَشْتَرِهِ انْتَقَضَ تَدْبِيرُهُ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ الَّذِي بَقِيَ لَهُ فِيهِ الرِّقُّ أَنْ يُعْطِيَهُ شَرِيكَهُ الَّذِي دَبَّرَهُ بِقِيمَتِهِ، فَإِنْ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ بِقِيمَتِهِ لَزِمَهُ ذَلِكَ، وَكَانَ مُدَبَّرًا كُلَّهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کۆیلەیەی کە دوو کەس تیایدا شەریك و هاوبەشن جا یەکێکیان بەشەکەی خۆی ئازاد دەکات بەچاوەڕوانکراوی، گوتوویەتی: هەردووکیان دەینرخێنن، جا ئەگەر ئەو کەسەی پشکەکەی خۆی بە چاوەڕوانکراوی ئازاد کردووە بەشەکەی دیکەشی کڕییەوە، ئەوە کۆیلەکە بەتەواوی دەبێتە ئازادکراوی چاوەڕوانکراو، وە ئەگەر نەیکڕییەوە ئەوە ئازادکردنە چاوەڕوانکردنەکەی هەڵدەوەشێتەوە (لەبەر شەریکەکەی دیکە)، تەنها لەو کاتە نەبێت کە ئەو کەسەی پشکەکەی خۆی بەکۆیلایەتی ماوەتەوە بە نرخی خۆی بیدات بەو شەریکەی بەچاوەڕوانکراوی بەشەکەی خۆی ئازاد کردووە، ئەگەر بە نرخی خۆی پێی بەخشی ئەوە بەتەواوی ئازاد دەبێت.

٢٣٦٨- **[فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ نَصْرَانِيٍّ دَبَّرَ عَبْدًا لَهُ نَصْرَانِيًّا، فَأَسْلَمَ الْعَبْدُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُحَالُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْعَبْدِ، وَيُخَارَجُ عَلَى سَيِّدِهِ النَّصْرَانِيِّ، وَلاَ يُبَاعُ عَلَيْهِ، حَتَّى يَتَبَيَّنَ أَمْرُهُ، فَإِنْ هَلَكَ النَّصْرَانِيُّ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، قُضِيَ دَيْنُهُ مِنْ ثَمَنِ الْمُدَبَّرِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِي مَالِهِ مَا يَحْمِلُ الدَّيْنَ، فَيَعْتِقُ الْمُدَبَّرُ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێکی دیان (نەصرانی) کە کۆیلەیەکی گاور (دیان)ی خۆی بەچاوەڕوانکراوی ئازاد بکات و دواتر کۆیلەکە ببێتە مسوڵمان، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گەورەکە و کۆیلەکە لە یەکدی جیا دەکرێنەوە (نابێ کۆیلەکە بۆخۆی بەکار بێنێت، تا کەسی کافر خزمەتی خۆی بە مسوڵمان نەکات)، (بەڵکوو لەجیاتی کارکردن مانگانە) زەریبە دەدات بە گەورەکەی و لێی نافرۆشرێت تا بابەتەکەی ڕوون دەبێتەوە، جا ئەگەر گاورەکە مرد و قەرزی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨٧ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨٨ في المدبر، عن مالك به.

لەسەر بوو، ئەوە (کۆیلەکە دەفرۆشرێت و) قەرزەکەی لە پارەی فرۆشتنی کۆیلە چاوەڕوانکراوەکە دەدرێتەوە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە ماڵ و سەروەتەکەی بەشی قەرزەکان بکات، ئەو کات کۆیلە چاوەڕوانکراوەکە ئازاد دەبێت.

## ٦- بریندارکردن لەلایەن کۆیلەی ئازادکراوی چاوەڕوانکراو[١]

**٢٣٦٩-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ قَضَى فِي الْمُدَبَّرِ إِذَا جَرَحَ، أَنَّ لِسَيِّدِهِ أَنْ يُسَلِّمَ مَا يَمْلِكُ مِنْهُ إِلَى الْمَجْرُوحِ، فَيَخْتَدِمُهُ الْمَجْرُوحُ وَيُقَاصُّهُ بِجِرَاحِهِ مِنْ دِيَةِ جَرْحِهِ، فَإِنْ أَدَّى قَبْلَ أَنْ يَهْلِكَ سَيِّدُهُ، رَجَعَ إِلَى سَيِّدِهِ[٢].

واتە: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ بڕیاری دا و دادوەری کرد دەربارەی کۆیلەی چاوەڕوانکراو کاتێ جینایەتێکی زامداری ئەنجام دەدات، بەوەی: گەورەکەی بۆی هەیە ئەوەی خاوەنیەتی لە کۆیلەکەدا (کە بریتییە لە خزمەتی کۆیلەکە بۆ گەورەکەی) بیدات بە بریندارکراوەکە، بریندارکراوەکە بۆخۆی بەکاری بهێنێت و خزمەتی خۆی پێ بکات و خوێنبایی برینەکەی پێ پڕ بکاتەوە، جا ئەگەر ئەوەی بەئەنجام گەیاند بەر لەوەی گەورەکەی بمرێت (واتە بای خوێنباییەکە خزمەتی بریندارکراوەکەی کرد) ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای گەورەکەی (خزمەتی ئەو دەکات تا دەمرێت، دوای مردنیشی ئازاد دەبێت، ئەگەر کەشی ئازادبوون هاتە جێ).

**٢٣٧٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْمُدَبَّرِ إِذَا جَرَحَ، ثُمَّ هَلَكَ سَيِّدُهُ، وَلَيْسَ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ: أَنَّهُ يُعْتَقُ ثُلُثُهُ، ثُمَّ يُقْسَمُ عَقْلُ الْجَرْحِ أَثْلاَثًا، فَيَكُونُ ثُلُثُ الْعَقْلِ عَلَى الثُّلُثِ الَّذِي عَتَقَ مِنْهُ، وَيَكُونُ ثُلُثَاهُ عَلَى الثُّلُثَيْنِ اللَّذَيْنِ بِأَيْدِي الْوَرَثَةِ، إِنْ شَاؤُوا أَسْلَمُوا الَّذِي لَهُمْ مِنْهُ إِلَى صَاحِبِ الْجَرْحِ، وَإِنْ شَاؤُوا أَعْطَوْهُ ثُلُثَيِ الْعَقْلِ، وَأَمْسَكُوا نَصِيبَهُمْ مِنَ الْعَبْدِ، وَذَلِكَ أَنَّ عَقْلَ ذَلِكَ الْجَرْحِ إِنَّمَا كَانَتْ جِنَايَتُهُ مِنَ الْعَبْدِ، وَلَمْ تَكُنْ دَيْنًا عَلَى السَّيِّدِ، فَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ الَّذِي أَحْدَثَ الْعَبْدُ بِالَّذِي يُبْطِلُ مَا صَنَعَ السَّيِّدُ مِنْ عِتْقِهِ وَتَدْبِيرِهِ، فَإِنْ كَانَ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ

---

(١) ـ جِرَاحُ الْمُدَبَّرِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٨٩ في المدبر؛ والحدثاني: ٤٤٣ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

دَيْنٌ لِلنَّاسِ، مَعَ جِنَايَةِ الْعَبْدِ، بِيعَ مِنَ الْمُدَبَّرِ بِقَدْرِ عَقْلِ الْجَرْحِ، وَقَدْرِ الدَّيْنِ، ثُمَّ يُبْدَأُ بِالْعَقْلِ الَّذِي كَانَ فِي جِنَايَةِ الْعَبْدِ، فَيُقْضَى مِنْ ثَمَنِ الْعَبْدِ، ثُمَّ يُقْضَى دَيْنُ سَيِّدِهِ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى مَا بَقِيَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنَ الْعَبْدِ، فَيَعْتِقُ ثُلُثُهُ، وَيَبْقَى ثُلُثَاهُ لِلْوَرَثَةِ، وَذَلِكَ أَنَّ جِنَايَةَ الْعَبْدِ هِيَ أَوْلَى مِنْ دَيْنِ سَيِّدِهِ.

وَذَلِكَ أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا هَلَكَ وَتَرَكَ عَبْدًا مُدَبَّرًا، قِيمَتُهُ خَمْسُونَ وَمِئَةُ دِينَارٍ، وَكَانَ الْعَبْدُ قَدْ شَجَّ رَجُلاً حُرًّا، مُوضِحَةً عَقْلُهَا خَمْسُونَ دِينَارًا، وَكَانَ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ مِنَ الدَّيْنِ خَمْسُونَ دِينَارًا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنَّهُ يُبْدَأُ بِالْخَمْسِينَ دِينَارًا الَّتِي فِي عَقْلِ الشَّجَّةِ، فَتُقْضَى مِنْ ثَمَنِ الْعَبْدِ، ثُمَّ يُقْضَى دَيْنُ سَيِّدِهِ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى مَا بَقِيَ مِنَ الْعَبْدِ، فَيَعْتِقُ ثُلُثُهُ، وَيَبْقَى ثُلُثَاهُ لِلْوَرَثَةِ، فَالْعَقْلُ أَوْجَبُ فِي رَقَبَتِهِ مِنْ دَيْنِ سَيِّدِهِ، وَدَيْنُ سَيِّدِهِ أَوْجَبُ مِنَ التَّدْبِيرِ، الَّذِي إِنَّمَا هُوَ وَصِيَّةٌ فِي ثُلُثِ مَالِ الْمَيِّتِ، فَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يَجُوزَ شَيْءٌ مِنَ التَّدْبِيرِ، وَعَلَى سَيِّدِ الْمُدَبَّرِ دَيْنٌ لَمْ يُقْضَ، وَإِنَّمَا هُوَ وَصِيَّةٌ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ ۝١١﴾ النساء[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ كَانَ فِي ثُلُثِ الْمَيِّتِ مَا يَعْتِقُ فِيهِ الْمُدَبَّرُ كُلُّهُ عَتَقَ، وَكَانَ عَقْلُ جِنَايَتِهِ دَيْنًا عَلَيْهِ، يُتَّبَعُ بِهِ بَعْدَ عِتْقِهِ، وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ الْعَقْلُ الدِّيَةَ كَامِلَةً، وَذَلِكَ إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَى سَيِّدِهِ دَيْنٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی كۆیلەی چاوەڕوانكراو (ئەوەی گەورەكەی وەسییەت دەكات دوای مردنی خۆی ئازاد بكرێت) ئەگەر جینایەتێكی برینداری ئەنجام دا، دواتر گەورەكەی مرد و ماڵ و سەروەتیشی نەبوو جگە لە كۆیلەكە ئەوە: سێیەكی كۆیلەكە ئازاد دەكرێت، دواتر خوێنبایی برینەكە دەكرێتە سێ بەش، سێیەكی خوێنباییەكە دەكەوێتە سەر ئەو سێیەكەی ئازاد بووە، دوو لەسەر سێش دەكەوێتە سەر ئەو دوو بەشەی كە بە دەست میراتگرەكانەوەیە، ئەگەر ویستیان دوو بەشەكەی كۆیلەكە دەدەن بە خاوەن برینەكە، ئەگەر بشیانەوێت پارەی دوو لەسەر سێی خوێنباییەكە دەدەن و پشكی خۆیان لە كۆیلەكە دەگێڕنەوە، جا ئەوە لەبەر ئەوەیە خوێنبایی برینەكە جینایەتەكەی كەوتۆتە سەر كۆیلەكە و قەرز نەبووە لەسەر گەورەكەی، كەواتە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٠ في المدبر؛ وفي: ٢٧٩٣ في المدبر، عن مالك به.

ئەوەی کۆیلەکە ئەنجامی داوە (کە بریندارکردنەکەیە) نەبۆتە هەڵوەشێنەرەوەی ئەوەی گەورەکە ئەنجامی داوە لە ئازادکردنی بە چاوەڕوانکراوی، جا ئەگەر گەورەی کۆیلەکە قەرزی خەڵکی لەسەر بوو لەگەڵ جینایەتی کۆیلەکە، ئەوە کۆیلەکە دەفرۆشرێت بە ئەندازەی خوێنبایی برینەکە و بە ئەندازەی قەرزەکە، دواتر بەو خوێنباییە دەست پێ دەکرێت کە کۆیلەکە ئەنجامی داوە، بە پارەی فرۆشتنی کۆیلەکە دەدرێتەوە، دواتر قەرزی گەورەکەی دەدرێتەوە، دواتر سەیری ئەوە دەکرێت کە لە کۆیلەکە زیاد دەکات و دەمێنێتەوە، جا (لەوەی دەمێنێتەوە) سێیەکی ئازاد دەبێت و دوو لەسەر سێش (لەو بەشەی ماوەتەوە) بۆ میراتگرانە، (بۆیەش سەرەتا بە خوێنباییەکە دەست پێ کرا) چونکە جینایەتی کۆیلەکە لەپێشترە لە قەرزی گەورەکەی.

ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەگەر کەسێك بمرێت و کۆیلەیەکی چاوەڕوانکراو دوای خۆی جێ بهێڵێت، نرخەکەی سەت و پەنجا دینار بێت و کۆیلەکەشی سەری کەسێکی ئازادی شکاندبێت بە شکانێك برینەکەی گەیشتبێتە سەر ئێسقان، کە خوێنباییەکەی پەنجا دینارە، گەورەی کۆیلەکەش پەنجا دینار قەرزی لەسەرە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: سەرەتا بەو پەنجا دینارە دەست پێ دەکرێت کە هی خوێنبایی سەرشکانەکەیە و لە نرخی کۆیلەکە دەدرێت، دواتر قەرزی گەورەکەی دەدرێتەوە، دواتر سەیری ئەوە دەکرێت کە لە کۆیلەکەدا ماوەتەوە، جا سێیەکی ئازاد دەبێت و دوو لەسەر سێش بۆ میراتگران دەمێنێتەوە، کەواتە خوێنباییەکەی کە لە ئەستۆیەتی شایستەتر و لەپێشترە لە قەرزی گەورەکەی (بۆیە بەو دەست پێ دەکرێت)، وە قەرزی گەورەکەشی لەپێشتر و شایستەترە لە ئازادبوونی کە تەنها وەسییەتێکە لە سێیەکی ماڵی مردوو، کەواتە نابێ ئازادبوونی بەچاوەڕوانکراوی جێبەجێ بکرێت لە کاتێکدا گەورەی کۆیلە چاوەڕوانکراوەکە قەرزی لەسەرە و نەدراوەتەوە، کۆیلە ئازادکردنەکەش تەنها وەسییەتێکە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ ١١﴾النساء، واتە: [دوای وەسییەتێك کە وەسییەتی پێ کرابێ یان قەرز] (جا بە ئیجماع قەرزەکە پێش وەسییەتە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر سێیەكی ماڵی مردووەكە ئەوەندە بوو بەشی ئازادكردنی تەواوی كۆیلەكەی دەكرد، ئەوە ئازاد دەبێت، خوێنبایی جینایەتەكەش دەبێتە قەرز لەسەر كۆیلەكە، دوای ئازادبوونی لێی وەردەگیرێت، هەرچەندە خوێنباییەكە خوێنبایی تەواویش بێت، ئەوە لە كاتێكدایە ئەگەر گەورەكەی قەرزی لەسەر نەبێت.

**٢٣٧١- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُدَبَّرِ إِذَا جَرَحَ رَجُلاً، فَأَسْلَمَهُ سَيِّدُهُ إِلَى الْمَجْرُوحِ، ثُمَّ هَلَكَ سَيِّدُهُ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، وَلَمْ يَتْرُكْ مَالاً غَيْرَهُ، فَقَالَ الْوَرَثَةُ: نَحْنُ نُسَلِّمُهُ إِلَى صَاحِبِ الْجُرْحِ، وَقَالَ صَاحِبُ الدَّيْنِ: أَنَا أَزِيدُ عَلَى ذَلِكَ، قَالَ: إِنَّهُ إِذَا زَادَ الْغَرِيمُ شَيْئًا، فَهُوَ أَوْلَى بِهِ، وَيُحَطُّ عَنِ الَّذِي عَلَيْهِ الدَّيْنُ قَدْرُ مَا زَادَ الْغَرِيمُ عَلَى دِيَةِ الْجَرْحِ، فَإِنْ لَمْ يَزِدْ شَيْئًا، لَمْ يَأْخُذِ الْعَبْدَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كۆیلەی چاوەڕوانكراو كاتێ زامدارییەك ئەنجام دەدات و گەورەكەی تەسلیمی برینداركراوەكەی دەكات (بۆ ئەوەی لە تۆڵەی خوێنباییەكەی خزمەتی بكات)، دواتر گەورەكەی دەمرێت لە كاتێكدا قەرزی لەسەرە و جگە لە كۆیلەكە هیچ سەروەت و سامانێكی دوای خۆی جێ نەهێشتووە، جا میراتگرانی دەڵێن: ئێمە تەسلیمی خاوەنی برینەكەی دەكەین، خاوەنی قەرزەكەش دەڵێت: من شتێكی زیادە دەدەم (تا بیدەن بە خاوەن برینەكە و كۆیلەكە بۆ من بێت)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر خاوەنی قەرزەكە شتێكی زیادی دا، ئەوە ئەو لەپێشترە بە وەرگرتنی كۆیلەكە و ئەو ئەندازەیەی خاوەنی قەرزەكە زیادی كردووە بۆ خوێنبایی برینەكە لەسەر ئەو كەسە نامێنێت كە قەرزەكەی لەسەرە، بەڵام ئەگەر هیچ زیاد نەكات ئەوە كۆیلەكە وەرناگرێت.

**٢٣٧٢- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُدَبَّرِ إِذَا جَرَحَ وَلَهُ مَالٌ فَأَبَى سَيِّدُهُ أَنْ يَفْتَدِيَهُ: فَإِنَّ الْمَجْرُوحَ يَأْخُذُ مَالَ الْمُدَبَّرِ فِي دِيَةِ جُرْحِهِ، فَإِنْ كَانَ فِيهِ وَفَاءٌ اسْتَوْفَى الْمَجْرُوحُ دِيَةَ جُرْحِهِ، وَرَدَّ الْمُدَبَّرَ إِلَى سَيِّدِهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ وَفَاءٌ، اقْتَضَاهُ مِنْ دِيَةِ جُرْحِهِ، وَاسْتَعْمَلَ الْمُدَبَّرَ بِمَا بَقِيَ لَهُ مِنْ دِيَةِ جُرْحِهِ[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٢ في المدبر، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٤ في المدبر، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی چاوەڕوانکراو کاتێ کەسێك زامدار دەکات و سەروەتیشی هەیە، جا گەورەکەی ڕەتی دەکاتەوە فیدیەی بۆ بدات، گوتوویەتی: کەسە بریندارکراوەکە لە سەروەتی کۆیلە چاوەڕوانکراوەکە وەردەگرێت بۆ خوێنبایی برینەکەی، جا ئەگەر تەواو بەشی خوێنبایی برینەکەی کرد ئەوە کۆیلەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، وە ئەگەر تەواو بەشی نەکرد، ئەوە هەندێك لە خوێنبایی برینەکەی وەردەگرێت و کۆیلەکەش بۆ خۆی بەکار دێنێت بەگوێرەی ئەوەی ماوە لە خوێنبایی برینەکەی.

### ٧- بریندارکردن لەلایەن ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی مناڵی لە گەورەکەی بووە[١]

**٢٣٧٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي أُمِّ الْوَلَدِ تَجْرَحُ: إِنَّ عَقْلَ ذَلِكَ الْجَرْحِ ضَامِنٌ عَلَى سَيِّدِهَا فِي مَالِهِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ عَقْلُ ذَلِكَ الْجَرْحِ أَكْثَرَ مِنْ قِيمَةِ أُمِّ الْوَلَدِ، فَلَيْسَ عَلَى سَيِّدِهَا أَنْ يُخْرِجَ أَكْثَرَ مِنْ قِيمَتِهَا، وَذَلِكَ أَنَّ رَبَّ الْعَبْدِ أَوِ الْوَلِيدَةِ، إِذَا أَسْلَمَ غُلاَمَهُ أَوْ وَلِيدَتَهُ، بِجُرْحٍ أَصَابَهُ وَاحِدٌ مِنْهُمَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، وَإِنْ كَثُرَ الْعَقْلُ، فَإِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ سَيِّدُ أُمِّ الْوَلَدِ أَنْ يُسَلِّمَهَا، لِمَا مَضَى فِي ذَلِكَ مِنَ السُّنَّةِ، فَإِنَّهُ إِذَا أَخْرَجَ قِيمَتَهَا، فَكَأَنَّهُ أَسْلَمَهَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يَحْمِلَ مِنْ جِنَايَتِهَا أَكْثَرَ مِنْ قِيمَتِهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی کە منداڵی لە گەورەکەی بووە زامدارییەك ئەنجام دەدات و کەسێك بریندار دەکات، گوتوویەتی: خوێنبایی برینەکە لەسەر گەورەکەی کۆیلەکەیە لە ماڵی خۆی، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە خوێنبایی برینەکە لە نرخی ئافرەتە کۆیلەکە زیاتر بێت، ئەو کات لەسەر گەورەکەی نییە زیاتر لە نرخی ئافرەتەکە بدات، چونکە خاوەنی کۆیلەکە جا کۆیلەکە پیاو بێت یان ئافرەت کاتێ گەورەکەی تەسلیمی دەکات بەهۆی زامداریکردنێکەوە کە یەکێکیان ئەنجامی داوە، ئەوە زیاتر لەوە لەسەر گەورەکە واجب نییە، هەرچەندە خوێنباییەکەش زیاتر بێت، جا ئەگەر گەورەی

---

(١) ـ جِرَاحُ أُمِّ الْوَلَدِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٩٥ في المدبر، عن مالك به.





ئافرەتە کۆیلەکە کە منالّی لە ئافرەتەکە بووە لەبەر بابەتێکی شەرعی نەیتوانی ئافرەتەکە تەسلیمی خاوەنی برینەکە بکات، ئەو کات ئەگەر قیمەتی ئافرەتەکەی دا بە خاوەن برینەکە، ئەوە وەك ئەوە وایە ئافرەتەکەی تەسلیم کردبێت و هیچی زیاتری لەسەر نییە، ئەوەش چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم لەو بارەیەوە، جا لەسەری نییە زیاتر لە قیمەتی ئافرەتەکە لەئەستۆ بگرێت لە جینایەتەکانیدا.

## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەجم[1]

**٢٣٧٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَتِ الْيَهُودُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَذَكَرُوا لَهُ، أَنَّ رَجُلاً مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ؟ فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلَامٍ ﵁: كَذَبْتُمْ، إِنَّ فِيهَا الرَّجْمَ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا، فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، ثُمَّ قَرَأَ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلَامٍ ﵁: ارْفَعْ يَدَكَ، فَرَفَعَ يَدَهُ، فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ، فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَرُجِمَا.

فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَحْنِي عَلَى الْمَرْأَةِ، يَقِيهَا الْحِجَارَةَ[2].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: يَعْنِي يَحْنِي، يُكِبُّ عَلَيْهَا، حَتَّى تَقَعَ الْحِجَارَةُ عَلَيْهِ.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: جوولەکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆیان باس کرد پیاوێك و ژنێك لە خۆیان زینایان کردووە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: چیتان لە تەوراتدا هەیە دەربارەی ڕەجم؟ گوتیان: ڕیسوایان دەکەین و جەڵدیان لێ دەدەین، عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیش ﵁ پێی گوتن: درۆتان کرد، ڕەجمکردن لە تەوراتدا هەیە، جا تەوراتیان هێنا و کردیانەوە، یەکێکیان دەستی خستە سەر ئایەتی ڕەجم و شاردیەوە و دواتر پێش و دواوەی خوێندەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیش ﵁ پێی گوت: دەستت هەڵگرە، جا دەستی هەڵگرت و ئایەتی ڕەجمی لەژێر بوو، جا جوولەکەکان گوتیان: ڕاست دەکات ئەی موحەممەد ﷺ، ئایەتی ڕەجمی تیایە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەوەی ڕەجم بکرێن و ڕەجم کران.

عەبدوڵڵا ﵁ گوتوویەتی: جا (لە کاتی ڕەجمەکە) بینیم پیاوەکە خۆی بەسەر ئافرەتەکەدا دابوو دەیپاراست لە بەردەکان.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الرَّجْمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٥ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٤ في الحدود في الزنا؛ والبخاري: ٣٦٣٥ في المناقب، وفي: ٦٨٤١ في المحاربين؛ وأبو داود: ٤٤٤٦ في الحدود؛ وابن حبان: ٤٤٣٤؛ والقابسي: ٢٤٥، كلهم عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: «يَحْنِي» واتە: خۆی بەسەردا دابوو، تا بەردەكان بكەون بەسەر پیاوەكەدا.

**٢٣٧٥-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ جَاءَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّ الآخِرَ زَنَى، فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: هَلْ ذَكَرْتَ هَذَا لأَحَدٍ غَيْرِي؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: فَتُبْ إِلَى اللهِ، وَاسْتَتِرْ بِسِتْرِ اللهِ، فَإِنَّ اللهَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ، فَلَمْ تُقْرِرْهُ نَفْسُهُ، حَتَّى أَتَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لأَبِي بَكْرٍ ﷺ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ، مِثْلَ مَا قَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ ﷺ، فَلَمْ تُقْرِرْهُ نَفْسُهُ، حَتَّى جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّ الأَخِرَ زَنَى، فَقَالَ سَعِيدٌ: فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، كُلُّ ذَلِكَ يُعْرِضُ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا أَكْثَرَ عَلَيْهِ، بَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى أَهْلِهِ، فَقَالَ: أَيَشْتَكِي؟ أَبِهِ جِنَّةٌ؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَاللَّهِ إِنَّهُ لَصَحِيحٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَبِكْرٌ أَمْ ثَيِّبٌ؟ فَقَالُوا: بَلْ ثَيِّبٌ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَرُجِمَ[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم هات بۆ لای ئەبو بەكری صدديق ﷺ و گوتی: هیچ و پووچ زینای كردووە (مەبەستی خۆی بوو)، ئیمامی ئەبو بەكریش ﷺ پێی گوت: ئایا ئەمەت بە كەسی جگە لە من گوتووە؟ ئەویش گوتی: نەخێر، ئیمامی ئەبو بەكریش ﷺ پێی گوت: كەواتە بگەڕێوە لای خوای پەروەردگار و تەوبە بكە و خۆت سەتر بكە بە سەتری خوا ﷻ (لای خەڵك كەشفی مەكە)، خوای پەروەردگار تەوبە لە بەندەكانی قبووڵ دەكات، جا نەفسی ئۆقرەی نەگرت (بە قسەی ئیمامی ئەبو بەكر، لە دڵی خۆی گوتوویەتی ئەبو بەكر لەبەر دڵنەرمی خۆی ئاوا دەڵێ)، تا چوو بۆ لای ئیمامی عومەر ﷺ، هەمان قسەی بۆ ئەویش كرد كە بۆ ئەبو بەكری كرد، ئیمامی عومەریش ﷺ هەمان قسەی ئیمامی ئەبو بەكری ﷺ پێ وت، جا (دیسان) نەفسی ئۆقرەی نەگرت، تا چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت: هیچ و پووچ زینای كردووە (كە مەبەستی خۆی بوو)، جا سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار ڕووی لێ وەرگێڕا (تا واز بێنێت)، گشت جارێك پێغەمبەری

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٦ في الحدود؛ والشيباني: ٧٠٠ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

خوا ﷺ پشتی تێ دەکرد، تا زۆر داوای لێ کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای خانەوادەی پیاوەکەی نارد و فەرمووی: ئایا نەخۆشە؟ ئایا شێتی هەیە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵنیایی ساغ و سەلامەتە (هیچ کێشەیەکی نییە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێژنە یان ژنداره؟ گوتیان: ژنداره ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەربارە دەرکرد و ڕەجم کرا.

**٢٣٧٦-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ، يُقَالُ لَهُ: هَزَّالٌ، يَا هَزَّالُ، لَوْ سَتَرْتَهُ بِرِدَائِكَ لَكَانَ خَيْرًا لَكَ، قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ ﵀: فَحَدَّثْتُ بِهَذَا الْحَدِيثِ فِي مَجْلِسٍ فِيهِ يَزِيدُ بْنُ نُعَيْمِ بْنِ هَزَّالٍ الأَسْلَمِيِّ، فَقَالَ يَزِيدُ: هَزَّالٌ جَدِّي، وَهَذَا الْحَدِيثُ حَقٌّ[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی ئەسلەمی ـ کە پێی دەگوترا هەزال ـ فەرمووە: ئەی هەزال ئەگەر ئەو بابەتەت بە جوبەی خۆت داپۆشیبا چاکتر بوو بۆ تۆ (چونکە زینای کردبوو)، یەحیای کوڕی سەعید ﵀ گوتوویەتی: جا ئەو فەرموودەیەم لە مەجلیسێکدا گێڕایەوە کە یەزیدی کوڕی نوعەیمی کوڕی هەزالی ئەسلەمی تێدا بوو، جا یەزید گوتی: هەزال باپیرمە، ئەو فەرموودەش حەق و ڕاستە.

**٢٣٧٧-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﵀، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَجُلاً اعْتَرَفَ عَلَى نَفْسِهِ بِالزِّنَا، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَرُجِمَ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﵀: فَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ، يُؤْخَذُ الرَّجُلُ بِاعْتِرَافِهِ عَلَى نَفْسِهِ[٢].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانی پێدا هێنا بە زیناکردن و چوار جار شاهێدی لەسەر خۆی دا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەربارە دەرکرد و ڕەجم کرا.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٧ في الحدود؛ والشيباني: ٧٠١ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٨ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٧ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: لەبەر ئەوە (واتە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە) مرۆڤ بە دانپێداهێنانی خۆی دەگیرێ (دەبێتە بەڵگە لەسەری و ئەحکامی شەرعی لەسەر دادەمەزرێ).

**٢٣٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا زَنَتْ وَهِيَ حَامِلٌ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: اذْهَبِي حَتَّى تَضَعِي، فَلَمَّا وَضَعَتْ جَاءَتْهُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: اذْهَبِي حَتَّى تُرْضِعِيهِ، فَلَمَّا أَرْضَعَتْهُ جَاءَتْهُ، فَقَالَ: اذْهَبِي فَاسْتَوْدِعِيهِ، قَالَ: فَاسْتَوْدَعَتْهُ، ثُمَّ جَاءَتْ، فَأَمَرَ بِهَا، فَرُجِمَتْ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە (گوتوویەتی): ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی پێ دا بەوەی زینای کردووە و دووگیانە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بڕۆ تا منداڵەکە دادەنێیت، جا کاتێ منداڵەکەی دانا هاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بڕۆ تا شیری پێ دەدەیت، جا کاتێ شیری پێدا (و ماوەی شیرپێدانی تەواو بوو) هاتەوە لای، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ڕاسپاردەی بکە (واتە ببیە لای کەسێك تا ئاگاداری بێت و گەورەکردنی لەئەستۆ بگرێت)، دەڵێ: ئەویش ڕاسپاردەی کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەربارە دەرکرد و ڕەجم کرا.

**٢٣٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّهُمَا أَخْبَرَاهُ، أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: يَا رَسُولَ اللهِ، اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ، وَقَالَ الآخَرُ، وَهُوَ أَفْقَهُهُمَا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللهِ، فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ، وَائْذَنْ لِي فِي أَنْ أَتَكَلَّمَ، قَالَ: تَكَلَّمْ، فَقَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَأَخْبَرَنِي أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِئَةِ شَاةٍ، وَبِجَارِيَةٍ لِي، ثُمَّ إِنِّي سَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي: أَنَّ مَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِئَةٍ، وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا الرَّجْمُ عَلَى امْرَأَتِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ،

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٩ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٦ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

أَمَّا غَنَمُكَ وَجَارِيَتُكَ، فَرَدٌّ عَلَيْكَ، وَجَلَدَ ابْنَهُ مِئَةً، وَغَرَّبَهُ عَامًا، وَأَمَرَ أُنَيْسًا الأَسْلَمِيَّ، أَنْ يَأْتِيَ امْرَأَةَ الآخَرِ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ، رَجَمَهَا، فَاعْتَرَفَتْ، فَرَجَمَهَا[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرە و زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنییەوە ﷺ گێردراوەتەوە هەردووكیان هەواڵیان داوە (گوتوویانە): دوو پیاو كێشەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و یەكێكیان گوتی: بە پەرتووكی خوا دادوەریمان لە نێواندا بكە (واتە صوڵح و شتی وا ناكەین، حوكم چۆنە ئاوا دەكەین)، ئەوەی دیكەشیان ـ كە لەو تێگەیشتووتر بوو ـ (بەئەدەب و مۆڵەتوەرگرتنەوە قسەی كرد) گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە پەرتووكی خوا دادوەریمان لە نێواندا بكە و مۆڵەتم بدە بەوەی قسە بكەم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: قسە بكە، ئەویش گوتی: كوڕەكەم لەلای ئەو پیاوە كرێكار بووە و زینای لەگەڵ خێزانی كردووە، جا هاواڵی پێ داوم بەوەی كوڕەكەم ڕەجمی لەسەرە، منیش سەت بزن و جارییەیەكی خۆمم لەجیاتی داوەتێ، دواتر من پرسیارم لە زانایان كرد و هەواڵیان پێ دام بەوەی: كوڕەكەم سەد جەڵد و دوورخستنەوەی ساڵێكی لەسەرە، وە هەواڵیان پێ دام بەوەی خێزانی ئەو پیاوەش ڕەجمی لەسەرە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دەنا سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە دەبێ بە پەرتووكی خوا دادوەریتان لە نێوان بكەم، هەرچی بزنەكان و جارییەكەتە بۆ خۆت، جا سەت جەڵدی لە كوڕەكەی دا و ساڵێكیش دووری خستەوە و فەرمانیشی بە ئونەیسی ئەسلەمی كرد بەوەی بچێتە لای خێزانی پیاوەكەی دیكە (پرسیاری لێ بكا) ئەگەر ئیعتیڕافی كرد ڕەجمی بكات، جا ئیعتیڕافی كرد و ڕەجمی كرد.

**٢٣٨٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ لَوْ أَنِّي وَجَدْتُ مَعَ امْرَأَتِي رَجُلاً، أَأُمْهِلُهُ حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ[٢].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٠ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٥ في الحدود في الزنا؛ والشافعي: ٧٩٨؛ وفي: ١١٨٠؛ والبخاري: ٦٦٣٣ في الأيمان والنذور، وفي: ٦٨٤٢ في المحاربين؛ والنسائي: ٥٤١٠ في القضاة؛ وأبو داود: ٤٤٤٥ في الحدود؛ والترمذي: ١٤٣٣ في الحدود؛ والقابسي: ٥٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٢ في الحدود؛ وفي: ٢٩٨٢ في الرهون؛ والشافعي: ٩٧٥؛ وفي: ١٧٤٧؛ وابن حنبل: ١٠٠٠٨؛ ومسلم: اللعان: ١٥؛ وأبو داود: ٤٥٣٣ في الديات؛ وابن حبان: ٤٢٨٢، وفي: ٤٤٠٩؛

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئایا چی دەفەرمووی ئەگەر (فەرەزەن دامانتا) من پیاوێکم لەگەڵ خێزانەکەم بینی (لە کاتی خراپەکاری) ئایا واز لە پیاوەکە بێنم تا چوار شاهێد دێنم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

**٢٣٨١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: الرَّجْمُ فِي كِتَابِ اللهِ حَقٌّ، عَلَى مَنْ زَنَى مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا أُحْصِنَ، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ، أَوِ الاِعْتِرَافُ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیگوت: ڕەجم (حوکمەکەی) لە پەرتووکی خوادا ﷻ حەق و ڕاستە، لەسەر ئەو کەسەیە کە زینا دەکات لە پیاوان و ئافرەتان کاتێ هاوسەرایەتییان بینیبێ، ئەگەر شاهێدی یان سکپڕی یان ئیعتیراف پەیدا بوو (واتە یەکێك لەو سێ شتانە تاوانەکەیان پێ دەسەلمێت).

**٢٣٨٢-** عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَتَاهُ رَجُلٌ وَهُوَ بِالشَّامِ، فَذَكَرَ لَهُ، أَنَّهُ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، فَبَعَثَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ إِلَى امْرَأَتِهِ يَسْأَلُهَا عَنْ ذَلِكَ، فَأَتَاهَا وَعِنْدَهَا نِسْوَةٌ حَوْلَهَا، فَذَكَرَ لَهَا الَّذِي قَالَ زَوْجُهَا لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، وَأَخْبَرَهَا أَنَّهَا لاَ تُؤْخَذُ بِقَوْلِهِ، وَجَعَلَ يُلَقِّنُهَا أَشْبَاهَ ذَلِكَ لِتَنْزِعَ، فَأَبَتْ أَنْ تَنْزِعَ، وَثَبَتَتْ عَلَى الاِعْتِرَافِ، فَأَمَرَ بِهَا عُمَرُ ﷺ، فَرُجِمَتْ[٢].

واتە: لە ئەبو واقیدی لەیسییەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە کاتێکدا لە شام بوو پیاوێك هات بۆ لای و بۆی باس کرد بەوەی پیاوێکی لەگەڵ خێزانی خۆی بینیوە، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئەبو واقیدی لەیسی بۆ لای ئافرەتەکە نارد تا پرسیاری لێ بکات دەربارەی ئەوە،

---

والمنتقى لابن الجارود: ٧٨٦؛ والقابسي: ٤٤١، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٥ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٢ في الحدود في الزنا؛ والشافعي: ٧٩٦؛ وفي: ١٥٥٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٤ في الحدود؛ والشافعي: ١٥٥٧، عن مالك به.

ئەویش چوو بۆ لای لە کاتێکدا کۆمەڵە ئافرەتێکی لەدەورە بوون، جا ئەو شتەی بۆ باس کرد کە هاوسەرەکەی بە عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ گوتووە، وە هەواڵی پێ دا کە بە قسەی مێردەکەت ناگیرێی و (حوکم نادرێی و نابێتە بەڵگە لەسەرت تا خۆت ئیعتیراف نەکەیت)، جا هەر خەریك بوو شتی وای فێر دەکرد تا واز بێنێت و نەڵێت زینام کردووە، جا ئافرەتەکە ڕازی نەبوو واز بێنێت و پێداگر بوو لەسەر ئیعتیراف، بۆیە ئیمامی عومەر ﷺ فەرمانی دەربارە دەرکرد و ڕەجم کرا.

**٢٣٨٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ يَقُولُ: لَمَّا صَدَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ مِنْ مِنًى، أَنَاخَ بِالأَبْطَحِ، ثُمَّ كَوَّمَ كَوْمَةً بَطْحَاءَ، ثُمَّ طَرَحَ عَلَيْهَا رِدَاءَهُ، وَاسْتَلْقَى، ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: اللهُمَّ كَبِرَتْ سِنِّي، وَضَعُفَتْ قُطوتِي، وَانْتَشَرَتْ رَعِيَّتِي، فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مُضَيِّعٍ، وَلاَ مُفَرِّطٍ، ثُمَّ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، قَدْ سُنَّتْ لَكُمُ السُّنَنُ، وَفُرِضَتْ لَكُمُ الْفَرَائِضُ، وَتُرِكْتُمْ عَلَى الْوَاضِحَةِ، إِلاَّ أَنْ تَضِلُّوا بِالنَّاسِ يَمِينًا وَشِمَالاً، وَضَرَبَ بِإِحْدَى يَدَيْهِ عَلَى الأُخْرَى، ثُمَّ قَالَ: إِيَّاكُمْ أَنْ تَهْلِكُوا عَنْ آيَةِ الرَّجْمِ، أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: لاَ نَجِدُ حَدَّيْنِ فِي كِتَابِ اللهِ، فَقَدْ رَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَرَجَمْنَا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلاَ أَنْ يَقُولَ النَّاسُ: زَادَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى، لَكَتَبْتُهَا، الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ، فَإِنَّا قَدْ قَرَأْنَاهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ ﷺ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷺ: فَمَا انْسَلَخَ ذُو الْحِجَّةِ، حَتَّى قُتِلَ عُمَرُ ﷺ.

قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: قَوْلُهُ: الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ، يَعْنِي: الثَّيِّبَ وَالثَّيِّبَةَ، فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە مینا هاتەوە، وشترەکەی لە ئەبتەح یەخ کرد، دواتر هەندێك چەگری کۆکردەوە، دواتر عەباکەی خۆی بەسەردا دا و لەسەر پشت ڕاکشا، دواتر دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و گوتی: پەروەردگارا تەمەنم گەورە بووە و هێزم

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٦ في الحدود؛ وفي: ١٧٦٧ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٣ في الحدود في الزنا؛ والشافعي: ٧٩٧، كلهم عن مالك به.

کەم بووه و هاوڵاتییه‌کانم بڵاو بوونه‌ته‌وه (ژماره‌یان زۆر بووه و له پانتایی زۆردا بڵاو بوونه‌ته‌وه و ده‌وڵه‌ت فراوان بووه)، جا بۆ لای خۆت بمبه‌ره‌وه به‌بێ ئه‌وه‌ی ببم به زایه‌ده‌ر و که‌مته‌رخه‌م، دواتر چوو بۆ مه‌دینه و وتاری بۆ خه‌ڵکی دا و گوتی: ئه‌ی خه‌ڵکینه، سوننه‌تتان بۆ دیاری کراوه و واجبتان بۆ دیاری کراوه و جێهێشتراون له‌سه‌ر ڕێگه‌ی ڕوون و ئاشکرا، (گومڕا نابن) ته‌نها ئه‌گه‌ر خۆتان گومڕاییتان بوێ و خه‌ڵکی لابده‌ن به‌لای ڕاست و چه‌پدا، جا ده‌ستێکیانی له ده‌سته‌که‌ی دیکه‌ی دا، دواتر گوتی: نه‌که‌ن به‌هیلاك بچن ده‌رباره‌ی ئایه‌تی ڕه‌جم، به‌وه‌ی که‌سێك بڵێت: دوو سزا نابینین له په‌رتووکی خوادا، به دڵنیایی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ڕه‌جمی کرد و ئێمه‌ش ڕه‌جمان کرد، جا سوێند به‌وه‌ی گیانی منی به ده‌سته، ئه‌گه‌ر خه‌ڵك نه‌یانگوتبایه: عومه‌ری کوڕی خه‌تتاب قوڕئانی زیاد کردووه ئه‌وه (ئایه‌ته مه‌نسوخه‌که‌م) ده‌نووسییه‌وه (که بریتییه له): ((الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ))، ئێمه پێشتر خوێندوومانه‌ته‌وه.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویه‌تی: یه‌حیای کوڕی سه‌عید ﷺ گوتی: سه‌عیدی کوڕی موسه‌یه‌ب ﷺ گوتی: جا مانگی زولحیججه ته‌واو نه‌بوو تا عومه‌ر ﷺ کوژرا (نزاکه‌ی قبووڵ بوو که گوتی: خوایه بۆخۆتم ببه‌یته‌وه).

یه‌حیا ﷺ گوتوویه‌تی: گوێم له ئیمامی مالیك ﷺ بوو ده‌یگوت: «الشيخ والشيخة» واته: پیاو و ئافره‌تی هاوسه‌ردار، ڕه‌جم بکه‌ن به‌بێ گومان.

**٢٣٨٤-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ أُتِيَ بِامْرَأَةٍ قَدْ وَلَدَتْ فِي سِتَّةِ أَشْهُرٍ، فَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُرْجَمَ، فَقَالَ لَهُ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: لَيْسَ ذَلِكَ عَلَيْهَا، إِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴿١٥﴾ ﴾ الأحقاف، وَقَالَ: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة، فَالْحَمْلُ يَكُونُ سِتَّةَ أَشْهُرٍ فَلاَ رَجْمَ عَلَيْهَا، فَبَعَثَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ فِي أَثَرِهَا، فَوَجَدَهَا قَدْ رُجِمَتْ[1].

واته: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم پێی گه‌یشتووه به‌وه‌ی عوسمانی کوڕی عه‌ففان ﷺ ئافره‌تێکیان هێناوه بۆ لای که به شه‌ش مانگ (دوای هاوسه‌رگیری)

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٣ في الحدود، عن مالك به.

منالی بووە، جا فەرمانی دەربارە دەرکرد ڕەجم بکرێت، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش ﷛ پێی گوت: ڕەجمی لەسەر نییە، خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا دەفەرموێ: ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴿١٥﴾ ﴾ الأحقاف، واتە: [ماوەی دووگیانبوون و لێبوونەوەی شیر سی مانگە]، وە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: [با دایکان دوو ساڵی تەواو شیر بدەن بە منالەکانیان، (ئەمە) بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیری تەواو بدات]، کەواتە ماوەی دووگیانی هەیە شەش مانگە، کەواتە ڕەجمی لەسەر نییە، جا عوسمانی کوڕی عەففان ﷛ بەدوایدا نارد (تا بڵێت ڕەجمی مەکەن)، بینیان ڕەجم کرابوو.

**٢٣٨٥-** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷀ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷀ عَنِ الَّذِي يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷀ: عَلَيْهِ الرَّجْمُ، أَحْصَنَ أَوْ لَمْ يُحْصِنْ[١].

واتە: ئیمامی مالیك ﷀ بۆی باس کردم پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷀ کردووە دەربارەی ئەو کەسەی کردەوەی قەومی لوت ئەنجام دەدات (واتە نێربازی ئەنجام دەدات)، ئیبنو شیهاب ﷀ گوتی: ڕەجمی لەسەرە، هاوسەرگیری کردبێ یان هاوسەرگیری نەکردبێ.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی ئیعتیراف لەسەر خۆی دەکات بە زینا[٢]

**٢٣٨٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷀ، أَنَّ رَجُلاً اعْتَرَفَ عَلَى نَفْسِهِ بِالزِّنَا، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَدَعَا لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِسَوْطٍ، فَأُتِيَ بِسَوْطٍ مَكْسُورٍ، فَقَالَ: فَوْقَ هَذَا، فَأُتِيَ بِسَوْطٍ جَدِيدٍ لَمْ تُقْطَعْ ثَمَرَتُهُ، فَقَالَ: دُونَ هَذَا، فَأُتِيَ بِسَوْطٍ قَدْ رُكِبَ بِهِ وَلاَنَ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَجُلِدَ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، قَدْ آنَ لَكُمْ أَنْ تَنْتَهُوا عَنْ حُدُودِ اللهِ، مَنْ أَصَابَ مِنْ هَذِهِ الْقَاذُورَاتِ شَيْئًا، فَلْيَسْتَتِرْ بِسِتْرِ اللهِ، فَإِنَّهُ مَنْ يُبْدِي لَنَا صَفْحَتَهُ، نُقِمْ عَلَيْهِ كِتَابَ اللهِ[٣].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٨ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِيمَنِ اعْتَرَفَ عَلَى نَفْسِهِ بِالزِّنَا.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦٩ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٨ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئیعتیرافی لەسەر خۆی کرد بە زینا، پێغەمبەری خواش ﷺ داوای قامچییەکی بۆ کرد، جا قامچییەکی شکاویان بۆ هێنا، ئەویش فەرمووی: یەکێکی باشتر، ئینجا قامچییەکی نوێیان بۆ هێنا سەرەکانی نەبڕابوو (زۆر بەهێز بوو)، فەرمووی: (ئەوەش نا) لەوە بێهێزتر، ئەو جارەیان قامچییەکیان بۆ هێنا کاری پێ کرابوو و نەرم ببوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەربارە دەرکرد و جەڵدی لێ درا، دواتر فەرمووی: ئەی خەڵکینە، کاتی ئەوەیە واز بێنن لە سنوورەکانی خوا ﷻ (چیتر نەیبەزێنن زینا و کارە قێزەونەکان ڕاگرن)، هەر کەسێکیش تووشی ئەو شتە پیسانە بێت، با خۆی بە سەتری خوا داپۆشێت (ئەگەر خوا ئاشکرای نەکرد)، چونکە هەر کەسێك خۆی دەربخات لێمان (بڵێت زینام کردووە)، ئەوە حوکمی پەرتووکی خوای بەسەردا جێبەجێ دەکەین.

**٢٣٨٧-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ أَبِي عُبَيْدٍ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ وَقَعَ عَلَى جَارِيَةٍ بِكْرٍ، فَأَحْبَلَهَا، ثُمَّ اعْتَرَفَ عَلَى نَفْسِهِ بِالزِّنَا، وَلَمْ يَكُنْ أَحْصَنَ، فَأَمَرَ بِهِ أَبُو بَكْرٍ، فَجُلِدَ الْحَدَّ، ثُمَّ نُفِيَ إِلَى فَدَكَ[1].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): صەفییەی کچی ئەبو عوبەید هەواڵی پێ داوە (گوتوویەتی): پیاوێك هێنرا بۆ لای ئەبو بەکری صددیق ﷺ کە زینای لەگەڵ ئافرەتێکی کۆیلەی کچ کردبوو و دووگیانی کردبوو، دواتر پیاوەکە ئیعتیرافی لەسەر خۆی کرد بە زینا، پێشتریش هاوسەرگیری نەکردبوو، جا ئیمامی ئەبو بەکر فەرمانی دەربارە دەرکرد و جەڵدی سزای لێ درا، دواتر دوور خرایەوە بۆ ناوچەی فەدەك.

**٢٣٨٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الَّذِي يَعْتَرِفُ عَلَى نَفْسِهِ بِالزِّنَا، ثُمَّ يَرْجِعُ عَنْ ذَلِكَ وَيَقُولُ: لَمْ أَفْعَلْ، وَإِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنِّي عَلَى وَجْهِ كَذَا وَكَذَا، لِشَيْءٍ يَذْكُرُهُ: إِنَّ ذَلِكَ يُقْبَلُ مِنْهُ، وَلاَ يُقَامُ

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٠ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٩ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

عَلَيْهِ الْحَدُّ، وَذَلِكَ أَنَّ الْحَدَّ الَّذِي هُوَ لِلَّهِ، لاَ يُؤْخَذُ إِلاَّ بِأَحَدِ وَجْهَيْنِ، إِمَّا بِبَيِّنَةٍ عَادِلَةٍ، تُثْبِتُ عَلَى صَاحِبِهَا، وَإِمَّا بِاعْتِرَافٍ يُقِيمُ عَلَيْهِ، حَتَّى يُقَامَ عَلَيْهِ الْحَدُّ، فَإِنْ أَقَامَ عَلَى اعْتِرَافِهِ، أُقِيمَ عَلَيْهِ الْحَدُّ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو کەسەی ئیعتیراف لەسەر خۆی دەکات بە زینا، دواتر لە ئیعتیرافەکە پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێت: نەمکردووە، بەڵکوو تەنها لەسەر ئەو شێوازە و ئەو شێوازە ئەنجامم دا وامزانی زینایە، باسی شتێك بکات (بۆ نموونە بڵێ: لە کاتی حەیز چووم بۆ لای خێزانم و وامزانی ئەوە زینایە، یان خۆم دامرکاند بە ئافرەتیك لە کاتێکدا نزیکی ئەندامی پێشەوە و دواوە نەکەوتم، بەڵام وامزانی ئەوەش هەر زینایە، جا ڕاست بکات و ڕاست نەکات) لێی قبووڵ دەکرێت و سزای شەرعی بەسەردا جێبەجێ ناکرێ (چونکە گومان دروست بوو، سزای شەرعیش گومانی بکەوێتە ناو جێبەجێ ناکرێ)، چونکە ئەو سزایەی حەقی خوایە بە دوو شێواز نەبێ جێبەجێ ناکرێ: یان دەبێ بە بەڵگە و شاهێدی عادیل بچەسپێ بەسەر ئەنجامدەری کارەکە، یان بە ئیعتیراف کە خۆی پێی هەڵسێ، تا سزاکەی لەسەر جێبەجێ ببێت، جا ئەگەر هەر لەسەر ئیعتیرافەکەی مایەوە (پەشیمان نەبۆیەوە)، ئەوە سزاکەی لەسەر جێبەجێ دەبێ.

٢٣٨٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا: أَنَّهُ لاَ نَفْيَ عَلَى الْعَبِيدِ إِذَا زَنَوْا(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوەی لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (ئەوەیە): کۆیلەکان دوورخستنەوەیان لەسەر نییە کاتێ زینا دەکەن.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧١ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٦ في الحدود، عن مالك به.

## ٣- بابەتی جۆراوجۆر لەوەی هاتووە دەربارەی سزای زینا[١]

**٢٣٩٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الأَمَةِ إِذَا زَنَتْ وَلَمْ تُحْصِنْ؟ فَقَالَ: إِنْ زَنَتْ، فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ، فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ، فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ بِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: لاَ أَدْرِي أَبَعْدَ الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ.

قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: وَالضَّفِيرُ، الْحَبْلُ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە ﷺ, گێڕدراوەتەوە گوتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئافرەتی کۆیلە کاتێ زینا دەکات و هاوسەرگیری نەکردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر زینای کرد جەڵدی لێ بدەن، دواتر ئەگەر زینای کردەوە ئەوە جەڵدی لێ بدەن، دواتر ئەگەر زینای کردەوە ئەوە جەڵدی لێ بدەن، دواتر بیفرۆشن و بیگۆڕنەوە ئەگەر بە گوریسێك و پەتێکیش بێت (چونکە بێکەڵکە و هەر بیری لەسەر بەدڕەوشتییە).

ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: نازانم لەدوای جاری سێیەم یان چوارەم بوو (فەرمووی: بیفرۆشن).

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: «الضَّفِير» بریتییە لە: حەبل و گوریس.

**٢٣٩١**- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدًا كَانَ يَقُومُ عَلَى رَقِيقِ الْخُمُسِ، وَأَنَّهُ اسْتَكْرَهَ جَارِيَةً مِنْ ذَلِكَ الرَّقِيقِ، فَوَقَعَ بِهَا، فَجَلَدَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، وَنَفَاهُ، وَلَمْ يَجْلِدِ الْوَلِيدَةَ، لأَنَّهُ اسْتَكْرَهَهَا[٣].

---

(١) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي حَدِّ الزِّنَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٢ في الحدود؛ والشيباني: ٧٠٥ في الحدود في الزنا؛ وابن حنبل: ١٧٠٩٨؛ والبخاري: ٢١٥٣ في البيوع، وفي: ٦٨٣٧ في المحاربين؛ ومسلم: الحدود: ٣٢؛ وأبو داود: ٤٤٦٩ في الحدود؛ والترمذي: ١٤٣٣ في الحدود؛ وابن حبان: ٤٤٤٤؛ والمنتقى لابن الجارود: ٨٢٠؛ والدارمي: ٢٣٢٦ في الحدود؛ والقابسي: ٥٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٣ في الحدود؛ والشيباني: ٧٠٢ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێکی کۆیلە هەبوو کاروباری کۆیلەکانی پێنجیەکی دەسکەوتی بەڕێوە دەبرد، جا ئافرەتێکی کۆیلەی لەوانی ناچار کردبوو و زۆری لێ کردبوو زینای لەگەڵ کردبوو، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ جەڵدی سزای زینای لێ دا و دووریشی خستەوە، جەڵدی لە ئافرەتە کۆیلەکە نەدا، چونکە پیاوەکە زۆری لێ کردبوو.

**٢٣٩٢-** أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ الْمَخْزُومِيَّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ فِي فِتْيَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَجَلَدْنَا وَلاَئِدَ مِنْ وَلاَئِدِ الإِمَارَةِ، خَمْسِينَ خَمْسِينَ فِي الزِّنَا[١].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعەی مەخزومی ﷺ گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ فەرمانی بە من کرد لەگەڵ چەند گەنجێکی قوڕەیش، جا چووین جەڵدمان لە ئافرەتانی کۆیلەی زیناکەر دا، هەر یەکەی چەنجا جەڵد (چونکە ئەوان نیوەی کەسی ئازادیان لێ دەدرێت).

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو ئافرەتەی دەستدرێژی کراوەتە سەر (ئیغتیصاب کراوە)[٢]

**٢٣٩٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْمَرْأَةِ تُوجَدُ حَامِلاً وَلاَ زَوْجَ لَهَا، فَتَقُولُ: قَدِ اسْتُكْرِهْتُ، أَوْ تَقُولُ: تَزَوَّجْتُ، إِنَّ ذَلِكَ لاَ يُقْبَلُ مِنْهَا، وَإِنَّهَا يُقَامُ عَلَيْهَا الْحَدُّ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَهَا عَلَى مَا ادَّعَتْ مِنَ النِّكَاحِ بَيِّنَةٌ، أَوْ عَلَى أَنَّهَا اسْتُكْرِهَتْ، أَوْ جَاءَتْ تَدْمَى إِنْ كَانَتْ بِكْرًا، أَوِ اسْتَغَاثَتْ حَتَّى أُتِيَتْ وَهِيَ عَلَى ذَلِكَ الْحَالِ، أَوْ مَا أَشْبَهَ هَذَا مِنَ الأَمْرِ الَّذِي تَبْلُغُ بِهِ فَضِيحَةَ نَفْسِهَا، قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَأْتِ بِشَيْءٍ مِنْ هَذَا، أُقِيمَ عَلَيْهَا الْحَدُّ، وَلَمْ يُقْبَلْ مِنْهَا مَا ادَّعَتْ مِنْ ذَلِكَ[٣].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٤ في الحدود؛ والشيباني: ٧٠٤ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْمُغْتَصَبَةِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٥ في الحدود، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو ئافرەتەی دووگیان دەبێ و مێردیشی نییە و دەڵێت: ناچار کراوم و دەستدرێژیم کراوەتە سەر، یان دەڵێت: مێردم کردووە (بەو پیاوەی کە لەگەڵی جووت بووم)، ئەوەی لێ قبووڵ ناکرێ و سزای شەرعی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، تەنها لەو کاتە نەبێت کە بەڵگە و شاهێدی هەبێت لەسەر مێردکردنەکەی یان لەسەر ئەوەی ناچار کراوە و دەستدرێژی کراوەتە سەر، یان (ئەو کاتەی ئەو شتەی بەسەر هاتووە) بە خوێنەوە هاتبێت ئەگەر کچ بووبێت (تا بیسەلمێنێت دەستدرێژی کراوەتە سەر)، یان (ئەو کات) داوای بەهاناوەچوونی کردبێت و چووبن بۆ لای و ئەویش لەو حاڵەتەدا بووبێت (خوێنی پێوە بووبێت)، یان شتێکی لەو شێوەیە کە فەزیحەتی خۆی پێ بە خەڵکی بگەیەنێت، (ئیمامی مالیك رحمه الله) گوتوویەتی: ئەگەر بەڵگەیەکی لەو جۆرە نەهێنێ، ئەوە سزای شەرعی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ و ئەوەی لێ قبووڵ ناکرێ کە بانگەشەی بۆ دەکات.

**٢٣٩٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷬: وَالْمُغْتَصَبَةُ لاَ تَنْكِحُ حَتَّى تَسْتَبْرِئَ نَفْسَهَا، بِثَلاَثِ حِيَضٍ، فَإِنِ ارْتَابَتْ مِنْ حَيْضَتِهَا، فَلاَ تَنْكِحُ حَتَّى تَسْتَبْرِئَ نَفْسَهَا مِنْ تِلْكَ الرِّيبَةِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەو ئافرەتەی دەستدرێژی کراوەتە سەر (ئیغتیصاب کراوە) نابێ شوو بکات تا ڕەحمی خۆی بەری دەکات، بە بینینی سێ حەیز (ئەگەر ئافرەتی ئازاد بوو)، جا ئەگەر لە حەیزەکەی بەگومان بوو (نەیدەزانی تەواو بووە یان نا)، ئەوە نابێ شوو بکات تاوەکوو ڕەحمی خۆی (بەدڵنیایی) بەری دەکات لەو گومانە (دەبێ دڵنیا بێ سێ حەیزی بینیوە).

## ٥- سزای شەرعی دەربارەی بوختانی ناموس و دەربارەی دوورخستنەوە و پەلار[1]

**٢٣٩٥-** عَنْ أَبِي الزِّنَادِ ﷬، أَنَّهُ قَالَ: جَلَدَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ عَبْدًا فِي فِرْيَةٍ ثَمَانِينَ.

---

(١) ـ الْحَدُّ فِي الْقَذْفِ وَالنَّفْيِ وَالتَّعْرِيضِ.

قَالَ أَبُو الزِّنَادِ ﵀: فَسَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﵀ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: أَدْرَكْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﵄، وَالْخُلَفَاءَ هَلُمَّ جَرًّا، فَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا جَلَدَ عَبْدًا فِي فِرْيَةٍ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ[1].

واتە: لە ئەبو زینــادەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومـــەری كــوڕی عەبدولعەزیز ﵀ هەشتا جەڵدی لە كۆیلەیەك دا دەربارەی بوختان.

ئەبو زیناد ﵀ گوتوویەتی: جا پرسیارم لە عەبدوڵڵای كوڕی عامری كوڕی ڕەبیعە ﵀ كرد دەربارەی ئەوە، ئەویش گوتی: گەیشتووم بە عومەری كوڕی خەتتاب و عوسمانی كوڕی عەففان و خەلیفەكانی دیكەش ﵃، كەسم نەبینیوە لە چل قامچی زیاتر لە كۆیلە بدات دەربارەی بوختان.

**٢٣٩٦-** عَنْ رُزَيْقِ بْنِ حَكِيمٍ الأَيْلِيِّ ﵀، أَنَّ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ: مِصْبَاحٌ، اسْتَعَانَ ابْنًا لَهُ، فَكَأَنَّهُ اسْتَبْطَأَهُ، فَلَمَّا جَاءَهُ قَالَ لَهُ: يَا زَانٍ، قَالَ رُزَيْقٌ: فَاسْتَعْدَانِي عَلَيْهِ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَجْلِدَهُ، قَالَ ابْنُهُ: وَاللَّهِ لَئِنْ جَلَدْتَهُ لأَبُوءَنَّ عَلَى نَفْسِي بِالزِّنَا، فَلَمَّا قَالَ ذَلِكَ: أَشْكَلَ عَلَيَّ أَمْرُهُ، فَكَتَبْتُ فِيهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀، وَهُوَ الْوَالِي يَوْمَئِذٍ، أَذْكُرُ لَهُ ذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيَّ عُمَرُ ﵀، أَنْ أَجِزْ عَفْوَهُ[2].

قَالَ رُزَيْقٌ ﵀: وَكَتَبْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ أَيْضًا: أَرَأَيْتَ رَجُلاً افْتُرِيَ عَلَيْهِ، أَوْ عَلَى أَبَوَيْهِ، وَقَدْ هَلَكَا، أَوْ أَحَدُهُمَا، قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ عُمَرُ ﵀: إِنْ عَفَا فَأَجِزْ عَفْوَهُ فِي نَفْسِهِ، وَإِنِ افْتُرِيَ عَلَى أَبَوَيْهِ، وَقَدْ هَلَكَا، أَوْ أَحَدُهُمَا، فَخُذْ لَهُ بِكِتَابِ اللهِ، إِلاَّ أَنْ يُرِيدَ سَتْرًا[3].

واتە: لە زوڕەیقی كوڕی حەكیمی ئەیلییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پێی دەگوترا: میصباح، داوای یارمەتی لە كوڕێكی خۆی كرد، ئەویش وەك بڵێی خۆی دوا خست (خاو و خلیچكی كرد)، جا كاتێ كوڕەكە چوو بۆ لای باوكی، باوكی پێی گوت: هەی زیناكار، زوڕەیق دەڵێ: (كوڕەكە لەسەر ئەو بوختانە) داوای یارمەتی لێ كردم (بەوەی باوكی لێپێچینەوەی لەگەڵ بكرێت

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٨ في الحدود؛ والشيباني: ٧٠٦ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨٠ في الحدود، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨١ في الحدود، عن مالك به.

بەهۆی ئەو قسەوە)، جا كاتێ ویستم قامچی بوختان جێبەجێ بكەم (بەسەر باوكی)، كوڕەكەی گوتی: سوێند بە خوا لێی بدەی ئیعتیراف دەكەم لەسەر خۆم بە زینا (تا قامچی لە باوكم نەدرێت)، دەڵێ: جا كاتێ ئەوەی گوت: ئیشكالم بۆ دروست بوو لە كارەكەیان (نەمزانی چی بكەم)، بۆیە نووسراوێكم دەربارە نووسی بۆ عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ، لە كاتێكدا لەو ڕۆژگارەدا كاربەدەست بوو، باسی ئەوەم بۆ كرد، جا عومەر ﷺ بۆی نووسیم: لێخۆشبوون جێبەجێ بكە.

زوڕەیق ﷺ گوتوویەتی: هەروەها نووسراوم كرد بۆ عومەری كوڕی عەبدولعەزیز (نووسیم): چی دەڵێی كەسێك بوختانی پێ بكرێت یان بوختان بە دایك و باوكی بكرێت لە كاتێكدا دایك و باوكی یان یەكێكیان مردووە، دەڵێ: ئیمامی عومەر ﷺ بۆی نووسیم: ئەگەر (بوختانەكە لەسەر خۆی بوو) و لە كەسەكە خۆش بوو، ئەوە لێخۆشبوونەكەی جێبەجێ بكە، وە ئەگەر بوختان بە دایك و باوكی كرابوو و ئەوانیش هەردووكیان یان یەكێكیان مردبوو، ئەوە بە پەرتووكی خوا حەقی بۆ وەرگرەوە (سزا جێبەجێ بكە لەسەر ئەو كەسەی بوختانی كردووە)، تەنها لەو كاتە نەبێت كە كەسەكەی بوختانی پێ كراوە مەبەستی بێت ستر بكرێت (بەوەی بترسێت بەڵگە پەیدا بێت لەسەر قسەی بوختانكەرەكە، با ئەو كات لێی گەڕێ).

**٢٣٩٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: وَذَلِكَ أَنْ يَكُونَ الرَّجُلُ الْمُفْتَرَى عَلَيْهِ يَخَافُ إِنْ كُشِفَ ذَلِكَ مِنْهُ، أَنْ تَقُومَ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ، فَإِذَا كَانَ عَلَى مَا وَصَفْتُ، فَعَفَا، جَازَ عَفْوُهُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: (ڕوونكردنەوەی ئەوەی پێشوو ئەوەیە) كەسە بوختانپێكراوەكە بترسێت ئەگەر ئەو قسەیەی دەربارەی ئاشكرا بێت (و بڵاو ببێتەوە)، بەڵگەی لەسەر پەیدا بێت (بەوەی ڕاستە زینای كردووە)، جا ئەگەر بەو شێوەیە بوو كە بۆم باس كردی، لێخۆشبوونی دروستە (سزا لەسەر بوختانكەرەكە جێبەجێ مەكە، با كەسەكەی بوختانی پێ كراوە بابەتەكەی بڵاو نەبێتەوە و بەڵگەی لەسەر پەیدا نەبێ).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨١ في الحدود، عن مالك به.




**٢٣٩٨-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ فِي رَجُلٍ قَذَفَ قَوْمًا جَمَاعَةً: أَنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ إِلاَّ حَدٌّ وَاحِدٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ تَفَرَّقُوا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ إِلاَّ حَدٌّ وَاحِدٌ[١].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەربارەی پیاوێك کە بوختان بە قەومێك دەکات بە تێکڕا، گوتوویەتی: هیچی لەسەر نییە جگە لە یەك حەد (واتە یەك جار هەشتا قامچی لێ دەدرێ، بە ژمارەی قەومەکە سزا نادرێ، ناوترێ بوختانی بە تاك تاکیان کردووە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچەندە خەڵکەکە لێکیش جیا ببنەوە (هەر بە یەك پارچە حیسابن)، لە یەك سزا زیاتر لەسەر بوختانکەرەکە نییە.

**٢٣٩٩-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ رَجُلَيْنِ اسْتَبَّا فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلآخَرِ: وَاللَّهِ مَا أَبِي بِزَانٍ، وَلاَ أُمِّي بِزَانِيَةٍ، فَاسْتَشَارَ فِي ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ قَائِلٌ: مَدَحَ أَبَاهُ وَأُمَّهُ، وَقَالَ آخَرُونَ: قَدْ كَانَ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ مَدْحٌ غَيْرُ هَذَا، نَرَى أَنْ تَجْلِدَهُ الْحَدَّ، فَجَلَدَهُ عُمَرُ ﷺ الْحَدَّ ثَمَانِينَ[٢].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): دوو پیاو جوێنیان بە یەکدی دا لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، یەکێکیان بەوەی دیکەی گوت: سوێند بە خوا نە باوکم زیناکەرە و نەدایکیشم زیناکەرە، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ڕاوێژی کرد دەربارەی ئەوە (ئاخۆ ئەو قسەیە لە ڕووی عادەت و زمانەوانییەوە چی دەگەیەنێ)، یەکێك گوتی: تەنها ستاییشی باوك و دایکی خۆی کردووە، ئەوانەی دیکە گوتیان: ستاییشی دیکە بۆ دایك و باوکی هەبووە دەیتوانی ستاییشی دیکە بکات (نەك ئەو قسەیە بکات)، پێمان باشە قامچی بوختانی لێ بدەی، جا عومەر ﷺ هەشتا قامچی بوختانی لێ دا (چونکە قسەکە

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨٢ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧٩ في الحدود؛ والشيباني: ٧٠٨ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

زیاتر پەلار دەگەیەنێ بۆ بەرانبەرەکەی، وەك بڵێی مەبەستی وا بووە دایك و باوکی تۆ زیناکەر بوون نەك هی من).

**٢٤٠٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ حَدَّ عِنْدَنَا إلاَّ فِي نَفْيٍ أَوْ قَذْفٍ أَوْ تَعْرِيضٍ، يُرَى أَنَّ قَائِلَهُ إِنَّمَا أَرَادَ بِذَلِكَ نَفْيًا أَوْ قَذْفًا، فَعَلَى مَنْ قَالَ ذَلِكَ الْحَدُّ تَامًّا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: سزای بوختان نییە تەنها لە نەفیکردنی نەسەبی کەسێك نەبێت یان لە تۆمەتبارکردن بە زینا یان لە پەلار، (بە مەرجێك، پەلارێك بێت) بزانرێت قسەکەرەکە مەبەستی پێ نەفی نەسەبی کەسەکە بێت یان تۆمەتبارکردن بێت بە زینا، (ئەو کات) ئەوەی وا بڵێت سزای تەواوی لەسەرە (کە بریتییە لە هەشتا قامچی).

**٢٤٠١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ إِذَا نَفَى رَجُلٌ رَجُلاً مِنْ أَبِيهِ، فَإِنَّ عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَإِنْ كَانَتْ أُمُّ الَّذِي نُفِيَ مَمْلُوكَةً، فَإِنَّ عَلَيْهِ الْحَدَّ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لای ئێمە کەسێك کەسێك لابدات لە باوکی (بڵێت فڵان کەس باوکی ئەو نییە، لە کاتێکدا باوکی دیار بێت)، ئەوە سزای بوختانی لەسەرە، جا هەرچەندە دایکی ئەو کەسەی کە باوکی نەفی دەکات کۆیلەش بێت، هەر سزای بوختانی لەسەرە.

## ٦- ئەو شتەی سزای تیا نییە[3]

**٢٤٠٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا سُمِعَ فِي الأَمَةِ يَقَعُ بِهَا الرَّجُلُ وَلَهُ فِيهَا شِرْكٌ: أَنَّهُ لاَ يُقَامُ عَلَيْهِ الْحَدُّ، وَأَنَّهُ يُلْحَقُ بِهِ الْوَلَدُ، وَتُقَوَّمُ عَلَيْهِ الْجَارِيَةُ حِينَ حَمَلَتْ، فَيُعْطَى شُرَكَاؤُهُ حِصَصَهُمْ مِنَ الثَّمَنِ، وَتَكُونُ الْجَارِيَةُ لَهُ، وَعَلَى هَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا[4].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨٣ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨٤ في الحدود، عن مالك به.

(٣) ـ مَا لَا حَدَّ فِيهِ.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨٥ في الحدود، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاكترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی ئافرەتی كۆیلە كە پیاوێك لەگەڵی جووت دەبێت و پیاوەكە خۆی پشكی تێدا هەبێت، گوتوویەتی: سزای شەرعی لەسەر جێبەجێ نابێت و منداڵەكە نەسەبی دەلكێندرێت بەوەوە و جارییەكەش نرخەكەی دەخەمڵێندرێت كاتێ دووگیان دەبێت، جا شەریكەكان پشكەكانی خۆیان پێ دەدرێت لە نرخەكە و جارییەكە دەبێتە هی ئەو، بابەتەكە لەسەر ئەوەیە لەلای ئێمە.

**٢٤٠٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُحِلُّ لِلرَّجُلِ جَارِيَتَهُ: إِنَّهُ إِنْ أَصَابَهَا الَّذِي أُحِلَّتْ لَهُ، قُوِّمَتْ عَلَيْهِ يَوْمَ أَصَابَهَا حَمَلَتْ أَوْ لَمْ تَحْمِلْ، وَدُرِئَ عَنْهُ الْحَدُّ بِذَلِكَ، فَإِنْ حَمَلَتْ، أُلْحِقَ بِهِ الْوَلَدُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی جارییەكەی خۆی بۆ پیاوێك حەڵاڵ دەكات، گوتوویەتی: ئەگەر ئەو پیاوەیان بچێتە لای كە بۆی حەڵاڵ كراوە، ئەوە جارییەكەی بەسەردا دەنرخێندرێت لەو ڕۆژەی لەگەڵی جووت بووە، دووگیان بووبێت یان دووگیان نەبووبێت، سزای زیناشی لەسەر لادەدرێت (چونكە بۆی حەڵاڵ كراوە)، جا ئەگەر دووگیانیش بوو ئەوە نەسەبی منداڵەكە دەلكێندرێت بەوەوە.

**٢٤٠٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَقَعُ عَلَى جَارِيَةِ ابْنِهِ أَوِ ابْنَتِهِ: إِنَّهُ يُدْرَأُ عَنْهُ الْحَدُّ، وَتُقَامُ عَلَيْهِ الْجَارِيَةُ، حَمَلَتْ أَوْ لَمْ تَحْمِلْ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی تووشی جووتبوون دەبێت لەگەڵ جارییەی كوڕەكەی یان جارییەی كچەكەی، گوتوویەتی: سزای زینای لەسەر لادەدرێت (جێبەجێ ناكرێت) و جارییەكەش بەسەریدا دەنرخێندرێت (پارەكەی دەدات و دەبێتە هی ئەو) دووگیان ببێت یان دووگیان نەبێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨٦ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٨٧ في الحدود، عن مالك به.

**٢٤٠٥**- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ خَرَجَ بِجَارِيَةٍ لامْرَأَتِهِ مَعَهُ فِي سَفَرٍ، فَأَصَابَهَا فَغَارَتِ امْرَأَتُهُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: وَهَبَتْهَا لِي، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: لَتَأْتِينِي بِالْبَيِّنَةِ، أَوْ لأَرْمِيَنَّكَ بِالْحِجَارَةِ، قَالَ: فَاعْتَرَفَتِ امْرَأَتُهُ أَنَّهَا وَهَبَتْهَا لَهُ[١].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە پیاوێکی گوت کە جارییەی خێزانەکەی خۆی لەگەڵ خۆی برد بۆ سەفەر و لەگەڵی جووت بوو و خێزانەکەی غیرە گرتی و ئەوەی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ باس کرد، ئیمامی عومەریش ﷺ پرسیاری لە پیاوەکە کرد دەربارەی ئەوە (کە ئاخۆ چۆن دەبێ جووت ببی لەگەڵ ئافرەتێك کە هی خۆت نییە)، ئەویش گوتی: خێزانەکەم بە دیاری داویەتی بە من، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: یان بەڵگەم بۆ دەهێنی یان بە بەرد ڕەجمت دەکەم، دەڵێ: جا ئافرەتەکە ئیعتیرافی کرد بەوەی ئەو خۆی بەدیاری داویەتی پێی.

## ٧- ئەوەی دەستبڕینی پێ واجب دەبێت[٢]

**٢٤٠٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ، ثَمَنُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزی بڕیوە لەسەر قەڵغانێك کە قیمەتەکەی سێ درهەم بووە.

**٢٤٠٧**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ الْمَكِّيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ مُعَلَّقٍ، وَلاَ فِي حَرِيسَةِ جَبَلٍ، فَإِذَا آوَاهُ الْمُرَاحُ أَوِ الْجَرِينُ، فَالْقَطْعُ فِيمَا يَبْلُغُ ثَمَنَ الْمِجَنِّ[٤].

---

(١) ـ موقوف ضعيف.

(٢) ـ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه الشيباني: ٦٨٦ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٤٤؛ وابن حنبل: ٥٣١٠؛ والبخاري: ٦٧٩٥ في الحدود؛ ومسلم: الحدود: ٦؛ والنسائي: ٤٩٠٨ في قطع السارق؛ وأبو داود: ٤٣٨٥ في الحدود؛ وابن حبان: ٤٤٦٣؛ والقابسي: ٢٤٦، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ حسن. أخرجه الشيباني: ٦٨٣ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٥٢، عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو حەسەنی مەکییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستبڕین نییە لە دزینی بەروبووم کە هێشتا بەسەر دارەوەیە، وە دەستبڕین نییە لەو ئاژەڵەی لە چیا لەناو کۆز دەدزرێت، جا ئەگەر ئاژەڵەکە لەناو مۆڵگەی خۆیدا بوو یان میوەکە لە شوێنی هەڵگرتنی میوەدا بوو (میوەکە لە شوێنی پارێزراوی خۆی داندرابوو و عەمبار کرابوو)، ئەو کات دەستبڕین لە ئەندازەی قەڵغانێکەوە دەست پێ دەکات.

٢٤٠٨- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵂، أَنَّ سَارِقًا سَرَقَ فِي زَمَانِ عُثْمَانَ أُتْرُنْجَةً، فَأَمَرَ بِهَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﵁ أَنْ تُقَوَّمَ، فَقُوِّمَتْ بِثَلَاثَةِ دَرَاهِمَ، مِنْ صَرْفِ اثْنَيْ عَشَرَ دِرْهَمًا بِدِينَارٍ، فَقَطَعَ عُثْمَانُ ﵁ يَدَهُ[1].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵂، گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): دزێك لە سەردەمی ئیمامی عوسمان ئوتروجەیەکی دزی، جا ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ فەرمانی دەرکرد بنرخێندرێت، جا بە سێ درهەم نرخێندرا، بە بۆرصەی دوازدە درهەم بەرانبەر دینارێك (کە بەو پێیە سێ درهەمەکە دەکاتە چارەگە دینارێك)، جا ئیمامی عوسمان ﵁ دەستی بڕی.

٢٤٠٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: مَا طَالَ عَلَيَّ، وَمَا نَسِيتُ الْقَطْعُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا[2].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: کاتێکی زۆر بەسەرمدا تێ پەڕ نەبووە و بیریشم نەچۆتەوە دەستبڕین لە چارەگە دینارێك و بەسەرەوەیە.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٠ في الحدود؛ والشيباني: ٦٨٨ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٤٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩١ في الحدود؛ والنسائي: ٤٩٢٧ في قطع السارق؛ وابن حبان: ٤٤٦٢؛ والقابسي: ٤٩٩، كلهم عن مالك به.

**٢٤١٠-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجَتْ عَائِشَةُ ﷺ، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى مَكَّةَ، وَمَعَهَا مَوْلاَتَانِ لَهَا، وَمَعَهَا غُلاَمٌ لِبَنِي عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، فَبَعَثَتْ مَعَ الْمَوْلاَتَيْنِ بِبُرْدٍ مُرَجَّلٍ قَدْ خِيطَ عَلَيْهِ خِرْقَةٌ خَضْرَاءُ، قَالَتْ: فَأَخَذَ الْغُلاَمُ الْبُرْدَ، فَفَتَقَ عَنْهُ، فَاسْتَخْرَجَهُ وَجَعَلَ مَكَانَهُ لِبْدًا أَوْ فَرْوَةً وَخَاطَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا قَدِمَتِ الْمَوْلاَتَانِ الْمَدِينَةَ، دَفَعَتَا ذَلِكَ إِلَى أَهْلِهِ، فَلَمَّا فَتَقُوا عَنْهُ، وَجَدُوا فِيهِ اللِّبْدَ وَلَمْ يَجِدُوا الْبُرْدَ، فَكَلَّمُوا الْمَرْأَتَيْنِ، فَكَلَّمَتَا عَائِشَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَوْ كَتَبَتَا إِلَيْهَا وَاتَّهَمَتَا الْعَبْدَ، فَسُئِلَ الْعَبْدُ عَنْ ذَلِكَ، فَاعْتَرَفَ، فَأَمَرَتْ بِهِ عَائِشَةُ، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، فَقُطِعَتْ يَدُهُ، وَقَالَتْ عَائِشَةُ: الْقَطْعُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا[1].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ مەککە لە کاتێکدا دوو ئافرەتی کۆیلەی لەگەڵدا بوو لەگەڵ کوڕێکی کۆیلە (کە کۆیلەی) کوڕەکانی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکری صدیق بوو، جا جوبەیەکی لەگەڵ دوو ئافرەتە کۆیلەکە نارد کە پارچە قوماشێکی کەسکی پێوە دوورابوو، جا کوڕە کۆیلەکە جوبەکەی برد و دوورمانەکەی هەڵوەشاندەوە و پارچە کەسکەکەی دەرهێنا و لە شوێنی ئەو صوفێك یان فەڕوەیەکی دانا و پێوەی دووری، جا کاتێ دوو ئافرەتە کۆیلەکە گەڕانەوە مەدینە ئەو ئەمانەتەیان دایەوە خاوەنەکەی، کاتێ کردیانەوە صوفیان بینی جوبە نەبوو (گۆڕابوو)، جا قسەیان لەگەڵ دوو ئافرەتە کۆیلەکە کرد، ئەوانیش قسەیان لەگەڵ عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ـ یان نووسراویان بۆ کرد و ـ کوڕە کۆیلەکەیان تۆمەتبار کرد، جا پرسیار لە کوڕە کۆیلەکە کرا و ئەویش ئیعتیرافی کرد، جا عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەربارە دەرکرد و دەستی بڕا، جا عائیشە ﷺ گوتی: دەستبڕین لە چارەگە دینارێکەوە بەسەرەوەیە (دیارە پارچە قوماشەکە نرخی گەیشتۆتە چارەگە دینارێك).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٢ في الحدود؛ والشيباني: ٦٨٧ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٥٣، عن مالك به.

**٢٤١١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحَبُّ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ إِلَيَّ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ، وَإِنِ ارْتَفَعَ الصَّرْفُ أَوِ اتَّضَعَ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ، وَأَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ قَطَعَ فِي أُتْرُنْجَةٍ، قُوِّمَتْ بِثَلاَثَةِ دَرَاهِمَ، وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم خۆشە ئەوەی دەستبڕین واجب بکات لای من بریتیبێت لە سێ درهەم، (جیاوازی نییە) هەرچەندە بۆڕصە بەرز بێتەوە یان نزم بێتەوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبڕینی ئەنجام داوە لە قەڵغانێکدا کە نرخەکەی سێ درهەم بووە، وە عوسمانی کوڕی عەففانیش ﷺ دەستبڕینی ئەنجام داوە لە ئوترونجەیەك کە بە سێ درهەم نرخێندراوە، ئەوە خۆشەویستترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم (لەو بابەتەدا).

## ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستبڕینی کۆیلەی هەڵاتوو و دز[٢]

**٢٤١٢-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدًا لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ سَرَقَ وَهُوَ آبِقٌ، فَأَرْسَلَ بِهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ، وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، لِيَقْطَعَ يَدَهُ، فَأَبَى سَعِيدٌ أَنْ يَقْطَعَ يَدَهُ، وَقَالَ: لاَ تُقْطَعُ يَدُ الآبِقِ السَّارِقِ إِذَا سَرَقَ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: فِي أَيِّ كِتَابِ اللهِ وَجَدْتَ هَذَا؟ ثُمَّ أَمَرَ بِهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، فَقُطِعَتْ يَدُهُ[٣].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کۆیلەیەکی هەڵاتووی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دزی کرد، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نێردراوی نارد بۆ لای سەعیدی کوڕی عاص ﷺ لە کاتێکدا گەورەی مەدینە بوو، تا دەستی ببڕێ، سەعیدیش ڕەتی کردەوە لەوەی دەستی ببڕێ و گوتی: دەستی کۆیلەی هەڵاتوو نابڕدرێت کاتێ دزی دەکات، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پێی گوت: لە چ پەرتووکێکی خوا شتی وات بینیوە؟! دواتر عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ خۆی فەرمانی دەربارە دەرکرد و دەستی برا.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٣ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي قَطْعِ الآبِقِ وَالسَّارِقِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٥ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩٠ في الضحايا وما يجزئ

**٢٤١٣**- عَنْ رُزَيْقِ بْنِ حَكِيمٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ أَخَذَ عَبْدًا آبِقًا، قَدْ سَرَقَ، قَالَ: فَأَشْكَلَ عَلَيَّ أَمْرُهُ، قَالَ: فَكَتَبْتُ فِيهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ، أَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ، وَهُوَ الْوَالِي يَوْمَئِذٍ، قَالَ: فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّنِي كُنْتُ أَسْمَعُ أَنَّ الْعَبْدَ الآبِقَ إِذَا سَرَقَ وَهُوَ آبِقٌ، لَمْ تُقْطَعْ يَدُهُ، قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ نَقِيضَ كِتَابِي يَقُولُ: كَتَبْتَ إِلَيَّ: أَنَّكَ كُنْتَ تَسْمَعُ أَنَّ الْعَبْدَ الآبِقَ إِذَا سَرَقَ لَمْ تُقْطَعْ يَدُهُ، وَإِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ:﴿ **وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٣٨** ﴾ المائدة، فَإِنْ بَلَغَتْ سَرِقَتُهُ رُبُعَ دِينَارٍ فَصَاعِدًا، فَاقْطَعْ يَدَهُ[1].

واتە: لە زورەیقی كوڕی حەكیمەوە ﷺ گێردراوەتەوە هەواڵی داوە (گوتوویەتی): كۆیلەیەكی هەڵاتووم گرت كە دزی كردبوو، دەڵێ: جا ئیشكالم بۆ دروست بوو دەربارەی (كە ئاخۆ كۆیلەی هەڵاتوو دەستی دەبڕێت یان نا)، دەڵێ: جا نووسراوێكم بۆ عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ نووسی، پرسیارم لێی كرد دەربارەی ئەوە، لە كاتێكدا لەو ڕۆژگارەدا كاربەدەست بوو، دەڵێ: جا هەواڵم پێ دا بەوەی من گوێبیست بووم بەوەی كۆیلەی هەڵاتوو كە دزی دەكات لە كاتێكدا هەڵاتووە دەستی نابڕدرێت، دەڵێ: عومەری كوڕی عەبدولعەزیزیش ﷺ پێچەوانەی نووسراوەكەی بۆ نووسیم گوتی: تۆ بۆت نووسیوم گوێت لێ بووە كۆیلەی هەڵاتوو كاتێ دزی دەكات دەستی نابڕدرێت، لە كاتێكدا خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووكەكەیدا دەفەرموێت:﴿ **وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٣٨** ﴾ المائدة، واتە: [دەستی پیاو و ئافرەتی دز ببڕن، لە تۆڵەی ئەو دزییەی كردوویانە، ئەمە تۆڵە و تەمێكردنێكە لەلایەن خواوە ﷻ، وە خوا ﷻ باڵادەست و كاردروستە]، جا ئەگەر دزییەكەی گەیشتە چارەگە دینارێك و بەسەرەوە، ئەوە دەستی ببڕە (چونكە ئایەتەكە گشتگیرە و كەسی جیا نەكردۆتەوە، بۆ كۆیلە و ئازاد وەكوو یەكە).

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٦ في الحدود، عن مالك به.

**٢٤١٤**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَسَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وَعُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ كَانُوا يَقُولُونَ إِذَا سَرَقَ الْعَبْدُ الآبِقُ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، قُطِعَ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە قاسمی کوڕی موحەممەد و سالمی کوڕی عەبدوڵلا و عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەیانگوت: ئەگەر کۆیلەی هەڵاتوو ئەندازەیەکی دزی کە بەهۆیەوە دەستبڕین واجب دەبوو، ئەوە دەستی دەبڕێت.

**٢٤١٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الْعَبْدَ الآبِقَ إِذَا سَرَقَ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، قُطِعَ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: کۆیلەی هەڵاتوو کاتێ ئەندازەیەك دەدزێت کە بەهۆیەوە دەستبڕین واجب دەبێت، ئەوە دەستی دەبڕدرێت.

## ٩- تکانەکردن بۆ دز کاتێ هەواڵی دزییەکەی دەگاتە کاربەدەست[٢]

**٢٤١٦**- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَفْوَانَ ﷺ، أَنَّ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ ﷺ قِيلَ لَهُ: إِنَّهُ مَنْ لَمْ يُهَاجِرْ هَلَكَ، فَقَدِمَ صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ الْمَدِينَةَ، فَنَامَ فِي الْمَسْجِدِ، وَتَوَسَّدَ رِدَاءَهُ، فَجَاءَ سَارِقٌ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ، فَأَخَذَ صَفْوَانُ السَّارِقَ، فَجَاءَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ تُقْطَعَ يَدُهُ، فَقَالَ صَفْوَانُ ﷺ: إِنِّي لَمْ أُرِدْ هَذَا يَا رَسُولَ اللهِ، هُوَ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَهَلاَّ قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ[٣].

واتە: لە صەفوانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی صەفوانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): صەفوانی کوڕی ئومەییە ﷺ پێی گوترا: هەر کەسێك کۆچی

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٧ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ تَرْكُ الشَّفَاعَةِ لِلسَّارِقِ إِذَا بَلَغَ السُّلْطَانَ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٢ في الحدود؛ والشيباني: ٦٨٥ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٥٠؛ وابن ماجه: ٢٦٢٤ في الحدود، كلهم عن مالك به.

نەکردبێت (بۆ مەدینە) ئەوە لەناو چووە، جا صەفوانی کوڕی ئومەییە هات بۆ مەدینە و لە مزگەوت خەوت و عەباکەی لەژێر سەری خۆی دانا، جا دزێك هات و عەباکەی برد، صەفوانیش دزەکەی دەستگیر کرد و بردی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی دەربارە دەرکرد بەوەی دەستی ببڕدرێت، صەفوانیش ﵁ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من مەبەستم ئەوە نەبوو (دەستی ببڕدرێت)، با عەباکە خێر و بەخشش بێت بۆ ئەو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بۆچی پێش ئەوەی بیهێنیت بۆ لای من پێت نەبەخشی (ئێستا سوودی نییە).

**٢٤١٧-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀، أَنَّ الزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ ﵁، لَقِيَ رَجُلاً قَدْ أَخَذَ سَارِقًا، وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِهِ إِلَى السُّلْطَانِ، فَشَفَعَ لَهُ الزُّبَيْرُ ﵁ لِيُرْسِلَهُ، فَقَالَ: لاَ، حَتَّى أَبْلُغَ بِهِ السُّلْطَانَ، فَقَالَ الزُّبَيْرُ ﵁: إِذَا بَلَغْتَ بِهِ السُّلْطَانَ، فَلَعَنَ اللهُ الشَّافِعَ وَالْمُشَفِّعَ[1].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): زوبەیری کوڕی عەوام ﵁ گەیشت بە پیاوێك دزێکی دەستگیر کردبوو و بەنیاز بوو بیبات بۆ لای کاربەدەست، زوبەیریش ﵁ شەفاعەت و تکای بۆ کرد تا ئازادی بکات، کابراش گوتی: نەخێر، تا دەیبەم بۆ لای کاربەدەست (لەوێ ئازادی دەکەم)، زوبەیریش ﵁ گوتی: ئەگەر گەیاندتە لای کاربەدەست، ئەوە نەفرەتی خوا هەیە بۆ ئەو کەسەی شەفاعەت دەکات و ئەوەشی شەفاعەتەکە قبووڵ دەکات (واتە کە گەیشتە لای کاربەدەست شەفاعەت و تکاکاری حەڕام دەبێت).

## ١٠- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی دەستبڕین[2]

**٢٤١٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﵀، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ، أَقْطَعَ الْيَدِ وَالرِّجْلِ، قَدِمَ، فَنَزَلَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵁، فَشَكَا إِلَيْهِ، أَنَّ عَامِلَ الْيَمَنِ قَدْ ظَلَمَهُ، فَكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَيَقُولُ أَبُو بَكْرٍ ﵁: وَأَبِيكَ مَا لَيْلُكَ بِلَيْلِ سَارِقٍ، ثُمَّ إِنَّهُمْ فَقَدُوا عِقْدًا لأَسْمَاءَ

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٣ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ الْقَطْعِ.

بِنْتِ عُمَيْسٍ امْرَأَةِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَطُوفُ مَعَهُمْ، وَيَقُولُ: اللهُمَّ عَلَيْكَ بِمَنْ بَيَّتَ أَهْلَ هَذَا الْبَيْتِ الصَّالِحِ، فَوَجَدُوا الْحُلِيَّ عِنْدَ صَائِغٍ، زَعَمَ أَنَّ الأَقْطَعَ جَاءَهُ بِهِ، فَاعْتَرَفَ بِهِ الأَقْطَعُ، أَوْ شُهِدَ عَلَيْهِ بِهِ، فَأَمَرَ بِهِ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ، فَقُطِعَتْ يَدُهُ الْيُسْرَى، وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: وَاللَّهِ لَدُعَاؤُهُ عَلَى نَفْسِهِ، أَشَدُّ عِنْدِي عَلَيْهِ مِنْ سَرِقَتِهِ[1].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی قاسمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێكی خەڵكی یەمەن كە دەستێك و قاچێكی بڕابوو هات (بۆ مەدینە) و لەلای ئەبو بەكری صددیق ﷺ مایەوە و شكاتی خۆی لەلا كرد بەوەی كاربەدەستی یەمەن ستەمی لێ كردووە (بەبێ تاوان دەستی بڕیوە)، جا شەو هەر شەونوێژی دەكرد، ئەبو بەكریش ﷺ گوتی: سوێند بە باوكت شەوەكەت بە شەوی دزان ناچێ (هەر شەونوێژت كرد)، دواتر ملوانكەی ئەسمائی كچی عومەیسیان لێ ون بوو، پیاوەكەش بەردەوام لەگەڵ ئەوان دەگەڕا و دەسوڕایەوە (بۆ دۆزینەوەی) و دەیگوت: پەروەردگارا سزا بڕژێنە بەسەر ئەو كەسەی دزی كردووە لەو ماڵە چاكە، جا (دواتر) خشڵەكەیان لەلای دوكاندارێكی خشڵدروستكردن دۆزییەوە، دوكاندارەكە گوتی: پیاوە دەست و قاچبڕاوەكە هێناویەتی، دواتر پیاوە دەست و قاچبڕاوەكەش خۆی ئیعتیڕافی كرد ـ یان شاهێدی لەسەر درا ـ، جا ئەبو بەكری صددیق ﷺ فەرمانی دەربارە دەركرد و دەستی چەپەی بڕدرا، جا ئەبو بەكر ﷺ گوتی: سوێند بە خوا ﷻ دوعایەكەی كە لەسەر خۆی كردی لەلای من ناخۆشتر بوو لە دزییەكەی (كە گوتی: پەروەردگارا سزا بڕژێنە سەر ئەو كەسەی دزی كردووە لەو ماڵە چاكە!!).

**٢٤١٩- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الَّذِي يَسْرِقُ مِرَارًا، ثُمَّ يُسْتَعْدَى عَلَيْهِ: إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ إِلاَّ أَنْ تُقْطَعَ يَدُهُ لِجَمِيعِ مَنْ سَرَقَ مِنْهُ، إِذَا لَمْ يَكُنْ أُقِيمَ عَلَيْهِ الْحَدُّ، فَإِنْ كَانَ قَدْ أُقِيمَ عَلَيْهِ الْحَدُّ قَبْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ سَرَقَ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، قُطِعَ أَيْضًا[2].

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٨ في الحدود؛ والشيباني: ٦٨٩ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٥٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٩ في الحدود، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو كەسەی چەند جارێك دزی دەكات، دواتر دەیپرژێنە سەری و دەستگیر دەكرێت (لە جاری كۆتایی)، ئەوە (حوكمەكەی ئاوایە) جگە لە یەك دەستبڕین بۆ گشت ئەوەی ئەنجامی داوە هیچی دیكەی لەسەر نییە ئەگەر پێشتر سزای لەسەر جێبەجێ نەكرابێت، (بەڵام) ئەگەر پێشتر سزای لەسەر جێبەجێ كرابێت، دواتر دزییەك بكات كە بەهۆیەوە دەست ببڕدرێت، ئەوە دیسان دەستی دەبڕێتەوە.

**٢٤٢٠-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا الزِّنَادِ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَامِلاً لِعُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ أَخَذَ نَاسًا فِي حِرَابَةٍ وَلَمْ يَقْتُلُوا أَحَدًا، فَأَرَادَ أَنْ يَقْطَعَ أَيْدِيَهُمْ أَوْ يَقْتُلَ، فَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ: لَوْ أَخَذْتَ بِأَيْسَرِ مِنْ ذَلِكَ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە ئەبو زیناد ﷺ هەواڵی پێ داوە (گوتوویەتی): كاربەدەستێكی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ خەڵكانێكی بە تۆمەتی ڕێگری دەستگیر كرد، كەسیان نەكوشتبوو، جا ویستی دەستیان ببڕێت یان بیانكوژێت، بۆیە نووسراوێكی لەو بارەیەوە بۆ عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ نووسی، عومەری كوڕی عەبدولعەزیزیش ﷺ بۆی نووسی: ئەگەر سووكترین بڕیاریان لەسەر جێبەجێ بكەی چاكترە.

**٢٤٢١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الَّذِي يَسْرِقُ أَمْتِعَةَ النَّاسِ الَّتِي تَكُونُ مَوْضُوعَةً بِالأَسْوَاقِ مُحْرَزَةً، قَدْ أَحْرَزَهَا أَهْلُهَا فِي أَوْعِيَتِهِمْ وَضَمُّوا بَعْضَهَا إِلَى بَعْضٍ: إِنَّهُ مَنْ سَرَقَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا مِنْ حِرْزِهِ، فَبَلَغَ قِيمَتُهُ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، فَإِنَّ عَلَيْهِ الْقَطْعَ، كَانَ صَاحِبُ الْمَتَاعِ عِنْدَ مَتَاعِهِ، أَوْ لَمْ يَكُنْ لَيْلاً ذَلِكَ أَوْ نَهَارًا[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو كەسەی كەلوپەلی خەڵكی دەدزێت كە لە بازاڕ لە شوێنی

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨١٠ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨١١ في الحدود، عن مالك به.

پارێزراو داندراوە، خاوەنەکانیان لە کیسەی خۆیان دایاناون و پێچاویاننەوە، گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك شتێك لەوانەی دزی لە شوێنی پارێزراوی خۆی و ئەندازە و نرخەکەی گەیشت بەوەی کە دەستبڕینی پێ واجب دەبێت، ئەوە دەستبڕینی لەسەرە، جا چون یەکە خاوەنی کاڵاکە لەلای کاڵاکەی بێت یان لەوێ نەبێت، شەو بێت یان ڕۆژ بێت.

**٢٤٢٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الَّذِي يَسْرِقُ: مَا يَجِبُ عَلَيْهِ فِيهِ الْقَطْعُ ثُمَّ يُوجَدُ مَعَهُ مَا سَرَقَ فَيُرَدُّ إِلَى صَاحِبِهِ: إِنَّهُ تُقْطَعُ يَدُهُ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ: كَيْفَ تُقْطَعُ يَدُهُ وَقَدْ أُخِذَ الْمَتَاعُ مِنْهُ، وَدُفِعَ إِلَى صَاحِبِهِ؟ فَإِنَّمَا هُوَ بِمَنْزِلَةِ الشَّارِبِ، يُوجَدُ مِنْهُ رِيحُ الشَّرَابِ الْمُسْكِرِ، وَلَيْسَ بِهِ سُكْرٌ، فَيُجْلَدُ الْحَدَّ.

قَالَ: وَإِنَّمَا يُجْلَدُ الْحَدَّ فِي الْمُسْكِرِ إِذَا شَرِبَهُ، وَإِنْ لَمْ يُسْكِرْهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِنَّمَا شَرِبَهُ لِيُسْكِرَهُ، فَكَذَلِكَ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي السَّرِقَةِ، الَّتِي أُخِذَتْ مِنْهُ، وَلَوْ لَمْ يَنْتَفِعْ بِهَا، وَرَجَعَتْ إِلَى صَاحِبِهَا، وَإِنَّمَا سَرَقَهَا حِينَ سَرَقَهَا لِيَذْهَبَ بِهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی دزی دەکات گوتوویەتی: ئەگەر ئەندازەیەکی دزی کە دەستبڕینی تیادا واجب دەبێت، دواتر ئەو شتەی لەلا بینرا کە دزیبووی، جا شتەکە گەڕێندرایەوە بۆ خاوەنەکەی، گوتوویەتی: هەر دەستی دەبڕدرێت (هەرچەندە شتەکەش گەڕابێتەوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك بڵێت: چۆن دەستی دەبڕدرێت لە کاتێکدا کاڵاکەی لێ وەرگیراوەتەوە و دراوەتەوە خاوەنەکەی؟ (لە وەڵامدا دەڵێین): (نموونەی) ئەوە وەك مەشرووبخۆر وایە، کاتێ بۆنی مەشرووبی بێهۆشکەری لێ دێت و بێهۆشیش نییە، هەر سزای قامچی لەسەر جێبەجێ دەکرێت.

گوتوویەتی: کە قامچیی سزای لێ دەدرێت دەربارەی مەشرووبی بێهۆشکەر کاتێ دەیخواتەوە، لەبەر ئەوەیە بۆ ئەوە خواردوویەتەوە تا بێهۆشی بکات (هەرچەندە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨١٨ في الحدود؛ وأبو مصعب الزهري: ١٨١٩ في الحدود؛ وفي: ١٨٣٠ في الحد في الخمر، عن مالك به.




بێهۆشیش نەبێت)، بە هەمان شێوەش دەستی دز دەبڕدرێت لەو دزییەی کە شتەکەی لێ وەرگیراوەتەوە، هەرچەندە سوودی لێ نەبینیوە و شتەکە گەڕاوەتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە ئەو کاتەی دزیویەتی بۆ ئەوە دزیویەتی بیبات و نەگەڕێتەوە.

**٢٤٢٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْقَوْمِ يَأْتُونَ إِلَى الْبَيْتِ فَيَسْرِقُونَ مِنْهُ جَمِيعًا، فَيَخْرُجُونَ بِالْعِدْلِ يَحْمِلُونَهُ جَمِيعًا أَوِ الصُّنْدُوقِ أَوِ الْخَشَبَةِ أَوْ بِالْمِكْتَلِ أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، مِمَّا يَحْمِلُهُ الْقَوْمُ جَمِيعًا، إِنَّهُمْ إِذَا أَخْرَجُوا ذَلِكَ مِنْ حِرْزِهِ، وَهُمْ يَحْمِلُونَهُ جَمِيعًا، فَبَلَغَ ثَمَنُ مَا خَرَجُوا بِهِ مِنْ ذَلِكَ، مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، وَذَلِكَ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ فَصَاعِدًا، فَعَلَيْهِمُ الْقَطْعُ جَمِيعًا.

قَالَ: وَإِنْ خَرَجَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ بِمَتَاعٍ عَلَى حِدَتِهِ، فَمَنْ خَرَجَ مِنْهُمْ بِمَا تَبْلُغُ قِيمَتُهُ ثَلاَثَةَ دَرَاهِمَ فَصَاعِدًا، فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ، وَمَنْ لَمْ يَخْرُجْ مِنْهُمْ بِمَا تَبْلُغُ قِيمَتُهُ ثَلاَثَةَ دَرَاهِمَ فَصَاعِدًا، فَلاَ قَطْعَ عَلَيْهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆمەڵە خەڵکێك کە بچن بۆ ماڵێك و گشتیان بەیەکەوە دزی لێ بکەن و بارێك یان سندوقێك یان کەنتۆرێك یان زەنبیلێك یان هاوشێوەی ئەو شتانە بەیەکەوە لەگەڵ خۆیان ببەنە دەرەوە لەو شتانەی (قورسن و عادەتەن) خەڵکانێك بەیەکەوە هەڵیدەگرن، گوتوویەتی: ئەگەر شتەکەیان لە شوێنی پاراستنی خۆی بردە دەرەوە لە کاتێکدا گشتیان هەڵیانگرتووە و گەیشتە نرخی ئەوەی دەستبڕینی پێ واجب دەبێت کە بریتییە لە سێ درهەم و زیاتر، ئەوە دەستبڕین لەسەر گشتیانە.

گوتوویەتی: وە ئەگەر هەر یەکێکیان بەجیا کەلوپەلێکی بردە دەرەوە، جا ئەو کەسەی لەوان شتێکی بردۆتە دەرەوە کە نرخەکەی سێ درهەم و زیاتر بێت، ئەوە دەستبڕینی لەسەرە، وە هەر کەسێك لەوان شتێکی بردە دەرەوە نرخەکەی نەگەیشتە سێ درهەم، ئەوە دەستبڕینی لەسەر نییە (هەر کەسە و حوکمی خۆی هەیە).

**٢٤٢٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا أَنَّهُ إِذَا كَانَتْ دَارُ رَجُلٍ مُغْلَقَةً عَلَيْهِ، لَيْسَ مَعَهُ فِيهَا غَيْرُهُ، فَإِنَّهُ لاَ يَجِبُ عَلَى مَنْ سَرَقَ مِنْهَا شَيْئًا الْقَطْعُ، حَتَّى يَخْرُجَ بِهِ مِنَ الدَّارِ كُلِّهَا،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٠ في الحدود، عن مالك به.

وَذَلِكَ أَنَّ الدَّارَ كُلَّهَا هِيَ حِرْزُهُ، فَإِنْ كَانَ مَعَهُ فِي الدَّارِ سَاكِنٌ غَيْرُهُ وَكَانَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ يُغْلِقُ عَلَيْهِ بَابَهُ وَكَانَتْ حِرْزًا لَهُمْ جَمِيعًا، فَمَنْ سَرَقَ مِنْ بُيُوتِ تِلْكَ الدَّارِ شَيْئًا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، فَخَرَجَ بِهِ إِلَى الدَّارِ، فَقَدْ أَخْرَجَهُ مِنْ حِرْزِهِ إِلَى غَيْرِ حِرْزِهِ، وَوَجَبَ عَلَيْهِ فِيهِ الْقَطْعُ[(١)].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە ئەگەر خانووێکی کەسێك داخرابوو لەسەری، کەسیش جگە لە خۆی تیایدا لەگەڵی نەدەژیا، ئەوە ئەو کەسەی شتێك لەو خانووە دەدزێت دەستبڕینی لەسەر نییە تاوەکوو شتەکە لە تەواوی خانووەکە نەباتە دەرەوە، لەبەر ئەوەی خانووەکە گشتی شوێنی پاراستنی شتەکەیە، وە ئەگەر کەسی دیکە لەگەڵی لە خانووەکە نیشتەجێ بوو و هەر یەکێکیش لەوان بەجیا دەرگای لەسەر خۆی دادەخست و خانووەکەش بەیەکەوە شوێنی پاراستنی شت بوو بۆ گشتیان، ئەوە هەر کەسێك لە ژوورەکانی ئەم خانووە شتێك بدزێت کە ئەندازەی دەستبڕین واجب دەکات و شتەکە بباتە ناو خانووەکە (لە ژوورەکە بیکاتە دەرەوە بۆ حەوشەکە)، ئەوە شتەکەی لە شوێنی پاراستنی خۆی هێناوەتە دەرەوە بۆ شوێنێك کە هی پاراستنی خۆی نییە و دەستبڕینی تیادا واجبە.

**٢٤٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْعَبْدِ يَسْرِقُ مِنْ مَتَاعِ سَيِّدِهِ: أَنَّهُ إِنْ كَانَ لَيْسَ مِنْ خَدَمِهِ، وَلاَ مِمَّنْ يَأْمَنُ عَلَى بَيْتِهِ، ثُمَّ دَخَلَ سِرًّا، فَسَرَقَ مِنْ مَتَاعِ سَيِّدِهِ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، فَلاَ قَطْعَ عَلَيْهِ، وَكَذَلِكَ الأَمَةُ إِذَا سَرَقَتْ مِنْ مَتَاعِ سَيِّدِهَا، لاَ قَطْعَ عَلَيْهَا[(٢)].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کۆیلەیەی لە کەلوپەلی گەورەکەی دەدزێت: ئەگەر کۆیلەکە لە خزمەتکارەکانی نەبوو، وە لەوانەش نەبوو کە لێی ئەمین بوون لە ماڵەکەیدا، دواتر بەنهێنی هاتە ژوورەوە و شتێکی لە کەلوپەلی گەورەکەی دزی کە ئەندازەکەی دەستبڕین واجب دەکات، ئەوە دەستبڕینی لەسەر واجب نییە، ئافرەتی کۆیلەش بەهەمان شێوە ئەگەر لە کەلوپەلی گەورەکەی دزی، دەستبڕینی لەسەر نییە (چونکە دەستبڕین لەسەر کۆیلە نییە لە دزینی ماڵی گەورەکەی، چونکە خۆی خاوەنی کۆیلەکەیە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢١ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٦ في الحدود، عن مالك به.




**٢٤٢٦- [فتوى]** وَقَالَ فِي الْعَبْدِ لاَ يَكُونُ مِنْ خَدَمِهِ، وَلاَ مِمَّنْ يَأْمَنُ عَلَى بَيْتِهِ، فَدَخَلَ سِرًّا، فَسَرَقَ مِنْ مَتَاعِ امْرَأَةِ سَيِّدِهِ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ: إِنَّهُ تُقْطَعُ يَدُهُ[١].

(فەتوا): واتە: وە دەربارەی ئەو کۆیلەیەی یەکێك نییە لە خزمەتکارەکانی گەورەکەی، وە لەوانەش نییە کە لێی ئەمینن لە ماڵەکەیدا، جا بەنهێنی هاتە ژوورەوە و شتێکی لە کەلوپەلی خێزانی گەورەکەی دزی کە ئەندازەکەی دەستبڕین واجب دەکات، ئەوە دەستی دەبڕێت (چونکە سەروەتی خێزانی گەورەکەی جیایە لەگەڵ سەروەتی گەورەکەی، ئەو بێگانە حیسابە بە نیسبەت کۆیلەکە و ئەو خاوەنی نییە).

**٢٤٢٧- [فتوى]** قَالَ: وَكَذَلِكَ أَمَةُ الْمَرْأَةِ إِذَا كَانَتْ لَيْسَتْ بِخَادِمٍ لَهَا، وَلاَ لِزَوْجِهَا، وَلاَ مِمَّنْ تَأْمَنُ عَلَى بَيْتِهَا، ثُمَّ دَخَلَتْ سِرًّا، فَسَرَقَتْ مِنْ مَتَاعِ سَيِّدَتِهَا مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، فَلاَ قَطْعَ عَلَيْهَا.

(فەتوا): واتە: (ئیمامی مالیك ﷺ) گوتوویەتی: بەهەمان شێوە جارییەی ئافرەتێك ئەگەر جارییەکە لە خزمەتکارەکانی نەبوو، وە خزمەتکاری مێردەکەشی نەبوو، وە لەوانەش نەبوو کە لێی ئەمین بوون لە ماڵەکەیدا، دواتر بەنهێنی هاتە ژوورەوە و شتێکی لە کەلوپەلی ئافرەتە گەورەکەی خۆی دزی کە ئەندازەکەی دەستبڕین واجب دەکات، ئەوە دەستبڕینی لەسەر واجب نییە (چونکە کۆیلەی خۆیەتی).

**٢٤٢٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ أَمَةُ الْمَرْأَةِ الَّتِي لاَ تَكُونُ مِنْ خَدَمِهَا، وَلاَ مِمَّنْ تَأْمَنُ عَلَى بَيْتِهَا، فَدَخَلَتْ سِرًّا، فَسَرَقَتْ مِنْ مَتَاعِ زَوْجِ سَيِّدَتِهَا مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ: أَنَّهَا تُقْطَعُ يَدُهَا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەهەمان شێوە جارییەی ئافرەتێك کە جارییەکە خزمەتکاری ئافرەتەکە نەبێت (تەنها جارییەی ئەو بێت)، وە لەوانەش نەبێ کە لێی ئەمین بن لە ماڵەکەیدا، جا بەنهێنی هاتە ژوورەوە و شتێکی لە کەلوپەلی مێردی ئافرەتە گەورەکەی دزی کە ئەندازەکەی دەستبڕین واجب دەکات، ئەوە دەستی دەبڕدرێت (چونکە مێردی ئافرەتەکە بێگانەیە بە نسبەت جارییەکە ئەو خاوەنی جارییەکە نییە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨١٤ في الحدود، عن مالك به.

**٢٤٢٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الرَّجُلُ يَسْرِقُ مِنْ مَتَاعِ امْرَأَتِهِ، أَوِ الْمَرْأَةُ تَسْرِقُ مِنْ مَتَاعِ زَوْجِهَا، مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ: إِنْ كَانَ الَّذِي سَرَقَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ مَتَاعِ صَاحِبِهِ فِي بَيْتٍ سِوَى الْبَيْتِ الَّذِي يُغْلِقَانِ عَلَيْهِمَا، وَكَانَ فِي حِرْزٍ سِوَى الْبَيْتِ الَّذِي هُمَا فِيهِ، فَإِنَّ مَنْ سَرَقَ مِنْهُمَا مِنْ مَتَاعِ صَاحِبِهِ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ فِيهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەهەمان شێوە ئەو پیاوەی لە کەلوپەلی خێزانەکەی دەدزێت، یان ئەو ئافرەتەی لە کەلوپەلی مێردەکەی دەدزێت، کە بگاتە ئەو ئەندازەی دەستبڕینی پێ واجب دەبێت: ئەگەر هەر یەکێك لەو دووانە کە لە کەلوپەلی بەرانبەرەکەیان دزیوە شتەکە لە ژوورێك بووبێت جگە لەو ژوورەی بەسەریاندا دادەخرێت (کە ژووری هەردووکیانە و هەردووکیان کۆ دەکاتەوە)، وە شتەکەش لە شوێنی پارێزراوی خۆی بووبێت جگە لەوماڵەی خۆیان تیایدان، ئەوە هەر یەکێك لەوان لە کەلوپەلی بەرانبەرەکەی بدزێت کە بگات بە ئەندازەی دەستبڕین، ئەوە تیایدا دەستبڕینی لەسەرە.

**٢٤٣٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الصَّبِيِّ الصَّغِيرِ وَالأَعْجَمِيِّ الَّذِي لاَ يُفْصِحُ: أَنَّهُمَا إِذَا سُرِقَا مِنْ حِرْزِهِمَا أَوْ غَلْقِهِمَا، فَعَلَى مَنْ سَرَقَهُمَا الْقَطْعُ، قَالَ: فَإِنْ خَرَجَا مِنْ حِرْزِهِمَا وَغَلْقِهِمَا، فَلَيْسَ عَلَى مَنْ سَرَقَهُمَا قَطْعٌ، وَإِنَّمَا هُمَا بِمَنْزِلَةِ حَرِيسَةِ الْجَبَلِ وَالثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی مناڵی بچووك و ئەو کەسەی لاڵە و قسەی ڕوون نییە، ئەگەر لە شوێنی خۆیان یان لە شوێنی داخراو دزران، گوتوویەتی: ئەو کەسەی دەیاندزێت دەستبڕینی لەسەرە، گوتوویەتی: بەڵام ئەگەر (مناڵەکە یان لاڵەکە) خۆیان لە شوێنی خۆیان و لە شوێنی داخراو چوونە دەرەوە، ئەوە ئەو کەسەی لە دەرەوە دەیاندزێت دەستبڕینی لەسەر نییە، چونکە ئەو دووانە لەو حاڵەتەدا وەك ئاژەڵی چیای ناو حەسار و بەروبوومی بەسەر دارەوە وان (پێشتریش گوترا ئەوانە دەستبڕینیان تیا نییە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠١ في الحدود؛ وفي: ١٨١٥ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨١٦ في الحدود، عن مالك به.

**٢٤٣١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الَّذِي يَنْبِشُ الْقُبُورَ: أَنَّهُ إِذَا بَلَغَ مَا أَخْرَجَ مِنَ الْقَبْرِ مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ، فَعَلَيْهِ فِيهِ الْقَطْعُ، قَالَ: وَذَلِكَ أَنَّ الْقَبْرَ حِرْزٌ لِمَا فِيهِ، كَمَا أَنَّ الْبُيُوتَ حِرْزٌ لِمَا فِيهَا.

قَالَ: وَلاَ يَجِبُ عَلَيْهِ الْقَطْعُ حَتَّى يَخْرُجَ بِهِ مِنَ الْقَبْرِ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی (بۆ شتدزین) گۆڕ هەڵدەداتەوە، ئەگەر ئەو شتەی دەریهێناوە لە گۆڕ بگاتە ئەو ئەندازەیەی دەستبڕینی تێدا واجبە، ئەوە تیایدا دەستبڕینی لەسەر واجبە، گوتوویەتی: چونکە گۆڕ شوێن و پارێزەرە بۆ ئەو شتەی تیایەتی، وەك چۆن ماڵ شوێن و پارێزەرە بۆ ئەو شتەی تیایەتی.

گوتوویەتی: دەستبڕینی لەسەر نییە تاوەکوو لە گۆڕەکە دەریدەهێنێ.

## ١١- ئەوەی دەستبڕینی تیا نییە(٢)

**٢٤٣٢-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ ﷺ، أَنَّ عَبْدًا سَرَقَ وَدِيًّا مِنْ حَائِطِ رَجُلٍ، فَغَرَسَهُ فِي حَائِطِ سَيِّدِهِ، فَخَرَجَ صَاحِبُ الْوَدِيِّ يَلْتَمِسُ وَدِيَّهُ، فَوَجَدَهُ، فَاسْتَعْدَى عَلَى الْعَبْدِ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ، فَسَجَنَ مَرْوَانُ الْعَبْدَ وَأَرَادَ قَطْعَ يَدِهِ، فَانْطَلَقَ سَيِّدُ الْعَبْدِ إِلَى رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَأَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ، وَلاَ كَثَرٍ، وَالْكَثَرُ: الْجُمَّارُ، فَقَالَ الرَّجُلُ: فَإِنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ، أَخَذَ غُلاَمًا لِي، وَهُوَ يُرِيدُ قَطْعَهُ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ تَمْشِيَ مَعِيَ إِلَيْهِ، فَتُخْبِرَهُ بِالَّذِي سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَمَشَى مَعَهُ رَافِعٌ إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، فَقَالَ: أَخَذْتَ غُلاَمًا لِهَذَا؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ: فَمَا أَنْتَ صَانِعٌ بِهِ، قَالَ: أَرَدْتُ قَطْعَ يَدِهِ، فَقَالَ لَهُ رَافِعٌ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ، فَأَمَرَ مَرْوَانُ بِالْعَبْدِ فَأُرْسِلَ(٣).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨١٧ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا قَطْعَ فِيهِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٤ في الحدود؛ والشيباني: ٦٨٤ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٤٨؛ وأبو داود: ٤٣٨٨ في الحدود، كلهم عن مالك به.

واتە: لە موحەممەدی كوڕی یەحیای كوڕی حەبانەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): كۆیلەیەك لەناو باغی پیاوێك شەتڵە دارخورمایێكی دزی و لەناو باغی گەورەكەی خۆی چاندی، جا خاوەنی شەتڵەكە هاتە دەرەوە بەدوای شەتڵەكەدا گەڕا و (لەناو باغی گەورەی كۆیلەكە) دۆزییەوە، جا مەڕوانی كوڕی حەكەمی بەسەر كۆیلەكەدا ئاگادار كردەوە و مەڕوان كۆیلەكەی بەند كرد و مەبەستی بوو دەستی ببڕێت، جا گەورەی كۆیلەكە چوو بۆ لای ڕافیعی كوڕی خەدیج ﷺ و پرسیاری دەربارەی ئەو بابەتە لێ كرد، ئەویش هەواڵی پێ دا كە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: دەستبڕین نییە لە بەرووبوم كاتێ بەسەر درەختەوەیە، وە (دەستبڕین نییە) لە كەثەر، (كەثەر) بەزی دار خورمایە، كە جومارە (كەثەر یان جومار بریتییە لە ناوكی دارخورما، وەك ناوكی خاس وایە)، جا پیاوەكە گوتی: مەڕوانی كوڕی حەكەم كۆیلەیەكی منی دەستگیر كردووە و دەیەوێت دەستی ببڕێت، جا من پێم باشە تۆ لەگەڵم بێیت بۆ لای و هەواڵی پێ بدەیت بەوەی گوێبیستی بوویت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، جا ڕافیع لەگەڵی ڕۆیشت بۆ لای مەڕوانی كوڕی حەكەم و گوتی: كۆیلەی ئەو پیاوەت گرتووە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، گوتی: دەتەویست چی لێ بكەی؟ گوتی: ویستم دەستی ببڕم، ڕافیعیش ﷺ پێی گوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەستبڕین نییە لە بەروبووم كاتێ بەسەر درەختەوەیە، وە (دەستبڕین نییە) لە كەثەر، جا مەڕوان فەرمانی دەركرد دەربارەی كۆیلەكە و ئازاد كرا.

**٢٤٣٣-** عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْحَضْرَمِيِّ، جَاءَ بِغُلَامٍ لَهُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: اقْطَعْ يَدَ غُلَامِي هَذَا، فَإِنَّهُ سَرَقَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: مَاذَا سَرَقَ؟ فَقَالَ: سَرَقَ مِرْآةً لِامْرَأَتِي ثَمَنُهَا سِتُّونَ دِرْهَمًا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَرْسِلْهُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَطْعٌ، خَادِمُكُمْ سَرَقَ مَتَاعَكُمْ[1].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٥ في الحدود؛ والشيباني: ٦٨٢ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١١٠٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەزرەمی خزمەتکارێکی خۆی هێنا بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و پێی گوت: دەستی ئەو خزمەتکارەم ببڕە، دزی کردووە، ئیمامی عومەریش ﷺ پێی گوت: چی دزیوە؟ ئەویش گوتی: ئاوێنەیەکی لە خێزانەکەم دزیوە نرخەکەی شەست درهەمە، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بەریدە، دەستبڕینی لەسەر نییە، خزمەتکارتانە و کەلوپەلی خۆتانی دزیوە (بە کەلوپەلی ماڵ حیسابە نەك کاڵای تایبەتی ئافرەتەکە، بۆیە دەکەوێتەوە ناو چوارچێوەی سەروەتی پیاوەکە).

**٢٤٣٤**- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ ﷺ، أُتِيَ بِإِنْسَانٍ قَدِ اخْتَلَسَ مَتَاعًا، فَأَرَادَ قَطْعَ يَدِهِ، فَأَرْسَلَ إِلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ يَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ: لَيْسَ فِي الْخُلْسَةِ قَطْعٌ[1].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کەسێکیان هێنا بۆ لای مەڕوانی کوڕی حەکەم ﷺ کە کەلوپەلێکی ڕفاندبوو، ویستی دەستی ببڕێ، جا (بۆ دڵنیایی) ناردی بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت ﷺ پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەوە، جا زەیدی کوڕی سابیت ﷺ گوتی: ڕفاندن دەستبڕینی تیا نییە.

**٢٤٣٥**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخَذَ نَبَطِيًّا قَدْ سَرَقَ خَوَاتِمَ مِنْ حَدِيدٍ، فَحَبَسَهُ لِيَقْطَعَ يَدَهُ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ عَمْرَةُ بِنْتُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، مَوْلَاةً لَهَا، يُقَالُ لَهَا: أُمَيَّةُ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَجَاءَتْنِي وَأَنَا بَيْنَ ظَهْرَانَيِ النَّاسِ، فَقَالَتْ: تَقُولُ لَكَ خَالَتُكَ عَمْرَةُ: يَا ابْنَ أُخْتِي أَخَذْتَ نَبَطِيًّا فِي شَيْءٍ يَسِيرٍ ذُكِرَ لِي، فَأَرَدْتَ قَطْعَ يَدِهِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَإِنَّ عَمْرَةَ تَقُولُ لَكَ: لاَ قَطْعَ إِلاَّ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَأَرْسَلْتُ النَّبَطِيَّ[2].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم ﷺ هەواڵی پێ دام بەوەی

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٧ في الحدود؛ والشيباني: ٦٩١ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٩ في الحدود، عن مالك به.

(جارێکیان) کەسێکی نەبەتی گرت (خەڵکی گوندی نەبەت بوو) کە چەند گوستیلەیەکی ئاسنی دزیبوو، جا بەندی کرد تا دەستی ببڕێت، عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانیش ئافرەتێکی خزمەتکاری خۆی بەدوادا نارد، پێی دەگوترا: ئومەییە، ئەبو بەکر دەڵێ: ئافرەتەکە هات بۆ لام لە کاتێکدا من لەناو خەڵکی بووم، جا گوتی: عەمرەی پورت پەیامی بۆت هەیە و پێت دەڵێت: ئەی کوڕی خوشکم کەسێکی نەبەتیت گرتووە لەسەر شتێکی کەم کە بۆم باس کراوە و ویستووتە دەستی ببڕیت؟ (دەڵێ) گوتم: بەڵێ وایە، ئافرەتەکە گوتی: عەمرە پێت دەڵێت: دەستبڕین نییە تەنها لە چارەگە دینارێك و بەرەو سەرەوە نەبێت، ئەبو بەکر دەڵێت: جا کابرا نەبەتییەکەم بەردا و ئازادم کرد.

**٢٤٣٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي اعْتِرَافِ الْعَبِيدِ: أَنَّهُ مَنِ اعْتَرَفَ مِنْهُمْ عَلَى نَفْسِهِ بِشَيْءٍ، يَقَعُ الْحَدُّ وَالْعُقُوبَةُ فِيهِ فِي جَسَدِهِ، فَإِنَّ اعْتِرَافَهُ جَائِزٌ عَلَيْهِ، وَلاَ يُتَّهَمُ أَنْ يُوقِعَ عَلَى نَفْسِهِ هَذَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَمَّا مَنِ اعْتَرَفَ مِنْهُمْ، بِأَمْرٍ يَكُونُ غُرْمًا عَلَى سَيِّدِهِ، فَإِنَّ اعْتِرَافَهُ غَيْرُ جَائِزٍ عَلَى سَيِّدِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە دەربارەی ئیعتیڕافی کۆیلەکان ئەوەیە: هەر کەسێك لەوان ئیعتیڕاف بە شتێك بکات لەسەر خۆی، ئەوە سزای شەرعی و عقوبەی تێدا دەکەوێتە سەر، چونکە ئیعتیڕافەکەی جێبەجێ دەبێت لەسەر خۆی و تۆمەتبار ناکرێت بەوەی ئەوەی خستبێتە سەر خۆی (لە پێناوی کەسی دیکە، لە کاتێکدا ئەنجامی نەدابێت، ئەو گومانە نابردرێت چونکە خۆی موکەلەفە و دەزانێ عاقیبەتەکە چۆنە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵام هەرچی ئەو کۆیلەیەیە کە ئیعتیڕاف بە شتێك دەکات کە دەبێتە هۆی غەرامە و پێژماردن بە گەورەکەی، ئەوە ئیعتیڕافەکەی جێبەجێ ناکرێت بەسەر گەورەکەی.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٠ في الحدود، عن مالك به.

٢٤٣٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ عَلَى الأَجِيرِ وَلاَ عَلَى الرَّجُلِ يَكُونَانِ مَعَ الْقَوْمِ يَخْدُمَانِهِمْ، إِنْ سَرَقَاهُمْ قَطْعٌ، لأَنَّ حَالَهُمَا لَيْسَتْ بِحَالِ السَّارِقِ، وَإِنَّمَا حَالُهُمَا حَالُ الْخَائِنِ، وَلَيْسَ عَلَى الْخَائِنِ قَطْعٌ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەکرێگیراو (کرێکار) و ئەو کەسەی لەگەڵ خەڵکانێکدان و خزمەتیان دەکەن، ئەگەر دزییان لێ کردن، دەستبڕینیان لەسەر نییە، چونکە حاڵیان حاڵی دز نییە، بەڵکوو حاڵیان حاڵی خیانەتکارە، خیانەتکاریش دەستبڕینی لەسەر نییە.

٢٤٣٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الَّذِي يَسْتَعِيرُ الْعَارِيَةَ فَيَجْحَدُهَا: إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ قَطْعٌ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ، مَثَلُ رَجُلٍ كَانَ لَهُ عَلَى رَجُلٍ دَيْنٌ فَجَحَدَهُ ذَلِكَ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ فِيمَا جَحَدَهُ قَطْعٌ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی شتێك بەخواستن وەردەگرێت و دواتر نکوڵی لێ دەکات، گوتوویەتی: دەستبڕینی لەسەر نییە، نموونەی ئەو کەسە وەك ئەو کەسە وایە کە قەرزی کەسێکی لەسەرە و نکوڵی لێ دەکات، جا (خۆ ئەو کەسە) دەستبڕینی لەسەر نییە لەوەی نکوڵی لێ دەکات (ئەو بابەتەش وەك ئەوە وایە).

٢٤٣٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي السَّارِقِ يُوجَدُ فِي الْبَيْتِ قَدْ جَمَعَ الْمَتَاعَ وَلَمْ يَخْرُجْ بِهِ: إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ قَطْعٌ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ وَضَعَ بَيْنَ يَدَيْهِ خَمْرًا لِيَشْرَبَهَا، فَلَمْ يَفْعَلْ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ حَدٌّ، وَمَثَلُ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٌ جَلَسَ مِنِ امْرَأَةٍ مَجْلِسًا حَرَامًا، وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُصِيبَهَا حَرَامًا، فَلَمْ يَفْعَلْ، وَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ مِنْهَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ أَيْضًا فِي ذَلِكَ حَدٌّ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە دەربارەی ئەو دزەی لە ماڵ دەبینرێت کەلوپەلی کۆ کردۆتەوە (تا بیدزێت، بەڵام هێشتا) نەچۆتە دەرەوە، دەستبڕینی لەسەر نییە، نموونەی ئەو

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٢ في الحدود، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٣ في الحدود، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠٤ في الحدود، عن مالك به.




کەسە وەك کەسێك وایە عارەق و مەشڕوبی لەبەردەست بێت تا بیخواتەوە و هێشتا نەیخواردبێتەوە، سزای شەرعی لەسەر نییە، وە نموونەی وەك ئەو پیاوە وایە لە تەك ئافرەتێك دابنیشێك بەدانیشتنێکی حەڕام (بۆ زیناکردن لە ناو چوارپەلی دانیشتبێت)، لە کاتێکدا مەبەستیەتی بەحەڕامی لەگەڵی جووت بێت، جا (دواتر) ئەنجامی نەدات و نەیگەیەنێتە ئەو قۆناغە، ئەوە بەهەمان شێوە سزای شەرعی لەسەر نییە.

٢٤٤٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لَيْسَ فِي الْخُلْسَةِ قَطْعٌ، بَلَغَ ثَمَنُهَا مَا يُقْطَعُ فِيهِ أَوْ لَمْ يَبْلُغْ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە ئەوەیە: ڕفاندن دەستبڕینی تیا نییە، نرخەکەی بگاتە ئەو ئەندازەی دەستبڕین واجب دەکات یان نەگات (جیاوازی نییە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩٨ في الحدود، عن مالك به.

## ١- سزای شەرعی دەربارەی مەی (مەشڕوب)[١]

**٢٤٤١-** عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﵁، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ خَرَجَ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ: إِنِّي وَجَدْتُ مِنْ فُلَانٍ رِيحَ شَرَابٍ، فَزَعَمَ أَنَّهُ شَرَبَ الطِّلَاءَ، وَأَنَا سَائِلٌ عَمَّا شَرِبَ، فَإِنْ كَانَ يُسْكِرُ جَلَدْتُهُ، فَجَلَدَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁ الْحَدَّ تَامًّا[٢].

واتە: لە سائیبی كوڕی یەزیدەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە بەوەی عومەری كوڕی خەتتاب ﵁ هاتۆتە دەرەوە بۆ لایان و (بۆی گێڕاونەوە و) گوتوویەتی: من هەستم بە بۆنی مەشڕوب كرد لە فڵان كەس، ئەویش گوتی: شەربەتی كوڵێنراوم خواردۆتەوە، جا من پرسیار دەكەم، ئەگەر (ئەو جۆرە شەربەتە) بێهۆشی دروست بكات ئەوە قامچیی سزای شەرعی لێ دەدەم، جا عومەری كوڕی خەتتاب ﵁ سزای تەواوی لەسەر جێبەجێ كرد (دوای ئەوەی زانی شەربەتەكە بێهۆشكەرە).

**٢٤٤٢-** عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ اسْتَشَارَ فِي الْخَمْرِ يَشْرَبُهَا الرَّجُلُ، فَقَالَ لَهُ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﵁: نَرَى أَنْ تَجْلِدَهُ ثَمَانِينَ، فَإِنَّهُ إِذَا شَرِبَ سَكِرَ، وَإِذَا سَكِرَ هَذَى، وَإِذَا هَذَى افْتَرَى، أَوْ كَمَا قَالَ، فَجَلَدَ عُمَرُ ﵁ فِي الْخَمْرِ ثَمَانِينَ[٣].

واتە: لە سەوری كوڕی زەیدی دیلییەوە﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب﵁ ڕاوێژی كرد دەربارەی مەشڕوب كە كەسێك دەیخواتەوە (ئاخۆ چەند قامچی لێ بدرێت)، جا عەلی كوڕی ئەبی تاڵیب﵁ پێی گوت: پێمان چاكە هەشتا قامچی لێ بدەی، چونكە كاتێ دەخواتەوە بێهۆش دەبێ، كاتێكیش بێهۆش بوو وڕێنە دەكا، كاتێكیش وڕێنەی كرد بوختان دەكا ـ یان شتێكی لەو شێوەیەی گوت ـ، بۆیە عومەری كوڕی خەتتاب﵁ هەشتا قامچی لە مەشڕوبخۆر دەدا.

---

(١) ـ الْحَدُّ فِي الْخَمْرِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٥ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧٠٩ في الحدود في الزنا؛ والشافعي: ١٣٧٦؛ والنسائي: ٥٧٠٨ في الأشربة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٦ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٠ في الحدود في الزنا؛ والشافعي: ١٣٨١، كلهم عن مالك به.

**٢٤٤٣-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ حَدِّ الْعَبْدِ فِي الْخَمْرِ؟ فَقَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ عَلَيْهِ نِصْفَ حَدِّ الْحُرِّ فِي الْخَمْرِ، وَأَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، قَدْ جَلَدُوا عَبِيدَهُمْ نِصْفَ حَدِّ الْحُرِّ فِي الْخَمْرِ(١).

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە پرسیاری لێ کرا دەربارەی سزای شەرعی کەسی کۆیلە دەربارەی مەشرووب؟ ئەویش گوتی: پێم گەیشتووە نیوەی سزای کەسی ئازادی لەسەرە دەربارەی مەشرووب، وە عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ قامچیی سزایان داوە لە کۆیلەکانیان بەئەندازەی نیوەی سزای کەسی ئازاد دەربارەی مەشرووب.

**٢٤٤٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ اللهُ يُحِبُّ أَنْ يُعْفَى عَنْهُ مَا لَمْ يَكُنْ حَدًّا(٢).

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: هیچ شتێك نییە حەتمەن خوای پەروەردگار حەز دەکات ببووردرێت مادەم حەدی شەرعی نەبێت (بەڵام کاتێ حەدی شەرعی بێت و بگاتە لای کاربەدەست حەتمەن دەبێ جێبەجێ بکرێ).

**٢٤٤٥-** [**فتوى**] قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالسُّنَّةُ عِنْدَنَا: أَنَّ كُلَّ مَنْ شَرِبَ شَرَابًا مُسْكِرًا، فَسَكِرَ أَوْ لَمْ يَسْكَرْ، فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْحَدُّ(٣).

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازەکە لای ئێمە ئاوایە: هەر کەسێك خواردنەوەیەکی بێهۆشکەر بخواتەوە، جا پێی بێهۆش ببێت یان بێهۆش نەبێت، ئەوە جێبەجێکردنی سزای شەرعی لەسەرە.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٧ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧٠٧ في الحدود في الزنا، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٨ في الحد في الخمر، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢٩ في الحد في الخمر، عن مالك به.




## ٢- ئەوەی نەهی لێ كراوە لەوەی شت بخرێتە ناوی (بۆ مەبەستی دروستكردنی خۆشاو)[١]

**٢٤٤٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﭬ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﭬ: فَأَقْبَلْتُ نَحْوَهُ، فَانْصَرَفَ قَبْلَ أَنْ أَبْلُغَهُ، فَسَأَلْتُ مَاذَا قَالَ؟ فَقِيلَ لِي: نَهَى أَنْ يُنْبَذَ فِي الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ خەڵكی دا لە یەكێك لە غەزاكان، عەبدوڵڵای كوڕی عومەریش ﭬ دەڵێ: منیش چووم بۆ لای (تا بزانم چی دەفەرمووێ)، جا تەواو بوو بەر لەوەی بگەمە لای، بۆیە پرسیارم كرد چی فەرمووی؟ پێم گوترا: نەهی كرد لەوەی (خورما و مێوژ و ئەو شتانە) بخرێنە ناو كودی زەرد و گۆزەی قیڕكراو (بۆ مەبەستی خۆشاو دروستكردن).

**٢٤٤٧**- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ فِي الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لەوەی (خورما بۆ خۆشاو دروستكردن) بخرێتە ناو گۆزە و كودی زەرد و (گۆزەی) قیڕكراو (چونكە زوو تێكدەچێت و دەبێتە بێهۆشكەر).

---

(١) ـ مَا يُنْهَى أَنْ يُنْبَذَ فِيهِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٢ في الحد في الخمر؛ وفي: ١٨٣٤ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٩ في الأشربة؛ والشافعي: ١٣٦٨؛ ومسلم: الأشربة: ٤٨؛ والقابسي: ٢٤٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٤ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧٢٠ في الأشربة؛ وابن حنبل: ١٠٦٧٧؛ والترمذي: ٤٨٧ في الوتر؛ والقابسي: ١٣٦، كلهم عن مالك به.

## ٣- ئەوەی کەڕاهەتی هەیە بەیەکەوە تێکەڵ بکرێن (بەمەبەستی خۆشاو دروستکردن)[١]

**٢٤٤٨-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ الْبُسْرُ وَالرُّطَبُ جَمِيعًا، وَالتَّمْرُ وَالزَّبِيبُ جَمِيعًا[٢].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لەوەی فەریکە خورما لەگەڵ ڕوتاب بەیەکەوە تێکەڵ بکرێن، وە هەروەها خورما و مێوژیش بەیەکەوە (بەمەبەستی خۆشاو دروستکردن).

**٢٤٤٩-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُشْرَبَ التَّمْرُ وَالزَّبِيبُ جَمِيعًا، وَالزَّهْوُ وَالرُّطَبُ جَمِيعًا[٣].

واتە: لە ئەبو قەتادەی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوای ﷺ نەهی کردووە لەوەی خۆشاوی: خورما و مێوژ بەیەکەوە (تێکەڵ بکرێت و) بخورێتەوە، وە لەوەی خۆشاوی: فەریکە خورما و ڕوتاب بەیەکەوە (تێکەڵ بکرێت و) بخورێتەوە (چونکە ئاوا خێراتر تێکدەچێت و دەبێتە بێهۆشکەر).

**٢٤٥٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ أَهْلُ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا، أَنَّهُ يُكْرَهُ ذَلِكَ لِنَهْيِ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَنْهُ[٤].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە ئەو بابەتەیە کە زانایان لە شارەکەمان بەردەوام لەسەری بوون، بەوەی ئەو جۆرە خۆشاوە ناپەسەندە لەبەر نەهیکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

(١) ـ مَا يُكْرَهُ أَنْ يُنْبَذَ جَمِيعًا.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٣ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٨ في الأشربة، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٥ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٧ في الأشربة؛ والقابسي: ٥٢٦، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٥ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٧ في الأشربة؛ والقابسي: ٥٢٦، كلهم عن مالك به.

## ٤- حەرامییەتی مەشرووب (ئارەق)[١]

**٢٤٥١-** عنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ ﷺ عَنِ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ[٢].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی بیتع (کە مەشرووبێك بوو لە هەنگوین و ئاو دروست دەکرا تا دەترشا، جا ئاخۆ حوکمەکەی چییە؟)، فەرمووی: هەموو خواردنەوەیەك کە بێهۆشکەر بێت حەرامە.

**٢٤٥٢-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْغُبَيْرَاءِ؟ فَقَالَ: لاَ خَيْرَ فِيهَا، وَنَهَى عَنْهَا[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَسَأَلْتُ زَيْدَ بْنَ أَسْلَمَ، مَا الْغُبَيْرَاءُ؟ فَقَالَ: هِيَ الأَسْكَرْكَةُ.

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی غوبەیڕاء؟ فەرمووی: هیچ باشەی تێدا نییە و حەرامی کرد.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: پرسیارم لە زەیدی کوڕی ئەسلەم کرد غوبەیڕاء چییە؟ گوتی: ئەسکەرکەیە (کە بریتیبوو لە خواردنەوەیەك لە گەنمەشامی دروست دەکرا بێهۆشکەر بوو).

---

(١) ـ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٧ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١١ في الأشربة؛ والشافعي: ١٣٥٧؛ وابن حنبل: ٢٥٦١٣؛ والبخاري: ٥٥٨٥ في الأشربة؛ ومسلم: الأشربة: ٦٧؛ والنسائي: ٥٥٩٢ في الأشربة؛ وأبو داود: ٣٦٨٢ في الأشربة؛ والترمذي: ١٨٦٣ في الأشربة؛ وابن حبان: ٥٣٤٥، وفي: ٥٣٧٢، وفي: ٥٣٩٣؛ والدارمي: ٢٠٩٧ في الأشربة؛ وشرح معاني الآثار: ٦٤٤٦؛ والقابسي: ٢٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٨ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٢ في الأشربة؛ والشافعي: ١٣٥٨، كلهم عن مالك به.





**٢٤٥٣**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا، حُرِمَهَا فِي الآخِرَةِ[١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مەشرووب (و خواردنەوەی بێهۆشکەر) بخواتەوە لە دونیادا، دواتر تەوبە نەکات و لێی پەشیمان نەبێتەوە و تەرکی نەکات، ئەوە لێی حەڕام و قەدەغە دەکرێت لە دوارۆژدا و پێی نادرێت (لە کاتێکدا ئارەقی بەهەشت هەرچی تام و بۆی خۆشە لەخۆی گرتووە و هەرچی خراپی و بێهۆشییە تیای نییە).

## ٥- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی حەڕامکردنی مەشرووب (ئارەق)[٢]

**٢٤٥٤**- عَنِ ابْنِ وَعْلَةَ الْمِصْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ عَمَّا يُعْصَرُ مِنَ الْعِنَبِ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: أَهْدَى رَجُلٌ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ رَاوِيَةَ خَمْرٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ اللهَ حَرَّمَهَا؟ قَالَ: لاَ، فَسَارَّهُ رَجُلٌ إِلَى جَنْبِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بِمَ سَارَرْتَهُ، فَقَالَ: أَمَرْتُهُ أَنْ يَبِيعَهَا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الَّذِي حَرَّمَ شُرْبَهَا، حَرَّمَ بَيْعَهَا، فَفَتَحَ الرَّجُلُ الْمَزَادَتَيْنِ حَتَّى ذَهَبَ مَا فِيهِمَا[٣].

واتە: لە ئیبنو وەعلەی میصرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ کردووە دەربارەی ئەو خواردنەوەی لە ترێ دروست دەکرێت؟ ئیبنو عەبباسیش ﷺ گوتی: پیاوێك مەتارەیەك مەشرووبی بە دیاری دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: مەگەر نەتزانیوە خوای پەروەردگار ﷻ حەڕامی کردووە؟ گوتی: نەخێر، جا بەنهێنی قسەی لەگەڵ پیاوێکی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٠ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٥ في الأشربة؛ والشافعي: ١٣٥٩؛ وابن حنبل: ٤٦٩٠؛ والبخاري: ٥٥٧٥ في الأشربة؛ ومسلم: الأشربة: ٧٦، وفي: الأشربة: ٧٧؛ والنسائي: ٥٦٧١ في الأشربة؛ والدارمي: ٢٠٩٠ في الأشربة؛ والقابسي: ٢٤٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ تَحْرِيمِ الْخَمْرِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣٦ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٣ في الأشربة؛ والشافعي: ١٣٧٠؛ وابن حنبل: ٣٣٧٣؛ ومسلم: المساقاة: ٦٨؛ والنسائي: ٤٦٦٤ في البيوع؛ وابن حبان: ٤٩٤٢؛ والقابسي:




تەنیشتی خۆی كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: چیت بەنهێنی پێ گوت؟ گوتی: فەرمانم پێ كرد بچێت بیفرۆشێت، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەو كەسەی خواردنەوەكەی حەڕام كردووە فرۆشتنیشی حەڕام كردووە، جا هەردوو سەری مەتارەكەی كردەوە تا ئەوەی لە ناویان بوو بەتاڵ بوو.

**٢٤٥٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ، وَأَبَا طَلْحَةَ الأَنْصَارِيَّ، وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، شَرَابًا مِنْ فَضِيخٍ طوتمرٍ، قَالَ: فَجَاءَهُمْ آتٍ، فَقَالَ: إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا أَنَسُ، قُمْ إِلَى هَذِهِ الْجِرَارِ فَاكْسِرْهَا، قَالَ: فَقُمْتُ إِلَى مِهْرَاسٍ لَنَا، فَضَرَبْتُهَا بِأَسْفَلِهِ حَتَّى تَكَسَّرَتْ[1].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من مەشڕوبێكم دەدا بە ئەبو عوبەیدەی جەڕاح و ئەبو تەلحەی ئەنصاری و ئوبەی كوڕی كەعب كە لە فەریكە خورما و خورما دروست كرابوو، دەڵێ: جا كەسێك هاتە لایان و گوتی: مەشڕوب حەڕام كراوە، جا ئەبو تەلحە گوتی: ئەی ئەنەس بچۆ بۆ لای ئەو گۆزەیە و بیشكێنە، دەڵێ: منیش چووم بۆ لای دەسكە ئاونێكی خۆمان (هەڵمگرت) و بە ژێرەكەی لێم دا تا شكا.

**٢٤٥٦-** عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ حِينَ قَدِمَ الشَّامَ، شَكَا إِلَيْهِ أَهْلُ الشَّامِ وَبَاءَ الأَرْضِ وَثِقَلَهَا، وَقَالُوا: لاَ يُصْلِحُنَا إِلاَّ هَذَا الشَّرَابُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: اشْرَبُوا هَذَا الْعَسَلَ، فَقَالُوا: لاَ يُصْلِحُنَا الْعَسَلُ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ: هَلْ لَكَ أَنْ نَجْعَلَ لَكَ مِنْ هَذَا الشَّرَابِ شَيْئًا لاَ يُسْكِرُ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَطَبَخُوهُ حَتَّى ذَهَبَ مِنْهُ الثُّلُثَانِ، وَبَقِيَ الثُّلُثُ، فَأَتَوْا بِهِ عُمَرَ ﷺ، فَأَدْخَلَ فِيهِ عُمَرُ ﷺ إِصْبَعَهُ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَهُ، فَتَبِعَهَا يَتَمَطَّطُ، فَقَالَ: هَذَا الطِّلاَءُ، هَذَا مِثْلُ طِلاَءِ الإِبِلِ، فَأَمَرَهُمْ عُمَرُ أَنْ يَشْرَبُوهُ، فَقَالَ لَهُ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ ﷺ: أَحْلَلْتَهَا وَاللَّهِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: كَلاَّ وَاللَّهِ، اللهُمَّ إِنِّي لاَ أُحِلُّ لَهُمْ شَيْئًا حَرَّمْتَهُ عَلَيْهِمْ، وَلاَ أُحَرِّمُ عَلَيْهِمْ شَيْئًا أَحْلَلْتَهُ لَهُمْ[2].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٢ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٦ في الأشربة؛ والشافعي: ١٣٦٠؛ والبخاري: ٥٥٨٢ في الأشربة، وفي: ٧٢٥٣ في خبر الواحد؛ ومسلم: الأشربة: ٩؛ وابن حبان: ٥٣٦٤؛ والقابسي: ١١٨، كلهم عن مالك به.




واتە: لە مەحمودی کوڕی لەبیدی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هات بۆ شام، خەڵکی شام شکاتی نەخۆشی و سەختی ناوچەکەیان لەلا کرد و گوتیان: هیچمان بۆ ناگونجێ (و لە جەستەمان ناکەوێ) تەنها ئەو خواردنەوەیە نەبێت، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئێ ئەو هەنگوینە بخۆنەوە، گوتیان: هەنگوین بۆ ئێمە نابێت، جا کەسێکی ناوچەکە گوتی: ئایا هەندێك لەو خواردنەوەیەت بۆ تێ بکەین بێهۆشکەر نییە؟ گوتی: بەڵێ، جا کوڵاندیان تا دوو بەش لە سێ بەشی ڕۆیشت و یەك بەش لە سێ بەشی مایەوە، جا بردیان بۆ لای ئیمامی عومەر ﷺ، ئیمامی عومەریش ﷺ پەنجەی خستە ناویەوە، دواتر دەستی بەرز کردەوە چلورەی کرد (جیڕ بوو وەك هەنگوین چلورەی دەکرد)، جا گوتی: ئەوە قیرە، وەك قیری وشتر وایە (کە وشتری گەڕی پێ ڕوپۆش دەکەن تا چاك بێتەوە)، وە ئیمامی عومەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی کرد بیخۆنەوە، عوبادەی کوڕی صامیتیش ﷺ گوتی: حەڵاڵت کرد سوێند بە خوا، عومەریش ﷺ گوتی: نەخێر سوێند بە خوا (من حەڵاڵم نەکردووە، خۆی حەڵاڵە مادەم بێهۆشکەر نییە)، پەروەردگارا من شتێکیان بۆ حەڵاڵ ناکەم کە تۆ حەڕامت کردبێت لەسەریان، وە شتێکیشیان لەسەر حەڕام ناکەم کە تۆ بۆت حەڵاڵ کردبن.

**٢٤٥٧**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رِجَالاً مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ قَالُوا لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّا نَبْتَاعُ مِنْ ثَمَرِ النَّخْلِ وَالْعِنَبِ، فَنَعْصِرُهُ خَمْرًا، فَنَبِيعُهَا، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: إِنِّي أُشْهِدُ اللهَ عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتَهُ وَمَنْ سَمِعَ مِنَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ، أَنِّي لاَ آمُرُكُمْ أَنْ تَبِيعُوهَا، وَلاَ تَبْتَاعُوهَا، وَلاَ تَعْصِرُوهَا وَلاَ تَشْرَبُوهَا، وَلاَ تَسْقُوهَا، فَإِنَّهَا رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کۆمەڵە کەسێکی خەڵکی عێراق پێیان گوت: ئەی عەبو عەبدوڕڕەحمان ئێمە بەروبوومی خورما و ترێ دەکڕین و دەیگوشین و دەیکەین بە مەشڕوب و دەیفرۆشین،

---

والشافعي: ١٣٧٥، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٣ في الحد في الخمر؛ والشيباني: ٧١٤ في الأشربة؛ والشافعي: ١٣٧٤، كلهم عن مالك به.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ گوتی: من خوا و فریشتەکان و ئەو کەسانەش کە گوێیان لێیە لە جنۆکە و مرۆڤەکان دەکەم بە شاهێد بەوەی من فەرمانم پێ نەکردوون بەوەی نە بیفرۆشن و نە بیکڕن و نە بیگوشن و نە بیخۆنەوە و نە بیدەن بە خەڵکی دیکە، ئەوە پیسە لە کردەوەی شەیتانە.

## ١- باسی خوێنباییەکان[١]

**٢٤٥٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ فِي الْكِتَابِ الَّذِي كَتَبَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ فِي الْعُقُولِ: أَنَّ فِي النَّفْسِ مِئَةً مِنَ الإِبِلِ، وَفِي الأَنْفِ، إِذَا أُوعِيَ جَدْعًا مِئَةٌ مِنَ الإِبِلِ، وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَفِي الْجَائِفَةِ مِثْلُهَا، وَفِي الْعَيْنِ خَمْسُونَ، وَفِي الْيَدِ خَمْسُونَ، وَفِي الرِّجْلِ خَمْسُونَ، وَفِي كُلِّ أُصْبُعٍ مِمَّا هُنَالِكَ، عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ، وَفِي السِّنِّ خَمْسٌ، وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): لەو نووسراوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەمری کوڕی حەزمی نووسی دەربارەی خوێنبایی، تیایدا هاتبوو: لە کوشتندا سەت وشتر خوێنباییە، وە لە لووتدا ئەگەر بەتەواوی بڕابوو سەت وشتر خوێنبایی هەیە، وە لە سەرشکانی قوڵدا کە بگاتە پەردەی دەماغ سێیەکی خوێنبایی هەیە، وە لەو برینەی بگاتە بۆشایی سەر بە هەمان شێوە سێیەکی خوێنبایی هەیە، وە لە چاودا پەنجا وشتر خوێنبایی هەیە، وە لە دەستدا پەنجا وشتر خوێنبایی هەیە، وە لە قاچدا پەنجا وشتر خوێنبایی هەیە، وە لە هەر پەنجەیەکی دەست و قاچدا دە وشتر خوێنبایی هەیە، وە لە ددانددا پێنج وشتر خوێنبایی هەیە، وە لەو سەرشکانەی کە ئێسقان دەردەکەوێ پێنج وشتر خوێنبایی هەیە.

## ٢- چۆنییەتی خوێنباییدان[٣]

**٢٤٥٩-** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَوَّمَ الدِّيَةَ عَلَى أَهْلِ الْقُرَى، فَجَعَلَهَا عَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفَ دِينَارٍ، وَعَلَى أَهْلِ الْوَرِقِ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفَ دِرْهَمٍ.

---

(١) ـ ذِكْرُ الْعُقُولِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢٦ في العقل؛ والشيباني: ٦٦٣ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٩٨٦؛ وفي: ٩٨٨؛ وفي: ١٦٠١؛ وفي: ١٦٠٨؛ والنسائي: ٤٨٥٧ في القسامة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ الْعَمَلُ فِي الدِّيَةِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَهْلُ الذَّهَبِ: أَهْلُ الشَّامِ، وَأَهْلُ مِصْرَ، وَأَهْلُ الْوَرِقِ: أَهْلُ الْعِرَاقِ[1].

واته: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس كردم پێی گەیشتووە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ خوێنبایی (بە پارە) نرخاند بەسەر خەڵكی شاردا (كە وشتریان نییە)، جا بە هەزار دینار نرخاندی بەسەر خاوەن زێڕدا، وە بە دوازدە هەزار درهەم نرخاندی بەسەر خاوەن زیودا.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خاوەنی زێڕ خەڵكی شام و میصرن، خاوەنی زیویش خەڵكی عێراقن.

**٢٤٦٠**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَّ الدِّيَةَ تُقْطَعُ فِي ثَلاَثِ سِنِينَ أَوْ أَرْبَعِ سِنِينَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالثَّلاَثُ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[2].

واته: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لێ بووە (قیستی) خوێنبایی كۆتایی پێ دێ بە سێ ساڵ یان چوار ساڵ.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: سێ ساڵ چاكترین و خۆشەویسترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووم.

**٢٤٦١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، أَنَّهُ لاَ يُقْبَلُ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فِي الدِّيَةِ الإِبِلُ، وَلاَ مِنْ أَهْلِ الْعَمُودِ الذَّهَبُ، وَلاَ الْوَرِقُ، وَلاَ مِنْ أَهْلِ الذَّهَبِ الْوَرِقُ، وَلاَ مِنْ أَهْلِ الْوَرِقِ الذَّهَبُ[3].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: لە خوێنباییدا وشتر لە خەڵكی شار وەرناگیرێت، وە زێڕ و زیو لە خاوەنی وشتر وەرناگیرێت، وە زیو لە خاوەنی زێڕ وەرناگیرێت، وە زێڕ لە خاوەنی زیو وەرناگیرێت (هەر یەكەیان خاوەنی چییە ئەوە دەدات).

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠٧ في العقل؛ وفي: ٢٣٠٨ في النذور والأيمان، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠٩ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١٠ في العقل، عن مالك به.

## ٣- دەربارەی خوێنبایی کوشتنی بەئەنقەست کاتێ قبووڵ دەکرێت (خوێنبایی وەربگیرێت لەجیاتی کوشتنەوەدا)، وە دەربارەی جینایەتی شێت[١]

**٢٤٦٢**- أَنَّ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: فِي دِيَةِ الْعَمْدِ إِذَا قُبِلَتْ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ، وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ حِقَّةً، وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ جَذَعَةً[٢].

واتە: ئیبنو شیهاب ﷺ دەربارەی خوێنبایی کوشتنی بەئەنقەست کاتێ خوێنبایی قبووڵ دەکرێت دەیگوت (خوێنباییەکە بریتییە لە): بیست و پێنج وشتری مێ کە پێیان نابێتە ناو ساڵی دووەمەوە، وە بیست و پێنج وشتری مێ کە پێیان نابێتە ناو ساڵی سێیەمەوە، وە بیست و پێنج وشتر کە پێیان نابێتە ناو ساڵی چوارەمەوە، وە بیست و پێنج وشتر کە پێیان نابێتە ناو ساڵی پێنجەمەوە.

**٢٤٦٣**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ ﷺ كَتَبَ إِلَى مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، أَنَّهُ أُتِيَ بِمَجْنُونٍ قَتَلَ رَجُلاً، فَكَتَبَ إِلَيْهِ مُعَاوِيَةُ ﷺ، أَنِ اعْقِلْهُ وَلاَ تُقِدْ مِنْهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ عَلَى مَجْنُونٍ قَوَدٌ[٣].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): مەڕوانی کوڕی حەکەم ﷺ نووسراوێکی بۆ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ نووسی بەوەی شێتێکیان هێناوەتە لای کە پیاوێکی کوشتووە، موعاویەش ﷺ بۆی نووسی: خوێنبایی (لە خزمەکانی) وەربگرە و تۆڵە لە شێتەکە مەکەرەوە، چونکە شێت تۆڵەی لەسەر نییە.

**٢٤٦٤**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْكَبِيرِ وَالصَّغِيرِ إِذَا قَتَلاَ رَجُلاً جَمِيعًا عَمْدًا، أَنَّ عَلَى الْكَبِيرِ أَنْ يُقْتَلَ، وَعَلَى الصَّغِيرِ نِصْفُ الدِّيَةِ[٤].

---

(١) ـ دِيَةُ الْعَمْدِ إِذَا قُبِلَتْ وَجِنَايَةِ الْمَجْنُونِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢٧ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢٨ في النذور والأيمان؛ وفي: ٢٣٢٩ في النذور والأيمان، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٠ في النذور والأيمان، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷫ دەربارەی کەسێکی گەورە و کەسێکی مناڵی بچووك کاتێ بەیەکەوە کەسێك دەکوژن بەئەنقەست، گوتوویەتی: کەسە گەورەکە دەبێ بکوژرێتەوە و نیوەی خوێنباییش لەسەر مناڵە بچووکەکە هەیە.

**٢٤٦٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷫: وَكَذَلِكَ الْحُرُّ وَالْعَبْدُ يَقْتُلَانِ الْعَبْدَ عَمْدًا، فَيُقْتَلُ الْعَبْدُ، وَيَكُونُ عَلَى الْحُرِّ نِصْفُ قِيمَةِ الْعَبدِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷫ دەربارەی کەسێکی ئازاد و کەسێکی کۆیلە کاتێ بەیەکەوە کۆیلەیەك بەئەنقەست دەکوژن، گوتوویەتی: کۆیلەکە دەکوژرێتەوە و نیوەی نرخی کۆیلەکەش لەسەر کەسە ئازادەکەیە.

## ٤- خوێنبایی کوشتنی بەهەڵە[2]

**٢٤٦٦-** عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷻ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي سَعْدِ بْنِ لَيْثٍ أَجْرَى فَرَسًا، فَوَطِئَ عَلَى إِصْبَعِ رَجُلٍ مِنْ جُهَيْنَةَ، فَنُزِيَ مِنْهَا، فَمَاتَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ لِلَّذِينَ ادُّعِيَ عَلَيْهِمْ: أَتَحْلِفُونَ بِاللَّهِ خَمْسِينَ يَمِينًا مَا مَاتَ مِنْهَا؟ فَأَبَوْا وَتَحَرَّجُوا، فَقَالَ لِلآخَرِينَ: أَتَحْلِفُونَ أَنْتُمْ؟ فَأَبَوْا، فَقَضَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ بِشَطْرِ الدِّيَةِ عَلَى السَّعْدِيِّينَ[3].

قَالَ مَالِكٌ ﷫: وَلَيْسَ الْعَمَلُ عَلَى هَذَا.

واتە: لە عیراکی کوڕی مالیك و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷻ گێڕدراوەتەوە (گوتوویانە): پیاوێك لە نەوەی سەعدی کوڕی لەیس ئەسپێکی دەڕواند، جا ئەسپەکە قاچی خستە سەر پەنجەی پیاوێك لە هۆزی جوهەینە و نەزیف بوو و مرد (خزمانی مردووەکە دەیانگوت: ئێوە کوشتتان، خزمانی خاوەنی ئەسپەکەش دەیانگوت: خۆی مردووە مرۆڤ چۆن بە یەك پەنجە دەمرێت)، جا عومەری کوڕی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣١ في النذور والأيمان، عن مالك به.

(٢) ـ دِيَةُ الْخَطَإِ فِي الْقَتْلِ.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٢ في العقل؛ والشيباني: ٦٨٠ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٧٥٠، كلهم عن مالك به.




خەتتاب ﷺ بەو کەسانەی گوت کە سکاڵایان لەسەر بوو: ئایا پەنجا سوێند دەخۆن بەوەی بەهۆی ئەو کارە نەمردووە؟ ئەوانیش سوێندیان نەخوارد و ئیحراج بوون، وە بەوانەی دیکەی گوت: ئێوە سوێند دەخۆن (بەوەی بەو کارە مردووە و هۆکاری دیکەی لەگەڵ نەبووە)؟ ئەوانیش سوێندیان نەخوارد، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بڕیاری دا بە پێدانی نیوەی خوێنبایی لەسەر نەوەی سەعد.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کردار لەسەر ئەوە نییە (بەوەی نیوەی خوێنبایی بدرێت و سەرەتا سوێندخواردن لەو کەسانەوە دەست پێ بکرێت کە سکاڵایان لەسەرە، لەلای ئێمە پێچەوانەی ئەوە کاری پێ دەکرێت).

**٢٤٦٧-** أَنَّ ابْنَ شِهَابٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ، وَرَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ كَانُوا يَقُولُونَ: دِيَةُ الْخَطَإِ عِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ، وَعِشْرُونَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَعِشْرُونَ ابْنَ لَبُونٍ ذَكَرًا، وَعِشْرُونَ حِقَّةً، وَعِشْرُونَ جَذَعَةً[١].

واتە: ئیبنو شیهاب و سولەیمانی کوڕی یەسار و ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەیانگوت: خوێنبایی کوشتنی بەهەڵە بریتییە لە: بیست وشتری مێ کە پێیان نابێتە ناو ساڵی دووەمەوە، وە بیست وشتری دیکەی مێ کە پێیان نابێتە ناو ساڵی سێیەمەوە، وە بیست وشتری دیکەی نێر کە پێیان نابێتە ناو ساڵی سێیەمەوە، وە بیست وشتری دیکە کە پێیان نابێتە ناو ساڵی چوارەمەوە، وە بیست وشتری دیکە کە پێیان نابێتە ناو ساڵی پێنجەمەوە.

**٢٤٦٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ قَوَدَ بَيْنَ الصِّبْيَانِ، وَإِنَّ عَمْدَهُمْ خَطَأٌ، مَا لَمْ تَجِبْ عَلَيْهِمُ الْحُدُودُ، وَيَبْلُغُوا الْحُلُمَ، وَإِنَّ قَتْلَ الصَّبِيِّ، لاَ يَكُونُ إِلاَّ خَطَأً، وَذَلِكَ لَوْ أَنَّ صَبِيًّا وَكَبِيراً قَتَلاَ رَجُلاً حُرًّا خَطَأً، كَانَ عَلَى عَاقِلَةِ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا نِصْفُ الدِّيَةِ[٢].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٣ في العقل؛ والشيباني: ٦٦٧ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٥ في النذور والأيمان، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی كۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە ئەوەیە: تۆڵەسەندنەوە لە نێوان منالان نییە، تاوانە بەئەنقەستەكانیشیان بەهەڵە حیسابە، مادەم سزا شەرعییەكانیان لەسەر واجب نەبێت و نەگەنە تەمەنی باڵغبوون، جا كوشتنی منالْ تەنها هەڵە حیسابە (بەڵام دەبێ خوێنبایی كوشتنی هەڵە بدەن)، لەبەر ئەوەی ئەگەر منالێك و گەورەیەك بەیەكەوە پیاوێكی ئازاد بەهەڵە بكوژن، ئەوە نیوەی خوێنبایی لەسەر خزمانی هەر یەكێكیان هەیە (كەواتە بەبێ خوێنبایی نابێ).

**٢٤٦٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ قَتَلَ خَطَأً، فَإِنَّمَا عَقْلُهُ مَالٌ لاَ قَوَدَ فِيهِ، وَإِنَّمَا هُوَ كَغَيْرِهِ مِنْ مَالِهِ، يُقْضَى بِهِ دَيْنُهُ، وَتَجُوزُ فِيهِ وَصِيَّتُهُ، فَإِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، تَكُونُ الدِّيَةُ قَدْرَ ثُلُثِهِ، ثُمَّ عُفِيَ عَنْ دِيَتِهِ، فَذَلِكَ جَائِزٌ لَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُ دِيَتِهِ، جَازَ لَهُ مِنْ ذَلِكَ الثُّلُثُ، إِذَا عُفِيَ عَنْهُ، وَأَوْصَى بِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك بەهەڵە كوشتنی ئەنجام دا، ئەوە خوێنباییەكەی بریتییە لە ماڵ و سەروەت، تۆڵەكردنەوەی لەسەر نییە، (ئەو خوێنباییەش) وەك ماڵ و سەروەتی دیكەیە بۆی، قەرزەكانی پێ دەدرێتەوە و وەسییەتەكانی پێ جێبەجێ دەكرێت، جا ئەگەر ماڵ و سەروەتی دیكەشی هەبوو، خوێنباییەكەش بریتی بوو لە سێیەكی ماڵەكەی، دواتر لە خوێنباییەكەی خۆش بوو، ئەوەی بۆ جێبەجێ دەكرێت (چونكە لە سێیەك زیاتر نییە)، وە ئەگەر هیچ ماڵ و سەروەتێكی نەبوو جگە لە خوێنباییەكەی، ئەوە لە سێیەكەكە جێبەجێ دەكرێت ئەگەر لێخۆشبوونی دەركرد یان وەسییەتی كرد (دوو لەسەر سێش دەبێتە میرات بۆ میراتگرەكانی).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٦ في النذور والأيمان، عن مالك به.




## ٥- خوێنبایی برینە بەهەڵەکان[١]

**٢٤٧٠- [فتوى]** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّ الأَمْرَ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَهُمْ فِي الْخَطَإِ: أَنَّهُ لاَ يُعْقَلُ حَتَّى يَبْرَأَ الْمَجْرُوحُ، وَيَصِحَّ، وَأَنَّهُ إِنْ كُسِرَ عَظْمٌ مِنَ الإِنْسَانِ يَدٌ أَوْ رِجْلٌ أَوْ غَيْرُ ذَلِكَ مِنَ الْجَسَدِ خَطَأً، فَبَرَأَ وَصَحَّ وَعَادَ لِهَيْئَتِهِ، فَلَيْسَ فِيهِ عَقْلٌ، فَإِنْ نَقَصَ أَوْ كَانَ فِيهِ عَثَلٌ، فَفِيهِ مِنْ عَقْلِهِ بِحِسَابِ مَا نَقَصَ مِنْهُ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ كَانَ ذَلِكَ الْعَظْمُ مِمَّا جَاءَ فِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عَقْلٌ مُسَمًّى، فَبِحِسَابِ مَا فَرَضَ فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ، وَمَا كَانَ مِمَّا لَمْ يَأْتِ فِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عَقْلٌ مُسَمًّى، وَلَمْ تَمْضِ فِيهِ سُنَّةٌ، وَلاَ عَقْلٌ مُسَمًّى، فَإِنَّهُ يُجْتَهَدُ فِيهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ فِي الْجِرَاحِ فِي الْجَسَدِ إِذَا كَانَتْ خَطَأً عَقْلٌ، إِذَا بَرَأَ الْجُرْحُ، وَعَادَ لِهَيْئَتِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ عَثَلٌ أَوْ شَيْنٌ، فَإِنَّهُ يُجْتَهَدُ فِيهِ، إِلاَّ الْجَائِفَةَ، فَإِنَّ فِيهَا ثُلُثَ دِيَةِ النَّفْسِ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ فِي مُنَقِّلَةِ الْجَسَدِ عَقْلٌ، وَهِيَ مِثْلُ مُوضِحَةِ الْجَسَدِ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم (گوتی): ئەوەی لەلای ئەمان کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی هەڵە ئەوەیە: خوێنبایی نادرێت تاوەکوو بریندارەکە چاك دەبێتەوە، وە ئەگەر ئێسقانێك لە مرۆڤێك شکێنرا دەست بوو یان قاچ بوو یان شوێنێکی دیکە بوو لە جەستە بەهەڵە ئەنجام درا، جا چاك بۆیەوە و ساغ بۆیەوە و وەك خۆی لێ هاتەوە، ئەوە خوێنبایی تیا نییە، جا ئەگەر کەموکوڕییەکی لێ پەیدابوو یان خواری دروستبوو، ئەوە بەگوێرەی کەموکوڕییەکە خوێنیایی تیایە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر ئەو ئێسقانە لەو ئێسقانانە بوو کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ خوێنبایی دیاریکراوی دەربارە هاتووە، ئەوە بەگوێرەی

---

(١) ـ عَقْلُ الْجِرَاحِ فِي الْخَطَإِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٢ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٠ في العقل؛ وفي: ٢٢٧٥ في العقل، كلهم عن مالك به.

ئەو حیسابەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری کردووە، وە ئەوەی لەوانە نەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنبایی دیاریکراوی بۆ داناوە، وە لەمەو پێش هیچی دەربارەوە نەهاتبێت و خوێنبایی دیاریکراوی نەبێت، ئەوە ئیجتیهادی تیادا دەکرێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: برینەکانی جەستە ئەگەر بەهەڵە ئەنجام درابن خوێنباییان تیا نییە کاتێ برینەکە چاك دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی جارانی (کاتێ هیچ عەیبێك جێ ناهێڵێت)، جا ئەگەر شتێك لەو برینانە خواری یان پەڵەی تێدا دروستبوو، ئەوە خوێنباییەکەی ئیجتیهادی تیادا دەکرێت، تەنها جائیفە نەبێت (کە بریتییە لەو برینەی بەشێك لە ئێسقان لەگەڵی دەڕوات)، ئەویان سێیەکی خوێنبایی مرۆڤی تەواوی تیایە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: برینی مونەقیلە (کە بریتییە لەوەی ئێسقانی سەر تۆزێك دەڕوشێت) خوێنبایی تیا نییە (ئەگەر بەهەڵە بێت)، ئەویان وەك موزیحە وایە لە جەستەدا (موزیحە بریتییە لەوەی ئێسقان دەربکەوێت بەڵام ئێسقانەکە زەرەری پێ نەگات).

**٢٤٧١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الطَّبِيبَ إِذَا خَتَنَ، فَقَطَعَ الْحَشَفَةَ إِنَّ عَلَيْهِ الْعَقْلَ، وَأَنَّ ذَلِكَ مِنَ الْخَطَإِ الَّذِي تَحْمِلُهُ الْعَاقِلَةُ، وَأَنَّ كُلَّ مَا أَخْطَأَ بِهِ الطَّبِيبُ أَوْ تَعَدَّى إِذَا لَمْ يَتَعَمَّدْ ذَلِكَ، فَفِيهِ الْعَقْلُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە ئەوەیە: پزیشك ئەگەر خەتەنەی ئەنجام دا و سەری زەکەری لێ کردەوە و بڕی، ئەوە خوێنبایی لەسەرە، ئەوە لەو هەڵانەیە کە خزمان هەڵیدەگرن، وە گشت ئەو شتانەی پزیشك هەڵەی تێدا بکات یان تێی بپەڕێنێت ئەگەر بەئەنقەست نەبوو، ئەوە خوێنبایی تیایە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤١ في العقل، عن مالك به.

## ٦- خوێنبایی ئافرەت[١]

**٢٤٧٢**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: تُعَاقِلُ الْمَرْأَةُ الرَّجُلَ إِلَى ثُلُثِ الدِّيَةِ، إِصْبَعُهَا كَإِصْبَعِهِ، وَسِنُّهَا كَسِنِّهِ، وَمُوضِحَتُهَا كَمُوضِحَتِهِ، وَمُنَقِّلَتُهَا كَمُنَقِّلَتِهِ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی دەیگوت: خوێنبایی ئافرەت وەك خوێنبایی پیاو وایە تا دەگاتە سێیەکی خوێنبایی تەواو (کە بوو بە زیاتر لە سێیەکی خوێنبایی تەواو ئەو کات خوێنباییەکەی نیوەی خوێنبایی پیاوە)، خوێنبایی پەنجەی ئافرەت وەك خوێنبایی پەنجەی پیاو وایە، خوێنبایی ددانی وەك خوێنبایی ددانی پیاو وایە، وە خوێنبایی برینی موزیحەی (کە بریتییە لەو برینەی لە سەردا ئێسقان دەردەکەوێت) وەك خوێنبایی برینی موزیحەی پیاو وایە، وە ئەو برینەی دەگاتە ئێسقان و ئێسقان دەڕوشێنێت وەك خوێنبایی پیاو وایە لەو برینە (چونکە هیچیان ناگەنە سێیەکی خوێنبایی تەواو).

**٢٤٧٣**- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، وَبَلَغَهُ عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّهُمَا كَانَا يَقُولاَنِ مِثْلَ قَوْلِ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ فِي الْمَرْأَةِ: أَنَّهَا تُعَاقِلُ الرَّجُلَ إِلَى ثُلُثِ دِيَةِ الرَّجُلِ، فَإِذَا بَلَغَتْ ثُلُثَ دِيَةِ الرَّجُلِ، كَانَتْ إِلَى النِّصْفِ مِنْ دِيَةِ الرَّجُلِ[٣].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ پێی گەیشتووە بەوەی هەردووکیان هەمان قسەی سەعیدی کوڕی موسەیەبیان دەگوت دەربارەی ئافرەت، (دەیانگوت): خوێنبایی ئافرەت وەك خوێنبایی پیاو وایە تا دەگاتە سێیەکی خوێنبایی تەواوی پیاو، جا کە گەیشت بە سێیەکی خوێنبایی پیاو ئەو کات (خوێنباییەکانی بریتییە لە) نیوەی خوێنبایی پیاو.

---

(١) ـ عَقْلُ الْمَرْأَةِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٣ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٤ في العقل، عن مالك به.

**٢٤٧٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنَّهَا تُعَاقِلُهُ فِي الْمُوضِحَةِ وَالْمُنَقِّلَةِ، وَمَا دُونَ الْمَأْمُومَةِ وَالْجَائِفَةِ، وَأَشْبَاهِهِمَا مِمَّا يَكُونُ فِيهِ ثُلُثُ الدِّيَةِ فَصَاعِدًا، فَإِذَا بَلَغَتْ ذَلِكَ، كَانَ عَقْلُهَا فِي ذَلِكَ النِّصْفَ مِنْ عَقْلِ الرَّجُلِ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە ئەوەیە: خوێنبایی ئافرەت لە برینی موزیحە و مونەقیلە و ئەوەی خوێنباییەکەی کەمترە لە مەئمومە و جائیفە و هاوشێوەکانی لەوانەی سێیەك و زیاتری خوێنباییان تیایە (دەبێ خوێنباییەکەی وەکوو هی پیاو بێت)، جا کە گەیشت بە سێیەکی خوێنبایی تەواو، ئەوە خوێنباییەکان نیوەی خوێنبایی پیاوە(٢).

**٢٤٧٥-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ ﵀ يَقُولُ: مَضَتِ السُّنَّةُ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا أَصَابَ امْرَأَتَهُ بِجُرْحٍ، أَنَّ عَلَيْهِ عَقْلَ ذَلِكَ الْجُرْحِ، وَلاَ يُقَادُ مِنْهُ(٣).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئیبنو شیهاب ﵀ بووە دەیگوت: ڕێبازەکە وا هاتووە ئەگەر پیاو برینێکی لە خێزانەکەی دروست کرد، ئەوە (تەنها) خوێنبایی ئەو برینەی لەسەرە و تۆڵەی لێ ناکرێتەوە.

**٢٤٧٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَإِنَّمَا ذَلِكَ فِي الْخَطَإِ، أَنْ يَضْرِبَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ، فَيُصِيبَهَا مِنْ ضَرْبِهِ مَا لَمْ يَتَعَمَّدْ، يَضْرِبُهَا بِسَوْطٍ، فَيَفْقَأُ عَيْنَهَا، وَنَحْوَ ذَلِكَ(٤).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بەهەڵە حیسابە کاتێ پیاو لە خێزانەکەی دەدات و ئەندامێکی شتێکی بەسەر دێت کە بەئەنقەست مەبەستی نەبووە، (بۆ نموونە) بە قامچی لێی بدات (بۆ ڕاستکردنەوە و تەمێکردن لەسەر کارێك کە شایستە بێت) جا چاوی کوێر بکات یان شتی لەو شێوەیە (چونکە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٥ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: موزیحە ئەو برینەیە کە ئێسقان تیایدا دەردەکەوێت، مونەقیلە ئەو برینەیە کە ئێسقان لەگەڵی دەردەکەوێت و دەڕوشێت، مەئمومەش ئەو برینەیە کە ئێسقانی سەر دەشکێت و دەگاتە مێشك، وە جائیفە ئەو برینەیە کە بەشێك لە ئێسقان لەگەڵی دەڕوات.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٦ في العقل؛ وفي: ٢٢٤٧ في العقل، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٦ في العقل؛ وفي: ٢٢٤٧ في العقل، عن مالك به.




مەبەستی کوێرکردن نەبووە، هەڵە حیسابە و خوێنبایی دەدات، بەڵام ئەگەر بەئەنقەست کوێری بکات ئەوە کوێر دەکرێتەوە).

**٢٤٧٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْمَرْأَةِ يَكُونُ لَهَا زَوْجٌ وَوَلَدٌ مِنْ غَيْرِ عَصَبَتِهَا وَلاَ قَوْمِهَا، فَلَيْسَ عَلَى زَوْجِهَا إِذَا كَانَ مِنْ قَبِيلَةٍ أُخْرَى مِنْ عَقْلِ جِنَايَتِهَا شَيْءٌ، وَلاَ عَلَى وَلَدِهَا إِذَا كَانُوا مِنْ غَيْرِ قَوْمِهَا، وَلاَ عَلَى إِخْوَتِهَا مِنْ أُمِّهَا إِذَا كَانُوا مِنْ غَيْرِ عَصَبَتِهَا وَلاَ قَوْمِهَا، فَهَؤُلاَءِ أَحَقُّ بِمِيرَاثِهَا، وَالْعَصَبَةُ عَلَيْهِمُ الْعَقْلُ، مُنْذُ زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَذَلِكَ مَوَالِي الْمَرْأَةِ، مِيرَاثُهُمْ لِوَلَدِ الْمَرْأَةِ، وَإِنْ كَانُوا مِنْ غَيْرِ قَبِيلَتِهَا، وَعَقْلُ جِنَايَةِ الْمَوَالِي عَلَى قَبِيلَتِهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتەی مێرد و منداڵی هەیە لە جگە لە عەصەبە و قەومەکەی خۆی (بۆ نموونە مێردەکەی کوڕەمامی خۆی نییە، بێگانەیە)، گوتوویەتی: مێردەکەی ئەگەر لە هۆزێکی دیکە بێت هیچ خوێنباییەکی جینایەتی خێزانەکەی خۆی لەسەر نییە (کاتێ خێزانەکەی جینایەتێکی لەدەست ڕوو دەدات)، وە منداڵی ئافرەتەکەش لەسەری نییە ئەگەر لە جگە لە قەومی ئافرەتەکە بن، وە لەسەر براکانی لە دایکیشی نییە ئەگەر لە عەصەبە و قەومی ئافرەتەکە نەبن، ئەمانە شایستەتر و لەپێشترن بە میراتی ئافرەتەکە، عەصەبەش خوێنبایی لەسەرە، (جا بابەتەکە ئاوا هاتووە) لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ تا ئێستا، بەهەمان شێوە کۆیلەی ئازادکراوی ئافرەتەکە میراتەکەیان بۆ منداڵی ئافرەتەکەیە هەرچەندە لە هەمان هۆزی ئافرەتەکەش نەبن، وە خوێنبایی جینایەتی گەورەکانی ئافرەتەکە لەسەر هۆزەکەی خۆیانە (منداڵی ئافرەتەکە بەژدار نابێت، واتە میرات دەبەن و خوێنباییش نادەن).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٨ في العقل، عن مالك به.

## ٧- خوێنبایی كۆرپەلە[1]

**٢٤٧٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ، رَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى، فَطَرَحَتْ جَنِينَهَا، فَقَضَى فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، گوتوویەتی: دوو ئافرەت لە قەبیلەی هوزەیل بەشەڕ هاتن و یەكێكیان بەردێكی گرتە ئەوەی دیكەیان و مناڵەكەی لەبار چوواند، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا بەوەی خوێنی مناڵەكە بریتییە لە نرخی كۆیلەیەك جا كۆیلەكە نێر بێت یان مێ.

**٢٤٧٩**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى فِي الْجَنِينِ يُقْتَلُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ، بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ، فَقَالَ الَّذِي قُضِيَ عَلَيْهِ: كَيْفَ أَغْرَمُ مَا لاَ شَرِبَ، وَلاَ أَكَلَ، وَلاَ نَطَقَ، وَلاَ اسْتَهَلَّ، وَمِثْلُ ذَلِكَ بَطَلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ[3].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی كۆرپەلە كە لە سكی دایكیدا بكوژرێت دادوەری كردووە بە نرخی كۆیلەیەكی نێر یان مێ، جا ئەو كەسەی بڕیارەكەی بەسەردا درا گوتی: چۆن تۆڵەی مناڵێك بدەم كە نە خواردوویەتیەوە و نە خواردوویەتی و نەقسەی كردووە و نە دەنگی دەرهاتووە، هاوشێوەی ئەو شتە بەتاڵە (هیچی بۆ دانادرێت)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو كەسە برای فاڵچییەكانە (لەبەر ڕێكخستنی وشەكانی بۆ قەناعەت دروستكردن، چونكە بۆ كاریگەری دانان لەسەر خەڵكی ڕستە سەرەكییەكانی بە پیتی لام كۆتایی پێ هێنا و گوتی: (كَيْفَ أَغْرَمُ مَا لاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلْ، وَلاَ نَطَقَ وَلاَ اسْتَهَلّ، وَمِثْلُ ذَلِكَ بَطَلْ).

---

(١) ـ عَقْلُ الْجَنِينِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤٩ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٥ في الضحايا وما يجزئ منها؛ وابن حنبل: ٧٢١٦؛ والبخاري: ٦٩٠٤ في الديات؛ ومسلم: القسامة: ٣٤؛ والنسائي: ٤٨١٩ في القسامة؛ وابن حبان: ٦٠١٧؛ وشرح معاني الآثار: ٥٠٧١؛ والقابسي: ٢٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٠ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٤ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٦٠٥؛ والبخاري: ٥٧٥٩ في الطب: ٤٦ئ؛ والنسائي: ٤٨٢٠ في القسامة، كلهم عن مالك به.




**٢٤٨٠**- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: الْغُرَّةُ تُقَوَّمُ خَمْسِينَ دِينَارًا، أَوْ سِتَّمِئَةِ دِرْهَمٍ، وَدِيَةُ الْمَرْأَةِ الْحُرَّةِ الْمُسْلِمَةِ خَمْسُمِئَةِ دِينَارٍ، أَوْ سِتَّةُ آلاَفِ دِرْهَمٍ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَدِيَةُ جَنِينِ الْحُرَّةِ، عُشْرُ دِيَتِهَا، وَالْعُشْرُ خَمْسُونَ دِينَارًا، أَوْ سِتُّمِئَةِ دِرْهَمٍ[1].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: نرخی کۆیلەکە دەبێ پەنجا دینار یان شەش سەت درهەم بێت، وە خوێنبایی ئافرەتی ئازادی مسوڵمانیش (لەسەر خاوەن زێڕ و زیو) پێنج سەت دینار یان شەش هەزار درهەمە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خوێنبایی کۆرپەلەی ناو سکی ئافرەتی ئازاد یەك لەسەر دەی خوێنبایی ئافرەتەکەیە، جا یەك لەسەر دەیەکە بریتییە لە پەنجا دینار یان شەش سەت درهەم.

**٢٤٨١**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا يُخَالِفُ فِي أَنَّ الْجَنِينَ لاَ تَكُونُ فِيهِ الْغُرَّةُ حَتَّى يُزَايِلَ بَطْنَ أُمِّهِ، وَيَسْقُطُ مِنْ بَطْنِهَا مَيِّتًا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە کەس نەبووە پێچەوانەی وتبێت لەوەی (حوکم دراوە بەوەی) کۆرپەلەی ناو سك خوێنبایی تیا نییە تاوەکوو لە سکی دایکی جیا نەبێتەوە و لە سکی نەیەتە خوارەوە بەمردوویی.

**٢٤٨٢**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَسَمِعْتُ أَنَّهُ إِذَا خَرَجَ الْجَنِينُ مِنْ بَطْنِ أُمِّهِ حَيًّا، ثُمَّ مَاتَ، أَنَّ فِيهِ الدِّيَةَ كَامِلَةً[3].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گوێم لێ بووە ئەگەر کۆرپەلە (دوای لێدان لە دایکی) لە سکی دایکی هاتە دەرەوە بەزیندوویی و دواتر بەو هۆیەوە مرد، ئەوە خوێنبایی تەواوی تیایە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥١ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٢ في العقل، عن مالك به.

**٢٤٨٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ حَيَاةَ لِلْجَنِينِ إِلاَّ بِالاسْتِهْلاَلِ، فَإِذَا خَرَجَ مِنْ بَطْنِ أُمِّهِ فَاسْتَهَلَّ، ثُمَّ مَاتَ، فَفِيهِ الدِّيَةُ كَامِلَةً، قَالَ: وَنَرَى أَنَّ فِي جَنِينِ الأَمَةِ عُشْرَ ثَمَنِ أُمِّهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کۆرپەلەی ناو سك (کە دێتە دەرەوە) حیسابی زیندووێتی بۆ ناکرێ تەنها بە دەنگ لێوەهاتن نەبێت، جا کاتێ لە سکی دایکی هاتە دەرەوە، دواتر مرد، ئەوە خوێنبایی تەواوی تیایە، وە گوتوویەتی: بۆچوونمان وایە کۆرپەلەی ئافرەتی کۆیلە یەك لەسەر دەی خوێنبایی دایکەکەیەتی.

**٢٤٨٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا قَتَلَتِ الْمَرْأَةُ رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً عَمْدًا، وَالَّتِي قَتَلَتْ حَامِلٌ، لَمْ يُقَدْ مِنْهَا حَتَّى تَضَعَ حَمْلَهَا، وَإِنْ قُتِلَتِ الْمَرْأَةُ وَهِيَ حَامِلٌ عَمْدًا أَوْ خَطَأً، فَلَيْسَ عَلَى مَنْ قَتَلَهَا فِي جَنِينِهَا شَيْءٌ إِنْ قُتِلَتْ عَمْدًا، قُتِلَ الَّذِي قَتَلَهَا، وَلَيْسَ فِي جَنِينِهَا دِيَةٌ، وَإِنْ قُتِلَتْ خَطَأً، فَعَلَى عَاقِلَةِ قَاتِلِهَا دِيَتُهَا، وَلَيْسَ فِي جَنِينِهَا دِيَةٌ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتێك پیاوێك یان ئافرەتێکی بەئەنقەست کوشت، جا ئەو ئافرەتەی کوشتنەکەی ئەنجام داوە دووگیان بوو، ئەوە تۆڵەی لێ ناکرێتەوە تاوەکوو حەملەکەی دادەنێ، وە ئەگەر ئافرەتێك کوژرا لە کاتێکدا دووگیان بوو جا کوشتنەکە بەئەنقەست بێت یان بەهەڵە، ئەوە ئەو کەسەی کوشتوویەتی خوێنبایی کۆرپەلەکەی لەسەر نییە هەرچەندە ئافرەتەکەشی بەئەنقەست کوشتبێت، ئەو کەسەی کوشتوویەتی دەکوژرێتەوە و خوێنبایی کۆرپەلەکەی لەسەر نییە، وە ئەگەر بەهەڵە کوژرا، ئەوە خوێنبایی ئافرەتەکە لەسەر خزمانی بکوژەکەیە و کۆرپەلەکەشی خوێنبایی تیا نییە.

**٢٤٨٥- [فتوى]** سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ جَنِينِ الْيَهُودِيَّةِ وَالنَّصْرَانِيَّةِ يُطْرَحُ؟ فَقَالَ: أَرَى أَنَّ فِيهِ عُشْرَ دِيَةِ أُمِّهِ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٤ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٥ في العقل، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی کۆرپەلەی ناو سکی ئافرەتی جوولەکە و گاور کە لەبار بچووێنرێت (بەهۆی لێدان و جەریمەی کەسێك)؟ گوتی: بۆچوونم وایە یەك لەسەر دەی خوێنبایی دایکەکەیەتی.

## ٨- ئەو شتانەی خوێنبایی تەواویان تیایە[١]

**٢٤٨٦-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: فِي الشَّفَتَيْنِ الدِّيَةُ كَامِلَةً، فَإِذَا قُطِعَتِ السُّفْلَى، فَفِيهَا ثُلُثَا الدِّيَةِ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: دوو لێوەکان خوێنبایی تەواویان تیایە، جا ئەگەر لێوی خوارەوە بڕدرا، ئەوە دوو لەسەر سێی خوێنبایی تەواو هەیە (چونکە ئیش و جوڵەی زیاتر بە لێوی خوارەوەیە).

**٢٤٨٧-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ عَنِ الرَّجُلِ الأَعْوَرِ يَفْقَأُ عَيْنَ الصَّحِيحِ، فَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ: إِنْ أَحَبَّ الصَّحِيحُ أَنْ يَسْتَقِيدَ مِنْهُ، فَلَهُ الْقَوَدُ، وَإِنْ أَحَبَّ، فَلَهُ الدِّيَةُ، أَلْفُ دِينَارٍ، أَوِ اثْنَا عَشَرَ أَلْفَ دِرْهَمٍ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی ئەو پیاوەی چاوێکی کوێرە و چاوە ساغەکەی کوێر بکرێت، ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر حەزی کرد تۆڵە بکاتەوە، ئەوە تۆڵەکردنەوەی بۆ هەیە (چاوی کەسەکە کوێر دەکرێت وەك ئەو)، وە ئەگەر حەزی کرد خوێنبایی وەربگرێت، ئەوە خوێنبایی بۆ هەیە، کە بریتییە لە هەزار دینار یان دوازدە هەزار درهەم.

---

(١) ـ مَا فِيهِ الدِّيَةُ كَامِلَةً.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٧ في العقل؛ والشيباني: ٦٦٤ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦٢ في العقل، عن مالك به.

**٢٤٨٨**- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ فِي كُلِّ زَوْجٍ مِنَ الإِنْسَانِ الدِّيَةَ كَامِلَةً، وَأَنَّ فِي اللِّسَانِ الدِّيَةَ كَامِلَةً، وَأَنَّ فِي الأُذُنَيْنِ إِذَا ذَهَبَ سَمْعُهُمَا الدِّيَةَ كَامِلَةً اصْطُلِمَتَا، أَوْ لَمْ تُصْطَلَمَا، وَفِي ذَكَرِ الرَّجُلِ الدِّيَةُ كَامِلَةً، وَفِي الأُنْثَيَيْنِ الدِّيَةُ كَامِلَةً(١).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی هەموو ئەو ئەندامانەی دووانەن لە مرۆڤدا خوێنبایی تەواوی تیایە، وە زمان خوێنبایی تەواوی تیایە، وە دوو گوێچکەکان ئەگەر بیستنیان نەمێنێ خوێنبایی تەواویان تیایە، چون یەکە لە بنڕا بڕابن یان نەبڕابن، وە زەکەری پیاو خوێنبایی تەواوی تیایە، وە دوو هێلکە گونەکانی پیاو خوێنبایی تەواویان تیایە.

**٢٤٨٩**- عَنْ مالِكٍ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ فِي ثَدْيَي الْمَرْأَةِ الدِّيَةَ كَامِلَةً(٢).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە: دوو مەمکەکانی ئافرەت خوێنبایی تەواوی تیایە.

**٢٤٩٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَأَخَفُّ ذَلِكَ عِنْدِي الْحَاجِبَانِ، وَثَدْيَا الرَّجُلِ(٣).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: دوو برۆکان و دوو مەمکەکانی پیاو (حوکمەکەیان) سووکترە لەلای من (دەوڵەت خوێنباییەکەی دیاری دەکات، بەڵام خوێنباییەکەیان کەمترە لە خوێنبایی تەواو).

**٢٤٩١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ عِنْدَنَا أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا أُصِيبَ مِنْ أَطْرَافِهِ أَكْثَرُ مِنْ دِيَتِهِ، فَذَلِكَ لَهُ إِذَا أُصِيبَتْ يَدَاهُ وَرِجْلاَهُ وَعَيْنَاهُ، فَلَهُ ثَلاَثُ دِيَاتٍ(٤).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە ئەگەر کەسێك دەست و پێکانی لەناو بران کە زیاتری دەکرد لە خوێنبایی تەواوی خۆی، ئەوە بۆی هەیە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٨ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٩ في العقل؛ وفي: ٢٢٦٠ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥٩ في العقل؛ وفي: ٢٢٦٠ في العقل، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦١ في العقل، عن مالك به.




کاتێ دوو دەست و دوو قاچەکانی و دوو چاوەکانی دەپێکرێن، سێ خوێنبایی تەواو وەربگرێت.

**٢٤٩٢-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي عَيْنِ الأَعْوَرِ الصَّحِيحَةِ إِذَا فُقِئَتْ خَطَأً: إِنَّ فِيهَا الدِّيَةَ كَامِلَةً(١).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی چاوێکی کوێرە و چاوە ساغەکەی کوێر دەکرێت گوتوویەتی: خوێنبایی تەواوی تیایە.

### ٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی چاو کاتێ بینایی نامێنێ(٢)

**٢٤٩٣-** أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: فِي الْعَيْنِ الْقَائِمَةِ إِذَا أُطْفِئَتْ مِئَةُ دِينَارٍ(٣).

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەربارەی چاوێك (ی کوێر) کە ناجوڵێت کاتێ هێنرایە دەر (بەهۆی دەستدرێژی کەسێکەوە) دەیگوت: (خوێنباییەکەی) سەت دینارە.

**٢٤٩٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ شَتَرِ الْعَيْنِ، وَحِجَاجِ الْعَيْنِ، فَقَالَ: لَيْسَ فِي ذَلِكَ إِلاَّ الاجْتِهَادُ، إِلاَّ أَنْ يَنْقُصَ بَصَرُ الْعَيْنِ، فَيَكُونُ لَهُ بِقَدْرِ مَا نَقَصَ مِنْ بَصَرِ الْعَيْنِ(٤).

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: پرسیار لە ئیمامی مالیك ﷺ کرا دەربارەی بڕینی پێڵووی خوارەوەی چاو و شکاندنی ئێسقانی دەورەی چاو، گوتی: لە ئیجتیهاد زیاتر هیچی تیا نییە (دەوڵەت بەئیجتیهاد دیاری دەکات)، تەنها لەو کاتە نەبێت کە بینایی چاو کەم بکات بەهۆیەوە، ئەو کات خوێنبایی بۆ هەیە بەئەندازەی ئەوەی کەمی کردووە لە بینایی چاوەکە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦٥ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي عَقْلِ الْعَيْنِ إِذَا ذَهَبَ بَصَرُهَا.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦٦ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٠ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦٨ في العقل، عن مالك به.

**٢٤٩٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْعَيْنِ الْقَائِمَةِ الْعَوْرَاءِ، إِذَا أُطْفِئَتْ، وَفِي الْيَدِ الشَّلاَّءِ إِذَا قُطِعَتْ: إِنَّهُ لَيْسَ فِي ذَلِكَ إِلاَّ الاِجْتِهَادُ، وَلَيْسَ فِي ذَلِكَ عَقْلٌ مُسَمًّى[١].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی چاوی نەجوڵاوی کوێر کاتێ دەڕژێندرێت، وە دەربارەی دەستی شەلەل کاتێ دەبڕدرێت، گوتوویەتی: لە ئیجتیهاد زیاتر هیچی تیا نییە، خوێنباییێکی دیاریکراوی تیا نییە.

### ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی شکانەکان[٢]

**٢٤٩٦-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﵀ يَذْكُرُ، أَنَّ الْمُوضِحَةَ فِي الْوَجْهِ مِثْلُ الْمُوضِحَةِ فِي الرَّأْسِ، إِلاَّ أَنْ تَعِيبَ الْوَجْهَ، فَيُزَادُ فِي عَقْلِهَا، مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ عَقْلِ نِصْفِ الْمُوضِحَةِ فِي الرَّأْسِ، فَيَكُونُ فِيهَا خَمْسَةٌ وَسَبْعُونَ دِينَارًا[٣].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سولەیمانی کوڕی یەسار ﵀ بووە باسی کردووە (گوتوویەتی): برینی موزیحە لە ڕوخساردا (کە برینێیە لەو برینەی ئێسقان دەردەخات)، وەك برینی موزیحە وایە لە سەردا، تەنها لەو کاتە نەبێت کە ڕوخسار عەیبدار بکات، ئەو کات خوێنباییەکەی زیاد دەکرێت (زیادییەکەش) لە نێوان خۆی و نیوەی خوێنبایی موزیحەی سەر دەبێت، کەواتە (بۆ خاوەنی زێڕ) حەفتا و پێنج دینارە.

**٢٤٩٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ فِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ فَرِيضَةً.

قَالَ: وَالْمُنَقِّلَةُ الَّتِي يَطِيرُ فِرَاشُهَا مِنَ الْعَظْمِ، وَلاَ تَخْرِقُ إِلَى الدِّمَاغِ، وَهِيَ تَكُونُ فِي الرَّأْسِ وَفِي الْوَجْهِ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦٧ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي عَقْلِ الشِّجَاجِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦٩ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٦ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٢ في العقل، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە برینی مونەقیلە خوێنبابییەكەی پازدە وشترە.

گوتوویەتی: جا مونەقیلە ئەوەیە كە تفری سەرەوەی ئێسقانەكە بڕوا و بڕوشێت و ئێسقانەكە ناشكێت تا بگات بە مێشك، كە ئەویش تەنها لە سەر و ڕوخساردا ڕوو دەدات.

**٢٤٩٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمَأْمُومَةَ وَالْجَائِفَةَ لَيْسَ فِيهِمَا قَوَدٌ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: برینی مەئمومە (كە بریتییە لەو برینەی ئێسقانی سەر دەشكێنێت و دەگاتە پەردەی مێشك)، وە برینی جائیفە (كە بریتییە لەو برینەی دەگاتە بۆشایی جەستە) تۆڵەیان تیا نییە (تەنها خوێنباییان تیایە).

**٢٤٩٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَدْ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: لَيْسَ فِي الْمَأْمُومَةِ قَوَدٌ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: برینی مەئمومە (كە بریتییە لەو برینەی ئێسقانی سەر دەشكێنێت و دەگاتە مێشك)، تۆڵەیان تیا نییە (تەنها خوێنباییان تیایە).

**٢٥٠٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمَأْمُومَةُ مَا خَرَقَ الْعَظْمَ إِلَى الدِّمَاغِ، وَلاَ تَكُونُ الْمَأْمُومَةُ إِلاَّ فِي الرَّأْسِ، وَمَا يَصِلُ إِلَى الدِّمَاغِ إِذَا خَرَقَ الْعَظْمَ(٣).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: برینی (مەئمومە) بریتییە لەو برینەی ئێسقان دەشكێنێت و دەگاتە مێشك، جا برینی مەئمومە تەنها لە سەردا هەیە لەوەی دەگاتە مێشك كاتێ ئێسقان دەبڕێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٤ في العقل؛ وفي: ٢٢٧٦ في العقل، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٤ في العقل؛ وفي: ٢٢٧٦ في العقل، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٤ في العقل؛ وفي: ٢٢٧٦ في العقل، كلهم عن مالك به.

**٢٥٠١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لَيْسَ فِيمَا دُونَ الْمُوضِحَةِ مِنَ الشِّجَاجِ عَقْلٌ، حَتَّى تَبْلُغَ الْمُوضِحَةَ، وَإِنَّمَا الْعَقْلُ فِي الْمُوضِحَةِ فَمَا فَوْقَهَا، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ انْتَهَى إِلَى الْمُوضِحَةِ فِي كِتَابِهِ لِعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، فَجَعَلَ فِيهَا خَمْسًا مِنَ الإِبِلِ، وَلَمْ تَقْضِ الأَئِمَّةُ فِي الْقَدِيمِ، وَلاَ فِي الْحَدِيثِ، فِيمَا دُونَ الْمُوضِحَةِ بِعَقْلٍ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە: برینێك کەمتر بێت لەو برینەی ئێسقان دەردەخات خوێنبایی تیا نییە، تا دەگاتە ئەو برینەی ئێسقانی تیا دەردەکەوێت و دەگاتە سەر ئێسقان، چونکە خوێنبایی تەنها لەو برینەیە کە ئێسقانی تیادا دەردەکەوێت و سەرووی ئەوەش (وەك شکان)، ئەوەش لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نووسراوەکەی بۆ عەمری کوڕی حەزم کۆتایی هێناوە بە باسکردنی خوێنبایی لەو برینەی ئێسقانی تێدا دەردەکەوێت، پێنج وشتری تیادا داناوە، زانایانیش لە کۆن و لە ئێستادا خوێنباییان دانەناوە لە کەمتر لەو برینەی ئێسقانی تیادا دەردەکەوێت.

**٢٥٠٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُلُّ نَافِذَةٍ فِي عُضْوٍ مِنَ الأَعْضَاءِ، فَفِيهَا ثُلُثُ عَقْلِ ذَلِكَ الْعُضْوِ[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر کونێك و قلیشێك لە ئەندامێکی جەستە بکرێت، ئەوە سێیەکی خوێنی ئەو ئەندامەی تیایە (دەبێ ئەو تۆڵەیە بدات).

**٢٥٠٣-** قَالَ يَحْيى ﷺ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقولُ: كَانَ ابْنُ شِهَابٍ لاَ يَرَى ذَلِكَ وَأَنَا لاَ أَرَى فِي نَافِذَةٍ فِي عُضْوٍ مِنَ الأَعْضَاءِ فِي الْجَسَدِ أَمْرًا مُجْتَمَعًا عَلَيْهِ، وَلَكِنِّي أَرَى فِيهِ الاِجْتِهَادَ، يَجْتَهِدُ الإِمَامُ فِي ذَلِكَ، وَلَيْسَ فِي ذَلِكَ أَمْرٌ مُجْتَمَعٌ عَلَيْهِ عِنْدَنَا[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٠ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٧ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٣ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٧ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٣ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئیبنو شیهاب پێی وا نەبوو منیش پێم وا نییە لە کوونتێکردنی ئەندامێك لە ئەندامەکانی جەستەدا حوکمێکی کۆدەنگ هەبێت، بەڵکوو پێم وایە دەبێ ئیجتیهادی تێدا بکرێت، ئیمام ئیجتیهادی تێدا دەکات، لەلای ئێمە حوکمێکی کۆدەنگ نییە لەو بارەیەوە.

**٢٥٠٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمَأْمُومَةَ وَالْمُنَقِّلَةَ وَالْمُوضِحَةَ لاَ تَكُونُ إِلاَّ فِي الْوَجْهِ وَالرَّأْسِ، فَمَا كَانَ فِي الْجَسَدِ مِنْ ذَلِكَ، فَلَيْسَ فِيهِ إِلاَّ الاِجْتِهَادُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە مەئمومە و مونەقیلە و موزیحە کە بریتین: لەو برینەی دەگاتە دەماغ و ئەوەشی کە دوای لاچوونی گۆشت ئێسقانیش دەڕوشێنێ[٢] و ئەوەشی کە تەنها گۆشتەکە لادەچێت و ئێسقان دەردەکەوێت، تەنها لە ڕوخسار و سەردا حیسابن (واتە ئەو خوێنباییەیان بۆ دادەنرێ کە دیاری کراوە)، هەرچی لەوانە (واتە هەرچی هاوتای ئەوانە) ڕوو بدەن لە جەستە، لە ئیجتیهاد زیاتر هیچی تیا نییە (واتە حوکمێکی کۆدەنگ نییە دەربارەی).

**٢٥٠٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ أَرَى اللَّحْيَ الأَسْفَلَ، وَالأَنْفَ مِنَ الرَّأْسِ فِي جِرَاحِهِمَا، لأَنَّهُمَا عَظْمَانِ مُنْفَرِدَانِ، وَالرَّأْسُ بَعْدَهُمَا عَظْمٌ وَاحِدٌ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وا نییە شەویلاگی خوارەوە و لووت بە سەر حیساب بن لە برینەکەیاندا، چونکە ئەو دووانە دوو ئێسقانی جیان، سەر لەدوای ئەوانەوە یەك پارچە ئێسقانە.

**٢٥٠٦-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ أَقَادَ مِنَ الْمُنَقِّلَةِ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٧ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك مونەقیلە بەو واتایە دێت، وەك لە دەقی ژمارە (٢٤٩٧)دا هاتووە.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٧ في العقل، عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧١ في العقل، عن مالك به.

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر تۆڵەی وەردەگرتەوە لەو برینەی کە گۆشت دەبڕێت و ئێسقان دەڕوشێنێت (بەڵام ئیمامی مالیك پێی وایە تۆڵەی تیا نییە، خوێنبایی تیایە).

## ١١- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی پەنجەکان[1]

**٢٥٠٧-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ: كَمْ فِي إِصْبَعِ الْمَرْأَةِ؟ فَقَالَ: عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ، فَقُلْتُ: كَمْ فِي إِصْبَعَيْنِ؟ قَالَ: عِشْرُونَ مِنَ الإِبِلِ، فَقُلْتُ: كَمْ فِي ثَلاَثٍ؟ فَقَالَ: ثَلاَثُونَ مِنَ الإِبِلِ، فَقُلْتُ: كَمْ فِي أَرْبَعٍ؟ قَالَ: عِشْرُونَ مِنَ الإِبِلِ، فَقُلْتُ: حِينَ عَظُمَ جُرْحُهَا، وَاشْتَدَّتْ مُصِيبَتُهَا، نَقَصَ عَقْلُهَا؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: أَعِرَاقِيٌّ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ: بَلْ عَالِمٌ مُتَثَبِّتٌ، أَوْ جَاهِلٌ مُتَعَلِّمٌ، فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: هِيَ السُّنَّةُ يَا ابْنَ أَخِي[2].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ کرد: خوێنبایی چەند هەیە دەربارەی پەنجەی ئافرەت؟ گوتی: دە وشتر، منیش گوتم: لە دوو پەنجەدا چەندە؟ گوتی: بیست وشتر، منیش گوتم: لە سێ پەنجەدا چەندە؟ گوتی: سی وشتر، منیش گوتم: لە چوار پەنجەدا چەندە؟ گوتی: بیست وشتر، منیش گوتم: (ئەوە بۆ) کاتێ برینەکەی گەورە دەبێت و بەڵاکەی زیاد دەبێت خوێنباییەکەی کەم دەبێت؟ سەعیدیش ﷺ گوتی: ئایا تۆ عێراقی (ئاوا قیاسی پێچەوانەی دەقی شەرعی دەکەیت)؟ منیش گوتم: (نەخێر) بەڵکوو زانایەکی پشتڕاستکەرەوەم یان نەزانێکی فێرخوازم، جا سەعید ﷺ گوتی: ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوایە (ئاوا حوکمی داوە) ئەی برازام.

**٢٥٠٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي أَصَابِعِ الْكَفِّ إِذَا قُطِعَتْ فَقَدْ تَمَّ عَقْلُهَا، وَذَلِكَ أَنَّ خَمْسَ أَصَابِعٍ إِذَا قُطِعَتْ كَانَ عَقْلُهَا عَقْلَ الْكَفِّ، خَمْسِينَ مِنَ الإِبِلِ، فِي كُلِّ إِصْبَعٍ عَشَرَةٌ مِنَ الإِبِلِ[3].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي عَقْلِ الأَصَابِعِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٨ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٠ في العقل، عن مالك به.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لای ئێمە دەربارەی پەنجەکانی دەست ئاوایە: ئەگەر گشتیان بڕان ئەوە تەواوی خوێنبایی دەست دەدرێت، جا لەسەر ئەو بنەمایە ئەگەر پێنج پەنجەکان بڕان خوێنباییەکەیان بریتییە لە خوێنبایی دەست، پەنجا وشترە، بۆ هەر پەنجەیەك دە وشتر.

**٢٥٠٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَحِسَابُ الأَصَابِعِ ثَلَاثَةٌ وَثَلَاثُونَ دِينَارًا، وَثُلُثُ دِينَارٍ فِي كُلِّ أُنْمُلَةٍ، وَهِيَ مِنَ الإِبِلِ ثَلَاثُ فَرَائِضَ وَثُلُثُ فَرِيضَةٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: حیسابی پەنجەکان بریتییە لە سی و سێ دینار، سێیەکی دینارێکیش بۆ هەر سەرە پەنجەیەك (ئەوە بەگوێرەی زێڕ)، لە وشتریشدا بریتییە لە سێ وشتر و سێیەکی وشترێك.

## ١٢- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی خوێنبایی ددان[٢]

**٢٥١٠-** عَنْ أَسْلَمَ ﷺ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَضَى فِي الضِّرْسِ بِجَمَلٍ، وَفِي التَّرْقُوَةِ بِجَمَلٍ، وَفِي الضِّلَعِ بِجَمَلٍ[٣].

واتە: لە ئەسلەمی خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دادوەری کرد دەربارەی شکاندنی ددانی خرێنە بە وشترێکی نێر، وە دەربارەی ئێسقانی چەڵەمە (ئێسکی نێوانی مل و سینگ) بڕیاری دا بە پێدانی وشترێکی نێر، وە دەربارەی پەراسوو بە وشترێکی نێر.

**٢٥١١-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: قَضَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ فِي الأَضْرَاسِ بِبَعِيرٍ بَعِيرٍ، وَقَضَى مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ فِي الأَضْرَاسِ بِخَمْسَةِ أَبْعِرَةٍ خَمْسَةِ أَبْعِرَةٍ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧٩ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ عَقْلِ الأَسْنَانِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨١ في العقل؛ والشافعي: ١١٠٧، كلهم عن مالك به.

قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷺ: فَالدِّيَةُ تَنْقُصُ فِي قَضَاءِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، وَتَزِيدُ فِي قَضَاءِ مُعَاوِيَةَ ﷺ، فَلَوْ كُنْتُ أَنَا لَجَعَلْتُ فِي الأَضْرَاسِ بَعِيرَيْنِ بَعِيرَيْنِ، فَتِلْكَ الدِّيَةُ سَوَاءٌ[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بڕیاری دەرکردووە دەربارەی (شکاندنی) ددانی خرێنە بۆ هەر ددانێك وشترێك، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانیش ﷺ بڕیاری دەرکردووە دەربارەی ددانی خرێنە بۆ هەر ددانێك پێنج وشتر.

سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ گوتوویەتی: خوێنباییەکە لە دادوەریکردنی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کەم بوو، وە لە دادوەریکردنی موعاویەش ﷺ زیاد بوو، ئەگەر من بام بۆ هەر ددانێك دوو وشترم دادەنا، جا ئەو خوێنباییانە هەمووی وەکوو یەکن (چونکە گشتی ئیجتیهادن).

٢٥١٢- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا أُصِيبَتِ السِّنُّ فَاسْوَدَّتْ، فَفِيهَا عَقْلُهَا تَامًّا، فَإِنْ طُرِحَتْ بَعْدَ أَنْ تَسْوَدَّ، فَفِيهَا عَقْلُهَا أَيْضًا تَامًّا[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئەگەر ددان پێکرا و لێی درا و ڕەش بوو (تێکچوو)، ئەوە خوێنبایی تەواوی خۆی هەیە، جا ئەگەر هەمان ددان فڕێدرا (کەوت) دوای ئەوەی کە ڕەش بوو، ئەوە جارێکی دیکە خوێنبایی تەواوی خۆی بۆ هەیە.

### ١٣- کرداری خوێنبایی ددانەکان[3]

٢٥١٣- عَنْ أَبِي غَطَفَانَ بْنِ طَرِيفٍ الْمُرِّيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ ﷺ بَعَثَهُ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ يَسْأَلُهُ: مَاذَا فِي الضِّرْسِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: فِيهِ خَمْسٌ مِنَ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٢ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٦ في العقل؛ والشيباني: ٦٦٩ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

(٣) ـ الْعَمَلُ فِي عَقْلِ الأَسْنَانِ.

الإِبِلِ، قَالَ: فَرَدَّنِي مَرْوَانُ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقَالَ: أَتَجْعَلُ مُقَدَّمَ الْفَمِ مِثْلَ الأَضْرَاسِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ: لَوْ لَمْ تَعْتَبِرْ ذَلِكَ إِلاَّ بِالأَصَابِعِ عَقْلُهَا سَوَاءٌ[1].

واتە: لە ئەبو غەتەفانی کوڕی تەریفی موڕییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە بەوەی: مەڕوانی کوڕی حەکەم ﷺ ئەوی ناردووە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ و پرسیاری لێ کردووە: خوێنبایی چەندە دەربارەی ددانی خرێنە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش ﷺ گوتی: پێنج وشتر، دەڵێ: جا مەڕوان گەڕاندمیەوە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ و گوتی (پێی بڵێ): ئایا خوێنبایی ددانەکانی پێشەوەش وەك خوێنبایی ددانی خرێنە دادەنێی؟ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش ﷺ گوتی: ئەگەر هیچ حیساب نەکەی و تەنها پەنجەکان لەبەرچاو بگری (دەزانی) خوێنباییان وەکوو یەکە (واتە چۆن پەنجەکان جیاوازن و خوێنباییشیان وەکوو یەکە، ددانەکانیش بە هەمان شێوە، هەردووکیان ئەو قیاسەیان لێ نایەتە جێ: کە بگوترێت مادەم جیاواز بن دەبێ خوێنباییان جیاواز بێ، نەخێر).

**٢٥١٤-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُسَوِّي بَيْنَ الأَسْنَانِ فِي الْعَقْلِ، وَلاَ يُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ[2].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی ددانەکانی وەکوو یەکدی دادەنان لە خوێنباییدا، هیچی بە گەورەتر دانەدەنا بەسەر ئەوانی دیکەدا.

**٢٥١٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ مُقَدَّمَ الْفَمِ وَالأَضْرَاسِ وَالأَنْيَابِ عَقْلُهَا سَوَاءٌ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: فِي السِّنِّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ، وَالضِّرْسُ سِنٌّ مِنَ الأَسْنَانِ، وَلاَ يَفْضُلُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْضٍ[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٤ في العقل؛ والشيباني: ٦٦٨ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٥٨٤، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٥ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٧ في العقل، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە: ددانەکانی پێشەوەی دەم و خڕێنەکان و کەڵبەکان خوێنباییان وەکوو یەکە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە ـ خوێنبایی ـ ددان‌دا پێنج وشتر هەیە))، جا ددانی خڕێنەش ددانێکە لە ددانەکان، هیچیان بە زیاتر داناندرێت بەسەر ئەوی دیکەدا.

## ١٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی زامدارکردنی کۆیلە[1]

٢٥١٦- أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ كَانَا يَقُولاَنِ: فِي مُوضِحَةِ الْعَبْدِ نِصْفُ عُشْرِ ثَمَنِهِ[2].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ دەیانگوت: ئەو برینەی کۆیلە کە لە سەریدا پەیدا دەکرێت و دەگاتە ئێسقان، خوێنباییەکەی بریتییە لە نیوەی دەیەکی نرخی خۆی.

٢٥١٧- أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ ﷺ كَانَ يَقْضِي فِي الْعَبْدِ يُصَابُ بِالْجِرَاحِ، أَنَّ عَلَى مَنْ جَرَحَهُ قَدْرَ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِ الْعَبْدِ[3].

واتە: مەڕوانی کوڕی حەکەم ﷺ دادوەری دەکرد و بڕیاری دەدا دەربارەی زامدارکردنی کۆیلە، بەوەی لەسەر ئەو کەسە واجبە کە زامداری کردووە ئەو ئەندازەیە لە خوێنبایی بدات کە (بە هۆی زامداربوونەکە) لە نرخی کۆیلەکە کەمی کردووە.

٢٥١٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ فِي مُوضِحَةِ الْعَبْدِ نِصْفَ عُشْرِ ثَمَنِهِ، وَفِي مُنَقِّلَتِهِ الْعُشْرُ وَنِصْفُ الْعُشْرِ مِنْ ثَمَنِهِ، وَفِي مَأْمُومَتِهِ وَجَائِفَتِهِ فِي كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا ثُلُثُ ثَمَنِهِ، وَفِيمَا سِوَى هَذِهِ الْخِصَالِ الأَرْبَعِ مِمَّا يُصَابُ بِهِ الْعَبْدُ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِهِ يُنْظَرُ فِي ذَلِكَ بَعْدَ مَا

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي دِيَةِ جِرَاحِ الْعَبِيدِ.

(٢) مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٨ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٨٩ في العقل، عن مالك به.




**يَصِحُّ الْعَبْدُ، وَيَبْرَأُ كَمْ بَيْنَ قِيمَةِ الْعَبْدِ بَعْدَ أَنْ أَصَابَهُ الْجُرْحُ، وَقِيمَتِهِ صَحِيحًا قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهُ هَذَا، ثُمَّ يَغْرَمُ الَّذِي أَصَابَهُ مَا بَيْنَ الْقِيمَتَيْنِ**[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو برینەی كۆیلە كە لە سەردا دروست دەبێت و ئێسقان دەردەكەوێ نیوەی دەیەكی نرخەكەیەتی، وە دەربارەی ئەو برینەی لە سەردا دەگاتە ئێسقان و ئێسقان دەڕوشێنێت دەیەك و نیوەی دەیەكی نرخەكەیەتی، وە دەربارەی ئەو برینەی دەگاتە پەردەی مێشك و مێشك بۆ هەر یەكێكیان سێیەكی نرخەكەی هەیە، وە دەربارەی جگە لەو چوار شتانە لەوەی كۆیلە تووشی دەبێت و نرخی كەم دەكات، دوای ئەوەی چاك دەبێتەوە سەیر دەكرێت چەند جیاوازی دروست بووە لە نێوان نرخی كۆیلەكە دوای ئەوەی تووشی برینەكە بووە وە لە نێوان نرخەكەی بەساغ و سەلامەتی بەر لەوەی تووشی ئەوە ببێت، دواتر غەرامەی ئەو جیاوازییە دەدات كە دەكەوێتە نێوان دوو نرخەكە.

**٢٥١٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْعَبْدِ إِذَا كُسِرَتْ يَدُهُ أَوْ رِجْلُهُ، ثُمَّ صَحَّ كَسْرُهُ، فَلَيْسَ عَلَى مَنْ أَصَابَهُ شَيْءٌ، فَإِنْ أَصَابَ كَسْرَهُ ذَلِكَ نَقْصٌ أَوْ عَثَلٌ، كَانَ عَلَى مَنْ أَصَابَهُ قَدْرُ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِ الْعَبْدِ**[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كۆیلە ئەگەر دەستی یان قاچی شكێنرا، دواتر شكانەكەی چاك بۆیەوە، گوتوویەتی: ئەوەی وای لێ كردووە هیچی لەسەر نییە، (بەڵام) ئەگەر ئەو شكانەی نەقسێك یان خواروخێچییەك دروست بكات، ئەوە ئەو كەسەی وای لێ كردووە دەبێ ئەو ئەندازەیە لە خوێنبایی بدات كە لە نرخی كۆیلەكە كەمی كردووە.

**٢٥٢٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْقِصَاصِ بَيْنَ الْمَمَالِيكِ، كَهَيْئَةِ قِصَاصِ الأَحْرَارِ، نَفْسُ الأَمَةِ بِنَفْسِ الْعَبْدِ، وَجُرْحُهَا بِجُرْحِهِ، فَإِذَا قَتَلَ الْعَبْدُ عَبْدًا عَمْدًا خُيِّرَ سَيِّدُ الْعَبْدِ الْمَقْتُولِ،**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٠ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩١ في العقل، عن مالك به.

فَإِنْ شَاءَ قَتَلَ، وَإِنْ شَاءَ أَخَذَ الْعَقْلَ، فَإِنْ أَخَذَ الْعَقْلَ أَخَذَ قِيمَةَ عَبْدِهِ، وَإِنْ شَاءَ رَبُّ الْعَبْدِ الْقَاتِلِ أَنْ يُعْطِيَ ثَمَنَ الْعَبْدِ الْمَقْتُولِ فَعَلَ، وَإِنْ شَاءَ أَسْلَمَ عَبْدَهُ، فَإِذَا أَسْلَمَهُ فَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُ ذَلِكَ، وَلَيْسَ لِرَبِّ الْعَبْدِ الْمَقْتُولِ إِذَا أَخَذَ الْعَبْدَ الْقَاتِلَ، وَرَضِيَ بِهِ أَنْ يَقْتُلَهُ، وَذَلِكَ فِي الْقِصَاصِ كُلِّهِ بَيْنَ الْعَبِيدِ فِي قَطْعِ الْيَدِ وَالرِّجْلِ وَأَشْبَاهِ ذَلِكَ بِمَنْزِلَتِهِ فِي الْقَتْلِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی تۆڵەسەندنەوەی کۆیلەکان وەك شێوازی تۆڵەسەندنەوەی ئازادەکانە، کۆیلەی ئافرەت وەك کۆیلەی پیاو وایە، وە بریندارییەکانیشی وەك برینداری ئەو وان، جا ئەگەر کۆیلەیەکی پیاو بەئەنقەست کۆیلەیەکی پیاو بکوژێت، ئەوە گەورەی کۆیلە کوژراوەکە سەرپشکە، ئەگەر بیەوێ دەیکوژێتەوە، وە ئەگەر بشیەوێ خوێنبایی وەردەگرێ، جا ئەگەر بە خوێنباییوەرگرتن ڕازی بوو ئەوە نرخی کۆیلەکەی خۆی وەردەگرێ، وە ئەگەر گەورەی کۆیلە بکوژەکە ویستی نرخی کۆیلە کوژراوەکە بدات ئەوە وا دەکات (دروستە)، وە ئەگەر بیەوێ دەتوانێت کۆیلەکەی تەسلیم بکات، جا ئەگەر تەسلیمی کرد ئەوە هیچی دیکەی لەسەر نییە، وە خاوەنی کۆیلە کوژراوەکە کاتێ کۆیلە بکوژەکەی وەرگرت و پێی ڕازی بوو بۆی نییە بیکوژێتەوە، جا ئەوە لە گشت تۆڵەسەندنەوەیەکدا لە نێوان کۆیلەکان دەربارەی بڕینی دەست و قاچ و هاوشێوەی ئەوانە بە هەمان شێوەی کوشتنە (بەو قیاسەی باس کرا بابەتەکە جێبەجێ دەکرێ).

**٢٥٢١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْعَبْدِ الْمُسْلِمِ يَجْرَحُ الْيَهُودِيَّ أَوِ النَّصْرَانِيَّ: إِنَّ سَيِّدَ الْعَبْدِ إِنْ شَاءَ أَنْ يَعْقِلَ عَنْهُ مَا قَدْ أَصَابَ فَعَلَ، أَوْ يُسْلِمَهُ، فَيُبَاعُ، فَيُعْطِي الْيَهُودِيَّ أَوِ النَّصْرَانِيَّ مِنْ ثَمَنِ الْعَبْدِ دِيَةَ جُرْحِهِ أَوْ ثَمَنَهُ كُلَّهُ إِنْ أَحَاطَ بِثَمَنِهِ، وَلاَ يُعْطِي الْيَهُودِيَّ وَلاَ النَّصْرَانِيَّ عَبْدًا مُسْلِمًا**[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەی مسوڵمان کە جوولەکەیەك یان گاورێك بریندار بکات، گوتوویەتی: گەورەی کۆیلەکە ئەگەر بیەوێت دەتوانێت

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٢ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٣ في العقل، عن مالك به.

خوێنبایی ئەوە بدات کە تووشی بووە، یان تەسلیمی دەکات و دەفرۆشرێت و لە پارەی کۆیلەکە خوێنبایی برینەکە دەدات بە جوولەکەکە یان گاورەکە، یان گشت پارەی فرۆشتنی کۆیلەکەی پێ دەدات ئەگەر خوێنبایی برینەکە گشت نرخی کۆیلەکە بگرێتەوە، بەڵام کۆیلەی مسوڵمان نادرێت بە جوولەکە و گاور (لە جیاتی خوێنباییەکە).

## ١٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی ئەهلی زیممە[1]

**٢٥٢٢- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ قَضَى، أَنَّ دِيَةَ الْيَهُودِيِّ أَوِ النَّصْرَانِيِّ إِذَا قُتِلَ أَحَدُهُمَا مِثْلُ نِصْفِ دِيَةِ الْحُرِّ الْمُسْلِمِ[2].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﵀ دادوەری کردووە و بڕیاری داوە بەوەی خوێنبایی کەسی جوولەکە و گاور کاتێ یەکێکیان بکوژرێت نیوەی خوێنبایی کەسی مسوڵمانی ئازاد بێت.

**٢٥٢٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ، إِلاَّ أَنْ يَقْتُلَهُ مُسْلِمٌ قَتْلَ غِيلَةٍ، فَيُقْتَلُ بِهِ[3].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە: مسوڵمان بە (هۆی کوشتنی) کافر ناکوژرێت، تەنها ئەگەر مسوڵمانێك بەفێڵ (بیڕفێنێت و) بیکوژێت، بەهۆیەوە دەکوژرێت.

**٢٥٢٤- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﵀ كَانَ يَقُولُ: دِيَةُ الْمَجُوسِيِّ ثَمَانِيَ مِئَةِ دِرْهَمٍ[4].**

**قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.**

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي دِيَةِ أَهْلِ الذِّمَّةِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٤ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٧ في العقل، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٥ في العقل، عن مالك به.

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سولەیمانی كوڕی یەسار ﷺ دەیگوت: خوێنبایی كەسی مەجووسی هەشت سەت درهەمە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لای ئێمە بەو شێوەیەیە.

**٢٥٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَجِرَاحُ الْيَهُودِيِّ وَالنَّصْرَانِيِّ وَالْمَجُوسِيِّ فِي دِيَاتِهِمْ عَلَى حِسَابِ جِرَاحِ الْمُسْلِمِينَ فِي دِيَاتِهِمُ الْمُوضِحَةُ نِصْفُ عُشْرِ دِيَتِهِ، وَالْمَأْمُومَةُ ثُلُثُ دِيَتِهِ، وَالْجَائِفَةُ ثُلُثُ دِيَتِهِ، فَعَلَى حِسَابِ ذَلِكَ جِرَاحَاتُهُمْ كُلُّهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خوێنبایی زامداریی كەسی جوولەكە و گاور و مەجووسی بە حیسابی خوێنبایی زامداریی مسوڵمانانە (بەو شێوەیە): زامداری تا سەر ئێسقان خوێنبابییەكەی نیوەی دەیەكی خوێنبایی مسوڵمانە (لەو برینەدا)، برینی تا سەر دەماغ سێیەكی خوێنبایی مسوڵمانە (لەو برینەدا)، وە ئەو برینەی دەگاتە ئێسقان و ئێسقان دەڕوشێنێت سێیەكی خوێنبایی مسوڵمانە (لەو برینەدا)، جا گشت زامدارییەكانی لەسەر ئەو حیسابەیە.

## ١٦- ئەو شتەی خوێنبایی لە خودی ماڵی ئەو كەسە واجب دەكات كە جینایەتەكەی ئەنجام داوە[2]

**٢٥٢٦-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لَيْسَ عَلَى الْعَاقِلَةِ عَقْلٌ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ، إِنَّمَا عَلَيْهِمْ عَقْلُ قَتْلِ الْخَطَإِ[3].

واتە: لە هیشامی كوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەیگوت: لە كوشتنی بەئەنقەستدا خوێنبایی لەسەر خزمانی بكوژەكە نییە (بەڵكوو تەنها لەسەر بكوژەكەیە)، تەنها خوێنبایی كوشتنی هەڵەیان لەسەرە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٦ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُوجِبُ الْعَقْلَ عَلَى الرَّجُلِ فِي خَاصَّةِ مَالِهِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠٢ في العقل، عن مالك به.




**٢٥٢٧-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: مَضَتِ السُّنَّةُ أَنَّ الْعَاقِلَةَ لاَ تَحْمِلُ شَيْئًا مِنْ دِيَةِ الْعَمْدِ، إِلاَّ أَنْ يَشَاؤُوا ذَلِكَ(١).

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ڕێبازەکە وا هاتووە خزمانی بکوژەکە هیچ ناخەنە سەر شانیان لە خوێنبایی کوشتنی بەئەنقەست، تەنها ئەگەر خۆیان ئەوەیان بووێت (ئەو کات بەئارەزووی خۆیانە و دەتوانن باری خزمە بکوژەکەی خۆیان سووك بکەن، بەڵام لەسەریان واجب نییە).

**٢٥٢٨-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، مِثْلَ ذَلِكَ(٢).

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

**٢٥٢٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنَّ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ قَالَ: مَضَتِ السُّنَّةُ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ حِينَ يَعْفُو أَوْلِيَاءُ الْمَقْتُولِ، أَنَّ الدِّيَةَ تَكُونُ عَلَى الْقَاتِلِ فِي مَالِهِ خَاصَّةً، إِلاَّ أَنْ تُعِينَهُ الْعَاقِلَةُ عَنْ طِيبِ أَنْفُسٍ مِنْهَا(٣).

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: دەربارەی کوشتنی بەئەنقەست کاتێ خزمانی کوژراوەکە لە بکوژەکە خۆش دەبن (بەوەی نەیکوژنەوە لەبری ئەوە خوێنبایی وەربگرن) ڕێبازەکە وا هاتووە: خوێنباییەکە لەسەر بکوژەکەیە لە ماڵی خۆی بەتەنها (لەسەر خزم و کەس نییە)، تەنها لەو کاتە نەبێت کە خزم و کەسەکانی بەئارەزووی دڵی خۆیان لە خوێنباییەکەدا یارمەتی بدەن.

**٢٥٣٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ الدِّيَةَ لاَ تَجِبُ عَلَى الْعَاقِلَةِ حَتَّى تَبْلُغَ الثُّلُثَ فَصَاعِدًا، فَمَا بَلَغَ الثُّلُثَ فَهُوَ عَلَى الْعَاقِلَةِ، وَمَا كَانَ دُونَ الثُّلُثِ فَهُوَ فِي مَالِ الْجَارِحِ خَاصَّةً.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە خوێنبایی (بریندارکردن) لەسەر خزمانی کەسەکە نییە تا دەگات بە سێیەك و زیاتر، جا کە گەیشتە سێیەك ئەوە

---

(١) ـ مقطوع صحيح.

(٢) ـ مقطوع صحيح.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩٩ في العقل؛ وفي: ٢٣٠١ في العقل؛ والشيباني: ٦٦٥ في الضحايا وما يجزئ منها، كلهم عن مالك به.

لەسەر خزمەکانە، ئەوەی کەمتریش بێت لەوە ئەوە تەنها لە ماڵی برینداركەرەكەیە (دەبێ بەتەنها خۆی بیدات).

٢٥٣١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا فِيمَنْ قُبِلَتْ مِنْهُ الدِّيَةُ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ، أَوْ فِي شَيْءٍ مِنَ الْجِرَاحِ الَّتِي فِيهَا الْقِصَاصُ، أَنَّ عَقْلَ ذَلِكَ لاَ يَكُونُ عَلَى الْعَاقِلَةِ إِلاَّ أَنْ يَشَاؤُوا، وَإِنَّمَا عَقْلُ ذَلِكَ فِي مَالِ الْقَاتِلِ أَوِ الْجَارِحِ خَاصَّةً، إِنْ وُجِدَ لَهُ مَالٌ، فَإِنْ لَمْ يُوجَدْ لَهُ مَالٌ كَانَ دَيْنًا عَلَيْهِ، وَلَيْسَ عَلَى الْعَاقِلَةِ مِنْهُ شَيْءٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاؤُوا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی خوێنبایی لێ قبووڵ دەکرێت (لەجیاتی کوشتنەوە) لە کوشتنی بەئەنقەستدا، یان لە برینداربیەك کە تۆڵەسەندنەوەی تیا بێت، (بریتییە لەوەی): خوێنباییەکە لەسەر خزم و کەس نییە مەگەر خۆیان بیانەوێ، ئەو خوێنباییە تەنها لە خودی ماڵی بکوژەکە یان برینداركەرەكە دەدرێت، ئەگەر ماڵ و سەروەتی هەبوو، جا ئەگەر ماڵ و سەروەتی نەبوو دەبێتە قەرز لەسەری و خزم و کەس (لەو حاڵەتەش) هیچیان لەسەر نییە مەگەر خۆیان بیانەوێ.

٢٥٣٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ تَعْقِلُ الْعَاقِلَةُ أَحَدًا أَصَابَ نَفْسَهُ عَمْدًا، أَوْ خَطَأً بِشَيْءٍ، وَعَلَى ذَلِكَ رَأْيُ أَهْلِ الْفِقْهِ وَالعِلْمِ عِنْدَنَا، وَلَمْ أَسْمَعْ أَنَّ أَحَدًا ضَمَّنَ الْعَاقِلَةَ مِنْ دِيَةِ الْعَمْدِ شَيْئًا، وَمِمَّا يُعْرَفُ بِهِ ذَلِكَ، أَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ﴿١٧٨﴾﴾ البقرة، فَتَفْسِيرُ ذَلِكَ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، أَنَّهُ مَنْ أُعْطِيَ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ مِنَ الْعَقْلِ، فَلْيَتْبَعْهُ بِالْمَعْرُوفِ، وَلْيُؤَدِّ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خزم و کەس خوێنبایی کەسێك نادەن بەئەنقەست خۆی بپێکێت و بەڵایەك بەسەر خۆی بێنێت یان بە هەڵەی خۆی شتێکی بەسەر بێت، بۆچوونی زانایانی شەرع و زانست لەلای ئێمە لەسەر ئەوەیە و گوێبیست نەبووم کەس لە زانایان خزم و کەسیان کردبێتە زامن لە هیچ خوێنباییێکی ئەنقەستدا، جا لەو بەڵگانەی ڕاستییەتی و تەواوییەتی ئەو حوکمەی پێ دەزانرێت

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠٣ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠٤ في العقل، عن مالك به.

بریتییە لەوەی خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌۢ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ﴿١٧٨﴾﴾ البقرة، تەفسیری ئەوە بە بۆچوونی ئێمە ئەوەیە: هەر کەسێك لەلایەن براکەیەوە (کە بکوژی خزمەکەیانە) خوێنبایی پێ درا، با بەچاکی و بەجوانی بەدوای وەرگرتنی خوێنباییەکەدا بچێت (توندوتیژ نەبێت لەگەڵی)، وە با بکوژەکەش بەجوانی خوێنباییەکەی پێ بدات (کەواتە خوێنبایی کوشتنی بەئەنقەست تەنها لەسەر خودی بکوژەکە خۆیەتی وەك لەو ئایەتەدا هەستی پێ دەکرێت).

٢٥٣٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الصَّبِيِّ الَّذِي لاَ مَالَ لَهُ، وَالْمَرْأَةِ الَّتِي لاَ مَالَ لَهَا، إِذَا جَنَى أَحَدُهُمَا جِنَايَةً دُونَ الثُّلُثِ، إِنَّهُ ضَامِنٌ عَلَى الصَّبِيِّ أَوِ الْمَرْأَةِ فِي مَالِهِمَا خَاصَّةً، إِنْ كَانَ لَهُمَا مَالٌ أُخِذَ مِنْهُ، وَإِلاَّ فَجِنَايَةُ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا دَيْنٌ عَلَيْهِ، لَيْسَ عَلَى الْعَاقِلَةِ مِنْهُ شَيْءٌ، وَلاَ يُؤْخَذُ أَبُو الصَّبِيِّ بِعَقْلِ جِنَايَةِ الصَّبِيِّ، وَلَيْسَ ذَلِكَ عَلَيْهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو منداڵەی ماڵ و سەروەتی نییە و دەربارەی ئەو ئافرەتەی ماڵ و سەروەتی نییە، کاتێ یەکێکیان تاوانێك ئەنجام دەدەن و خوێنباییەکەی لە سێیەك کەمترە، گوتوویەتی: خوێنباییەکە لەسەر منداڵ و ئافرەتەکەیە، لە ماڵی تایبەتی خۆیان دەدرێت، ئەگەر ماڵ و سەروەتیان هەبێت لە سەروەتەکە وەردەگیرێت، وە ئەگەر ماڵ و سەروەتیان نەبوو هەر یەکەیان تاوانی خۆیان لەسەریان دەبێتە قەرز (دەبێ دواتر خۆیان بیدەن)، هیچ شتێك لەسەر خزم و کەس نییە، وە باوکی منداڵ بە خوێنبایی تاوانی منداڵەکە ناگیرێ (نابێ خوێنباییەکە لەو بسەندرێ)، خوێنباییەکە لەسەر ئەو نییە.

٢٥٣٤- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ: أَنَّ الْعَبْدَ إِذَا قُتِلَ كَانَتْ فِيهِ الْقِيمَةُ يَوْمَ يُقْتَلُ، وَلاَ تَحْمِلُ عَاقِلَةُ قَاتِلِهِ مِنْ قِيمَةِ الْعَبْدِ شَيْئًا قَلَّ أَوْ كَثُرَ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ عَلَى الَّذِي أَصَابَهُ فِي مَالِهِ خَاصَّةً بَالِغًا مَا بَلَغَ، وَإِنْ كَانَتْ قِيمَةُ الْعَبْدِ الدِّيَةَ أَوْ أَكْثَرَ، فَذَلِكَ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ، وَذَلِكَ لأَنَّ الْعَبْدَ سِلْعَةٌ مِنَ السِّلَعِ[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠٥ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠٦ في العقل، عن مالك به.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: ئەگەر کۆیلە کوژرا، ئەوە دەبێ نرخی ئەو ڕۆژەی تێیدا کوژراوە ئەژمار بکرێت، خزم و کەسانی بکوژەکە نرخی کۆیلەکە هەڵناگرن جا زۆر بێت یان کەم بێت، بەڵکوو تەنها لەسەر ئەو کەسەیە کە کوشتوویەتی لە ماڵی تایبەتی ئەو دەدرێت جا بگاتە هەر چەندێك، هەرچەندە نرخی کۆیلەکە بگاتە نرخی خوێنبایی (کەسی ئازاد)یش یان زیاتر، تەنها لەسەر خۆی واجبە لە ماڵی خۆی، ئەوەش لەبەر ئەوەی کۆیلە کاڵایەکە لە کاڵاکان.

## ١٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی خوێنبایی و قورسکردن و ئەستورکردنی[1]

٢٥٣٥- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ نَشَدَ النَّاسَ بِمِنًى: مَنْ كَانَ عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الدِّيَةِ أَنْ يُخْبِرَنِي، فَقَامَ الضَّحَّاكُ بْنُ سُفْيَانَ ﷺ الْكِلَابِيُّ فَقَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنْ أُوَرِّثَ امْرَأَةَ أَشْيَمَ الضِّبَابِيِّ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: ادْخُلِ الْخِبَاءَ حَتَّى آتِيَكَ، فَلَمَّا نَزَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، أَخْبَرَهُ الضَّحَّاكُ، فَقَضَى بِذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: وَكَانَ قَتْلُ أَشْيَمَ خَطَأً[2].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە مینا داوای خەڵکی کرد (گوتی): کێ زانیارییەکی لەلایە دەربارەی خوێنبایی با هەواڵم پێ بدات، جا زەححاکی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ هەڵسایەوە و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی نووسیم بەوەی: خێزانی ئەشیەمی زیبابی بکەم بە میراتگر لە خوێنبایی مێردەکەی، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: بچۆرە ناو خێمەکە تا دێم بۆ لات، جا کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هاتە بن خێمەکە زەححاك هەواڵەکەی پێ دا و عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ بڕیار و دادوەری پێ دا.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الْعَقْلِ وَالتَّغْلِيظِ فِيهِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١١ في العقل؛ وفي: ٢٣١٢ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٢ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٩٩٠، كلهم عن مالك به.




ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: کوشتنی ئەشیەم کوشتنی بەهەڵە بوو.

**٢٥٣٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي مُدْلِجٍ، يُقَالُ لَهُ: قَتَادَةُ، حَذَفَ ابْنَهُ بِالسَّيْفِ، فَأَصَابَ سَاقَهُ، فَنُزِيَ فِي جُرْحِهِ، فَمَاتَ، فَقَدِمَ سُرَاقَةُ بْنُ جُعْشُمٍ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: اعْدُدْ عَلَى مَاءِ قُدَيْدٍ عِشْرِينَ وَمِئَةَ بَعِيرٍ حَتَّى أَقْدَمَ عَلَيْكَ، فَلَمَّا قَدِمَ إِلَيْهِ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، أَخَذَ مِنْ تِلْكَ الإِبِلِ ثَلاَثِينَ حِقَّةً، وَثَلاَثِينَ جَذَعَةً، وَأَرْبَعِينَ خَلِفَةً، ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ أَخُو الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: هَأَنَذَا، قَالَ: خُذْهَا، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ لِقَاتِلٍ شَيْءٌ[١].

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە نەوەی مودلیج پێی دەگوترا: قەتادە، شمشێری لە کوڕەکەی گرت (ڕایوەشاند) بەر قاچی کەوت و نەزیف بوو و مرد، جا سوڕاقەی کوڕی جوعشوم هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، ئیمامی عومەریش ﷺ پێی گوت: سەت و بیست وشتر لەسەر ئاوی قودەید ئامادە بکە تا دێم بۆ لات، جا کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هات بۆ لای، سی وشتری سێ ساڵی و سی وشتری چوار ساڵی و چل وشتری ئاوسی وەرگرت دواتر گوتی: کوا برای کوژراوەکە؟ گوتی: ئەوەتام، عومەر ﷺ گوتی: وەریگرە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بکوژ هیچی بۆ نییە (نە خوێنبایی و نە میرات، بۆیە میرات و خوێنبایی نەدا بە باوکی).

**٢٥٣٧-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ، سُئِلاَ: أَتُغَلَّظُ الدِّيَةُ فِي الشَّهْرِ الْحَرَامِ؟ فَقَالاَ: لاَ، وَلَكِنْ يُزَادُ فِيهَا لِلْحُرْمَةِ، فَقِيلَ لِسَعِيدٍ: هَلْ يُزَادُ فِي الْجِرَاحِ كَمَا يُزَادُ فِي النَّفْسِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ پرسیاریان لێ کراوە: ئایا خوێنبایی دەکرێتە جۆرە ئەستورەکە (بە هۆی ئەنجامدانی جینایەت) لە مانگەکانی حەڕامدا؟ گوتیان: نەخێر، بەڵام لەبەر حوڕمەت زیاد دەکرێت، جا

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١٣ في العقل؛ والشافعي: ٩٨٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١٤ في العقل؛ وفي: ٢٣١٥ في العقل، عن مالك به.

بە سەعید گوترا: ئایا لە شکست و برینداریيەکانیش زیاد دەکرێت وەك چۆن لە نەفس زیاد دەکرێت؟ گوتی: بەڵێ.

**٢٥٣٨-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أُرَاهُمَا أَرَادَا مِثْلَ الَّذِي صَنَعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ فِي عَقْلِ الْمُدْلِجِيِّ حِينَ أَصَابَ ابْنَهُ[١].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وایە هەردووکیان مەبەستیان ئەو زیادکردنە بووە کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەربارەی خوێنبایی مودلەجی ئەنجامی دا کاتێ کوڕەکەی خۆی کوشت (لە مانگی حەڕامدا).

**٢٥٣٩-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُ: أُحَيْحَةُ بْنُ الْجُلاَحِ، كَانَ لَهُ عَمٌّ صَغِيرٌ، هُوَ أَصْغَرُ مِنْ أُحَيْحَةَ، وَكَانَ عِنْدَ أَخْوَالِهِ، فَأَخَذَهُ أُحَيْحَةُ، فَقَتَلَهُ، فَقَالَ أَخْوَالُهُ: كُنَّا أَهْلَ ثُمِّهِ وَرُمِّهِ، حَتَّى إِذَا اسْتَوَى عَلَى عُمَمِهِ، غَلَبَنَا حَقُّ امْرِئٍ فِي عَمِّهِ.

قَالَ عُرْوَةُ ﷺ: فَلِذَلِكَ لاَ يَرِثُ قَاتِلٌ مَنْ قَتَلَ[٢].

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە ئەنصارییەکان پێی دەگوترا: ئوحەیحەی کوڕی جولاح، مامێکی بچووکی هەبوو، بچووکتر بوو لە ئوحەیحە، لەلای خاڵەکانی بوو، جا ئوحەیحە گرتی و کوشتی، خاڵەکانیشی گوتیان: ئێمە خاوەنی هەموو شتێکی ئەوین لە سەرەتاوە تا کۆتایی تەمەنی هەر ئێمە چاودێریمان کردووە (یان مەبەستی ئەوەیە خێر و شەڕی ئەومان لەخۆ گرتووە)، تا لەسەر قامی گەنجایەتی خۆی وەستا (ئینجا کوژرا) و حەقی کەسێك لە مامەکانی بەسەرماندا زاڵ بوو (مامێکی دیکەی خوێنباییەکەی وەرگرت و بوو بە هی ئەو).

عوروە ﷺ گوتوویەتی: هەر بۆیە بکوژی هەر کەسێك میرات نابات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١٤ في العقل؛ وفي: ٢٣١٥ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١٦ في العقل، عن مالك به.




**٢٥٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا: أَنَّ قَاتِلَ الْعَمْدِ لاَ يَرِثُ مِنْ دِيَةِ مَنْ قَتَلَ شَيْئًا، وَلاَ مِنْ مَالِهِ، وَلاَ يَحْجُبُ أَحَدًا وَقَعَ لَهُ مِيرَاثٌ، وَأَنَّ الَّذِي يَقْتُلُ خَطأً لاَ يَرِثُ مِنَ الدِّيَةِ شَيْئًا، وَقَدِ اخْتُلِفَ فِي أَنْ يَرِثَ مِنْ مَالِهِ لأَنَّهُ لاَ يُتَّهَمُ عَلَى أَنَّهُ قَتَلَهُ لِيَرِثَهُ، وَلِيَأْخُذَ مَالَهُ، فَأَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَرِثَ مِنْ مَالِهِ، وَلاَ يَرِثُ مِنْ دِيَتِهِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە (ئەوەیە): بکوژی بەئەنقەست نە میرات لە خوێنبایی ئەو کەسە دەگرێت کە دەیکوژێت، نە میراتیش لە ماڵەکەی دەگرێت، نە کەسیش قەدەغە دەکات کە میراتی بۆ هەبێت، وە ئەو کەسەی بەهەڵە خزمێك دەکوژێت میرات لە خوێنباییەکەی ناگرێت، ڕاجیاییش هەیە لەوەی میرات لە ماڵەکەی بگرێت، (بەڵام) چونکە تۆمەتبار ناکرێت بەوەی کوشتوویەتی تا میراتی لێ بگرێت، بۆیە پێم چاکترە میرات لە ماڵەکەی بگرێت و لە خوێنباییەکەی نەگرێت.

## ١٨- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی خوێنبایی[٢]

**٢٥٤١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: جَرْحُ الْعَجْمَاءِ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ الْجُبَارِ، أَنَّهُ لاَ دِيَةَ فِيهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی: برینداركردنی شتێك لەلایەن حەیوانێكی ماڵییەوە هیچی تیا نییە (واتە تۆڵە و خوێنبایی نادرێت ئەگەر هیچ کەمتەرخەمی لە خاوەنەکەیدا

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١٧ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ الْعَقْلِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣٨ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٧ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٤٤١؛ وفي: ٩٥١؛ والبخاري: ١٤٩٩ في الزكاة؛ والنسائي: ٢٤٩٧ في الزكاة؛ والترمذي: الفرائض: ١٦؛ وابن حبان: ٦٠٠٥؛ والدارمي: ١٦٦٨ في الزكاة، وفي: ٢٣٧٨ في الديات؛ وشرح معاني الآثار: ٥٠٦٢، وفي: ٥٣٥٤؛ والقابسي: ١٩؛ وفي: ٣٥٦، كلهم عن مالك به.

ڕووی نەدابێت)، وە بیر هیچی تیا نییە (ئەگەر کەسێك لە زەوییەکەی خۆیدا هەڵی بکەنێ و کەسێك بکەوێتە ناوی، بەبێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی)، وە کانگای مەعدەن هیچی تیا نییە (ئەگەر کەسێك بۆ دۆزینەوەی کانزا لە زەوییەکەی خۆیدا هەڵی بکەنێ و کەسێك بکەوێتە ناوی، بەبێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی)، وە لە خەزێنە (واتە لە دۆزینەوەی ئەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام) پێنجیەك زەکات هەیە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مانای «الْجُبَارِ» ئەوەیە: خوێنبایی تیا نییە.

**٢٥٤٢- [فتوى]** وَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: الْقَائِدُ وَالسَّائِقُ وَالرَّاكِبُ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ لِمَا أَصَابَتِ الدَّابَّةُ، إِلاَّ أَنْ تَرْمَحَ الدَّابَّةُ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُفْعَلَ بِهَا شَيْءٌ تَرْمَحُ لَهُ، وَقَدْ قَضَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فِي الَّذِي أَجْرَى فَرَسَهُ بِالْعَقْلِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَالْقَائِدُ وَالرَّاكِبُ وَالسَّائِقُ أَحْرَى أَنْ يَغْرَمُوا مِنَ الَّذِي أَجْرَى فَرَسَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەسەی وڵاغ ڕادەکێشێت و لێی دەخوڕێت و سواری دەبێت گشتیان زامنن لەو شتەی وڵاغەکە ئەنجامی دەدات (لە برینداركردن و شتشکاندن و خەڵککوشتن)، تەنها لەو حاڵەتە نەبێت (زامن نییە) کە وڵاغەکە لەقە بهاوێژێت بێئەوەی هیچی لێ بکرێت، (جا کە دەڵێین لەو حاڵەتانەدا زامنە بەڵگە ئەوەیە) ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دادوەری کردووە و بڕیاری داوە بە خوێنبایی دەربارەی ئەو کەسەی ئەسپەکەی دەڕوێنێت (لە کاتێکدا کەمترین جڵەوی ئەسپەکەی لەدەستە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەواتە ئەو کەسەی ڕایدەکێشێت یان سواری بووە یان لێی دەخوڕێت شایستەترە بەوەی غەڕامە بکرێت لەو کەسەی ئەسپەکەی دەڕوێنێت.

**٢٥٤٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الَّذِي يَحْفِرُ الْبِئْرَ عَلَى الطَّرِيقِ، أَوْ يَرْبِطُ الدَّابَّةَ، أَوْ يَصْنَعُ أَشْبَاهَ هَذَا عَلَى طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ، أَنَّ مَا صَنَعَ مِنْ ذَلِكَ مِمَّا لاَ يَجُوزُ لَهُ أَنْ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣٩ في العقل؛ وفي: ٢٣٤٠ في العقل؛ وفي: ٢٣٤١ في العقل، عن مالك به.

يَصْنَعَهُ عَلَى طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ، فَهُوَ ضَامِنٌ لِمَا أُصِيبَ فِي ذَلِكَ مِنْ جَرْحٍ، أَوْ غَيْرِهِ، فَمَا كَانَ مِنْ ذَلِكَ عَقْلُهُ دُونَ ثُلُثِ الدِّيَةِ، فَهُوَ فِي مَالِهِ خَاصَّةً، وَمَا بَلَغَ الثُّلُثَ فَصَاعِدًا، فَهُوَ عَلَى الْعَاقِلَةِ، وَمَا صَنَعَ مِنْ ذَلِكَ مِمَّا يَجُوزُ لَهُ أَنْ يَصْنَعَهُ عَلَى طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ، فَلاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ فِيهِ، وَلاَ غُرْمَ، وَمِنْ ذَلِكَ: الْبِئْرُ يَحْفِرُهَا الرَّجُلُ لِلْمَطَرِ، وَالدَّابَّةُ يَنْزِلُ عَنْهَا الرَّجُلُ لِلْحَاجَةِ، فَيَقِفُهَا عَلَى الطَّرِيقِ، فَلَيْسَ عَلَى أَحَدٍ فِي هَذَا غُرْمٌ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی بیرێك (یان قۆرتێك) لەسەر ڕێگا لێ دەدات، یان ئاژەڵێك لەسەر ڕێگا دەبەستێتەوە، یان شتێکی لەو شێوەیە لەسەر ڕێگای مسوڵمانان ئەنجام دەدات، ئەوە ئەو شتەی ئەنجامی دەدات ئەگەر لەوانە بێت کە بۆی دروست نییە ئەنجامی بدات لەسەر ڕێگای مسوڵمانان، ئەوە زامنی ئەو شتەیە کە خەڵك تووشی دەبێت لە برینداری و شتی دیکە، جا هەر شتێك ڕوو بدات خوێنباییەکەی لە سێیەك کەمتر بێت ئەوە لە ماڵی تایبەتی خۆی دەیدات، ئەوەیشی کە دەگاتە سێیەك و زیاتر لەسەر خزمەکانیەتی، وە ئەوەی ئەنجامی بدات لەو شتانەی بۆی دروستە ئەنجامیان بدات لەسەر ڕێگەی مسوڵمانان، ئەوە تیایدا زامن نابێت و غەرامەی لەسەر نییە، لەوانە وەك: بیر کە کەسێك هەڵیبکەنێ بۆ باران، هەروەها ئاژەڵ کە کەسێك لەسەری بێتە خوارەوە بۆ پێویستی لەسەر ڕێگە ڕایبگرێت (وەك شت کڕین و هاتنە بەر دەرگای کەسێك و ... هتد)، ئەوانە غەرامەکەیان لەسەر کەس نییە.

**٢٥٤٤- [فتوى]** وَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَنْزِلُ فِي الْبِئْرِ، فَيُدْرِكُهُ رَجُلٌ آخَرُ فِي أَثَرِهِ، فَيَجْبِذُ الأَسْفَلُ الأَعْلَى، فَيَخِرَّانِ فِي الْبِئْرِ، فَيَهْلِكَانِ جَمِيعًا، أَنَّ عَلَى عَاقِلَةِ الَّذِي جَبَذَهُ الدِّيَةَ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی شۆڕ دەبێتەوە ناو بیر و پیاوێکی دیکەش لەدوای ئەو شوڕ دەبێتەوە، جا ئەوەی خوارەوە ئەوەی سەرەوە ڕابکێشێت و هەردووکیان بکەونە ناو بیرەکەوە و بەیەکەوە بمرن، گوتوویەتی: خوێنبایی واجبە لەسەر خزمانی ئەو کەسەی خوارەوە کە ڕایکێشاوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤٢ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤٣ في العقل، عن مالك به.




**٢٥٤٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الصَّبِيِّ يَأْمُرُهُ الرَّجُلُ يَنْزِلُ فِي الْبِئْرِ أَوْ يَرْقَى فِي النَّخْلَةِ، فَيَهْلِكُ فِي ذَلِكَ، أَنَّ الَّذِي أَمَرَهُ ضَامِنٌ لِمَا أَصَابَهُ مِنْ هَلاَكٍ أَوْ غَيْرِهِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو مناڵەی پیاوێك فەرمانی پێ دەکات بچێتە ناو بیرێکەوە (بۆ کارێك) یان بچێتە سەر دارخورمایەك (بۆ شتێك)، جا بەهۆی ئەوەوە بمرێت، گوتوویەتی: ئەو کەسەی فەرمانی پێ کردووە زامنە لەوەی بەسەری دێت لە مردن و شتی دیکە (چونکە ئەو بۆتە هۆکار).

**٢٥٤٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ عَقْلٌ يَجِبُ عَلَيْهِمْ أَنْ يَعْقِلُوهُ مَعَ الْعَاقِلَةِ فِيمَا تَعْقِلُهُ الْعَاقِلَةُ مِنَ الدِّيَاتِ، وَإِنَّمَا يَجِبُ الْعَقْلُ عَلَى مَنْ بَلَغَ الْحُلُمَ مِنَ الرِّجَالِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: ئافرەت و منداڵ خوێنباییان لەسەر نییە تا لەگەڵ خزمان بیدەن و بەژدار بن لەو خوێنباییانەی خزمانی بکوژ دەیدەن، خوێنبایی تەنها لەسەر ئەو کەسانە واجبە کە گەیشتوون بە تەمەنی بلوغ لە پیاوان.

**٢٥٤٧- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي عَقْلِ الْمَوَالِي، تُلْزَمُهُ الْعَاقِلَةُ إِنْ شَاؤُوا، وَإِنْ أَبَوْا كَانُوا أَهْلَ دِيوَانٍ، أَوْ مُقْطَعِينَ، وَقَدْ تَعَاقَلَ النَّاسُ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَفِي زَمَانِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ و قَبْلَ أَنْ يَكُونَ دِيوَانٌ، وَإِنَّمَا كَانَ الدِّيوَانُ فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَلَيْسَ لأَحَدٍ أَنْ يَعْقِلَ عَنْهُ غَيْرُ قَوْمِهِ وَمَوَالِيهِ، لأَنَّ الْوَلاَءَ لاَ يَنْتَقِلُ، وَلأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْوَلاَءُ نَسَبٌ ثَابِتٌ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی خوێنبایی کۆیلەی ئازادکراو گوتوویەتی: خوێنباییەکەی لەسەر خزمانی ئازادکەرەکەیەتی بیانەوێ یان نەیانەوێ، (جا چون یەکە) خاوەنی فۆڕمی بەخشش بن (کە ئیمامی عومەر داینا) یان خاوەنی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤٤ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤٥ في العقل، عن مالك به.

فۆڕمی بەخشش نەبن (واتە جیاوازی نییە دەرامەتی حکومەتیان هەبێت یان نا)، (چونکە) خەڵکی خوێنباییان بەو شێوەیە داوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و لە سەردەمی ئەبو بەکری صدیق ﷺ بەر لەوەی دیوانی بەخشش دابندرێت، دیوان تەنها لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ داندرا، جا بۆ کەس نییە خوێنباییەکەی بۆ بدرێت لە لایەن جگە لە قەومەکەی و خزمەکانی، چونکە وەلاء ناگوازرێتەوە، وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەلاء بۆ ئەو کەسەیە کە ئازاد دەکات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وەلاء  نەسەبێکی جێگیرە (ناگۆڕێت).

**٢٥٤٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَا أُصِيبَ مِنَ الْبَهَائِمِ: أَنَّ عَلَى مَنْ أَصَابَ مِنْهَا شَيْئًا قَدْرَ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو برین و زامدارییەی تووشی ئاژەڵان دەبێت گوتوویەتی: ئەوەی زامداریان دەکات خوێنبایی لەسەرە بەئەندازەی ئەو پارەی کەم دەکات لە نرخەکەی (بەهۆی ئەو زامدارییەی).

**٢٥٤٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَكُونُ عَلَيْهِ الْقَتْلُ، فَيُصِيبُ حَدًّا مِنَ الْحُدُودِ، أَنَّهُ لاَ يُؤْخَذُ بِهِ، وَذَلِكَ أَنَّ الْقَتْلَ يَأْتِي عَلَى ذَلِكَ كُلِّهِ إِلاَّ الْفِرْيَةَ، فَإِنَّهَا تَثْبُتُ عَلَى مَنْ قِيلَتْ لَهُ، يُقَالُ لَهُ: مَا لَكَ لَمْ تَجْلِدْ مَنِ افْتَرَى عَلَيْكَ، فَأَرَى أَنْ يُجْلَدَ الْمَقْتُولُ الحَدَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُقْتَلَ، ثُمَّ يُقْتَلَ، وَلاَ أَرَى أَنْ يُقَادَ مِنْهُ فِي شَيْءٍ مِنَ الْجِرَاحِ إِلاَّ الْقَتْلَ، لأَنَّ الْقَتْلَ يَأْتِي عَلَى ذَلِكَ كُلِّهِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کوشتنی لەسەرە (بەهۆی کوشتنی کەسێك بەئەنقەست)، جا لەگەڵ ئەوە حەدێکی شەرعیشی دەکەوێتە سەر (وەك حەدی زینا یان مەشروب یان ... هتد) گوتوویەتی: حەدەکەی لەسەر جێبەجێ ناکرێت، لەبەر ئەوەی (هەر دەکوژرێت) و کوشتنیش بەسەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤٧ في العقل؛ وفي: ٢٩٠٧ في الأقضية، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤٨ في العقل، عن مالك به.




هەموو حەدەکان جێبەجێ دەبێت (هەموو حەدەکان لەخۆ دەگرێت)، تەنها حەدی بوختان نەبێت (ئەویانی لەسەر لاناچێت)، چونکە ئەویان حەقێکە بۆ ئەو کەسە جێگیر دەبێت کە بوختانەکەی دەربارە گوتراوە (مافی خەڵکە مافی خوا نییە)، پێی دەگوترێت: بۆچی جەڵدی خۆت لەو کەسە نادەیت کە بوختانی پێ کردووی؟، جا بۆچوونم وایە سەرەتا حەدی بوختانی لەسەر جێبەجێ بکرێت بەر لەوەی بکوژرێت، دواتر بکوژرێت، وە پێشم وا نییە هیچ تۆڵەیەکی ئەندامەکانی لێ بکرێتەوە جگە لە کوشتن، چونکە کوشتنەکە بەسەر گشتیدا جێبەجێ دەبێ.

**٢٥٥٠- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا أَنَّ الْقَتِيلَ إِذَا وُجِدَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ قَوْمٍ فِي قَرْيَةٍ أَوْ غَيْرِهَا لَمْ يُؤْخَذْ بِهِ أَقْرَبُ النَّاسِ إِلَيْهِ دَارًا، وَلاَ مَكَانًا، وَذَلِكَ أَنَّهُ قَدْ يُقْتَلُ الْقَتِيلُ، ثُمَّ يُلْقَى عَلَى بَابِ قَوْمٍ لِيُلَطَّخُوا بِهِ، فَلَيْسَ يُؤَاخَذُ أَحَدٌ بِمِثْلِ ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لای ئێمە ئەگەر کوژراوێك دۆزرایەوە لەناو قەومێکدا لە گوندێك یان شوێنی دیکە ئەوە نزیکترینی خەڵکی کە ماڵ و شوێنی لەوێ نزیکە تۆمەتبار ناکرێت، چونکە زۆرجاری وا هەیە کەسێك دەکوژرێت و فڕێدەدرێتە بەر دەرگای خەڵکانێك تا تێوە بگلێن، کەواتە کەس بە شتێکی ئاوا تۆمەتبار ناکرێت.

**٢٥٥١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي جَمَاعَةٍ مِنَ النَّاسِ، اقْتَتَلُوا فَانْكَشَفُوا، وَبَيْنَهُمْ قَتِيلٌ أَوْ جَرِيحٌ، لاَ يُدْرَى مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ بِهِ، إِنَّ أَحْسَنَ مَا سُمِعَ فِي ذَلِكَ، أَنَّ عَلَيْهِ الْعَقْلَ، وَأَنَّ عَقْلَهُ عَلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ نَازَعُوهُ، وَإِنْ كَانَ الْجَرِيحُ أَوِ الْقَتِيلُ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيقَيْنِ، فَعَقْلُهُ عَلَى الْفَرِيقَيْنِ جَمِيعًا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆمەڵێك لە خەڵکی کە شەڕ دەکەن و شەڕەکە دەوەستێت لە کاتێکدا کوژراو یان بریندار لەنێوانیان پەیدا دەبێ، نەزانرێ کێ وای کردووە، ئەوە چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو بابەتە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤٩ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥٠ في العقل، عن مالك به.




ئەوەیە: خوێنبایی واجبە، خوێنباییەکەش لەسەر ئەو خەڵکانەیە کە بەرانبەری وەستاونەتەوە و دژایەتییان کردووە، وە ئەگەر بریندارەکە یان کوژراوەکە لە خەڵکانێکی جگە لە دوو کۆمەڵەکە بێت (خەڵکی دیکە بەر شەڕەکە بکەوێت و بکوژرێت)، ئەوە خوێنباییەکەی لەسەر هەردوو کۆمەڵەکە واجبە.

## ١٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی کوشتنی بەفێڵ و جادوو (کە بۆ کوشتن ئەنجام بدرێت)[١]

**٢٥٥٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ قَتَلَ نَفَرًا، خَمْسَةً أَوْ سَبْعَةً بِرَجُلٍ وَاحِدٍ، قَتَلُوهُ قَتْلَ غِيلَةٍ، وَقَالَ عُمَرُ ﵁: لَوْ تَمَالأَ عَلَيْهِ أَهْلُ صَنْعَاءَ لَقَتَلْتُهُمْ جَمِيعًا[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ چەند کەسێکی کوشت، پێنج کەس یان حەوت کەس بوون، بە هۆی کوشتنی یەك پیاو، کە بەفێڵ کوشتبوویان، جا عومەر ﵁ گوتی: ئەگەر خەڵکی صەنعا هەمووی دەستیان هەبووایە لە کوشتنی ئەوە گشتیانم دەکوشت.

**٢٥٥٣-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ زُرَارَةَ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ حَفْصَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَتَلَتْ جَارِيَةً لَهَا سَحَرَتْهَا، وَقَدْ كَانَتْ دَبَّرَتْهَا، فَأَمَرَتْ بِهَا، فَقُتِلَتْ[٣].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی زوڕارەوە ﵀ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە حەفصەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ جارییەیەکی خۆی کوشتووە کە جادووی لێ کردبوو، لە کاتێکدا جارییەکەی کردبوو بە ئازادکراوی چاوەڕوانکراو (واتە دوای مردنی خاوەنەکەی ڕاستەوخۆ ئازاد ببێت، بۆیە جادووی لێ کردبوو تا زوو بیکوژێت و ئازاد ببێت)، جا حەفصە فەرمانی دەربارە دەرکرد و کوژرا.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْغِيلَةِ وَالسِّحْرِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١٩ في العقل؛ والشيباني: ٦٧١ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٩٧٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧٦ في المكاتب؛ وفي: ٢٩٨٤ في الرهون، عن مالك به.

٢٥٥٤- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السَّاحِرُ الَّذِي يَعْمَلُ السِّحْرَ، وَلَمْ يَعْمَلْ ذَلِكَ لَهُ غَيْرُهُ، هُوَ مَثَلُ الَّذِي قَالَ اللهُ ﷻ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ﴿١٠٢﴾﴾ البقرة، فَأَرَى أَنْ يُقْتَلَ ذَلِكَ، إِذَا عَمِلَ ذَلِكَ هُوَ نَفْسُهُ[١].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو جادووگەرەی جادوو دەكات، خەڵكی دیكە جادووەكەی بۆ نەكردووە (خۆی كردوویەتی)، ئەوە ئەو كەسەیە كە خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووكەكەیدا باسی كردووە: ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ﴿١٠٢﴾﴾ البقرة، واتە: [بێگومان زانییان هەر كەسێك جادوو بكات لە ڕۆژی دواییدا بێبەش دەبێ]، جا پێم وایە بكوژرێت، ئەگەر بۆ خۆی جادووەكە ئەنجام بدات.

## ٢٠- ئەوەی لە كوشتنی ئەنقەستدا واجبە[٢]

٢٥٥٥- عَنْ عُمَرَ بْنِ حُسَيْنٍ، مَوْلَى عَائِشَةَ بِنْتِ قُدَامَةَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ الْمَلِكِ بْنَ مَرْوَانَ ﷺ أَقَادَ وَلِيَّ رَجُلٍ مِنْ رَجُلٍ قَتَلَهُ بِعَصًا، فَقَتَلَهُ وَلِيُّهُ بِعَصًا[٣].

واتە: لە عومەری كوڕی حوسەینی خزمەتكاری عائیشەی كچی قودامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان ﷺ تۆڵەی دایە دەستی وەلی و خزمی پیاوێك دەربارەی بابەتی كوشتنی پیاوێك كە پیاوێكی دیكە بە دار كوشتبووی، جا خزمی كوژراوەكە بە دار كوشتییەوە.

٢٥٥٦- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ، الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا ضَرَبَ الرَّجُلَ بِعَصًا أَوْ رَمَاهُ بِحَجَرٍ أَوْ ضَرَبَهُ عَمْدًا، فَمَاتَ مِنْ ذَلِكَ، فَإِنَّ ذَلِكَ هُوَ الْعَمْدُ، وَفِيهِ الْقِصَاصُ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨٥ في الرهون؛ والحدثاني: ٣٠٢ في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَجِبُ فِيهِ الْعَمْدُ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٢١ في العقل، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٢٢ في العقل، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە ئەوەیە: ئەگەر کەسێك بە دار لە کەسێکی دا یان بەردێکی تێ گرت یان بە (دەست) بەئەنقەست لێی دا، جا بەهۆی ئەوەوە مرد، ئەوە کوشتنی بەئەنقەستە و تۆڵەی تێدایە.

٢٥٥٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَقَتْلُ الْعَمْدِ عِنْدَنَا: أَنْ يَعْمِدَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فَيَضْرِبَهُ حَتَّى تَفِيظَ نَفْسُهُ، وَمِنَ الْعَمْدِ أَيْضًا أَنْ يَضْرِبَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي النَّائِرَةِ تَكُونُ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ يَنْصَرِفُ عَنْهُ وَهُوَ حَيٌّ، فَيُنْزَى فِي ضَرْبِهِ فَيَمُوتُ، فَتَكُونُ فِي ذَلِكَ الْقَسَامَةُ[1].

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: کوشتنی بەئەنقەست لای ئێمە ئەوەیە: کەسێك بچێت لە کەسێك بدات تا گیانی دەردەچێت، وە ئەوەش لە کوشتنی بەئەنقەست حیسابە کە کەسێك لە کەسێك بدات بە هۆی (ناتەبایی و) دوژمنایەتییەك کە لە نێوانیانە، دواتر وازی لێ بێنێت لە کاتێکدا هێشتا زیندووە، جا نەزیف بێت و هەر خوێنی لەبەر بڕوات بەهۆی لێدانەکەیەوە و بمرێت، ئەوەیان سوێندخواردنی کوشتنی تیایە.

٢٥٥٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ يُقْتَلُ فِي الْعَمْدِ الرِّجَالُ الأَحْرَارُ بِالرَّجُلِ الْحُرِّ الْوَاحِدِ، وَالنِّسَاءُ بِالْمَرْأَةِ كَذَلِكَ، وَالْعَبِيدُ بِالْعَبْدِ كَذَلِكَ أَيْضًا.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لای ئێمە: لە کوشتنی بەئەنقەستدا چەند پیاوێکی ئازاد بەهۆی کوشتنی یەك پیاوی ئازادەوە دەکوژرێن، وە چەندین ئافرەتیش بەهۆی کوشتنی یەك ئافرەتەوە دەکوژرێن، وە کۆمەڵە کۆیلەیەکیش بە هۆی کوشتنی یەك کۆیلەوە دەکوژرێن.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٢٣ في العقل، عن مالك به.

## ٢١- تۆڵەسەندنەوە لە كوشتندا[١]

**٢٥٥٩**- أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ ﷺ كَتَبَ إِلَى مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ يَذْكُرُ، أَنَّهُ أُتِيَ بِسَكْرَانَ قَدْ قَتَلَ رَجُلاً، فَكَتَبَ إِلَيْهِ مُعَاوِيَةُ ﷺ: أَنِ اقْتُلْهُ بِهِ[٢].

واتە: مەڕوانی كوڕی حەكەم ﷺ نووسراوێكی بۆ موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان ﷺ نووسی باسی ئەوەی كرد سەرخۆشێكیان هێناوە پیاوێكی كوشتووە، موعاویەش ﷺ بۆی نووسی: بەهۆیەوە بیكوژەوە.

**٢٥٦٠**- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي تَأْوِيلِ هَذِهِ الآيَةِ، قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ﴿١٧٨﴾ ﴾ البقرة، أَنَّ الْقِصَاصَ يَكُونُ بَيْنَ الإِنَاثِ كَمَا يَكُونُ بَيْنَ الذُّكُورِ، وَالْمَرْأَةُ الْحُرَّةُ تُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ الْحُرَّةِ كَمَا يُقْتَلُ الْحُرُّ بِالْحُرِّ، وَالأَمَةُ تُقْتَلُ بِالأَمَةِ كَمَا يُقْتَلُ الْعَبْدُ بِالْعَبْدِ، وَالْقِصَاصُ يَكُونُ بَيْنَ النِّسَاءِ، كَمَا يَكُونُ بَيْنَ الرِّجَالِ، وَالْقِصَاصُ أَيْضًا يَكُونُ بَيْنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ﴿٤٥﴾ ﴾ المائدة، فَذَكَرَ اللهُ ﷻ: أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ، فَنَفْسُ الْمَرْأَةِ الْحُرَّةِ بِنَفْسِ الرَّجُلِ الْحُرِّ، وَجُرْحُهَا بِجُرْحِهِ[٣].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاكترینی ئەوەی بیستوومە لە لێكدانەوەی ئەم ئایەتە كە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ﴿١٧٨﴾ ﴾ البقرة، تۆڵەسەندنەوە لە نێوان ئافرەتانیش ئەنجام دەدرێت هەروەك لە نێوان پیاوان ئەنجام دەدرێت، جا ئافرەتی ئازاد دەكوژرێتەوە بەهۆی كوشتنی ئافرەتی ئازاد، وەك چۆن پیاوی ئازاد دەكوژرێتەوە بە هۆی پیاوی ئازاد، وە ئافرەتی كۆیلەش دەكوژرێتەوە بە هۆی كوشتنی ئافرەتی كۆیلە، هەروەك چۆن پیاوی كۆیلە دەكوژرێتەوە بە هۆی

---

(١) ـ الْقِصَاصِ فِي الْقَتْلِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٢٥ في العقل، عن مالك به.

کوشتنی پیاوی کۆیلە، کەواتە تۆڵەسەندنەوە لە نێوان ئافرەتان ئەنجام دەدرێت وەك چۆن لە نێوان پیاوان ئەنجام دەدرێت، هەروەها تۆڵەسەندنەوە لە نێوان پیاوان و ئافرەتانیش ئەنجام دەدرێت، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا فەرموویەتی: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ﴿٤٥﴾ ﴾ المائدة، خوای پەروەردگار ﷻ باسی: نەفس بە نەفسی کردووە، کەواتە نەفسی ئافرەتی ئازاد هاوتایە بە نەفسی پیاوی ئازاد، برینداربیەکەشی هاوتایە لەگەڵ برینداربیەکەی (واتە لە نەفس و ئەندام تۆڵەی لێ دەکرێتەوە).

٢٥٦١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يُمْسِكُ الرَّجُلَ لِلرَّجُلِ فَيَضْرِبُهُ فَيَمُوتُ مَكَانَهُ: أَنَّهُ إِنْ أَمْسَكَهُ وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ يُرِيدُ قَتْلَهُ قُتِلاَ بِهِ جَمِيعًا، وَإِنْ أَمْسَكَهُ وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ إِنَّمَا يُرِيدُ الضَّرْبَ مِمَّا يَضْرِبُ بِهِ النَّاسُ، لاَ يَرَى أَنَّهُ عَمَدَ لِقَتْلِهِ، فَإِنَّهُ يُقْتَلُ الْقَاتِلُ، وَيُعَاقَبُ الْمُمْسِكُ أَشَدَّ الْعُقُوبَةِ، وَيُسْجَنُ سَنَةً لأَنَّهُ أَمْسَكَهُ، وَلاَ يَكُونُ عَلَيْهِ الْقَتْلُ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کەسێك بۆ کەسێك دەگرێت و ئەویش لێی دەدات و دەستبەجێ لەوێ دەمرێت، گوتوویەتی: ئەگەر گرتبێتی لە کاتێکدا دەزانێ (لێدەرەکە) مەبەستیەتی بیکوژێ، ئەوە هەردووکیان بەهۆیەوە دەکوژرێنەوە، وە ئەگەر بیگرێت پێی وا بێت مەبەستیەتی ئەو لێدانەی لێ بدات کە عادەتەن خەڵك لێی دەدرێت، پێم وا نییە کوشتنەکە (بۆ ئەو) بەئەنقەست بێت، (بەڵکوو حوکمەکە بەو جۆرەیە): بکوژەکە دەکوژرێتەوە و ئەوەشی گرتوویەتی سزایەکی سەخت دەدرێت و ساڵێکیش بەند دەکرێت چونکە گرتوویەتی، (بەڵام) کوشتنی لەسەر نییە.

٢٥٦٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَقْتُلُ الرَّجُلَ عَمْدًا، أَوْ يَفْقَأُ عَيْنَهُ عَمْدًا، فَيُقْتَلُ الْقَاتِلُ، أَوْ تُفْقَأُ عَيْنُ الْفَاقِئِ، قَبْلَ أَنْ يُقْتَصَّ مِنْهُ: أَنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ دِيَةٌ وَلاَ قِصَاصٌ، وَإِنَّمَا كَانَ حَقُّ الَّذِي قُتِلَ أَوْ فُقِئَتْ عَيْنُهُ فِي الشَّيْءِ بِالَّذِي ذَهَبَ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ يَقْتُلُ الرَّجُلَ عَمْدًا،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٢٦ في العقل، عن مالك به.

ثُمَّ يَمُوتُ الْقَاتِلُ، فَلاَ يَكُونُ لِصَاحِبِ الدَّمِ إِذَا مَاتَ الْقَاتِلُ شَيْءٌ دِيَةٌ وَلاَ غَيْرُهَا، وَذَلِكَ لِقَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ ﴿١٧٨﴾﴾ البقرة.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنَّمَا يَكُونُ لَهُ الْقِصَاصُ عَلَى صَاحِبِهِ الَّذِي قَتَلَهُ، فَإِذَا هَلَكَ قَاتِلُهُ الَّذِي قَتَلَهُ، فَلَيْسَ لَهُ قِصَاصٌ وَلاَ دِيَةٌ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی بەئەنقەست پیاوێك دەکوژێت یان چاوی دەتەقێنێت و کوێری دەکات، جا بەر لەوەی تۆڵەی لێ بکرێتەوە بکوژەکە کوژرا و چاوڕژێنەرەکە چاوی ڕژێنرا، گوتوویەتی: بکوژەکە (مادەم نەماوە و کوژراوە) هیچ خوێنێکی لەسەر نییە و (چاوڕژێنەرەکەش مادەم چاوی ڕژێنراوە لە ڕووداوێکی دیکە) تۆڵەی لەسەر نییە، چونکە حەقی ئەو کەسەی دەکوژرێت یان چاوی دەڕژێنرێت لەو شتەدایە کە (ئێستا) نەماوە، جا ئەوە وەکوو ئەو پیاوە وایە کە بەئەنقەست پیاوێك دەکوژێت، دواتر بکوژەکە خۆی دەمرێت، ئەوە خاوەنی خوێنەکە هیچ خوێنبایی و شتێکی بۆ نییە کاتێ بکوژەکە دەمرێت، ئەوەش لەبەر وتەی خوای پەروەردگار ﷻ کە دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ ﴿١٧٨﴾﴾ البقرة.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (خاوەنی کوژراوەکە) تەنها تۆڵەسەندنەوەیان بۆ هەیە لەسەر ئەو کەسەی کوشتوویەتی، جا کاتێ ئەو بکوژەی کوشتوویەتی دەمرێت، ئەوە هیچ تۆڵە و خوێنباییەکی بۆ نییە.

**٢٥٦٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ بَيْنَ الْحُرِّ وَالْعَبْدِ قَوَدٌ فِي شَيْءٍ مِنَ الْجِرَاحِ، وَالْعَبْدُ يُقْتَلُ بِالْحُرِّ إِذَا قَتَلَهُ عَمْدًا، وَلاَ يُقْتَلُ الْحُرُّ بِالْعَبْدِ، وَإِنْ قَتَلَهُ عَمْدًا، وَهُوَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: تۆڵەسەندنەوە لە نێوان ئازاد و کۆیلە نییە لە بریندارکردن و لەناوبردنی هیچ ئەندامێك، (بەڵام) کۆیلە بە هۆی کوشتنی کەسێکی ئازاد دەکوژرێتەوە، بەڵام کەسی ئازاد بەهۆی کوشتنی کۆیلە ناکوژرێت، هەر چەندە بەئەنقەستیش بیکوژێت، ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٢٧ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٢٨ في العقل، عن مالك به.

## ٢٢- لێخۆشبوون لە كوشتنی بەئەنقەستدا[١]

٢٥٦٤- **[فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ أَدْرَكَ مَنْ يَرْضَى مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُونَ فِي الرَّجُلِ إِذَا أَوْصَى أَنْ يُعْفَى عَنْ قَاتِلِهِ إِذَا قَتَلَ عَمْدًا: إِنَّ ذَلِكَ جَائِزٌ لَهُ، وَأَنَّهُ أَوْلَى بِدَمِهِ مِنْ غَيْرِهِ مِنْ أَوْلِيَائِهِ مِنْ بَعْدِهِ[٢].

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گەیشتووە بەو زانایانەی لە زانستەكەیان ڕازی بووە دەربارەی ئەو پیاوەی وەسیەت دەكات لە بكوژەكەی خۆش ببن ئەگەر بەئەنقەست كوشتیان، (زاناكان) دەیانگوت: ئەوەی بۆ دروستە و ئەو لەپێشترە بە خوێنی خۆی لە خزمەكانی خۆی دوای خۆی.

٢٥٦٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَعْفُو عَنْ قَتْلِ الْعَمْدِ بَعْدَ أَنْ يَسْتَحِقَّهُ، وَيَجِبَ لَهُ: إِنَّهُ لَيْسَ عَلَى الْقَاتِلِ عَقْلٌ يَلْزَمُهُ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الَّذِي عَفَا عَنْهُ اشْتَرَطَ ذَلِكَ عِنْدَ عَفْوِهِ عَنْهُ.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە لە كوشتنی بەئەنقەست خۆش دەبێت دوای ئەوەی حەقی دەكەوێت و بۆی هەبووە بیكوژێتەوە، گوتوویەتی: خوێنبایی لەسەر بكوژەكە واجب نییە، تەنها لەو كاتە نەبێت كە ئەو كەسەی لێی خۆش دەبێت لە كاتی لێخۆشبوونەكەی ئەو مەرجە دابنێت (بڵێت ناتكوژمەوە بەڵام خوێنباییم دەوێ).

٢٥٦٦- قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْقَاتِلِ عَمْدًا إِذَا عُفِيَ عَنْهُ: أَنَّهُ يُجْلَدُ مِئَةَ جَلْدَةٍ وَيُسْجَنُ سَنَةً[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی بەئەنقەست كەسێك دەكوژێت ئەگەر خاوەنی كوژراوەكە لێی خۆش بوو گوتوویەتی: دەبێ سەت جەڵدی لێ بدرێت وساڵێكیش بەند بكرێت (تاوەكوو تەمێ بێت و جارێكی دیكە نەوێرێت نزیكی تاوانی ئاوا بكەوێتەوە).

---

(١) ـ الْعَفْوُ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣١ في العقل، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣٤ في العقل، عن مالك به.

**٢٥٦٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا قَتَلَ الرَّجُلُ عَمْدًا وَقَامَتْ عَلَى ذَلِكَ الْبَيِّنَةُ، وَلِلْمَقْتُولِ بَنُونَ وَبَنَاتٌ، فَعَفَا الْبَنُونَ وَأَبَى الْبَنَاتُ أَنْ يَعْفُونَ، فَعَفْوُ الْبَنِينَ جَائِزٌ عَلَى الْبَنَاتِ، وَلاَ أَمْرَ لِلْبَنَاتِ مَعَ الْبَنِينَ فِي الْقِيَامِ بِالدَّمِ وَالْعَفْوِ عَنْهُ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك بەئەنقەست کوژرا و بەڵگە هەبوو لەسەر ئەوە، کوژراوەکەش کوڕ و کچی هەبوون، جا کوڕەکان لە بکوژەکە خۆش بوون و کچەکانیش ڕازی نەبوون لێی خۆش بن، ئەوە لێخۆشبوونی کوڕەکان جێبەجێ دەکرێت بەسەر کچەکان، کچەکان کاریگەرییان نییە لەگەڵ هەبوونی کوڕەکان لە بابەتی هەڵسان بە تۆڵەکردنەوەی خوێن و لێخۆشبوونی خوێن.

## ٢٣- تۆڵەسەندنەوە دەربارەی ئەندامەکان[2]

**٢٥٦٨-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّهُ مَنْ كَسَرَ يَدًا، أَوْ رِجْلاً عَمْدًا، أَنَّهُ يُقَادُ مِنْهُ، وَلاَ يَعْقِلُ[3].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: هەر کەسێك دەستێك یان قاچێك بەئەنقەست بشکێنێت، تۆڵەی لێ دەکرێتەوە، خوێنبایی نادات.

**٢٥٦٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يُقَادُ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى تَبْرَأَ جِرَاحُ صَاحِبِهِ، فَيُقَادُ مِنْهُ، فَإِنْ جَاءَ جُرْحُ الْمُسْتَقَادِ مِنْهُ مِثْلَ جُرْحِ الأَوَّلِ حِينَ يَصِحُّ فَهُوَ الْقَوَدُ، وَإِنْ زَادَ جُرْحُ الْمُسْتَقَادِ مِنْهُ أَوْ مَاتَ، فَلَيْسَ عَلَى الْمَجْرُوحِ الأَوَّلِ الْمُسْتَقِيدِ شَيْءٌ، وَإِنْ بَرَأَ جُرْحُ الْمُسْتَقَادِ مِنْهُ، وَشَلَّ الْمَجْرُوحُ الأَوَّلُ، أَوْ بَرَأَتْ جِرَاحُهُ، وَبِهَا عَيْبٌ أَوْ نَقْصٌ أَوْ عَثَلٌ، فَإِنَّ الْمُسْتَقَادَ مِنْهُ لاَ يَكْسِرُ الثَّانِيَةَ، وَلاَ يُقَادُ بِجُرْحِهِ، قَالَ: وَلَكِنَّهُ يُعْقَلُ لَهُ بِقَدْرِ مَا نَقَصَ مِنْ يَدِ الأَوَّلِ أَوْ فَسَدَ مِنْهَا، وَالْجِرَاحُ فِي الْجَسَدِ عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ[4].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣٢ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ الْقِصَاصُ فِي الْجِرَاحِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣٦ في العقل، عن مالك به.




(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: تۆڵە لە کەس ناکرێتەوە تاوەکوو برینی بەرانبەرەکەی چاك دەبێتەوە، ئینجا تۆڵەی لێ دەکرێتەوە، جا ئەگەر برین و شکانی ئەو کەسەی تۆڵەکەی لێ کراوەتەوە وەك برینی کەسی یەکەمی لێ هاتەوە کاتێ چاك بۆیەوە، ئەوە برینییە لە تۆڵەوەرگرتنەوەی تەواو (پاك لە پاك)، وە ئەگەر برینی ئەو کەسەی تۆڵەی لێ کراوەتەوە زیاتر بوو، یان مرد (بەهۆیەوە)، ئەوە خاوەن برینەکەی یەکەم (کە تۆڵەی بۆ سەندراوەتەوە) هیچی لەسەر نییە، وە ئەگەر برینی کەسی تۆڵەلێسەندراو چاك بۆیەوە، (بەڵام) برینداری یەکەم شەلەل بوو (بەهۆی دەستدرێژییەکەوە)، یان چاك بۆیەوە (شەلەل نەبوو، بەڵام) عەیبێك یان نەقسێك یان خواروخێچییەکی لێ پەیدا بوو، ئەوە تۆڵەلێسەندراوەکە دووبارە ئەندامی ناشکێنرێت و تۆڵەی لێ ناکرێتەوە بەهۆی برینەکەوە، گوتوویەتی: بەڵکوو تۆڵە و خوێنبایی لێ دەسەنرێت بەئەندازەی ئەو کەموکوڕییەی لە دەستی کەسی یەکەم ڕووی داوە یان تێکچووە، (ئەوە دەربارەی دەست و قاچ بوو) جا دەربارەی ئەندامەکانی دیکەی جەستەش هەمان شتە.

**٢٥٧٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا عَمَدَ الرَّجُلُ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَفَقَأَ عَيْنَهَا، أَوْ كَسَرَ يَدَهَا، أَوْ قَطَعَ إِصْبَعَهَا، أَوْ أَشْبَاهَ ذَلِكَ مُتَعَمِّدًا لِذَلِكَ، فَإِنَّهَا تُقَادُ مِنْهُ، وَأَمَّا الرَّجُلُ يَضْرِبُ امْرَأَتَهُ بِالْحَبْلِ أَوْ بِالسَّوْطِ فَيُصِيبُهَا مِنْ ضَرْبِهِ مَا لَمْ يُرِدْ، وَلَمْ يَتَعَمَّدْ، فَإِنَّهُ يَعْقِلُ مَا أَصَابَ مِنْهَا عَلَى هَذَا الْوَجْهِ، وَلاَ يُقَادُ مِنْهُ[1].**

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر پیاو بۆ خێزانەکەی چوو، جا چاوی ڕژاند یان دەستی شکاند یان پەنجەی بڕی یان هاوشێوەی ئەو شتانە، بەئەنقەست، ئەوە بەهۆیەوە تۆڵەی لێ دەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر پیاو بە پەت یان قامچی لە خێزانەکەی دا و شتێکی لێ هات کە مەبەستی نەبوو و بەئەنقەست وای نەکرد، ئەوە خوێنبایی ئەوە دەدات کە ئافرەتەکە تووشی بووە بەو جۆرە و تۆڵەی لێ ناکرێتەوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣٧ في العقل، عن مالك به.

**٢٥٧١-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرِ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ أَقَادَ مِنْ كَسْرِ الْفَخِذِ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم ﷺ تۆڵەسەندنەوەی ئەنجام دا لە شکاندنی ڕان.

## ٢٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی سائیبە و جینایەتەکەی[٢]

**٢٥٧٢-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ سَائِبَةً أَعْتَقَهُ بَعْضُ الْحُجَّاجِ، فَقَتَلَ ابْنَ رَجُلٍ مِنْ بَنِي عَائِذٍ، فَجَاءَ الْعَائِذِيُّ أَبُو الْمَقْتُولِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، يَطْلُبُ دِيَةَ ابْنِهِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: لاَ دِيَةَ لَهُ، فَقَالَ الْعَائِذِيُّ: أَرَأَيْتَ لَوْ قَتَلَهُ ابْنِي؟ فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: إِذًا تُخْرِجُونَ دِيَتَهُ، فَقَالَ الْعَائِذِيُّ: هُوَ إِذًا كَالأَرْقَمِ، إِنْ يُتْرَكْ يَلْقَمْ، وَإِنْ يُقْتَلْ يَنْقَمْ[٣].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): یەکێك لە حاجییەکان سائیبەی ئازاد کرد، جا کۆیلە سائیبەکە (بەهەڵە) کوڕی پیاوێکی نەوەی عائیزی کوشت، جا عائیزییەکە باوکی کوژراوەکە هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ داوای خوێنبایی کوڕەکەی کرد، عومەریش ﷺ گوتی: خوێنبایی بۆ نییە (چونکە خوێنبایی کوشتنی هەڵە لەسەر خزم و کەسە، ئەویش خۆ خزم و کەسی نییە)، پیاوە عائیزییەکەش گوتی: ئەی چی دەڵێیت ئەگەر کوڕەکەم بیکوشتایە؟ عومەر ﷺ گوتی: ئێوە خوێنباییەکەتان دەدا، کابرای عائیزی گوتی: کەواتە وەك مار وایە ئەگەر وازی لێ بێنی قوتت دەدات، ئەگەر بشیکوژی (ماری دیکە) تۆڵە دەکاتەوە (ئەوە مەسەلێکی عەرەبییە بۆ ئەو بابەتانە دەگوترێت کە لە هەردوو سەر زەرەرتە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٥ في العقل، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي دِيَةِ السَّائِبَةِ وَجِنَايَتِهِ.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣٤ في العقل؛ والشيباني: ٦٧٩ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.



# پەرتووکی

# سوێندی ئاشکراکردنی بکوژ[1]



---

(١) ـ كِتَابُ الْقَسَامَةِ.

## ١- دەستپێکردنی خاوەنی خوێن لە سوێندخواردنی کوشتندا[١]

**٢٥٧٣-** عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ رِجَالٌ مِنْ كُبَرَاءِ قَوْمِهِ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأُتِيَ مُحَيِّصَةُ، فَأُخْبِرَ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرِ بِئْرٍ أَوْ عَيْنٍ، فَأَتَى يَهُودَ، فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ، فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، فَأَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ، فَذَكَرَ لَهُمْ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ، وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ، فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ، وَهُوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَبِّرْ كَبِّرْ، يُرِيدُ السِّنَّ، فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ، فَكَتَبَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبُوا: إِنَّا وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِحُوَيِّصَةَ، وَمُحَيِّصَةَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَتَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟ فَقَالُوا: لاَ، قَالَ: أَفَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ؟ قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ، فَوَدَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ بِمِئَةِ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ، قَالَ سَهْلٌ: لَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الْفَقِيرُ، هُوَ الْبِئْرُ.

واتە: لە سەهلی کوڕی ئەبو حەسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): چەند کەسێك لە گەورەکانی قەومەکەم هەواڵیان پێ دام کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەیصە دەرچوون بۆ خەیبەر بەهۆی قاتوقوڕی کە تووشیان ببوو (جا دەیانویست قوتێك و خواردنێك لە خەیبەر پەیدا بکەن) جا هەواڵ درا بەوەی عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژراوە و خراوەتە ناو بیرێکەوە ـ یان ناو کانییەکەوە ـ جا (موحەیصە) هات بۆ لای جوولەکەکان و گوتی: سوێند بە خوا ئێوە کوشتووتانە، ئەوانیش گوتیان: سوێند بە خوا ئێمە نەمانکوشتووە، جا هاتەوە تا هاتە لای قەومەکەی خۆی و ئەوەی بۆ باس کردن، دواتر خۆی و حوەیصەی برای کە

---

(١) ـ تَبْدِئَةُ أَهْلِ الدَّمِ فِي الْقَسَامَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥٢ في القسامة؛ والشيباني: ٦٨١ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٧٤٧؛ وفي: ١٦١٢؛ وابن حنبل: ١٦١٤١ عن طريق محمد بن إدريس الشافعي؛ والبخاري: ٧١٩٢ في الأحكام؛ ومسلم: القسامة: ٦؛ والنسائي: ٤٧١٠ في القسامة، وفي: ٤٧١١ في القسامة؛ وأبو داود: ٤٥٢١ في الديات؛ وابن ماجه: ٢٧٠٩ في الديات؛ والمنتقى لابن الجارود: ٧٩٨؛ والقابسي: ٥٢٥، كلهم عن مالك به.

لەو گەورەتر بوو لەگەڵ عەبدوڕڕەحمان هاتن، جا موحەیصە کە لە خەیبەر ببوو (ئاگای لە مەسەلەکە بوو) ڕۆیشتە پێشەوە تا قسە بکات، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: گەورە پێش بخە گەورە پێش بخە، مەبەستی تەمەن بوو (واتە ڕێ بدە گەورەتر قسە بکات)، جا حوەیصە قسەی کرد، دواتر موحەیصە قسەی کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یان (جوولەکەکان) دەبێ خوێنبایی خزمەکەتان بدەن، یان دەبێ جەنگ ڕابگەیەنن (لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلام)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی دەربارەی ئەوە بۆ جوولەکەکان نووسی، ئەوانیش نووسییان: سوێند بە خوا ئێمە نەمانکوشتووە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە حوەیصە و موحەیصە و عەبدوڕڕەحمانی فەرموو: ئایا ئێوە سوێند دەخۆن و خوێنی هاوەڵەکەتان وەربگرن؟ گوتیان: نەخێر، فەرمووی: ئەی کەواتە جوولەکەکان سوێندتان بۆ بخۆن (کە ئەوان نەیانکوشتووە)؟ گوتیان: (نەخێر، چونکە) ئەوان مسوڵمان نین (گوێیان لە درۆ و سوێندخواردن نییە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لەلای خۆیەوە خوێنەکەی پێ دان، سەت وشتری بۆ ناردن تا چوونە ناوماڵەکەوە، سەهل گوتوویەتی: وشترێکی مێی سوور لەوان لەقەیەکی لێ دام.

ئیمامی مالیك رحمه الله گوتوویەتی: «الفقير» بریتییە لە: بیر.

**٢٥٧٤-** عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ رحمه الله، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَهْلٍ الأَنْصَارِيَّ، وَمُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ، خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ، فَتَفَرَّقَا فِي حَوَائِجِهِمَا، فَقُتِلَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَهْلٍ، فَقَدِمَ مُحَيِّصَةُ، فَأَتَى هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ لِيَتَكَلَّمَ لِمَكَانِهِ مِنْ أَخِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَبِّرْ كَبِّرْ، فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ، فَذَكَرَا شَأْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَهْلٍ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَحْلِفُونَ خَمْسِينَ يَمِينًا، وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ أَوْ قَاتِلِكُمْ؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَمْ نَشْهَدْ، وَلَمْ نَحْضُرْ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَمِينًا، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ نَقْبَلُ أَيْمَانَ قَوْمٍ كُفَّارٍ؟[1].

قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ رحمه الله: فَزَعَمَ بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَدَاهُ مِنْ عِنْدِهِ.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥٣ في القسامة؛ وفي: ٢٣٥٤ في القسامة؛ والنسائي: ٤٧١٨ في القسامة، كلهم عن مالك به.

واتە: لە بوشەیری کوڕی یەسارەوە ﵀ گێردراوەتەوە هەواڵی داوە بەوەی عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی ئەنصاری و موحەیصەی کوڕی مەسعود دەرچوون بۆ خەیبەر و لێك جیا بوونەوە بۆ پێویستییەکانیان و عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژرا، جا موحەیصە لەگەڵ حوەیصە و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهلی برای هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ جا عەبدوڕڕەحمان (کە بچووکترینیان بوو) هاتە پێشەوە تا قسە لەسەر براکەی بکات، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: گەورە پێش بخە گەورە پێش بخە، جا حوەیصە و موحەیصە قسەیان کرد و باسی بابەتی عەبدوڵڵای کوڕی سەهلیان کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ئایا پەنجا سوێند دەخۆن تا خوێنی براکەتان یان بکوژەکەتان بەدەست بێنن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چاومان لێ نەبووە و لەوێ نەبووین (تا سوێند بخۆین ئەوان کوشتوویانە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: کەواتە جوولەکەکان بە پەنجا سوێند خۆیان بەری دەکەن لێتان و (حەقتان ناکەوێت)، ئەوانیش گوتیان: چۆن سوێندی خەڵکانێکی کافر قبووڵ بکەین؟

یەحیای کوڕی سەعید ﵀ گوتوویەتی: جا بوشەیری کوڕی یەسار گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنباییەکەی لەلای خۆیەوە پێ دان.

**٢٥٧٥- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، وَالَّذِي سَمِعْتُ مِمَّنْ أَرْضَى فِي الْقَسَامَةِ، وَالَّذِي اجْتَمَعَتْ عَلَيْهِ الأَئِمَّةُ فِي الْقَدِيمِ وَالْحَدِيثِ: أَنْ يَبْدَأَ بِالأَيْمَانِ الْمُدَّعُونَ فِي الْقَسَامَةِ فَيَحْلِفُونَ، وَأَنَّ الْقَسَامَةَ لاَ تَجِبُ إِلاَّ بِأَحَدِ أَمْرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يَقُولَ الْمَقْتُولُ: دَمِي عِنْدَ فُلاَنٍ، أَوْ يَأْتِيَ وُلاَةُ الدَّمِ بِلَوْثٍ مِنْ بَيِّنَةٍ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ قَاطِعَةً عَلَى الَّذِي يُدَّعَى عَلَيْهِ الدَّمُ، فَهَذَا الَّذِي يُوجِبُ الْقَسَامَةَ لِلْمُدَّعِينَ الدَّمَ عَلَى مَنِ ادَّعَوْهُ عَلَيْهِ، وَلاَ تَجِبُ الْقَسَامَةُ عِنْدَنَا إِلاَّ بِأَحَدِ هَذَيْنِ الْوَجْهَيْنِ[1].**

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە و لەو کەسانە گوێبیست بووم کە پێیان ڕازیم لە قەسامەدا و ئەوەی زانایان لە کۆن و نوێ لەسەری کۆکن (ئەوەیە): ئەوانەی داوای خوێن دەکەن

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥٥ في القسامة؛ وفي: ٢٣٥٦ في القسامة، عن مالك به.

دەبێ سەرەتا دەست بە سوێندخواردن بکەن لە قەسامەدا (لە سوێندخواردن بۆ دیاریکردنی بکوژ)، وە قەسامە (سوێندخواردن) واجب نابێت تەنها بە دوو جۆر نەبێت: یان ئەوەیە کوژراوەکە (بەر لەوەی گیانی دەرچێت) بڵێت: خوێنی من لەلای فڵانە (ئەو لێی داوم)، یان خزمی کوژراوەکە بەڵگەیەکی ناتەواو بێنن یەکلاییکەرەوە نەبێت لەسەر ئەو کەسەی بانگەشەی کوشتنی لەسەر دەکرێت، ئەوە بریتییە لەوەی سوێندخواردن واجب دەکات بۆ ئەو کەسانەی داوای خوێن دەکەن لەسەر ئەو کەسەی بانگەشەکەی لەسەر دەکەن (کە کوشتبێتی)، جا لەلای ئێمە سوێندخواردنی کوشتن واجب نابێت تەنها بەو دوو جۆرە نەبێت.

**٢٥٧٦- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتِلْكَ السُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا عِنْدَنَا، وَالَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ عَمَلُ النَّاسِ: أَنَّ الْمُبَدَّئِينَ بِالْقَسَامَةِ أَهْلُ الدَّمِ، وَالَّذِينَ يَدَّعُونَهُ فِي الْعَمْدِ وَالْخَطَإِ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَدْ بَدَّأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْحَارِثِيِّينَ فِي صَاحِبِهِمِ الَّذِي قُتِلَ بِخَيْبَرَ[١].**

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە ئەو ڕێبازەیە کە ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە و خەڵکیش بەردەوام کاریان لەسەر ئەوە بووە (بەوەی): ئەوانەی یەکەم جار دەست بە سوێندخواردن دەکەن خاوەنی خوێنەکەن، وە ئەوانەشن کە بانگەشەی کوشتنی بەئەنقەست و هەڵە دەکەن (کاتێ یەکێك دەکوژرێت و خاوەنی کوژراوەکە دەڵێ کوشتنی ئەنقەست بووە، ئەوانەی بەرانبەریش دەڵێن کوشتنی هەڵە بووە)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا دەستی کردووە بە سوێنددانی حاریسییەکان دەربارەی خزمەکەیان کە لە خەیبەر کوژرابوو.

**٢٥٧٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ حَلَفَ الْمُدَّعُونَ اسْتَحَقُّوا دَمَ صَاحِبِهِمْ، وَقَتَلُوا مَنْ حَلَفُوا عَلَيْهِ، وَلاَ يُقْتَلُ فِي الْقَسَامَةِ إِلاَّ وَاحِدٌ، لاَ يُقْتَلُ فِيهَا اثْنَانِ، يَحْلِفُ مِنْ وُلاَةِ الدَّمِ خَمْسُونَ رَجُلاً خَمْسِينَ يَمِينًا، فَإِنْ قَلَّ عَدَدُهُمْ أَوْ نَكَلَ بَعْضُهُمْ، رُدَّتِ الأَيْمَانُ عَلَيْهِمْ، إِلاَّ أَنْ يَنْكُلَ أَحَدٌ مِنْ وُلاَةِ الْمَقْتُولِ، وُلاَةِ الدَّمِ الَّذِينَ يَجُوزُ لَهُمُ الْعَفْوُ عَنْهُ، فَإِنْ نَكَلَ أَحَدٌ مِنْ أُولَئِكَ، فَلاَ سَبِيلَ إِلَى الدَّمِ إِذَا نَكَلَ أَحَدٌ مِنْهُمْ[٢].**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥٥ في القسامة؛ وفي: ٢٣٥٦ في القسامة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥٨ في القسامة، عن مالك به.

قَالَ يَحْيَى رَحِمَهُ اللهُ: قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللهُ: وَإِنَّمَا تُرَدُّ الأَيْمَانُ عَلَى مَنْ بَقِيَ مِنْهُمْ، إِذَا نَكَلَ أَحَدٌ مِمَّنْ لاَ يَجُوزُ لَهُ عَفْوٌ، فَإِنْ نَكَلَ أَحَدٌ مِنْ وُلاَةِ الدَّمِ الَّذِينَ يَجُوزُ لَهُمُ الْعَفْوُ عَنِ الدَّمِ، وَإِنْ كَانَ وَاحِدًا، فَإِنَّ الأَيْمَانَ لاَ تُرَدُّ عَلَى مَنْ بَقِيَ مِنْ وُلاَةِ الدَّمِ، إِذَا نَكَلَ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنِ الأَيْمَانِ، وَلَكِنِ الأَيْمَانُ إِذَا كَانَ ذَلِكَ تُرَدُّ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِمْ، فَيَحْلِفُ مِنْهُمْ خَمْسُونَ رَجُلاً خَمْسِينَ يَمِينًا، فَإِنْ لَمْ يَبْلُغُوا خَمْسِينَ رَجُلاً، رُدَّتِ الأَيْمَانُ عَلَى مَنْ حَلَفَ مِنْهُمْ، فَإِنْ لَمْ يُوجَدْ أَحَدٌ إِلاَّ الَّذِي ادُّعِيَ عَلَيْهِ، حَلَفَ هُوَ خَمْسِينَ يَمِينًا وَبَرِئَ.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك رَحِمَهُ اللهُ گوتوویەتی: ئەگەر ئەو کەسانەی بانگەشەیان دەکرد بەوەی فڵان کەس خزمەکەی ئەوانی کوشتووە سوێندیان خوارد، ئەوە شایستەی وەرگرتنی خوێنی خزمەکەیان دەبن و ئەو کەسە دەکوژن کە سوێندیان لەسەر خواردووە، جا لە قەسامەدا لە کەسێك زیاتر ناکوژرێت، دوو کەس ناکوژرێن، پەنجا کەس لە خاوەن خوێنەکە پەنجا سوێند دەخۆن (هەر یەکەیان یەك سوێند دەخوات)، جا ئەگەر ژمارەیان کەمتر بوو (لە پەنجا کەس) یان هەندێکیان نکوڵییان کرد سوێند بخۆن، ئەوە سوێندەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەر ئەوانی دیکە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە یەکێك لە خاوەنە نزیکەکانی کوژراوەکە کە خاوەنی خوێنەکەیە و کە لێخۆشبوونیان بۆ هەیە (وەك کوڕ و برا) نکوڵی بکەن و سوێند نەخۆن، جا ئەگەر یەکێك لەوانە سوێندی نەخوارد، ئەوە هیچ ڕێگایەك نامێنێ بۆ وەرگرتنەوەی خوێنەکە کاتێ یەکێك لەوان نکوڵی دەکات لەوەی سوێند بخوات (واتە بابەتەکە هەڵدەوەشێتەوە).

یەحیا رَحِمَهُ اللهُ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك رَحِمَهُ اللهُ گوتوویەتی: تەنها لەو حاڵەتە سوێندی ئەو کەسانەی پەشیمان بوونەتەوە لە سوێندخواردن دەگەڕێندرێتەوە سەر ئەو کەسانەی ماونەتەوە، کاتێ کەسێك نکوڵی بکات کە لێخۆشبوونی بەدەست نییە، جا ئەگەر یەکێك لە خاوەنی خوێنەکە لەوانەی لێخۆشبوونیان بۆ هەیە لە خوێنەکە نکوڵی کرد، هەرچەندە یەك کەسیش بێت، ئەوە سوێندخواردنەکە ناگەڕێندرێتەوە بۆ ئەوانەی ماونەتەوە لە خاوەنی خوێنەکە، کاتێ یەکێك لە نزیکەکان نکوڵی لە سوێندخواردن دەکات، بەڵکوو ئەگەر ئەوە ڕووی دا سوێندەکە دەگەڕێندرێتەوە

بۆ سەر ئەو کەسانەی دەعوا و سکاڵایان لەسەرە، جا پەنجا کەس لەوان پەنجا سوێند دەخۆن، جا ئەگەر نەگەیشتن بە پەنجا کەس، ئەوە سوێندە زیادەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ ئەوانەی سوێند دەخۆن، جا ئەگەر کەس نەبوو تەنها ئەو کەسە نەبێت کە تۆمەتەکەی ئاڕاستە کراوە، ئەوە ئەو بەتەنها پەنجا سوێندەکە دەخوات و بەری دەبێت.

**٢٥٧٨- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَإِنَّمَا فُرِقَ بَيْنَ الْقَسَامَةِ فِي الدَّمِ وَالأَيْمَانِ فِي الْحُقُوقِ، أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا دَايَنَ الرَّجُلَ اسْتَثْبَتَ عَلَيْهِ فِي حَقِّهِ، وَأَنَّ الرَّجُلَ إِذَا أَرَادَ قَتْلَ الرَّجُلِ لَمْ يَقْتُلْهُ فِي جَمَاعَةٍ مِنَ النَّاسِ، وَإِنَّمَا يَلْتَمِسُ الْخَلْوَةَ، قَالَ: فَلَوْ لَمْ تَكُنِ الْقَسَامَةُ إِلاَّ فِيمَا تَثْبُتُ فِيهِ الْبَيِّنَةُ، وَلَوْ عُمِلَ فِيهَا كَمَا يُعْمَلُ فِي الْحُقُوقِ هَلَكَتِ الدِّمَاءُ، وَاجْتَرَأَ النَّاسُ عَلَيْهَا إِذَا عَرَفُوا الْقَضَاءَ فِيهَا، وَلَكِنْ إِنَّمَا جُعِلَتِ الْقَسَامَةُ إِلَى وُلاَةِ الْمَقْتُولِ، يُبَدَّؤُونَ بِهَا فِيهَا، لِيَكُفَّ النَّاسُ عَنِ الدَّمِ، وَلِيَحْذَرَ الْقَاتِلُ أَنْ يُؤْخَذَ فِي مِثْلِ ذَلِكَ بِقَوْلِ الْمَقْتُولِ[١].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: جیاوازی خراوەتە نێوان سوێندخواردن لە کوشتندا و سوێندخواردن لە حەق و مافەکاندا، بەوەی کاتێ کەسێك قەرز دەدات بە یەکێك بەڵگە دروست دەکات لەسەری بۆ مافەکەی (بەڵگەکە ئەوەیە شاهێدی دەگرێت، ڕەهن وەردەگرێت)، وە کاتێ کەسێك دەیەوێت کەسێك بکوژێت خۆ لەناو کۆمەڵی خەڵکی نایکوژێت، بەڵکوو بەدوای چۆڵیدا دەگەڕێ (کەس چاوی دیار نەبێ)، گوتوویەتی: جا ئەگەر سوێندخواردن نەبووایە تەنها لەو شتانەدا هەبووایە کە بە بەڵگە و شاهێد سابیت دەبن، جا چۆن کار دەکرێت دەربارەی مافەکانی دیکە ئاواش بکرایە بۆ بابەتی کوشتن، ئەوە خوێن بەفیڕۆ دەچوو و خەڵك هێرشی دەکردە سەر خوێن ئەگەر بیانزانیایە بڕیار بەو شێوەیە (خواردنی پەنجا سوێندی تیا نەبووایە)، بەڵام سوێندخواردن بۆ خاوەنی کوژراوەکە داندراوە، سەرەتا ئەوان دەست بە سوێندخواردن دەکەن، تا خەڵك دەست هەڵبگرن لە خوێنی یەکدی و بکوژیش بترسێت لەوەی بکوژرێتەوە بە قسەی خاوەنی کوژراوەکە لە بابەتی کوشتندا.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥٩ في القسامة، عن مالك به.

**٢٥٧٩- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَقَدْ قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْقَوْمِ يَكُونُ لَهُمُ الْعَدَدُ يُتَّهَمُونَ بِالدَّمِ فَيَرُدُّ وُلاَةُ الْمَقْتُولِ الأَيْمَانَ عَلَيْهِمْ، وَهُمْ نَفَرٌ لَهُمْ عَدَدٌ، أَنَّهُ يَحْلِفُ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ عَنْ نَفْسِهِ خَمْسِينَ يَمِينًا، وَلاَ تُقْطَعُ الأَيْمَانُ عَلَيْهِمْ بِقَدْرِ عَدَدِهِمْ، وَلاَ يَبْرَؤُونَ دُونَ أَنْ يَحْلِفَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ عَنْ نَفْسِهِ خَمْسِينَ يَمِينًا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ[١].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی خەڵكانێك كە چەند كەسێكن تۆمەتبار دەكرێن بە خوێن (بە كوشتن)، جا خاوەنی كوژراوەكە سوێندەكان دەگەڕێننەوە بۆ تۆمەتباركراوەكان، لە كاتێكدا چەند كەسێكن، گوتوویەتی: هەر یەكێك لەوان پەنجا سوێند دەربارەی خۆی دەخوات، سوێندەكانیان لەسەر ناپچڕێنرێت بەئەندازەی ژمارەیان و بەری نابن بێئەوەی هەر یەكێكیان پەنجا سوێندی خۆی بخوات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو بابەتە.

**٢٥٨٠- [فتوى]** قَالَ: وَالْقَسَامَةُ تَصِيرُ إِلَى عَصَبَةِ الْمَقْتُولِ، وَهُمْ وُلاَةُ الدَّمِ، الَّذِينَ يَقْسِمُونَ عَلَيْهِ، وَالَّذِينَ يُقْتَلُ بِقَسَامَتِهِمْ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: سوێندخواردن بۆ خزمانی پشتێی كوژراوەكە دەچێت، ئەوان خاوەنی خوێنەكەن، ئەوانەن كە سوێندی لەسەر دەخۆن و هەر ئەوانیشن بە سوێندخواردنیان كوشتن ئەنجام دەدرێت (لە بەرانبەرەكەیان).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٦ في القسامة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٠ في القسامة، عن مالك به.

## ٢- ئەو کەسەی سوێندخواردنی بۆ دروستە لە وەلییەکانی کوژراوەکە لە کوشتنی بەئەنقەستدا[١]

**٢٥٨١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، أَنَّهُ لاَ يَحْلِفُ فِي الْقَسَامَةِ فِي الْعَمْدِ أَحَدٌ مِنَ النِّسَاءِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لِلْمَقْتُولِ وُلاَةٌ إِلاَّ النِّسَاءُ، فَلَيْسَ لِلنِّسَاءِ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ قَسَامَةٌ وَلاَ عَفْوٌ[٢].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە (ئەوەیە): هیچ ئافرەتێك لە سوێندخواردنی کوشتنی بەئەنقەستدا سوێند ناخوات، هەرچەندە کوژراوەکە وەلی و خاوەنی خوێنی نەبێت جگە لە ئافرەت، چونکە ئافرەت لە کوشتنی بەئەنقەست سوێندخواردن و لێخۆشبوونیان لەدەست نییە.

**٢٥٨٢- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يُقْتَلُ عَمْدًا: أَنَّهُ إِذَا قَامَ عَصَبَةُ الْمَقْتُولِ أَوْ مَوَالِيهِ، فَقَالُوا: نَحْنُ نَحْلِفُ وَنَسْتَحِقُّ دَمَ صَاحِبِنَا، فَذَلِكَ لَهُمْ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ أَرَادَ النِّسَاءُ أَنْ يَعْفُونَ عَنْهُ، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُنَّ الْعَصَبَةُ وَالْمَوَالِي أَوْلَى بِذَلِكَ مِنْهُنَّ، لأَنَّهُمْ هُمِ الَّذِينَ اسْتَحَقُّوا الدَّمَ وَحَلَفُوا عَلَيْهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ عَفَتِ الْعَصَبَةُ أَوِ الْمَوَالِي بَعْدَ أَنْ يَسْتَحِقُّوا الدَّمَ وَأَبَى النِّسَاءُ، وَقُلْنَ: لاَ نَدَعُ قَاتِلَ صَاحِبِنَا، فَهُنَّ أَحَقُّ وَأَوْلَى بِذَلِكَ، لأَنَّ مَنْ أَخَذَ الْقَوَدَ، أَحَقُّ مِمَّنْ تَرَكَهُ مِنَ النِّسَاءِ، وَالْعَصَبَةِ إِذَا ثَبَتَ الدَّمُ وَوَجَبَ الْقَتْلُ[٣].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی بەئەنقەست دەکوژرێت، گوتوویەتی: ئەگەر عەصەبەی کوژراو یان ئازادکەرەکانی هەڵسان و گوتیان: ئێمە سوێند دەخۆین و خوێنی خزمەکەمان وەردەگرینەوە، ئەوەیان بۆ هەیە.

---

(١) ـ مَنْ تَجُوزُ قَسَامَتُهُ فِي الْعَمْدِ مِنْ وُلاَةِ الدَّمِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦١ في القسامة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٢ في القسامة، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتان ویستیان لێی خۆش بن، ئەوە ئافرەتان ئەوەیان بۆ نییە، عەصەبە و ئازادکەرەکانی شایستەترن بەوە لە ئافرەتان، چونکە ئەوان شایستەی وەرگرتنی خوێنەکەن و ئەوان سوێندیان لەسەر خواردووە.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: وە ئەگەر هاتوو عەصەبە یان ئازادکەرەکان لێخۆشبوونیان دەرکرد دوای ئەوەی بوونە خاوەنی خوێنەکە و ئافرەتەکان ڕازی نەبوون و گوتیان: بکوژی خزمەکەمان واز لێ ناهێنین، (ئەو کات) ئافرەتەکان شایستەترن بەوە، چونکە ئەوەی تۆڵەسەندنەوە وەربگرێت شایستەترە لەوەی وازی لێ دێنێت لە ئافرەتان و عەصەبەکان کاتێ خوێنەکە دەچەسپێ و کوشتنەوە واجب دەبێت.

**٢٥٨٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ يُقْسِمُ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ مِنَ الْمُدَّعِينَ إِلاَّ اثْنَانِ فَصَاعِدًا، تُرَدَّدُ الأَيْمَانُ عَلَيْهِمَا حَتَّى يَحْلِفَا خَمْسِينَ يَمِينًا، ثُمَّ قَدِ اسْتَحَقَّا الدَّمَ، وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لە کوشتنی بەئەنقەستدا ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بەرانبەرەکەیان خزمەکەی ئەوانی بەئەنقەست کوشتووە حەتمەن دەبێ دوو کەس یان زیاتر بن سوێند بخۆن، سوێندەکە لە نێوان ئەو دووانە (یان زیاتر لەو دووانە) دێت و دەچێت تاوەکوو پەنجا سوێند دەخۆن، دواتر دەبنە خاوەنی خوێنەکە، بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە (واتە نابێ یەك کەس بێت، بەڵکوو دەبێ بەلانی کەم دوو کەس بن).

**٢٥٨٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَإِذَا ضَرَبَ النَّفَرُ الرَّجُلَ حَتَّى يَمُوتَ تَحْتَ أَيْدِيهِمْ، قُتِلُوا بِهِ جَمِيعًا، فَإِنْ هُوَ مَاتَ بَعْدَ ضَرْبِهِمْ كَانَتِ الْقَسَامَةُ، وَإِذَا كَانَتِ الْقَسَامَةُ لَمْ تَكُنْ إِلاَّ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ، وَلَمْ يُقْتَلْ غَيْرُهُ، وَلَمْ نَعْلَمْ قَسَامَةً كَانَتْ قَطُّ إِلاَّ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەگەر چەند کەسێك لە پیاوێکیان دا تا لەژێر دەستیان مرد، هەموویان بەهۆیەوە دەکوژرێنەوە، جا ئەگەر دوای

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٣ في القسامة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٤ في القسامة، عن مالك به.

لێدانەکەیان مرد، ئەوە سوێندخواردن دێتە ئاراوە، جا ئەگەر سوێندخواردنەکە هاتە ئاراوە دەبێ تەنها لەسەر یەك کەس بێ (یەك کەس بە بکوژ دیاری بکرێ) و کەسی دیکە ناکوژرێت، وە هەرگیز هیچ سوێندخواردنێکمان نەزانیوە تەنها لەسەر یەك کەس نەبێت.

## ٣- سوێندخواردن دەربارەی کوشتنی بەهەڵە[1]

**٢٥٨٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الْقَسَامَةُ فِي قَتْلِ الْخَطَإِ، يُقْسِمُ الَّذِينَ يَدَّعُونَ الدَّمَ، وَيَسْتَحِقُّونَهُ بِقَسَامَتِهِمْ، يَحْلِفُونَ خَمْسِينَ يَمِينًا، تَكُونُ عَلَى قَسْمِ مَوَارِيثِهِمْ مِنَ الدِّيَةِ، فَإِنْ كَانَ فِي الأَيْمَانِ كُسُورٌ إِذَا قُسِمَتْ بَيْنَهُمْ، نُظِرَ إِلَى الَّذِي يَكُونُ عَلَيْهِ أَكْثَرُ تِلْكَ الأَيْمَانِ إِذَا قُسِمَتْ، فَتُجْبَرُ عَلَيْهِ تِلْكَ الْيَمِينُ[2].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لِلْمَقْتُولِ وَرَثَةٌ إِلاَّ النِّسَاءُ، فَإِنَّهُنَّ يَحْلِفْنَ وَيَأْخُذْنَ الدِّيَةَ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَارِثٌ إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ، حَلَفَ خَمْسِينَ يَمِينًا، وَأَخَذَ الدِّيَةَ، وَإِنَّمَا يَكُونُ ذَلِكَ فِي قَتْلِ الْخَطَإِ، وَلاَ يَكُونُ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ.

(فەتوا)واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی سوێندخواردنی کوشتنی بەهەڵە گوتوویەتی: ئەو کەسانەی داوای خوێن دەکەن و دەبنە خاوەنی بەهۆی سوێندخواردنیانەوە، دەبێ پەنجا سوێند بخۆن (پشکی سوێندەکان) بەگوێرەی پشکی میراتەکەیانە لە خوێنباییەکە، جا ئەگەر باقی مایەوە لە سوێندەکەدا کاتێ لە نێوانیان بەش کرا، سەیری ئەو کەسە دەکرێت کە زۆرترین سوێندی لەسەرە کاتێ دابەش دەکرێت، جا سوێندەکە بەو پڕ دەکرێتەوە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر کوژراوەکە هیچ میراتگرێکی نەبوو جگە لە ئافرەت، ئەوە ئەوان سوێندەکە دەخۆن و خوێنباییەکە وەردەگرن، جا ئەگەر هیچ میراتگرێکی نەبوو تەنها یەك پیاو نەبێ، ئەوە ئەو پەنجا سوێندەکە دەخوات

---

(١) ـ الْقَسَامَةُ فِي قَتْلِ الْخَطَإِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٥ في القسامة، عن مالك به.

و خوێنباییەکە وەردەگرێ، جا ئەوە تەنها لە کوشتنی بەهەڵە دەبێت، لە کوشتنی بەئەنقەستدا نابێت (چونکە لە کوشتنی بەئەنقەستدا دەبێ بەلانی کەم دوو کەس سوێند بخۆن).

## ٤- میرات لە قەسامە و سوێندخواردنی کوشتندا[١]

٢٥٨٦- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀: إِذَا قَبِلَ وُلاَةُ الدَّمِ الدِّيَةَ، فَهِيَ مَوْرُوثَةٌ عَلَى كِتَابِ اللهِ، يَرِثُهَا بَنَاتُ الْمَيِّتِ وَأَخَوَاتُهُ، وَمَنْ يَرِثُهُ مِنَ النِّسَاءِ، فَإِنْ لَمْ يُحْرِزِ النِّسَاءُ مِيرَاثَهُ، كَانَ مَا بَقِيَ مِنْ دِيَتِهِ لأَوْلَى النَّاسِ بِمِيرَاثِهِ مَعَ النِّسَاءِ[٢].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەگەر خاوەنی خوێنەکە بە خوێنبایی ڕازی بوون، ئەوە دەبێتە میرات بەپێی پەرتووکی خوای پەروەردگار، کچەکانی مردووەکە و خوشکەکانی و ئەوانەی میراتی لێ دەگرن لە ئافرەتان بە میرات خوێنباییەکە وەردەگرن، جا ئەگەر ئافرەتەکان گشت ماڵەکەیان بە میرات نەبرد (هەندێك مایەوە)، ئەوە چەندەی دەمێنێتەوە لە خوێنباییەکەی بۆ نزیکترین کەسە (لە پیاوانی عەصەبە) ئەو لەگەڵ ئافرەتەکان میراتەکە دەبات.

٢٥٨٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: إِذَا قَامَ بَعْضُ وَرَثَةِ الْمَقْتُولِ الَّذِي يُقْتَلُ خَطَأً، يُرِيدُ أَنْ يَأْخُذَ مِنَ الدِّيَةِ بِقَدْرِ حَقِّهِ مِنْهَا، وَأَصْحَابُهُ غَيَبٌ لَمْ يَأْخُذْ ذَلِكَ، وَلَمْ يَسْتَحِقَّ مِنَ الدِّيَةِ شَيْئًا، قَلَّ وَلاَ كَثُرَ، دُونَ أَنْ يَسْتَكْمِلَ الْقَسَامَةَ، يَحْلِفُ خَمْسِينَ يَمِينًا، فَإِذَا حَلَفَ خَمْسِينَ يَمِينًا، اسْتَحَقَّ حِصَّتَهُ مِنَ الدِّيَةِ، وَذَلِكَ أَنَّ الدَّمَ لاَ يَثْبُتُ إِلاَّ بِخَمْسِينَ يَمِينًا، وَلاَ تَثْبُتُ الدِّيَةُ حَتَّى يَثْبُتَ الدَّمُ، فَإِنْ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنَ الْوَرَثَةِ أَحَدٌ، حَلَفَ مِنَ الْخَمْسِينَ يَمِينًا بِقَدْرِ مِيرَاثِهِ، وَأَخَذَ حَقَّهُ حَتَّى يَسْتَكْمِلَ الْوَرَثَةُ حُقُوقَهُمْ، إِنْ جَاءَ أَخٌ لأُمٍّ، فَلَهُ السُّدُسُ، وَعَلَيْهِ مِنَ الْخَمْسِينَ يَمِينًا السُّدُسُ، فَمَنْ حَلَفَ اسْتَحَقَّ حَقَّهُ مِنَ الدِّيَةِ، وَمَنْ نَكَلَ بَطَلَ حَقُّهُ، وَإِنْ كَانَ بَعْضُ الْوَرَثَةِ غَائِبًا أَوْ صَبِيًّا لَمْ يَبْلُغْ

---

(١) ـ الْمِيرَاثُ فِي الْقَسَامَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٧ في القسامة، عن مالك به.

الْحُلُمَ، حَلَفَ الَّذِينَ حَضَرُوا خَمْسِينَ يَمِينًا، فَإِنْ جَاءَ الْغَائِبُ بَعْدَ ذَلِكَ حَلَفَ، أَوْ بَلَغَ الصَّبِيُّ الْحُلُمَ حَلَفَ، يَحْلِفُونَ عَلَى قَدْرِ حُقُوقِهِمْ مِنَ الدِّيَةِ، وَعَلَى قَدْرِ مَوَارِيثِهِمْ مِنْهَا.

قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر یەکێك لە میراتگرانی کوژراوەکە کە بەهەڵە کوژراوە ویستی بەگوێرەی مافی خۆی لە خوێنباییەکە ببات لە کاتێکدا میراتگرەکانی دیکە غائیبن و لەوێ نین، ئەوە نایبات و شایستەی هیچ لە خوێنباییەکە نابێت (جا پشکەکەی) کەم بێت یان زۆر بێت، بێئەوەی سوێندخواردنەکە تەواو بکات و پەنجا سوێند بخوات، جا ئەگەر پەنجا سوێندی خوارد ئەوە دەبێتە خاوەنی پشکەکەی خۆی لە خوێنباییەکە، (ئەوەش) لەبەر ئەوەیە خوێن دانامەزرێت تەنها بە پەنجا سوێند نەبێت، وە خوێنباییش دانامەزرێت تاوەکوو خوێنەکە دانەمەزرێت و یەکلایی نەبێتەوە، جا ئەگەر دوای ئەوە یەکێکی دیکە لە میراتگران هات، دەبێ بەگوێرەی پشکی میراتی خۆی لە پەنجا سوێندەکە بخوات و مافی خۆی وەربگرێت، (ئا بەم شێوەیە) تا میراتگران گشتیان مافی خۆیان وەردەگرن، (بۆ نموونە) ئەگەر برای لە دایك هات، ئەوە شەشیەکی بۆ هەیە و شەشیەکی سوێندخواردنەکەشی لەسەرە، جا هەر کەسێك سوێند بخوات مافی خۆی وەردەگرێت لە خوێنباییەکەدا، هەر کەسێکیش نکوڵی بکات و سوێند نەخوات مافەکەی نامێنێت، جا ئەگەر یەکێ لە میراتگران غائیب بوو یان مناڵ بوو، ئەوە ئەوانەی ئامادەن سوێند دەخۆن، جا غائیبەکە ئەگەر هات دوای ئەوە سوێند دەخوات، یان مناڵەکە کەی بلوغی بوو ئەو کات سوێند دەخوات، (گشتیان) سوێند دەخۆن بەگوێرەی مافی خۆیان لە خوێنباییەکە و بەگوێرەی میراتەکەیان لە خوێنباییەکە.

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەبوو کە گوێبیستی بووم (لەو بارەیەوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٨ في القسامة، عن مالك به.

## ٥- قەسامە (سوێندخواردنی كوشتن) دەربارەی كۆیلە[١]

٢٥٨٨- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْعَبِيدِ: أَنَّهُ إِذَا أُصِيبَ الْعَبْدُ عَمْدًا أَوْ خَطَأً، ثُمَّ جَاءَ سَيِّدُهُ بِشَاهِدٍ، حَلَفَ مَعَ شَاهِدِهِ يَمِينًا وَاحِدَةً، ثُمَّ كَانَ لَهُ قِيمَةُ عَبْدِهِ، وَلَيْسَ فِي الْعَبِيدِ قَسَامَةٌ فِي عَمْدٍ وَلاَ خَطَإٍ، وَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ قَالَ ذَلِكَ[٢].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی كۆیلەكان: ئەگەر كۆیلەیەك بكوژرێت بەئەنقەست یان بەهەڵە، دواتر گەورەكەی شاهێدێك بهێنێت و لەگەڵ شاهێدەكە یەك سوێند بخوات، ئەوە قیمەتی كۆیلەكەی خۆی بۆ هەیە، جا قەسامە (سوێندخواردنی كوشتن كە بریتییە لە پەنجا سوێند) دەربارەی كۆیلە نە لە كوشتنی ئەنقەست و نە لە كوشتنی هەڵە ناخورێت، لە هیچ كەسێكی خاوەن زانستم نەبیستووە ئەوەی وتبێت (واتە وتبێتی قەسامە دەربارەی كۆیلەش هەیە).

٢٥٨٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ قَتَلَ الْعَبْدُ عَبْدًا عَمْدًا أَوْ خَطَأً، لَمْ يَكُنْ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ الْمَقْتُولِ قَسَامَةٌ وَلاَ يَمِينٌ، وَلاَ يَسْتَحِقُّ سَيِّدُهُ ذَلِكَ، إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ عَادِلَةٍ، أَوْ بِشَاهِدٍ فَيَحْلِفُ مَعَ شَاهِدِهِ.

قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر كۆیلەیەك كۆیلەیەكی دیكەی بەئەنقەست یان بەهەڵە كوشت، ئەوە گەورەی كۆیلە كوژراوەكە قەسامە و سوێندخواردنی لەسەر نییە و گەورەكەی نرخی كۆیلەكەی وەرناگرێت تەنها بە دوو شاهێدی عادیل نەبێت، یان بە شاهێدێك و خۆیشی لەگەڵ شاهێدەكە سوێندێك بخوات (بەو جۆرە دەتوانێت نرخی كۆیلەكەی وەربگرێتەوە).

---

(١) ـ الْقَسَامَةُ فِي الْعَبِيدِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦٩ في القسامة، عن مالك به.

یەحیا ﷬ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم (لەو بارەیەوە).

## ١- نزا بۆ مەدینە و خەڵکەکەی[١]

**٢٥٩٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اللهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مِكْيَالِهِمْ، وَبَارِكْ لَهُمْ فِي صَاعِهِمْ وَمُدِّهِمْ، يَعْنِي أَهْلَ الْمَدِينَةِ[٢].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ, گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارا بەرەکەت بخەیتە پێوانەکەیان، هەروەها بەرەکەت بخەیتە صاعیان و مودیان (کە ناوی دوو جۆر لە پێوانەن)، واتە صاع و مودی مەدینە (نزای بۆ کێشان و پێوانیان کردووە).

**٢٥٩١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ النَّاسُ إِذَا رَأَوْا أَوَّلَ الثَّمَرِ، جَاؤُوا بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَإِذَا أَخَذَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثَمَرِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مُدِّنَا، اللهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ عَبْدُكَ وَخَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنِّي عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنَّهُ دَعَاكَ لِمَكَّةَ، وَإِنِّي أَدْعُوكَ لِلْمَدِينَةِ بِمِثْلِ مَا دَعَاكَ بِهِ لِمَكَّةَ، وَمِثْلَهُ مَعَهُ، ثُمَّ يَدْعُو أَصْغَرَ وَلِيدٍ يَرَاهُ، فَيُعْطِيهِ ذَلِكَ الثَّمَرَ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ, گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەموو جار خەڵکی کاتێ یەکەم بەروبوومیساڵیان ببینیایە دەیانهێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەریدەگرت دەیفەرموو: پەروەردگارا فەڕ وبەرەکەت بخەیتە بەروبوومەکەمان و فەڕ وبەرەکەت بخەیتە ناو شارەکەمان و فەڕ وبەرەکەت بخەیتە ناو صاعەکەمان و فەڕ وبەرەکەت بخەیتە مودەکەمان (واتە بەرەکەت بخەیتە کێشان و پێوانمان)، پەروەردگارا ئیبڕاهیم بەندە و خۆشەویست و پێغەمبەری تۆ بوو، منیش بەندە و پێغەمبەری تۆمە، ئەو بۆ مەککە داوای لێ کردی (تا بەرەکەتی

---

(١) ـ الدُّعَاءُ لِلْمَدِينَةِ وَأَهْلِهَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٥ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٣١ في المناسك؛ والبخاري: ٢١٣٠ في البيوع، وفي: ٦٧١٤ في كفارات، وفي: ٧٣٣١ في الاعتصام؛ ومسلم: المناسك: ٤٦٥؛ وابن حبان: ٣٧٤٥؛ والدارمي: ٢٥٧٥ في البيوع؛ والقابسي: ١٢٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٦ في الجامع؛ ومسلم: المناسك: ٤٧٣؛ والترمذي، ٣٤٥٤ في الدعوات؛ وابن حبان: ٣٧٤٧؛ والقابسي: ٤٤٧، كلهم عن مالك به.

تێ بخەیت)، منیش بۆ مەدینە داوات لێ دەكەم بە هەمان ئەو داوایەی لێی كردی بۆ مەككە و هی دیكەش، دواتر بانگی بچووكترین مناڵی دەكرد كە ببینیایە لەوێ ئامادەیە، جا بەروبووم و میوەكەی دەدا بەو.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی نیشتەجێبوون لە مەدینە و چوونەدەرەوە لێی[1]

**٢٥٩٢**- عَنْ قَطَنِ بْنِ وَهْبِ بْنِ عُوَيْمِرِ بْنِ الأَجْدَعِ ﷺ، أَنَّ يُحَنِّسَ، مَوْلَى الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا عِنْدَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ فِي الْفِتْنَةِ، فَأَتَتْهُ مَوْلَاةٌ لَهُ تُسَلِّمُ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَرَدْتُ الْخُرُوجَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، اشْتَدَّ عَلَيْنَا الزَّمَانُ، فَقَالَ لَهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: اقْعُدِي لَكَاعُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَصْبِرُ عَلَى لأْوَائِهَا وَشِدَّتِهَا أَحَدٌ، إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَفِيعًا أَوْ شَهِيدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ[2].

واتە: لە قەتەنی كوڕی عوەیمیری كوڕی ئەجدەعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): یوخەنەسی خزمەتكاری زوبەیری كوڕی عەوام هەواڵی پێ داوم بەوەی لەلای عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دانیشتووە لە كاتی فیتنە (لە سەردەمی یەزیدی كوڕی موعاویە)، جا ئافرەتێكی خزمەتكاری عەبدوڵڵا هات و سەلامی لێكرد و گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان من دەمەوێ (لە مەدینە) بچمە دەرەوە و بڕۆم زەمان خراپ بووە، عەبدوڵڵای كوڕی عومەریش ﷺ پێی گوت: دانیشە نەزان، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: هەر كەسێك ئارام بگرێت لەسەر بێحاڵی و برسییەتی مەدینە حەتمەن بۆی دەبم بە تكاكار و شاهێد لە ڕۆژی دواییدا.

**٢٥٩٣**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى رَسُولُ اللهِ

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي سُكْنَى الْمَدِينَةِ وَالْخُرُوجِ مِنْهَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٧ في الجامع؛ وابن حنبل: ٥٩٣٥، وفي: ٦٠٠١؛ ومسلم: المناسك: ٤٨٢؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٧٩٠ عن طريق؛ والقابسي: ٤٠٦، كلهم عن مالك به.




ﷺ، ثُمَّ جَاءَهُ، فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ، فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طِيبُهَا[1].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێکی دەشتەکی بەیعەت و پەیمانی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیسلامەتی، جا دەشتەکییەکە تووشی تا بوو، جا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتەکەم لەسەر هەڵگرە (واز لە هیجرەت دێنم و لە مەدینە دەڕۆم لێرە تەحەمول ناکەم)، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕەتی کردەوە، دواتر (جارێکی دیکە) هاتەوە لای و گوتی: بەیعەتەکەم لەسەر هەڵگرە، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕەتی کردەوە، دواتر (بۆ جاری سێیەم) هاتەوە لای و گوتی: بەیعەتەکەم لەسەر هەڵگرە، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕەتی کردەوە، جا دەشتەکییەکە (بە قسەی پێغەمبەری خوای ﷺ نەکرد و) لە مەدینە چووە دەرەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مەدینە وەك کوورە وایە، پیسی و خەوش لادەبات و چاك و پاڵفتەکە دەهێڵێتەوە.

**٢٥٩٤**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْحُبَابِ سَعِيدَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: أُمِرْتُ بِقَرْيَةٍ تَأْكُلُ الْقُرَى، يَقُولُونَ: يَثْرِبُ، وَهِيَ الْمَدِينَةُ، تَنْفِي النَّاسَ كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ[2].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو حوباب سەعیدی کوڕی یەسار ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: فەرمانم پێ کرا (کۆچ بکەم) بۆ شارێك گشت شارێك دەخوات (واتە بەسەر گشت شارێکدا زاڵە بە پاداشت)، هەندێك خەڵك ناوی دێنن بە «یثرب»، ئەو شارە بریتییە لە مەدینە، خەڵکی خراپ لە ناوەخۆی دەردەکات وەك چۆن کوورە پیسایی و خەوشی ئاسن لادەبات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٨ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩١ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٤٣٢٣؛ والبخاري: ٧٢٠٩ في الأحكام، وفي: ٧٢١١ في الأحكام، وفي: ٧٣٢٢ في الاعتصام؛ ومسلم: المناسك: ٤٨٩؛ والنسائي: ٤١٨٥ في البيعة؛ والترمذي: ٣٩٢٠ في المناقب؛ وابن حبان: ٣٧٣٢، وفي: ٣٧٣٥؛ والقابسي: ٨٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤٩ في الجامع؛ وابن حنبل: ٧٢٣١؛ والبخاري: ١٨٧١ في فضائل المدينة؛ ومسلم: المناسك: ٤٨٨؛ وابن حبان: ٣٧٢٣؛ والقابسي: ٥١١، كلهم عن مالك به.





**٢٥٩٥- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَخْرُجُ أَحَدٌ مِنَ الْمَدِينَةِ رَغْبَةً عَنْهَا، إِلاَّ أَبْدَلَهَا اللهُ خَيْرًا مِنْهُ[١].**

واتە: لە هیشامی كوڕی عوڕوەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لە مەدینە بچێتە دەرەوە پشت لە پاداشتەكەی بكات (مەدینەی لا گرنگ نەبێت)، حەتمەن خوای پەروەردگار كەسی چاكتر لە شوێنی ئەو دادەنێت.

**٢٥٩٦- عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: تُفْتَحُ الْيَمَنُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، وَتُفْتَحُ الشَّامُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبِسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، وَتُفْتَحُ الْعِرَاقُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبِسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ[٢].**

واتە: لە سوفیانی كوڕی ئەبو زوهەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: یەمەن ئازاد دەكرێت و خەڵكانێك دێن (بۆ مەدینە، دواتر نامێنن) دەڕۆن، خانەوادە و ئەوانەشی كە گوێڕایەڵییان دەكەن دەیانبەن و دەڕۆن، لە كاتێكدا مەدینە چاكترە بۆیان ئەگەر بزانن، وە شام ئازاد دەكرێت و خەڵكانێك دێن (بۆ مەدینە، دواتر نامێنن) دەڕۆن، خانەوادە و ئەوانەشی كە گوێڕایەڵییان دەكەن دەیانبەن و دەڕۆن، لە كاتێكدا مەدینە چاكترە بۆیان ئەگەر بزانن، وە عێراق ئازاد دەكرێت و خەڵكانێك دێن (بۆ مەدینە، دواتر نامێنن) دەڕۆن، خانەوادە و ئەوانەشی كە گوێڕایەڵییان دەكەن دەیانبەن و دەڕۆن، لە كاتێكدا مەدینە چاكترە بۆیان ئەگەر بزانن.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٠ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥١ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢١٩٦٦؛ والبخاري: ١٨٧٥ في فضائل المدينة؛ وابن حبان: ٦٦٧٣؛ والقابسي: ٤٧٩، كلهم عن مالك به.

**٢٥٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَتُتْرَكَنَّ الْمَدِينَةُ عَلَى أَحْسَنِ مَا كَانَتْ، حَتَّى يَدْخُلَ الْكَلْبُ أَوِ الذِّئْبُ، فَيُغَذِّي عَلَى بَعْضِ سَوَارِي الْمَسْجِدِ أَوْ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَلِمَنْ تَكُونُ الثِّمَارُ ذَلِكَ الزَّمَانَ؟ قَالَ: لِلْعَوَافِي: الطَّيْرِ وَالسِّبَاعِ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (زەمانێك دادێت) مەدینە بە چاكترین حاڵ جێ دەهێڵن و چۆڵی دەكەن (لە كاتێكدا پڕە لە بەهرە و خێروبێر)، تا وای لێ دێت سەگ ـ یان گورگ ـ دەچێتە ناویەوە و میز دەكات بە هەندێك لە دینگەكانی مزگەوت یان لەسەر مینبەر، جا (هاوەڵان) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بەروبوومەكە بۆ كێیە لەو سەردەمدا؟ فەرمووی: بۆ باڵندە و ئاژەڵ.

**٢٥٩٨-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ حِينَ خَرَجَ مِنَ الْمَدِينَةِ الْتَفَتَ إِلَيْهَا فَبَكَى، ثُمَّ قَالَ: يَا مُزَاحِمُ، أَتَخْشَى أَنْ تَكُونَ مِمَّنْ نَفَتِ الْمَدِينَةُ؟[2].

واتە: عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﵀ كاتێ لە مەدینە چووە دەرەوە، ئاوڕی لێ دایەوە و گریا، دواتر گوتی: ئەی موزاحیم (كە خزمەتكاری خۆی بوو) ئایا دەترسی لەوەی لەو كەسانە بی كە مەدینە دووریان دەخاتەوە؟

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی حەرامكردنی (ڕاو و نێچیر لە) مەدینە[3]

**٢٥٩٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ طَلَعَ لَهُ أُحُدٌ، فَقَالَ: هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، اللهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ، وَإِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا[4].

---

(١) ـ صحيح ما عدا جملة الكلب. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٢ في الجامع؛ وابن حبان: ٦٧٧٣؛ والقابسي: ٥١٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٣ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٣٦أ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي تَحْرِيمِ الْمَدِينَةِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٤ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٢٥٣٢؛ والبخاري: ٣٣٦٧ في الأنبياء، وفي: ٤٠٨٤ في المغازي، وفي: ٧٣٣٣ في الاعتصام؛ والترمذي: ٣٩٢٢ في المناقب؛ وأبو يعلى الموصلي: ٣٧٠٢؛ والقابسي: ٤٠٣، كلهم عن مالك.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ چیای ئوحودی لێ دەركەوت و فەرمووی: ئەوە چیایێكە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێ، پەروەردگارا ئیبڕاهیم ﷺ مەككەی كرد بە حەڕەم، منیش نێوانی دوو خاكە بەردەڵانە ڕەشەكەی مەدینە دەكەم بە حەڕەم (بەوەی حەڕام بێت نێچیری لێ ڕاو بكرێت و دەبێ حورمەتی بگیرێت).

**٢٦٠٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لَوْ رَأَيْتُ الظِّبَاءَ بِالْمَدِينَةِ تَرْتَعُ مَا ذَعَرْتُهَا، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا حَرَامٌ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئەگەر لە مەدینە ئاسكێك ببینم كە دەلەوەڕێت نایترسێنم و دەری ناكەم (چجای ئەوەی ڕاوی بكەم) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نێوانی دوو خاكە بەردەڵانە ڕەشەكەی مەدینە حەڕەمە (بەوەی حەڕام بێت نێچیری لێ ڕاو بكرێت و دەبێ حورمەتی بگیرێت).

**٢٦٠١**- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ وَجَدَ غِلْمَانًا قَدْ أَلْجَؤُوا ثَعْلَبًا إِلَى زَاوِيَةٍ، فَطَرَدَهُمْ عَنْهُ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَعْلَمُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: أَفِي حَرَمِ رَسُولِ اللهِ ﷺ يُصْنَعُ هَذَا؟[٢].

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كۆمەڵە منداڵێكی بینیوە بەدوای ڕێوییەكەوە بوون لە ناوچەیەكی مەدینە، ئەویش دەریكردن و لەكۆڵی كردنەوە (لەبەر حورمەتی مەدینە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا زانیومە تەنها گوتوویەتی: ئایا لە حەڕەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا دەكرێت؟! (واتە تاكە هۆكار ئەوە بووە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٥ في الجامع؛ وابن حنبل: ٧٢١٧؛ والبخاري: ١٨٧٣ في فضائل المدينة؛ ومسلم: المناسك: ٤٧١؛ والترمذي: ٣٩٢١ في المناقب؛ وابن حبان: ٣٧٥١؛ والمنتقى لابن الجارود: ٥٠٩؛ وشرح معاني الآثار: ٦٣٢٠؛ والقابسي: ١٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٦ في الجامع؛ وشرح معاني الآثار: ٦٣٠٢، عن مالك به.

**٢٦٠٢-** عنْ رَجُلٍ قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ وَأَنَا بِالأَسْوَافِ، وَقَدِ اصْطَدْتُ نُهَسًا، فَأَخَذَهُ مِنْ يَدِي فَأَرْسَلَهُ[1].

واتە: لە پیاوێکەوە گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ هاتە لام لە کاتێکدا من لە ئەسواف بووم (کە شوێنێکە لە مەدینە) و جۆرە چۆلەکەیەکم ڕاو کردبوو، جا لەدەستی وەرگرتم و بەڕەڵای کرد.

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی نەخۆشی مەدینە[2]

**٢٦٠٣-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ، وَبِلَالٌ ﷺ، قَالَتْ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِمَا، فَقُلْتُ: يَا أَبَتِ، كَيْفَ تَجِدُكَ؟ وَيَا بِلَالُ، كَيْفَ تَجِدُكَ؟ قَالَتْ: فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ إِذَا أَخَذَتْهُ الْحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ ... وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ.

وَكَانَ بِلَالٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ، يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ فَيَقُولُ:

أَلَا لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً ... بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ؟.

وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْمًا مِيَاهَ مَجِنَّةٍ ... وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ؟.

قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَجِئْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: اللهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ، أَوْ أَشَدَّ، وَصَحِّحْهَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا، وَانْقُلْ حُمَّاهَا، فَاجْعَلْهَا بِالْجُحْفَةِ[3].

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەدینە، ئەبو بەکر و بیلال ﷺ نەخۆش کەوتن، دەڵێ: چوومە لایان، گوتم: باوکە ئێستا چۆنی؟ ئەدی بیلال تۆ چۆنی؟ دەڵێ: کە ئەبو بەکر ﷺ تای دەهاتێ دەیگوت:

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٧ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي وَبَاءِ الْمَدِينَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥٨ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢٦٢٨٤؛ والبخاري: ٣٩٢٦ في مبعث النبي، وفي: ٥٦٥٤ في المرضى، وفي: ٥٦٧٧ في المرضى؛ وابن حبان: ٣٧٢٤؛ والقابسي: ٤٧٢، كلهم عن مالك به.




هەر مرۆڤێك لە نێو ماڵ و منداڵی بەیانی دەکاتەوە
مـردنیش نزیکترە لێـــی لە قــەیتـانی نەعـلەکانی

وە کاتێك بیلال هۆشی دەهاتەوە، دەنگی خۆی بەرز دەکردەوە و دەیگوت:

ئایا دەبێ تا بەیانی بمێنم و شـەو بەزیندوویی بکەمـــەوە
لە دۆڵی مەککە و ئیزخیر[1](چیای) جەلیلم لە دەورە بـێ
ئــایـــا ڕۆژێ دێ بچـمـــە ســـەر ئاوی مـــەجەننە
وە ئایا چیای شامـــە و طەفیلـــم بـــۆ دەردەکەوێ؟

عائیشە ﵂، دەڵێ: منیش کە هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینیبووم (لە ئەبو بەکر و بیلال) بۆیم باس کرد، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوایە مەدینەمان لەلا خۆشەویست بکە، وەك خۆشەویستیمان بۆ مەککە و زیاتریش، (خوایە مەدینەمان) بۆ باش بکە، وە بەرەکەت بخەرە ناو صاع و مودەکەی (واتە بەرەکەت بخەیتە کێشانە و پێوانەمان)، وە (نەخۆشی) تایەکە بگوازەوە بۆ جوحفە.

**٢٦٠٤-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وحَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: وَكَانَ عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ يَقُولُ:

قَدْ رَأَيْتُ الْمَوْتَ قَبْلَ ذَوْقِهْ ... إِنَّ الْجَبَانَ حَتْفُهُ مِنْ فَوْقِهْ[2].

واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: یەحیای کوڕی سەعید ﵀ بۆی گێڕامەوە گوتی: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: عامری کوڕی فوهەیرە دەیگوت:

مردنم بینی بەر لەوەی کاتی خۆی بێت ... ترسنۆك لەناوچوونی لەسەرەوەیەتی

**٢٦٠٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلاَئِكَةٌ، لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ، وَلاَ الدَّجَّالُ[3].

---

(١)ـ گیایەکی بۆنخۆشی شاری مەککەیە.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٠ في الجامع؛ وابن حنبل: ٧٢٣٣، وفي: ٨٨٦٣؛ والبخاري: ١٨٨٠

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کۆمەڵە فریشتەیەك لەناو دەرگاکانی شاری مەدینەن، تاعون و دەجال ناچنە ناویەوە (لەبەر ئەو فریشتانە ناتوانن بچنە ناویەوە).

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی وەدەرنانی جوولەکەکان لە مەدینە[1]

**٢٦٠٦-** عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَكِيمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ يَقُولُ: كَانَ مِنْ آخِرِ مَا تَكَلَّمَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَنْ قَالَ: قَاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ، لاَ يَبْقَيَنَّ دِينَانِ بِأَرْضِ الْعَرَبِ[2].

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو حەکیمەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوێی لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ بووە دەیگوت: یەکێك لە کۆتایی ئەو قسانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردی ئەوەبوو فەرمووی: خوا ﷻ جوولەکە و گاورەکان لەناو ببات، قەبری پێغەمبەرەکانیان دەکردن بە مزگەوت، نابێ دوو ئایین لە زەوی عەرەب بمێنن (دەبێ تەنها ئایینی ئیسلام سەروەر بێ).

**٢٦٠٧-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَجْتَمِعُ دِينَانِ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: فَفَحَصَ عَنْ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، حَتَّى أَتَاهُ الثَّلْجُ وَالْيَقِينُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَجْتَمِعُ دِينَانِ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، فَأَجْلَى يَهُودَ خَيْبَرَ[3].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو ئایین کۆ نابنەوە لە دوورگەی عەرەبدا.

---

في فضائل المدينة، وفي: ٧١٣٣ في الفتن؛ ومسلم: المناسك: ٤٨٥؛ والقابسي: ٢٧٠، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مَا جَاءَ فِي إِجْلاَءِ الْيَهُودِ مِنَ الْمَدِينَةِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧١ في الجمعة؛ وفي: ١٨٦١ في الجامع؛ والحدثاني: ١٨٤أ في الصلاة؛ والشيباني: ٨٧٤ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٢ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٤١أ في المناسك، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەو بابەتەی کۆڵییەوە تا گوشادی و دڵنیایی پێ گەیشت بەوەی ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو ئایین کۆ نابنەوە لە دوورگەی عەرەب، بۆیە جوولەکەکانی خەیبەری وەدەرنا.

**٢٦٠٨**- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَدْ أَجْلَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَهُودَ نَجْرَانَ وَفَدَكَ، فَأَمَّا يَهُودُ خَيْبَرَ، فَخَرَجُوا مِنْهَا لَيْسَ لَهُمْ مِنَ الثَّمَرِ، وَلاَ مِنَ الأَرْضِ شَيْءٌ، وَأَمَّا يَهُودُ فَدَكَ، فَكَانَ لَهُمْ نِصْفُ الثَّمَرِ، وَنِصْفُ الأَرْضِ، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ صَالَحَهُمْ عَلَى نِصْفِ الثَّمَرِ، وَنِصْفِ الأَرْضِ، فَأَقَامَ لَهُمْ عُمَرُ ﷺ نِصْفَ الثَّمَرِ وَنِصْفَ الأَرْضِ، قِيمَةً مِنْ ذَهَبٍ، وَوَرِقٍ، وَإِبِلٍ، وَحِبَالٍ، وَأَقْتَابٍ، ثُمَّ أَعْطَاهُمُ الْقِيمَةَ وَأَجْلاَهُمْ مِنْهَا[١].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: عومەی کوڕی خەتتاب ﷺ (جگە لە جوولەکەکانی خەیبەر) جوولەکەکانی نەجران و فەدەکیشی وەدەرنا، (بەڵام جیاوازییەکیان هەبوو) هەرچی جوولەکەکانی خەیبەر بوون، چوونە دەرەوە و هیچ لە بەروبووم و زەوییان بۆ نەبوو، (بەڵام) هەرچی جوولەکەکانی فەدەك بوون، نیوەی بەروبووم و نیوەی زەوییەکەیان بۆ هەبوو، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێککەوتنی لەگەڵ کردبوون بە نیوەی بەروبووم و نیوەی زەوی، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نیوەی بەروبووم و زەوییەکەی بۆ نرخاندن بە زێڕ و زیو و وشتر و حەبل و کەژاوەی وشتر، دواتر نرخەکەی پێ دان (کە بریتیبوو لەو شتانە) و لە دوورگەی عەرەب دەریکردن.

### ٦- ئەوەی دەربارەی مەدینە هاتووە[٢]

**٢٦٠٩**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ طَلَعَ لَهُ أُحُدٌ، فَقَالَ: هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٣ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٤٢ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي أَمْرِ الْمَدِينَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٥ في الجامع، عن مالك به.




واتە: لە هیشامی کوڕی عورِوەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (کاتێ لە خەیبەر گەڕایەوە) چیای ئوحودی لێ دەرکەوت و گوتی: ئەوە چیایێکە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێت.

**٢٦١٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، أَنَّ أَسْلَمَ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ زَارَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَيَّاشٍ الْمَخْزُومِيَّ، فَرَأَى عِنْدَهُ نَبِيذًا، وَهُوَ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، فَقَالَ لَهُ أَسْلَمُ: إِنَّ هَذَا الشَّرَابَ يُحِبُّهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَحَمَلَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَيَّاشٍ قَدَحًا عَظِيمًا، فَجَاءَ بِهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَوَضَعَهُ فِي يَدِهِ، فَقَرَّبَهُ عُمَرُ إِلَى فِيهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ هَذَا لَشَرَابٌ طَيِّبٌ، فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ رَجُلاً عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا أَدْبَرَ عَبْدُ اللهِ، نَادَاهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ: أَأَنْتَ الْقَائِلُ: لَمَكَّةُ خَيْرٌ مِنَ الْمَدِينَةِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ، فَقُلْتُ: هِيَ حَرَمُ اللهِ وَأَمْنُهُ، وَفِيهَا بَيْتُهُ، فَقَالَ عُمَرُ: لاَ أَقُولُ فِي بَيْتِ اللهِ، وَلاَ فِي حَرَمِهِ شَيْئًا، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: أَأَنْتَ الْقَائِلُ: لَمَكَّةُ خَيْرٌ مِنَ الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَقُلْتُ: هِيَ حَرَمُ اللهِ وَأَمْنُهُ، وَفِيهَا بَيْتُهُ، فَقَالَ عُمَرُ: لاَ أَقُولُ فِي حَرَمِ اللهِ، وَلاَ فِي بَيْتِهِ شَيْئًا، ثُمَّ انْصَرَفَ[1].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەسلەمی خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەواڵی پێ داوە بەوەی چۆتە سەردانی عەبدوڵڵای کوڕی عەیاشی مەخزومی ﷺ و خۆشاوی لەلا بینیوە، لە کاتێکدا لەسەر ڕێی مەککە بوو، جا ئەسلەم ﷺ پێی گوت: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ حەزی لەو خواردنەوەیە دەکرد، جا عەبدوڵڵای کوڕی عەیاش دۆلکەیەکی گەورەی هەڵگرت و هێنای بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و خستیە دەستیەوە، جا عومەر ﷺ نزیکی کردەوە لە دەمی، دواتر سەری بەرزکردەوە، عومەر ﷺ گوتی: ئەوە خواردنەوەیەکی خۆشە، جا لێی خواردەوە، دواتر دای بە پیاوێك لەلای ڕاستیەوە، جا کاتێ عەبدوڵڵا ﷺ پشتی تێ کرد بڕوات، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بانگی کرد و گوتی: ئایا تۆ بووی گوتبووت: مەککە چاکترە لە مەدینە؟ عەبدوڵڵاش ﷺ دەڵێ: منیش گوتم: (لەبەر ئەوە وام گوتووە چونکە مەککە) حەرەمی خوا و شوێنێکە خوا ئەمن و ئاسایشی پێ داوە

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٦ في الجامع، عن مالك به.

و ماڵی خوا لەوێیە، عومەریش ﷺ گوتی: قسە لەسەر ماڵی خوا و حەرەمەکەی ناکەم، دواتر عومەر ﷺ دیسان گوتی: ئایا تۆ بووی گوتبووت: مەککە چاکترە لە مەدینە؟ عەبدوڵڵاش ﷺ دەڵێ: منیش گوتم: (لەبەر ئەوە وام گوتووە چونکە مەککە) حەرەمی خوا و شوێنێکە خوا ئەمن و ئاسایشی پێ داوە و ماڵی خوا لەوێیە، عومەریش ﷺ گوتی: قسە لەسەر ماڵی خوا و حەرەمەکەی ناکەم، دواتر ڕۆیشت (واتە خودی مەدینە لە خودی مەککە گەورەترە، نەك لە حەرەم و مزگەوتی حەرام گەورەتر بێت، بەدڵنیایی مزگەوتی حەرام گەورەترە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە بەراوردێکی دیکەیە).

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی تاعون[1]

**٢٦١١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الشَّامِ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِسَرْغَ، لَقِيَهُ أُمَرَاءُ الأَجْنَادِ: أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ ﷺ، وَأَصْحَابُهُ، فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ الْوَبَأَ قَدْ وَقَعَ بِأَرْضِ الشَّامِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: ادْعُ لِي الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ، فَدَعَاهُمْ فَاسْتَشَارَهُمْ، وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَأَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، فَاخْتَلَفُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لأَمْرٍ، وَلاَ نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلاَ نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَإِ، فَقَالَ عُمَرُ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي الأَنْصَارَ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهَاجِرِينَ، وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلاَفِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي مَنْ كَانَ هَاهُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ، مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَلَمْ يَخْتَلِفْ عَلَيْهِ مِنْهُمُ اثْنَانِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ، وَلاَ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَإِ، فَنَادَى عُمَرُ فِي النَّاسِ: إِنِّي مُصْبِحٌ عَلَى ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ، فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ ﷺ: أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللهِ؟ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ؟ نَعَمْ، نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ إِلَى قَدَرِ اللهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ إِبِلٌ، فَهَبَطَتْ وَادِيًا لَهُ عُدْوَتَانِ، إِحْدَاهُمَا: مُخْصَبَةٌ، وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصِبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ، وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ؟ فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ، وَكَانَ غَائِبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي مِنْ هَذَا عِلْمًا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الطَّاعُونِ.




بِأَرْضٍ، فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ، قَالَ: فَحَمِدَ اللهَ عُمَرُ ﷺ، ثُمَّ انْصَرَفَ[١].

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەرچوو بۆ شام، تا گەیشت بە سەرغ، لەوێ سەرکردەی سەربازەکانی ئیسلام پێی گەیشتن، کە بریتیبوون لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و هاوەڵەکانی، جا هەواڵیان پێ دا بەوەی نەخۆشی لە شام پەیدا بووە، ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: کۆچکەرە پێشینەکانم بۆ بانگ بکەن، جا بانگیان کردن و ڕاوێژی پێ کردن و هەواڵی پێ دان بەوەی نەخۆشی لە شام بڵاو بۆتەوە (جا ئایا بچین بۆ شام یان نەچین)، ئەوانیش ڕاجیاییان کەوتە نێوان: هەندێکیان گوتیان: تۆ بۆ شتێك دەرچوویت (کە بریتییە لە چاودێریکردن و سەیرکردنی حاڵی هاونشتیمانیانی دەوڵەتی ئیسلام و لە نزیکەوە ئاشنابوون بە حاڵیان) و بۆچوونمان وا نییە بگەڕێیتەوە، هەندێکی دیکەش گوتیان: تۆ خەڵکە چاکەکەی زەمانی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی پێغەمبەری خوات ﷺ لەگەڵە، بۆچوونمان وا نییە بیانبەیت بۆ ناو ئەو نەخۆشییە (با ئەو خەڵکە چاکە لەناو نەچن)، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: لاچن لەلام، دواتر گوتی: پشتیوانانم بۆ بانگ بکە، (ئیبنو عەبباس ـ ﷺ ـ دەڵێ): منیش بانگم کردن، ڕاوێژی پێ کردن، ئەوانیش وەك موهاجیرەکانیان کرد و بۆچوونیان جیاواز بوو وەك ئەوانی دیکە بۆچوونیان جیاواز بوو، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئێوە هەڵسن، دواتر گوتی: ئەو کەسانەم بۆ بانگ بکە کە لە گەورەکانی قورەیشن لە کۆچکەرانی ساڵی فەتح، (ئیبنو عەبباس ـ ﷺ ـ دەڵێ): منیش بانگم کردن، جا دوو کەسیش لەوان بۆچوونیان جیاواز نەبوو گشتیان گوتیان: پێمان باشە خەڵك بگەڕێنیتەوە و نەیانبەیت بۆ ناو ئەو نەخۆشییە، جا عومەر ﷺ لەناو خەڵکی هاواری کرد: من بەیانی لەسەر پشتی وڵاغم (بۆ گەڕانەوە بۆ مەدینە)، ئێوەش بەیانی لەسەر

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٧ في الجامع؛ وفي: ١٨٧٠ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٦٨٣؛ والبخاري: ٥٧٢٩ في الطب، وفي: ٥٧٣٠ في الطب؛ ومسلم: السلام: ٩٨؛ وأبو داود: ٣١٠٣ في الجنائز؛ وابن حبان: ٢٩٥٣؛ وأبو يعلى الموصلي: ٨٣٧؛ والقابسي: ٦٣، كلهم عن مالك به.

ولاّغ بن، جا ئەبو عوبەیدە ﷺ گوتی: هەڵاتن لە قەدەری خوا؟! عومەریش ﷺ گوتی: وای ئەگەر كەسێكی جگە لە تۆ ئاوای گوتبا ئەی ئەبو عوبەیدە (واتە ئەوە بەدڵنیایی تەمێم دەكرد)؟! بەڵێ ڕادەكەین لە قەدەری خوا ﷻ بۆ قەدەرێكی دیكەی خوا ﷻ، چی دەڵێی ئەگەر وشترێكت هەبێت بچێتە ناو دۆڵێك كە دوو حاڵەت و ناوچەی هەیە، یەكیان: بەلەوەڕە، ئەوەی دیكەیان: وشك و بێلەوەڕە، جا ئایا ئەگەر لەوەڕاندت لە ناوچە بەلەوەڕەكە مەگەر نەتلەوەڕاندووە بە قەدەری خوا، وە ئەگەر لەوەڕاندت لە ناوچە وشكەكە مەگەر نەتلەوەڕاندووە بە قەدەری خوا؟ جا (دوای ئەو مەسەلە و ئیجتیهادە) عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف ﷺ هات لە كاتێكدا پێشتر لەوێ نەبوو بۆ پێویستییەكی خۆی ڕۆیشتبوو، هات و گوتی: من زانستێكم لەسەر ئەو بابەتە لایە، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر گوێتان لێ بوو نەخۆشی لە ناوچەیەك بڵاو بۆتەوە، ئەوە مەچن بۆ ئەوێ، وە ئەگەر لە ناوچەیەك پەیدا بوو كە ئێوەی تێدا بوو، ئەوە دەرمەچن بەهەڵاتن لێی، دەڵێ: جا عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ ستاییشی خوای كرد (بەوەی لە ئیجتیهادەكەی پێكاویەتی)، دواتر ڕۆیشت (گەڕایەوە بۆ مەدینە).

**٢٦١٢-** عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَسْأَلُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ ﷺ، مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الطَّاعُونِ؟ فَقَالَ أُسَامَةُ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الطَّاعُونُ رِجْزٌ، أُرْسِلَ عَلَى طَائِفَةٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، أَوْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ، فَلاَ تَدْخُلُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ يُخْرِجُكُمْ إِلاَّ فِرَارًا مِنْهُ.

واتە: لە عامری كوڕی سەعدی كوڕی ئەبو وەقاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە بەوەی گوێی لێی بووە پرسیاری لە ئوسامەی كوڕی زەید ﷺ كردووە گوتوویەتی: چیت گوێ لێ بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی تاعون؟ ئوسامەش ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تاعون سزایە، بۆ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٨ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥٥ في العتاق؛ وابن حنبل: ٢١٨١١؛ والبخاري: ٣٤٧٣ في الأنبياء؛ ومسلم: السلام: ٩٢؛ وابن حبان: ٢٩٥٢؛ والقابسي: ٨٧، كلهم عن مالك به.

بەشێك لە بەنو ئیسرائیل ـ یان بۆ كەسانێكی پێش ئێوە ـ (بەسزا) ڕەوانە كرا، ئەگەر گوێتان لێ بوو نەخۆشی لە ناوچەیەك بڵاو بۆتەوە، ئەوە مەچن بۆ ئەوێ، وە ئەگەر لە ناوچەیەك پەیدا بوو كە ئێوەی تێدا بوو، ئەوە دەرمەچن بەهەڵاتن لێی.

ئیمامی مالیك ﷫ گوتوویەتی: ئەبو نەزر گوتوویەتی: دەرتاننەپەڕێنێ تەنها ڕاكردن نەبێ لێی (واتە ئەوەی دروست نییە تەنها بریتییە لە دەرچوون بە نیازی ڕاكردن، بەڵام دەرچوون بۆ سەفەر و كاری پێویستی دروستە).

٢٦١٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷫، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الشَّامِ، فَلَمَّا جَاءَ سَرْغَ، بَلَغَهُ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، فَأَخْبَرَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ، فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ، فَرَجَعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ مِنْ سَرْغَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عامری كوڕی ڕەبیعەوە ﷫ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەرچوو بۆ شام، جا كاتێ هات بۆ سەرغ، پێی گەیشت نەخۆشی لە شام پەیدا بووە، جا عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف ﷺ هەواڵی پێ دا بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گوێتان لێ بوو نەخۆشی لە ناوچەیەك بڵاو بۆتەوە، ئەوە مەچن بۆ ئەوێ، وە ئەگەر لە ناوچەیەك پەیدا بوو كە ئێوەی تێدا بوو، ئەوە دەرمەچن بەهەڵاتن لێی، جا عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لە سەرغەوە گەڕایەوە (نەچوو بۆ شام).

٢٦١٤- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷫، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، إِنَّمَا رَجَعَ بِالنَّاسِ عَنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ[2].

واتە: لە سالمی كوڕی عەبدوڵڵاوە ﷫ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ كە خەڵكی گەڕاندەوە لەبەر فەرموودەكەی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف بوو ـ ﷺ ـ (كە لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕایەوە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦٩ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٦٨٢؛ والبخاري: ٥٧٣٠ في الطب، وفي: ٦٩٧٣ في الحيل؛ والقابسي: ٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح.

**٢٦١٥-** عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لَبَيْتٌ بِرُكْبَةَ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ عَشَرَةِ أَبْيَاتٍ بِالشَّامِ(1).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُرِيدُ لِطُولِ الأَعْمَارِ وَالْبَقَاءِ، وَلِشِدَّةِ الْوَبَاءِ بِالشَّامِ.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ماڵێکم لە ڕوکبە (کە شوێنێکە لە نێوان مەککە و عێڕاق) پێ چاکترە لە دە ماڵ لە شام.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مەبەستی تەمەندرێژی و مانەوە (ی خەڵکی ڕوکبە) و نەخۆشی سەختە لە شام (لەسەر ئەو بنەمایە ڕوکبەی پێ چاکتر بووە لە شام).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧١ في الجامع، عن مالك به.

## ١- قەدەغەكردن لە قسەكردن دەربارەی قەدەر[١]

**٢٦١٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تَحَاجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، قَالَ لَهُ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي أَغْوَيْتَ النَّاسَ، وَأَخْرَجْتَهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ؟ فَقَالَ لَهُ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِي أَعْطَاهُ اللهُ عِلْمَ كُلِّ شَيْءٍ، وَاصْطَفَاهُ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالَتِهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِّرَ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێغەمبەر ئادەم ﷺ و پێغەمبەر موسا ﷺ موناقەشەیان كرد، جا پێغەمبەر ئادەم ﷺ زاڵ بوو بەسەر پێغەمبەر موسادا ﷺ، (موناقەشەكەش ئەوە بوو): پێغەمبەر موسا ﷺ پێی فەرموو: تۆ ئەو ئادەمەیت كە خەڵكت تووشی لادان كرد و وەدەرتنان لە بەهەشت؟ پێغەمبەر ئادەمیش ﷺ پێی فەرموو: تۆ ئەو موسایەیت كە خوای پەروەردگار زانستی گشت شتێكی پێ دا و بەسەر خەڵكی هەڵیبژارد بە پەیامەكەی؟ پێغەمبەر موساش ﷺ فەرمووی: بەڵێ ڕاستە، پێغەمبەر ئادەمیش ﷺ فەرمووی: جا ئایا سەرزەنشتم دەكەیت لەسەر بابەتێك كە بە قەدەر لەسەرم داندراوە بەر لەوەی دروست بكرێم.

**٢٦١٧-** عَنْ مُسْلِمِ بْنِ يَسَارٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ سُئِلَ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُسْأَلُ عَنْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ ﷻ خَلَقَ آدَمَ، ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ بِيَمِينِهِ، فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً، فَقَالَ: خَلَقْتُ هَؤُلَاءِ لِلْجَنَّةِ، وَبِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَعْمَلُونَ، ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ، فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً، فَقَالَ: خَلَقْتُ هَؤُلَاءِ لِلنَّارِ، وَبِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ يَعْمَلُونَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَفِيمَ الْعَمَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ إِذَا خَلَقَ الْعَبْدَ لِلْجَنَّةِ، اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُدْخِلُهُ بِهِ

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنِ الْقَوْلِ بِالْقَدَرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٢ في الجامع؛ ومسلم: القدر: ١٤؛ وابن حبان: ٦٢١٠؛ والقابسي: ٣٦١، كلهم عن مالك به.

الْجَنَّةَ، وَإِذَا خَلَقَ الْعَبْدَ لِلنَّارِ، اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ النَّارِ، فَيُدْخِلُهُ بِهِ النَّارَ[1].

واته: لە موسلیمی کوڕی یەساری جوهەنییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف، واتە: [وە کاتێك پەروەردگارت بەدیهێنا لە پشتی ئادەمییەکان وەچە و نەوەکانیان وە کردنی بە شاهێد بەسەر خۆیانەوە (پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ گوتیان: بەڵێ شاهێدیمان دا، تا لە ڕۆژی دواییدا نەڵێن بەڕاستی ئێمە بێئاگا بووین لەوە (کە الله پەروەردگارمان بێت)]، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەو ئایەتە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار پێغەمبەر ئادەمی ﷺ دروست کرد، دواتر بەقودرەتی خۆی فەرمانی بە پشتی کرد و هەندێك لە نەوەکانی لێ هاتنە دەرەوە، جا فەرمووی: ئەوانەم بۆ بەهەشت دروست کردوون و کردەوەی خەڵکی بەهەشت ئەنجام دەدەن، دواتر فەرمانی بە پشتی کرد هەندێکی دیکە لە نەوەکانی هاتنە دەرەوە و فەرمووی: ئەوانەشم بۆ ئاگر دروست کردوون و کردەوەی خەڵکی ئاگر ئەنجام دەدەن، جا پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە کردەوە بۆ چییە (مادەم کارەکە بڕابێتەوە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار ئەگەر بەندەیەکی بۆ بەهەشت دروست کرد، بەکاری دەهێنێت (مۆفەقی دەکات) بە کردەوەی خەڵکی بەهەشت، تا لەسەر کردەوەی خەڵکی بەهەشت دەمرێت و بەهۆیەوە دەیخاتە بەهەشتەوە، وە ئەگەر بەندەیەکی بۆ دۆزەخ دروست کرد، بەکاری دەهێنێت بۆ کردەوەی خەڵکی دۆزەخ (واتە قودرەتی پێ دەدات و ئیزنی دەدات بۆ ئەنجامدانی ئەو خراپانەی خۆی دەیەوێت)، تا لەسەر کردەوەی خەڵکی دۆزەخ دەمرێت و بەهۆیەوە دەیخاتە دۆزەخەوە.

---

(١) ـ ضعيف بهذا التمام. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٣ في الجامع؛ وابن حنبل: ٣١١؛ وأبو داود: ٤٧٠٣ في السنة؛ والترمذي: ٣٠٧٥ في تفسير؛ وابن حبان: ٦١٦٦، كلهم عن مالك به.

**٢٦١٨-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ، لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ، وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ(١).

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو شتم لەناو ئێوەدا جێ هێشتووە، گومڕا نابن هەتا ئەو كاتەی دەستیان پێوە بگرن (دوو شتەكانیش بریتین لە): پەرتووكی خوا ﷻ و فەرموودە و ڕێبازی پێغەمبەرەكەی ﷺ.

**٢٦١٩-** عَنْ طَاوُوسٍ الْيَمَانِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَدْرَكْتُ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَقُولُونَ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ(٢).

قَالَ طَاوُوسٌ ﷺ: وَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ حَتَّى الْعَجْزِ وَالْكَيْسِ، أَوِ الْكَيْسِ وَالْعَجْزِ(٣).

واتە: لە تاوسی یەمانییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گەیشتووم بە خەڵكانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانگوت: گشت شتێك بە قەزاوقەدەرە.

تاوس ﷺ گوتوویەتی: وە گوێم لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ بووە دەیگوت: گشت شتێك بە قەزاوقەدەرە هەتا دەسەوسانی و زیرەكیش، یان زیرەكی و دەسەوسانی (ڕاوی نەیزانیوە كامیانی پێشتر گوتووە: زیرەكی یان دەسەوسانی).

**٢٦٢٠-** عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ: إِنَّ اللهَ هُوَ الْهَادِي وَالْفَاتِنُ(٤).

واتە: لە عەمری كوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر ﷺ بوو لە وتارەكەیدا دەیگوت: خوای پەروەردگار ڕێنموییكار و گومڕاكارە (بۆ ئەو كەسەی گومڕایی هەڵدەبژێرێت).

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٤ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٤٥أ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٠ في الجامع؛ وابن حنبل: ٥٨٩٣؛ ومسلم: القدر: ١٨؛ وابن حبان: ٦١٤٩؛ والقابسي: ١٨٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه ابن حنبل: ٥٨٩٣، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٥ في الجامع، عن مالك به.

**٢٦٢١**- عَنْ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَسِيرُ مَعَ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ، فَقَالَ: مَا رَأْيُكَ فِي هَؤُلَاءِ الْقَدَرِيَّةِ؟ فَقُلْتُ: رَأْيِي أَنْ تَسْتَتِيبَهُمْ، فَإِنْ قَبِلُوا، وَإِلاَّ عَرَضْتَهُمْ عَلَى السَّيْفِ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ: وَذَلِكَ رَأْيِي[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ رَأْيِي.

واتە: لە ئەبو سوهەیلی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: من لەگەڵ عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ بەڕێدا دەڕۆیشتم گوتی: بۆچوونت چییە دەربارەی ئەو قەدەرییانە (كە كۆمەڵەیەك بوون باوەڕیان بە قەدەر نەبوو)؟ منیش گوتم: بۆچوونم وایە داوای تەوبە و گەڕانەوە و پەشیمانبوونەوەیان بۆ لای خوا لێ بكەیت، جا ئەگەر تەوبەیان كرد (ئەوە باشە)، ئەگەرنا بە شمشێر ڕووبەڕوویان ببیتەوە، جا عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ گوتی: بۆچوونی منیش ئاوایە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆچوونی منیش ئاوایە.

## ٢- بابەتی جۆراوجۆر لەوەی هاتووە دەربارەی ئەهلی قەدەر[2]

**٢٦٢٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا، وَلِتَنْكِحَ، فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئافرەت داوای تەڵاقی خوشكەكەی نەكات تاوەكوو سینی (و خوانی) ئەو بۆخۆی بەتاڵ بكات (واتە با هیچ ئافرەتێك بەتەڵاقدان نەدات بۆ ئەوەی خۆی بچێتە شوێنی و بە حیسابی خۆی خۆشەویستی و بژێوی ئەو بۆ خۆی

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٦ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٤٦ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي أَهْلِ الْقَدَرِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٧ في الجامع؛ والبخاري: ٦٦٠١ في القدر عن طريق عبد الله بن يوسف؛ وأبو داود: ٢١٧٦ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٠٦٩؛ والقابسي: ٣٦٢، كلهم عن مالك به.

بيات)، (بەڵكوو) با شوو بكات (بەبێ هەوڵدان بۆ زەوتكردنی مافی ئافرەتی دیكە، با خەڵك خۆيان بێن بۆ داوای)، چونكە ئەو قەدەری خۆی هەيە.

**٢٦٢٣- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَى اللهُ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْهُ الْجَدُّ، مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ هَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، عَلَى هَذِهِ الأَعْوَادِ[١].**

واتە: لە موحەممەدی كوڕی كەعبی قوڕەزييەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوويەتی: موعاويەی كوڕی ئەبو سوفيان ﷺ لە كاتێكدا لەسەر مینبەر بوو گوتی: ئەی خەڵكينە، بەدڵنيايی هيچ ڕێگرێك نييە لە بەردەم ئەو شتەی خوا ﷻ دەيبەخشێ، وە هيچ بەخشەرێك نييە بۆ ئەو شتەی خوا ﷻ دەيگرێتەوە و نايبەخشێت، وە هيچ داراييەك سوودی بۆ خاوەنەكەی نابێت لە سزای تۆ، هەر كەسێك خوا بيەوێ خێر و چاكەی لەگەڵ بكات ئەوە لە ئايينی ئيسلام شارەزای دەكات، دواتر گوتی: ئەو وتانەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێ لێ بووە لەلای ئەو دينگە و ئەستوندانە (لێرە فەرموويەتی).

**٢٦٢٤- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّهُ كَانَ يُقَالُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ كَمَا يَنْبَغِي، الَّذِي لاَ يَعْجَلُ شَيْءٌ أَنَاهُ وَقَدَّرَهُ، حَسْبِيَ اللهُ وَكَفَى، سَمِعَ اللهُ لِمَنْ دَعَا، لَيْسَ وَرَاءَ اللهِ مَرْمَى[٢].**

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەيشتووە دەگوترا (واتە زانايانی شەرعزان دەيانگوت): ستاييش بۆ ئەو خوايەی گشت شتێكی بەو شێوەيە دروست كردووە كە پێويستە وا بێت، ئەوەی هيچ شتێك پێش كاتی خۆی ناكەوێت و ئەندازەگيری بۆ كردووە (لە گشت ڕووێكەوە)، خوام بەسە، خوای پەروەردگار وەڵامی ئەو كەسە دەداتەوە كە داوای لێ دەكات، لەدوای خوای پەروەردگار هيچ شتێك جێی خواستەكان نييە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٨ في الجامع؛ والقابسي: ٥٢١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧٩ في الجامع، عن مالك به.




**٢٦٢٥**- عَنْ مالِكٍ رحمه الله، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّهُ يُقَالُ: إِنَّ أَحَدًا لَنْ يَمُوتَ، حَتَّى يَسْتَكْمِلَ رِزْقَهُ، فَأَجْمِلُوا فِي الطَّلَبِ[١].

**واتە: لە ئیمامی مالیکەوە رحمه الله گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە دەگوترا (واتە زانایان دەیانگوت): کەس نامرێت تا ڕۆزی خۆی تەواو نەکات، کەواتە بەجوانی (ڕۆزی) داوا بکەن و پەیدای بکەن (فێڵ و حەڕام و خیانەت بەکار مەهێنن بۆ پەیداکردنی).**

---

(١) ـ مقطوع ضعيف.




## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەوشت جوانی[١]

**٢٦٢٦-** أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: آخِرُ مَا أَوْصَانِي بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ وَضَعْتُ رِجْلِي فِي الْغَرْزِ، أَنْ قَالَ: أَحْسِنْ خُلُقَكَ لِلنَّاسِ، مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ ﷺ [٢].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ گوتوویەتی: کۆتا ئامۆژگاری کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردمی کاتێ قاچم خستە ناو ئاوزەنگی وڵاخەوە (دەچووم بۆ یەمەن) ئەوەبوو فەرمووی: ڕەوشتت بۆ خەڵکی جوان بکە ئەی موعازی کوڕی جەبەل ﷺ.

**٢٦٢٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي أَمْرَيْنِ قَطُّ إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا، كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِنَفْسِهِ، إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللهِ، فَيَنْتَقِمُ لِلَّهِ بِهَا[٣].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەرگیز نەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك کرابێت لە نێوانی دوو شتاندا حەتمەن کامەی ئاسانە ئەوەی هەڵبژاردوە مادەم گوناح نەبووبێ، وە ئەگەریش گوناح بووبێ، ئەوە لە هەموو خەڵکی لێی دوورتر بووە، وە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەسەندۆتەوە، تەنها ئەگەر سنوور و حەڕامکراوەکانی خوا بەزێنرابن، ئەو کات تۆڵەی وەرگرتۆتەوە بۆ خوای زاڵی پایەدار.

**٢٦٢٨-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مِنْ حُسْنِ إِسْلاَمِ الْمَرْءِ، تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ[٤].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي حُسْنِ الْخُلُقِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨١ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٢ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢٤٨٩٠، وفي: ٢٥٥٢٤، وفي: ٢٥٥٩٨، وفي: ٢٦٣٠٥؛ والبخاري: ٣٥٦٠ في المناقب، وفي: ٦١٢٦ في الأدب؛ ومسلم: فضائل النبي: ٧٧؛ وأبو داود: ٤٧٨٥ في الأدب؛ وأبو يعلى الموصلي: ٤٣٨٢؛ والقابسي: ٤٣، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٣ في الجامع؛ والشيباني: ٩٤٩ في العتاق؛ والترمذي: ٢٣١٨ في الزهد، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێك لە جوان مسوڵمانبوونی کەسی مسوڵمان ئەوەیە واز بێنێت لەو شتەی پەیوەندی بەوەوە نییە.

**٢٦٢٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: وَأَنَا مَعَهُ فِي الْبَيْتِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ، ثُمَّ أَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَلَمْ أَنْشَبْ أَنْ سَمِعْتُ ضَحِكَ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَعَهُ، فَلَمَّا خَرَجَ الرَّجُلُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، قُلْتَ فِيهِ مَا قُلْتَ، ثُمَّ لَمْ تَنْشَبْ أَنْ ضَحِكْتَ مَعَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ، مَنِ اتَّقَاهُ النَّاسُ لِشَرِّهِ[1].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك داوای مۆڵەتی هاتنە لای پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، عائیشە ﵂ دەڵێ: لە کاتێکدا من لەگەڵی بووم لە ماڵەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە لە خراپترین کەسی هۆزەکەیەتی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێ دا، عائیشە ﵂ دەڵێ: بەردەوام گوێم لە پێکەنینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبوو لەگەڵی، جا کاتێك کە چووە دەرەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەی فەرمووت دەربارەی فەرمووت، پاشان بەردەوام پێکەنیت لەگەڵی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یەکێك لە خراپترینی خەڵکی ئەو کەسەیە خەڵك خۆی لێ بپارێزێ لەبەر خراپەکارییەکەی (واتە لەبەر خراپی ئەو ئاوا ڕووم دایێ تا تووشی موشکیلەم نەکات، هێندە خراپە).

**٢٦٣٠-** عَنْ كَعْبِ الأَحْبَارِ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: إِذَا أَحْبَبْتُمْ أَنْ تَعْلَمُوا مَا لِلْعَبْدِ عِنْدَ رَبِّهِ، فَانْظُرُوا مَاذَا يَتْبَعُهُ مِنْ حُسْنِ الثَّنَاءِ[2].

واتە: لە کەعبی ئەحبارەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەگەر حەز دەکەن بزانن بەندەیەك چی بۆ هەیە لەلای خوای پەروەردگار، ئەوە سەیرکەن چ مەدح و سەنایەکی دەکرێت.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٤ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٦ في الجامع، عن مالك به.




**٢٦٣١-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَلَغَنِي: أَنَّ الْمَرْءَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الْقَائِمِ بِاللَّيْلِ الظَّامِي بِالْهَوَاجِرِ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی (لە پێغەمبەری خواوە ﷺ) پێم گەیشتووە (فەرموویەتی): مرۆڤ بە ڕەوشت جوانی دەگاتە پلەی شەونوێژکاری تینوو بە کاتی گەرما (واتە پلەی وەك ئەو کەسە وایە بەشەو شەونوێژ دەکات و بەڕۆژیش بەڕۆژووە).

**٢٦٣٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ كَثِيرٍ مِنَ الصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْبِغْضَةَ، فَإِنَّهَا هِيَ الْحَالِقَةُ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بوو دەیگوت: ئایا هەواڵتان پێ نەدەم بە پلەیەك کە باشتر و چاکتر بێ لە نوێژ و ڕۆژوو و صەدەقەی (سوننەت)؟! گوتیان: بۆنا، گوتی: ئاشتکردنەوەی نێوانی خەڵکی، وە خۆتان بپارێزن لە بوغزاندن، چونکە تاشەری دینە (دینتان دەتاشێ، چونکە دینداریيەکەتان بێهێز دەبێ و بەرەو لەناوچوون دەچێت).

**٢٦٣٣-** وَحَدَّثَنِي عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ حُسْنَ الأَخْلاَقِ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەدڵنیایی من ڕەوانەکراوم بۆ ئەوەی ڕەوشتە جوانەکان تەواو بکەم.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٧ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٨ في الجامع؛ والشيباني: ٨٦٧ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٥ في الجامع، عن مالك به.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی شەرم و حەیا[١]

**٢٦٣٤-** عَنْ زَيْدِ بْنِ طَلْحَةَ بْنِ رُكَانَةَ ﷺ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لِكُلِّ دِينٍ خُلُقٌ، وَخُلُقُ الإِسْلاَمِ الْحَيَاءُ[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی تەڵحەی کوڕی ڕوکانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ هەر دینێك خەسڵەتێك هەیە (خەڵکەکەی هاندراون بۆی)، خەسڵەتی ئیسلامیش حەیا و شەرمە.

**٢٦٣٥-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای پیاوێکدا تێ پەڕی، لە کاتێکدا ئامۆژگاری برایەکەی دەکرد بەوەی هێندە بەشەرم و حەیا نەبێ، (بۆیە پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموو: وازی لێ بێنە، بەڕاستی شەرم و حەیا لە ئیمانەوەیە.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی توڕەبوون[٤]

**٢٦٣٦-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، عَلِّمْنِي كَلِمَاتٍ أَعِيشُ بِهِنَّ، وَلاَ تُكْثِرْ عَلَيَّ، فَأَنْسَى، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَغْضَبْ[٥].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْحَيَاءِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨٩ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥٠ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٠ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥١ في العتاق؛ وابن حنبل: ٥١٨٣؛ والبخاري: ٢٤ في الإيمان؛ والنسائي: ٥٠٣٣ في الإيمان؛ وأبو داود: ٤٧٩٥ في الأدب، كلهم عن مالك.

(٤) ـ مَا جَاءَ فِي الْغَضَبِ.

واتە: لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشەیەکم فێر بکە پێیانەوە ژیان بەسەر ببەم، (بەڵام) لەسەرم زۆر مەکە (واتە با وتەیەکی درێژ نەبێ) لەیادم دەچێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: توڕە مەبە (واتە لەسەر کاردانەوەکانی توڕەبوون بەردەوام مەبە).

**٢٦٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ[1].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەهێز ئەوە نییە پشتی خەڵکی لە زەوی بدات، بەڵکوو بەهێز ئەوەیە کە دان بەخۆیدا دەگرێت لە کاتی توڕەییدا.

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆلەیەکدیگرتن (قسەنەکردن لەگەڵ یەکدی)[2]

**٢٦٣٨-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُهَاجِرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا، وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ[3].

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نییە بۆ هیچ مسوڵمانێك زیاتر لە سێ ڕۆژ قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی ببڕێت و قسەی لەگەڵدا نەکات، (بەشێوەیەك) بگەن بە یەکدی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٢ في الجامع؛ وابن حنبل: ٧٢١٨، وفي: ١٠٧١٣؛ والبخاري: ٦١١٤ في الأدب؛ ومسلم: البر والصلة: ١٠٧؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٥٣٧٦ في الأدب؛ والقابسي: ١٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْمُهَاجَرَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٣ في الجامع؛ والشيباني: ٩١٧ في العتاق؛ والبخاري: ٦٠٧٧ في الأدب؛ ومسلم: البر والصلة: ٢٥؛ وأبو داود: ٤٩١١ في الأدب؛ وابن حبان: ٥٦٦٩، وفي: ٥٦٧٠، وفي: ٥٦٧٠، وفي: ٥٦٧٠؛ والقابسي: ٧٩، كلهم عن مالك به.

ئەوەیان پشت هەڵبکا و ئەوەی دیکەشیان هەر پشت هەڵبکا و قسە لەگەڵ یەکدی نەکەن، وە باشترینیان ئەو کەسەیە کە سەرەتا دەست دەکات بە سڵاوکردن (دەستپێشخەری دەکات بۆ ئاشتبوونەوە).

**٢٦٣٩**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَانًا، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُهَاجِرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَحْسِبُ التَّدَابُرَ إِلاَّ الإِعْرَاضَ عَنْ أَخِيكَ الْمُسْلِمِ، فَتُدْبِرَ عَنْهُ بِوَجْهِكَ[٢].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئێرەیی و حەسوودی بە یەکدی مەبەن و پشت لە یەکدی مەکەن، بەندەی خوا بن و پێکەوە برا بن، وە حەڵاڵ نییە بۆ هیچ مسوڵمانێك لە سێ شەو زیاتر قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی ببڕێت و قسەی لەگەڵدا نەکات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وا نییە «التدابر» جگە لە پشتهەڵکردن لە برای مسوڵمانت هیچ شتێکی دیکە بێت، (ئەوەیە) ڕووی لێ وەرگێڕیت.

**٢٦٤٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَنَافَسُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَانًا[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ, گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە گومان، چونکە گومان درۆترین قسەیە (واتە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٤ في الجامع؛ والبخاري: ٦٠٧٦ في الأدب؛ ومسلم: البر والصلة: ٢٣؛ وأبو داود: ٤٩١٠ في الأدب؛ وابن حبان: ٥٦٦٠؛ والقابسي: ٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٥ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩٦ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٠٠٠٢، وفي: ١٠٧١٢؛ والبخاري: ٦٠٦٦ في الأدب؛ ومسلم: البر والصلة: ٢٨؛ وأبو داود: ٤٩١٧ في الأدب؛ وابن حبان: ٥٦٨٧؛ والقابسي: ٣٦٦، كلهم عن مالك به.

درۆترین قسەی دڵە)، وە سیخوڕی و جاسوسی مەکەن، هەستیار و بەهەنجەت مەبن بەرانبەر یەکدی، وە کێبڕکێ مەکەن (لە حەز و ئارەزووی دونیادا)، وە حەسوودی و ئیرەیی بە یەکدی مەبەن، وە ڕق و کینەتان بەرانبەر یەکدی نەبێ و یەکدی مەبوغزێنن، وە پشت لە یەکدی مەکەن، وە ببن بە بەندەی خوا و برای یەکدی بن.

**٢٦٤١**- عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مُسْلِمٍ عَبْدِ اللهِ الْخُرَاسَانِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَصَافَحُوا يَذْهَبِ الْغِلُّ، وَتَهَادَوْا تَحَابُوا، وَتَذْهَبِ الشَّحْنَاءُ[1].

واتە: لە عەتائی کوڕی ئەبو موسلیم کە عەبدوڵڵای خۆڕاسانییە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەوقە لەگەڵ یەکدی بکەن ڕق ناهێڵێت، وە دیاری و خەڵات بدەن بە یەکدی، خۆشەویست دەبن لە لای یەکدی و دوژمنایەتی ناهێڵێت.

**٢٦٤٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ مُسْلِمٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا، إِلاَّ رَجُلاً كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا، أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ, گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممە دەرگاکانی بە هەشت دەکرێنەوە، لە هەموو بەندەیەك دەبووردرێ کە هیچ هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێت، تەنها کەسێك نەبێت کە لە نێوانی خۆی و مسوڵمانێکی دیکە ڕق و کینەیەك هەبێ (بەهۆیەوە بەینیان نەبێ)، جا دەگوترێ: چاوەڕێی ئەو دووانە بکەن (جارێ لێخۆشبوونیان بۆ نییە) تاوەکوو ئاشت دەبنەوە.

---

(١) ـ ضعيف بهذا اللفظ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٦ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٧ في الجامع؛ وابن حنبل: ٩١٨٨، وفي: ١٠٠٠٧؛ ومسلم: البر [illegible] ٥٦٦٦، وفي: ٥٦٦٨؛ [illegible] ٤٤٣٠، كلهم عن مالك به.

**٢٦٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: تُعْرَضُ أَعْمَالُ النَّاسِ كُلَّ جُمُعَةٍ مَرَّتَيْنِ، وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ مُؤْمِنٍ، إِلاَّ عَبْدًا كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: اتْرُكُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَفِيئَا، أَوِ ارْكُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَفِيئَا[1].**

واته: له ئه‌بو هوڕه‌یره‌وه ﷺ, گێڕدراوه‌ته‌وه (گوتوویه‌تی): کرده‌وه‌ی خه‌ڵکی دوو جار له جومعه‌یه‌کدا (هه‌فته‌یه‌کدا) نمایش ده‌کرێن له ڕۆژانی دوو شه‌ممه و پێنج شه‌ممه‌دا، جا له هه‌موو به‌نده‌یه‌کی بڕوادار ده‌بووردرێ، ته‌نها که‌سێك نه‌بێت له نێوانی خۆی و مسوڵمانێکی دیکه ڕق و کینه‌یه‌ك هه‌بێ (به‌هۆیه‌وه به‌ینیان نه‌بێ)، ده‌گوترێ: چاوه‌ڕێی ئه‌و دووانه بکه‌ن (جارێ لێخۆشبوونیان بۆ نییه) تاوه‌کوو ئاشت ده‌بنه‌وه یان ئه‌و دووانه دوا بخه‌ن تاوه‌کوو پێکدێنه‌وه.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩٨ في الجامع؛ ومسلم: البر والصلة: ١٣٦؛ وابن حبان: ٥٦٦٧، كلهم عن مالك به.

## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی پۆشینی جلوبەرگ بەمەبەستی جوانی و ڕازانەوە پێی[1]

**٢٦٤٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ ﵄، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ بَنِي أَنْمَارٍ، قَالَ جَابِرٌ ﵁: فَبَيْنَا أَنَا نَازِلٌ تَحْتَ شَجَرَةٍ، إِذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلُمَّ إِلَى الظِّلِّ، قَالَ: فَنَزَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقُمْتُ إِلَى غِرَارَةٍ لَنَا، فَالْتَمَسْتُ فِيهَا، فَوَجَدْتُ جِرْوَ قِثَّاءٍ، فَكَسَرْتُهُ، ثُمَّ قَرَّبْتُهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ لَكُمْ هَذَا؟ قَالَ: فَقُلْتُ: خَرَجْنَا بِهِ يَا رَسُولَ اللهِ مِنَ الْمَدِينَةِ، قَالَ جَابِرٌ: وَعِنْدَنَا صَاحِبٌ لَنَا نُجَهِّزُهُ، يَذْهَبُ يَرْعَى ظَهْرَنَا، قَالَ: فَجَهَّزْتُهُ ثُمَّ أَدْبَرَ يَذْهَبُ فِي الظَّهْرِ، وَعَلَيْهِ بُرْدَانِ لَهُ قَدْ خَلَقَا، قَالَ: فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَمَا لَهُ ثَوْبَانِ غَيْرُ هَذَيْنِ؟ فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، لَهُ ثَوْبَانِ فِي الْعَيْبَةِ، كَسَوْتُهُ إِيَّاهُمَا، قَالَ: فَادْعُهُ، فَمُرْهُ فَلْيَلْبَسْهُمَا، قَالَ: فَدَعَوْتُهُ، فَلَبِسَهُمَا، ثُمَّ وَلَّى يَذْهَبُ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا لَهُ ضَرَبَ اللهُ عُنُقَهُ، أَلَيْسَ هَذَا خَيْرًا؟ قَالَ: فَسَمِعَهُ الرَّجُلُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فِي سَبِيلِ اللهِ، قَالَ: فَقُتِلَ الرَّجُلُ فِي سَبِيلِ اللهِ[2].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصارییەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەنگی بەنو ئەنمار دەرچووین، جابر ﵁ دەڵێ: لە کاتێکدا من لەژێر درەختێك گیرسامەوە (پشووم دا)، لەناکاو پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرە بۆ ژێر سێبەر، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ هات و لەوێ گیرسایەوە، منیش چووم بۆ لای گوش و تورەگەیەکی خۆمان و دەستم تێدا گێڕا و ترۆزییەکی بچووکم دەست کەوت و پارچەم کرد، دواتر لە پێغەمبەری خوام ﷺ نزیك کردەوە (تا بیخوات)، فەرمووی: ئەوەتان لەکوێ هێناوە؟ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەوە لەگەڵ خۆمان هێناومانە، جا جابر گوتی: هاوەڵێکیشمان لەلایە ئامادەی دەکەین ئاژەڵەکانمان بۆ دەلەوەڕێنێ، دەڵێ: جا کەسەکەم ئامادە کرد، دواتر کەسەکە ڕۆیشت بەسەر پشتی وڵاغەکەوە

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الثِّيَابِ لِلْجَمَالِ بِهَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦١ في الحدود؛ وفي: ١٨٩٩ في الجامع؛ والشافعي: ١٥٠٢؛ وابن حبان: ٥٤١٨؛ والقابسي: ١٦٦، كلهم عن مالك به.

لە کاتێکدا دوو جلی لەبەردا بوون ڕزی و کۆن ببوون، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کرد و فەرمووی: ئایا دوو جلی دیکەی نییە جگە لەمانە؟ منیش گوتم: بۆنا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جلی هەیە لە مەغزەنی جلوبەرگە، من پێم داوە، فەرمووی: بانگی بکە و فەرمانی پێ بکە با بیانپۆشێت، دەڵێ: منیش بانگم کرد و دوو جلەکانی پۆشی، دواتر پشتی تێ کردین و ڕۆیشت، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆچی وای دەکرد (بۆچی شتی کۆن و ڕزیوی دەکردە بەری) خوا لە گەردنی بدات، ئایا (ئەو جلە نوێیانە) باشر نییە؟ دەڵێ: جا پیاوەکە گوێی لێ بوو (پێغەمبەری خوا ئەو دوعایەی لێ کرد جا تا بۆی نەبێتە عاقیبەتێکی خراپ گەڕایەوە و داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد) و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (بڵێ) لە پێناوی خوا (واتە خوا لە گەردنم بدا لە پێناوی خۆی)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە پێناوی خوا، دەڵێ: جا پیاوەکە کوژرا لە پێناوی خوا ﷻ (لە جیهاد).

**٢٦٤٥-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ أَنْظُرَ إِلَى الْقَارِئِ أَبْيَضَ الثِّيَابِ[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: من حەز دەکەم سەیری زانای پۆشاك سپی بکەم (چونکە جوانی و پۆشاکی سپی بۆ زانایان سوننەتە).

**٢٦٤٦-** عَنِ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ ﷺ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: إِذَا أَوْسَعَ اللهُ عَلَيْكُمْ، فَأَوْسِعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، جَمَعَ رَجُلٌ عَلَيْهِ ثِيَابَهُ[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر خوای پەروەردگار ڕۆزی لەسەر فراوان کردن، ئەوە (شوێنەواری فەزڵی ئەو ڕۆزی و دەوڵەمەندییە) لەسەر خۆتان فراوان بکەن، با هەر کەسێك لە ئێوە چەند جلێك بپۆشێت (واتە ئەو جلانە بکڕێت و بیپۆشێت کە کەماڵ و جوانی و حەیا و حیشمەت زیاد دەکەن، وەك پارچە

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٥ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٨٧ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري [illegible]

جلەکانی ژێرەوە، نەوەك یەك تاقە جل بپۆشێت و عەورەتی دەربکەوێت و جوانی لەدەست بدات، لە کاتێکدا هەبوونە و هەیەتی).

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی پۆشینی جلی بۆیەکراو و لەبەرکردنی زێڕ[1]

**٢٦٤٧-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَلْبَسُ الثَّوْبَ الْمَصْبُوغَ بِالْمِشْقِ، وَالْمَصْبُوغَ بِالزَّعْفَرَانِ[2].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ جلی بۆیەکراو بە گڵی سوور و بۆیەکراو بە زەعفەرانی دەپۆشی.

**٢٦٤٨- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: وَأَنَا أَكْرَهُ أَنْ يَلْبَسَ الْغِلْمَانُ شَيْئًا مِنَ الذَّهَبِ، لأَنَّهُ بَلَغَنِي، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ، فَأَنَا أَكْرَهُهُ لِلرِّجَالِ الْكَبِيرِ مِنْهُمْ وَالصَّغِيرِ[3].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: من پێم باش نییە مناڵی بچوکی کوڕ هیچ زێڕێك بپۆشن، چونکە پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە لەدەستکردنی گوستیلەی زێڕ، جا من بە حەڕامی دادەنێم بۆ پیاوان و بە کەڕاهەتیشی دادەنێم بۆ مناڵی کوڕ.

**٢٦٤٩- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الْمَلاَحِفِ الْمُعَصْفَرَةِ فِي الْبُيُوتِ لِلرِّجَالِ، وَفِي الأَفْنِيَةِ، قَالَ: لاَ أَعْلَمُ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا حَرَامًا، وَغَيْرُ ذَلِكَ مِنَ اللِّبَاسِ أَحَبُّ إِلَيَّ[4].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی سەرچەفی بۆیەکراو بە زەردەچەوە لە ماڵەکان بۆ پیاوان و (پەردەکانی) حەوشە

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الثِّيَابِ الْمُصَبَّغَةِ وَالذَّهَبِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٢ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٣ في الجامع، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٤ في الجامع، عن مالك به.

دەیگوت: هیچ شتێکی حەڕامم دەربارەی ئەوە نەزانیوە، (بەڵام) جل و پۆشاك و قوماشی دیکەم پێ چاکترە.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی پۆشینی جلی سوف کە دەورەی ئاوریشم بێت[١]

**٢٦٥٠**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا كَسَتْ عَبْدَ الله بْنَ الزُّبَيْرِ مِطْرَفَ خَزٍّ كَانَتْ عَائِشَةُ تَلْبَسُهُ[٢].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی جلی سوفی دەورە بە ئاوریشمی لەبەر عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر کردووە کە پێشتر عائیشە ﵂ خۆی دەیپۆشی.

## ٤- ئەوەی ناپەسەندە بۆ ئافرەتان بیپۆشن لە پۆشاك[٣]

**٢٦٥١**- عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ ﵀، عَنْ أُمِّهِ، أَنَّهَا قَالَتْ: دَخَلَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَلَى عَائِشَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَعَلَى حَفْصَةَ خِمَارٌ رَقِيقٌ، فَشَقَّتْهُ عَائِشَةُ ﵂، وَكَسَتْهَا خِمَارًا كَثِيفًا[٤].

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی ئەبو عەلقەمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە دایکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: حەفصەی کچی عەبدوڕڕەحمان هاتە ژوورەوە بۆ لای عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا حەفصە لەچکێکی تەنکی بەسەرەوە بوو، جا عائیشە ﵂ پارچەی کرد (تا جارێکی دیکە نەیپۆشێتەوە) و پۆشتەی کرد بە لەچکێکی ئەستوور.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الْخَزِّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٦ في الجامع؛ وشرح معاني الآثار: ٦٧٣٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مَا يُكْرَهُ لِلنِّسَاءِ لُبْسُهُ مِنَ الثِّيَابِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٧ في الجامع، عن مالك به.

**٢٦٥٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: نِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مَائِلاَتٌ مُمِيلاَتٌ لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ، وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَرِيحُهَا يُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ خَمْسِ مِئَةِ سَنَةٍ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ئافرەتانێکی پۆشتەی ڕووتی لادەر لە دین و حەق (یان خۆبادەر و لەنجەکار)ی وازهێنەر (لە مێردەکانیان)، ناچنە بەهەشت، بۆنیشی ناکەن، لە کاتێکدا بۆنەکەی بەدرێژایی پێنج سەتساڵەڕێ هەستی پێ دەکرێت.

**٢٦٥٣**- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَنَظَرَ فِي أُفُقِ السَّمَاءِ فَقَالَ: مَاذَا فُتِحَ اللَّيْلَةَ مِنَ الْخَزَائِنِ؟ وَمَاذَا وَقَعَ مِنَ الْفِتَنِ؟ كَمْ مِنْ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا، عَارِيَةٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ أَيْقِظُوا صَوَاحِبَ الْحُجَرِ[2].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان هەڵسا و سەیری ئاسۆی ئاسمانی کرد و فەرمووی: ئەمشەو دەبێ چ لە خەزێنەکان کرابنەوە و واڵا کرابن؟! وە دەبێ چ لە فیتنە و خراپە ڕووی دابێ؟! چەند زۆرن ئەو کەسانەی پۆشتەن لە دونیا، ڕووتن لە ڕۆژی دواییدا (ئەو کاتەی خەڵکی چاکەکار پۆشتە دەکرێن)؟! (جا دواتر فەرمووی): هەڵسن ئەوانەی لە ژوورەکانن (مەبەستی خێزانەکانی بوو تا هەڵسن و لە خواپەرستان بن و شەونوێژ بکەن).

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەردانەوە و درێژکردنی دامێنی جلوبەرگ[3]

**٢٦٥٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الَّذِي يَجُرُّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ، لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[4].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٨ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠٩ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي إِسْبَالِ الرَّجُلِ ثَوْبَهُ.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی جلەکەی لەدوای خۆی دەخشێنی لەبەر لووتبەرزی، خوای پەروەردگار ﷻ لە ڕۆژی دوایی (بەڕەحمەت) سەیری ناکات.

**٢٦٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَنْظُرُ اللهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى مَنْ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَرًا[1].**

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ لە ڕۆژی دوایی (بەڕەحمەت) سەیری ئەو کەسە ناکات کە جلەکەی لەدوای خۆی دەخشێنی لەبەر لووتبەرزی.

**٢٦٥٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَنْظُرُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى مَنْ يَجُرُّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ[2].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ لە ڕۆژی دوایی (بەڕەحمەت) سەیری ئەو کەسە ناکات کە جلەکەی لەدوای خۆی دەخشێنی لەبەر لووتبەرزی.

**٢٦٥٧- عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ عَنِ الإِزَارِ، فَقَالَ: أَنَا أُخْبِرُكَ بِعِلْمٍ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِزْرَةُ الْمُسْلِمِ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، لاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَيْنِ، مَا أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ فَفِي النَّارِ، مَا أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ فَفِي النَّارِ، لاَ يَنْظُرُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ بَطَرًا[3].**

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩١١ في الجامع؛ والبخاري: ٥٧٨٨ في اللباس؛ والقابسي: ٣٥٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩١٢ في الجامع؛ والبخاري: ٥٧٨٣ في اللباس؛ ومسلم: اللباس: ٤٢؛ والترمذي: ١٧٣٠ في اللباس؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٧٩٤؛ والقابسي: ١٦٥؛ وفي: ٢٩٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩١٣ في الجامع؛ وابن حبان: ٥٤٤٧؛ والقابسي: ١٣٨، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەلائی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ کرد دەربارەی جلی خوارەوە ئەویش گوتی: من هەواڵت پێ دەدەم لەسەر بنەمای زانیاری: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: شەرواڵ و جلی خوارەوەی کەسی مسوڵمان تا نیوەی قاچەکانیەتی، تاوانی بۆ نییە تا گۆزینگەکانی، (دوو جار فەرمووی) لەوە لەخوارتر بێت لە ئاگردایە، لەوە لەخوارتر بێت لە ئاگردایە، خوای پەروەردگار ﷻ لە ڕۆژی دوایی (بەڕەحمەت) سەیری ئەو کەسە ناکات کە جلەکەی لەدوای خۆی دەخشێنی لەبەر لووتبەرزی.

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی دامێنشۆڕی و بەردانەوەی جلوبەرگ بۆ ئافرەت[1]

**٢٦٥٨**- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ حِينَ ذُكِرَ الإِزَارُ: فَالْمَرْأَةُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: تُرْخِيهِ شِبْرًا، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ ﷺ: إِذًا يَنْكَشِفُ عَنْهَا، قَالَ: فَذِرَاعًا لاَ تَزِيدُ عَلَيْهِ[2].

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە کاتێ باسی دامێنی جلوبەرگ کرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدی ئافرەت (ئەندازەی دامێنی کراسەکەی تا کوێیە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: یەك بست بەردەداتەوە، ئوممو سەلەمە ﷺ گوتی: ئەو کات (قاچ و قولی) دەردەکەوێت (کاتێ خۆی دەچەمێنێتەوە)، فەرمووی: کەواتە با بەئەندازەی باڵێك بێت و زیاتری نەکات.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي إِسْبَالِ الْمَرْأَةِ ثَوْبَهَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩١٧ في الجامع؛ وأبو داود: ٤١١٧ في اللباس؛ وابن حبان: ٥٤٥١؛ والقابسي: ٥٢٣، كلهم عن مالك به.

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی نەعل و پێڵاو لەبەرکردن[١]

**٢٦٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَمْشِيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، لِيَنْعَلْهُمَا جَمِيعًا، أَوْ لِيُحْفِهِمَا جَمِيعًا[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لە ئێوە بە یەك تاك نەعلەوە ڕێ نەکات و نەڕوات، یان با هەردووکیان لەپێ بکات یان با هەردووکیان دابکەنێ.

**٢٦٦٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ، وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، وَلْتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ، وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ هەر یەکێك لە ئێوە نەعلە و پێڵاو لەپێ دەکات با بە ڕاستە دەست پێ بکات، وە کاتێ دایکەند با بە چەپە دەست پێ بکات، کەواتە با ڕاستە بۆ لەپێکردن یەکەم بێت و بۆ داکەندن دوای چەپە بێت.

**٢٦٦١-** عَنْ كَعْبِ الأَحْبَارِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً نَزَعَ نَعْلَيْهِ، فَقَالَ: لِمَ خَلَعْتَ نَعْلَيْكَ؟ لَعَلَّكَ تَأَوَّلْتَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾ ﴾ طه، قَالَ: ثُمَّ قَالَ كَعْبٌ لِلرَّجُلِ: أَتَدْرِي مَا كَانَتْ نَعْلاَ مُوسَى؟[٤].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَدْرِي مَا أَجَابَهُ الرَّجُلُ، فَقَالَ كَعْبٌ: كَانَتَا مِنْ جِلْدِ حِمَارٍ مَيِّتٍ[٥].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الانْتِعَالِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩١٩ في الجامع؛ والبخاري: ٥٨٥٦ في اللباس؛ ومسلم: اللباس: ٦٨؛ وأبو داود: ٤١٣٦ في اللباس؛ والترمذي: ١٧٧٤ في اللباس؛ وابن حبان: ٥٤٦٠؛ والقابسي: ٣٥٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢٠ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٠٠٠٤؛ والبخاري: ٥٨٥٥ في اللباس؛ وأبو داود: ٤١٣٩ في اللباس؛ والترمذي: ١٧٧٩ في اللباس؛ وابن حبان: ٥٤٥٥؛ والقابسي: ٣٦٠، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح.

(٥) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢١ في الجامع؛ وفي: ٢١٨٢ في الضحايا؛ والحدثاني: ٤١٦أ في الصيد والذبائح؛ وفي: ٤١٦ب في الصيد والذبائح، عن مالك به.

واتە: لە کەعبی ئەحبارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك (لە كاتی نوێژ) نەعلەكانی داكەند، كەعبیش ﷺ گوتی: بۆچی نەعلەكانت داكەند؟ ڕەنگە لەبەر ئەو ئایەتە وات كردبێت: ﴿ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾ ﴾ طه، واتە: [نەعلەكانت داكەنە تۆ لە دۆڵی پیرۆزی توای]، دەڵێ: دواتر كەعب ﷺ بە پیاوەكەی گوت: ئایا دەزانی نەعلەكانی موسا ﷺ چۆن بوو (بۆیە دایكەند)؟

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نازانم پیاوەكە چۆن وەڵامی داوەتەوە، (بەڵام دەزانم) كەعب ﷺ گوتی: نەعلەكان لە پێستی گوێدرێژی تۆپیو بوو (بۆیە پەروەردگار ﷻ فەرمووی دایكەنە).

## ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی پۆشینی جلوبەرگ[١]

**٢٦٦٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ لِبْسَتَيْنِ، وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ، عَنِ الْمُلاَمَسَةِ، وَعَنِ الْمُنَابَذَةِ، وَعَنْ أَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ، وَعَنْ أَنْ يَشْتَمِلَ الرَّجُلُ بِالثَّوْبِ الْوَاحِدِ عَلَى أَحَدِ شِقَّيْهِ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لە دوو جلپۆشین و لە دوو مامەڵە كردووە: (لە مامەڵەكاندا نەهی كردووە) لە مونابەزە و مولامەسە (جا مولامەسە ئەوەیە: موشتەری لەناو تاریكیدا دەستی دادەنا لەسەر جلێك و مامەڵەكە دەكەوتە سەر ئەو جلە و دەبووایە حەتمەن ئەو شتەی ببردایە، یان بەپێچراوەیی دەستی لەسەر دادەنا، جا چاك دەرچووایە یان خراپ، وەك یانسیب وا بوو، وە مونابەزەش ئەوەیە: دوو كەس شتیان بۆ یەكتری هەڵدەدا و بەبێ تەماشاكردن شتەكان بەیەكتری دەفرۆشران و بەو شێوەیە مامەڵەكەیان بەسەر یەكتری دەسەپاند)، وە (لە دوو پۆشینەكانیش) نەهی كردووە

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الثِّيَابِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢٢ في الجامع؛ والشافعي: ٧٧؛ وفي: ١٠٧٦؛ وابن حنبل: ٨٩٢٢؛ والبخاري: ٣٥٩ في الصلاة، وفي: ٢١٤٦ في البيوع، وفي: ٥٨٢١ في اللباس؛ ومسلم: البيوع: ١؛ وابن حبان: ٤٩٧٥؛ والقابسي: ٩٩؛ وفي: ٣٥٧، كلهم عن مالك به.

لەوەی كەسێك لەسەر سمتی خۆی دابنیشێ و قاچەكانیشی بچەقێنێ بە تاكە جلێكەوە و عەورەتی هیچی بەسەرەوە نەبێت (شۆرت و بێجامەی لەبەر نەبێت)، وە نەهی كردووە لەوەی مرۆڤ تاكە جلێك لە خۆی بئاڵێنی لەلایەكی جەستەی (لە لایەكەی دیكەش عەورەتی دەربكەوێت).

**٢٦٦٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ تُبَاعُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوِ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ الْحُلَّةَ، فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ، ثُمَّ جَاءَ رَسُولَ اللهِ ﷺ مِنْهَا حُلَلٌ، فَأَعْطَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ مِنْهَا حُلَّةً، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَكَسَطوتنيهَا، وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا، فَكَسَاهَا عُمَرُ ﷺ أَخًا لَهُ مُشْرِكًا بِمَكَّةَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ تاخمە جلێكی پڕ حەریری بینی (دەفرۆشرا) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (زۆر چاك دەبوو) ئەگەر ئەوەت بكڕیبا و لە ڕۆژی هەینی و بۆ (چاوپێكەوتنی) وەفدەكان بتپۆشییایە كاتێ دەهاتن بۆ لات، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: بەدڵنیایی ئەو كەسە ئەوە لەبەر دەكات كە لە دواڕۆژدا هیچ پشك و بەشی (چاكەی) بۆ نییە، پاشان (دوای ماوەیەك) چەند قەدە جلێكی لەو جۆرە كرا بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ تاخمە جلێكی لە پۆشاكەكان بە دیاری دا بە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ، عومەریش ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ من پۆشتە دەكەیت بەو پۆشاكە لە كاتێكدا گوێم لێ بوو ئەوەی فەرمووت دەربارەی جلەكەی عوتارد (كە دەیفرۆشت و گوتم بیكڕە)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من ئەوەم نەداوەتە تۆ تا لەبەری بكەیت، جا عومەر ﷺ ناردی بۆ برایەكی موشریكی خۆی لە مەككە (بەر لەوەی مسوڵمان ببێ)[2].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٩ في الجنائز؛ وفي: ١٩٢٣ في الجامع؛ والشيباني: ٣١٤ في الجنائز؛ وفي: ٨٧٠ في العتاق؛ والشافعي: ٢٦٩؛ والبخاري: ٨٨٦ في الجمعة، وفي: ٢٦١٢ في الهبة؛ ومسلم: اللباس: ٦؛ والنسائي: ١٣٨٢ في الجمعة؛ وأبو داود: ١٠٧٦ في الجمعة، وفي: ٤٠٤٠ في اللباس؛ وابن حبان: ٥٤٣٩؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١١٩٦٨ في الجنائز؛ والقابسي: ٢٥٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بۆیە بۆ براكەی خۆی نارد چونكە كافر بوو و جارێ گوێ بە تەكلیفی شەرع نادات، جا لێرەدا




**٢٦٦٤- قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ وَهُوَ يَوْمَئِذٍ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ، وَقَدْ رَقَّعَ بَيْنَ كَتِفَيْهِ بِرُقَعٍ ثَلاَثٍ، لَبَّدَ بَعْضَهَا فَوْقَ بَعْضٍ[1].**

واته: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتابم ﷺ بینی لە کاتێکدا گەورەی باوەڕداران بوو، سێ پینەی (لە پشتەوە) لە نێوانی شانەکان بوو، لەسەر یەکدی دابوون.

---

ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەت بووە بۆ کافرانیش: [وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين].

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢٤ في الجامع، عن مالك به.



# پەرتووكی سیفەت و ئاكاری

# پێغەمبەری خوا ﷺ (١)



---

١) - كِتابُ صِفَةِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی سیفەتی پێغەمبەری خوا ﷺ[١]

**٢٦٦٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّهُ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلاَ بِالْقَصِيرِ، وَلَيْسَ بِالأَبْيَضِ الأَمْهَقِ، وَلاَ بِالآدَمِ، وَلاَ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلاَ بِالسَّبِطِ، بَعَثَهُ اللهُ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللهُ ﷻ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً، وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ ﷺ [٢].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﵁ گێردراوەتەوە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ باڵای درێژێکی دیار نەبوو، کورتیش نەبوو، وە زۆریش سپی نەبوو، ئەسمەریش نەبوو (بەڵکوو سپییێکی تێکەڵ بە سور بوو، پەمبە بوو)، وە مووی نە لوولێکی قرژن بوو، نە خاویش بوو، خوای پەروەردگار لە دوای تەواوکردنی چل ساڵی ڕەوانەی کرد بە پێغەمبەر، (دوای ڕەوانەکردنی بە پێغەمبەرایەتی) دە ساڵ لە مەککە مایەوە و دە ساڵیش لە مەدینە مایەوە، وە خوای پەروەردگار گەڕاندیەوە لای خۆی لە سەرەتای شەستەکان، (لە کاتێکدا) لە سەر و ڕیشی موبارەکی بیست مووی سپی نەبوون (ڕوحمان بەقوربانی بێ).

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی سیفەتی عیسای کوڕی مەریەم ﵇ و دەجال[٣]

**٢٦٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَرَانِي اللَّيْلَةَ عِنْدَ الْكَعْبَةِ، فَرَأَيْتُ رَجُلاً آدَمَ، كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنْ أُدْمِ الرِّجَالِ، لَهُ لِمَّةٌ، كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ اللِّمَمِ، قَدْ رَجَّلَهَا، فَهِيَ تَقْطُرُ مَاءً، مُتَّكِئًا عَلَى رَجُلَيْنِ أَوْ عَلَى عَوَاتِقِ رَجُلَيْنِ، يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ، فَسَأَلْتُ مَنْ

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ النَّبِيِّ ﷺ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢٥ في الجامع؛ والشيباني: ٩٤٧ في العتاق؛ والبخاري: ٣٥٤٨ في المناقب، وفي: ٥٩٠٠ في اللباس؛ ومسلم: فضائل النبي: ١١٣؛ والترمذي: ٣٦٢٣ في المناقب؛ وابن حبان: ٦٣٨٧؛ والقابسي: ١٥٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، وَالدَّجَّالِ.



هَذَا؟ قِيلَ: هَذَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ، ثُمَّ إِذَا أَنَا بِرَجُلٍ جَعْدٍ قَطَطٍ أَعْوَرِ الْعَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، فَسَأَلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ لِي: هَذَا الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەمشەو لەلای کەعبە (خەونم بینی)، پیاوێکی ئەسمەرم بینی، وەك جوانترین ئەسمەر کە تۆ بینیبێتت لە پیاوی ئەسمەر، قژی تا سەرشانی بوو، وەك جوانترینی تۆ بینیبێتت لەو کەسانەی قژیان تا سەرشانیانە، شانەی کردبوو و دڵۆپە ئاوی لێ دەتکا، خۆی دادابووە سەر دوو پیاو ـ یان خۆی دادابووە سەر شانی دوو پیاو ـ تەوافی بە دەوری کەعبەدا دەکرد، جا پرسیارم کرد ئەوە کێیە؟ گوترا: ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە ﷺ، دواتر پیاوێکم بینی قژلوولی زۆر قرژن بوو چاوی ڕاستەی کوێر بوو، وەك دەنکەترێی پڵقاوە وا بوو، جا پرسیارم کرد ئەوە کێیە؟ پێم گوترا: ئەوە مەسیحی دەجالە (لەعنەتی خوای لێ بێ).

### ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی سوننەتی فیترەت[2]

**٢٦٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: تَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَالاخْتِتَانُ[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێنج شت لە فیترەت و خوی جوانەوەیە (کە بریتین لە): نینۆککردن و کورتکردنەوەی سمێڵ ، هەڵکێشانی مووی بنباڵ (یان تاشینی) و تاشینی مووی عەوڕەت و خەتەنەکردن.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢٦ في الجامع؛ والبخاري: ٥٩٠٢ في اللباس، وفي: ٦٩٩٩ في التعبير؛ ومسلم: الإيمان: ٢٧٣؛ وابن حبان: ٦٢٣١؛ والقابسي: ٢٥٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي السُّنَّةِ فِي الْفِطْرَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢٧ في الجامع؛ والنسائي: ٥٠٤٤ في الزينة؛ والقابسي: ٤١٩، كلهم عن مالك به.




**٢٦٦٨-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ إِبْرَاهِيمُ ﷺ أَوَّلَ النَّاسِ ضَيَّفَ الضَّيْفَ، وَأَوَّلَ النَّاسِ اخْتَتَنَ، وَأَوَّلَ النَّاسِ قَصَّ شَارِبِهِ، وَأَوَّلَ النَّاسِ رَأَى الشَّيْبَ، فَقَالَ: يَا رَبِّ مَا هَذَا؟ فَقَالَ اللهُ ﷻ: وَقَارٌ يَا إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ: رَبِّ زِدْنِي وَقَارًا[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئیبڕاهیم ﷺ یەکەم کەس بوو میوانداری میوانی کرد، وە یەکەم کەس بوو خەتەنەی کرد، وە یەکەم کەس بوو سمێڵی کورت کردەوە، وە یەکەم کەس بوو کە مووی سپی پیری بینی فەرمووی: ئەی پەروەردگارا ئەوە چییە؟ خوای پەروەردگاریش ﷻ فەرمووی: ویقارڕ و ڕێز و شکۆیە ئەی ئیبڕاهیم، ئەویش گوتی: کەواتە پەروەردگارا ویقارم زیاد بکە.

**٢٦٦٩- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: يُؤْخَذُ مِنَ الشَّارِبِ حَتَّى يَبْدُوَ طَرَفُ الشَّفَةِ، وَهُوَ الإِطَارُ، وَلاَ يَجُزُّهُ، فَيُمَثِّلُ بِنَفْسِهِ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: سمێڵ کورت دەکرێتەوە تاوەکوو ڕۆخی لێو دەردەکەوێت، کە بریتییە لە چواردەورەکە، نابێ بیتاشێ و خۆی هەتك بکات.

## ٤- نەهیکردن لە خواردن و خواردنەوە بە دەستی چەپ[2]

**٢٦٧٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ السَّلَمِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَنْ يَأْكُلَ الرَّجُلُ بِشِمَالِهِ، أَوْ يَمْشِيَ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، وَأَنْ يَشْتَمِلَ الصَّمَّاءَ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، كَاشِفًا عَنْ فَرْجِهِ[3].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵای سەلەمییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لەوەی مرۆڤی مسوڵمان بە دەستی چەپی بخوات،

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢٨ في الجامع؛ والشيباني: ٩٨٠ في العتاق، عن مالك به.

(٢) ـ النَّهْيِ عَنِ الْأَكْلِ بِالشِّمَالِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٠ في الجامع؛ والشيباني: ٩٢٤ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٤٥٢٩، وفي: ١٤٧٤٦؛ ومسلم: اللباس: ٧٠؛ وابن حبان: ٥٢٢٥؛ والقابسي: ١٠٤، كلهم عن مالك به.

یان بە یەك تاك نەعلەوە ڕێ بكات و بڕوات، وە لەوەی جل لە خۆی بئاڵێنێ بەشێوەیەك دەستی لەژێرەوە كەلەمچە ببن (بەشێوەیەك ئەگەر بكەوێت نەتوانێت دەریانبێنێت)، وە لەوەی لەسەر سمتەكانی دابنیشێت بە تاقە جلێكەوە عەورەتی دیار بێت (جا لە سەرەوەی یاخەوە عەورەتی دیار بێت یان لە ژێرەوەی جلەكەی).

**٢٦٧١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ، وَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ[١].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ یەكێك لە ئێوە خواردی با بە دەستی ڕاستی بخوات و بە دەستی ڕاستیش بخواتەوە، چونكە شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات و بە دەستی چەپیشی دەخواتەوە.

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی هەژاران[٢]

**٢٦٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ الْمِسْكِينُ بِهَذَا الطَّوَّافِ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ، فَتَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، قَالُوا: فَمَا الْمِسْكِينُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الَّذِي لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يَفْطُنُ النَّاسُ لَهُ فَيُتَصَدَّقَ عَلَيْهِ، وَلاَ يَقُومُ فَيَسْأَلَ النَّاسَ[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوە هەژاری (ڕاستەقینە) نییە بەو سوڕانەوەی كە بەناو خەڵكیدا دەسوڕێتەوە و پارووێك و دوو پاروو و خورماییێك و دوو خورما بەشی دەكات و پێی ڕازییە، گوتیان: ئەی هەژار كێیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: (هەژاری

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣١ في الجامع؛ والشيباني: ٨٨٣ في العتاق؛ وابن حنبل: ٤٨٨٦؛ والدارمي: ٢٠٣٠ في الأطعمة؛ والقابسي: ٦٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْمَسَاكِينِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٢ في الجامع؛ والحدثاني: ٨٠٣ في الجامع؛ والشيباني: ٩٣١ في العتاق؛ والبخاري: ١٤٧٩ في الزكاة؛ والنسائي: ٢٥٧٢ في الزكاة؛ وابن حبان: ٣٣٥٢؛ والقابسي: ٣٦٩، كلهم عن مالك به.

ڕاستەقینە) ئەو کەسەیە شتێکی وای نییە بەشی بکات، خەڵکیش هەستی پێ ناکەن تا پێی ببەخشن، خۆیشی هەڵناستێت داوا لە خەڵکی بکات.

**٢٦٧٣- عَنِ ابْنِ بُجَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ ثُمَّ الْحَارِثِيِّ ﷺ، عَنْ جَدَّتِهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: رُدُّوا الْمِسْكِينَ وَلَوْ بِظِلْفٍ مُحْرَقٍ[١].**

واتە: لە ئیبنو بوجەیدی ئەنصاری حاریسییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە داپیرەیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەڵامی هەژار بدەنەوە و پێی ببەخشن هەرچەندە سمێکی سوتاویش بێت (واتە هەرچەندە با کەمترین شتیش بێت).

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی گەدەکانی کەسی کافر (زۆرخواردنی کافر)[٢]

**٢٦٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَأْكُلُ الْمُسْلِمُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ[٣].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤی بڕواداری (ڕاستەقینە و بەقەناعەت) بەئەندازەی یەك گەدە دەخوات (واتە تەنها ئەوەندە دەخوات تا برسییەتی بشکێ)، کافریش بەئەندازەی چەندین گەدە دەخوات (واتە تەنگەی پڕ پڕ دەکات).

**٢٦٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ضَافَهُ ضَيْفٌ كَافِرٌ، فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِشَاةٍ فَحُلِبَتْ، فَشَرِبَ حِلاَبَهَا، ثُمَّ أُخْرَى فَشَرِبَهُ، ثُمَّ أُخْرَى فَشَرِبَهُ، حَتَّى شَرِبَ حِلاَبَ سَبْعِ شِيَاهٍ، ثُمَّ إِنَّهُ أَصْبَحَ، فَأَسْلَمَ، فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِشَاةٍ فَحُلِبَتْ، فَشَرِبَ حِلاَبَهَا، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ**

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٣ في الجامع؛ وفي: ٢١٠٤ في الجامع؛ والشيباني: ٩٣٣ في العتاق؛ وابن حنبل: ٢٧٤٩٠؛ والنسائي: ٢٥٦٥ في الزكاة؛ وابن حبان: ٣٣٧٤؛ والقابسي: ١٨١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي مِعَى الْكَافِرِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٤ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥٨ في العتاق؛ والبخاري: ٥٣٩٦ في الأطعمة؛ وابن حبان: ١٦١، وفي: ٥٢٣٨؛ والقابسي: ٣٦٧، كلهم عن مالك به.

بِأُخْرَى، فَلَمْ يَسْتَتِمَّهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْمُؤْمِنُ يَشْرَبُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَشْرَبُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ میوانداری میوانێکی کافری کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بزنێکی بۆ بدۆشرێت، جا شیرە دۆشراوەکەی خواردەوە، دواتر بزنێکی دیکە دۆشرا و خواردیەوە، دواتر بزنێکی دیکە دۆشرا و خواردیەوە، تا شیری دۆشراوی حەوت بزنی خواردەوە، دواتر بەیانی کردەوە و بوو بە مسوڵمان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بزنێکی بۆ بدۆشرێت، جا شیرە دۆشراوەکەی خواردەوە، دواتر فەرمانی کرد یەکێکی دیکەی بۆ دۆشرا، جا تەواوی نەکرد (گشتی نەخواردەوە) جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مرۆڤی بڕواداری (ڕاستەقینە و بەقەناعەت) بەئەندازەی یەك گەدە دەخواتەوە (واتە تەنها ئەوەندە دەخواتەوە تا برسییەتی بشکێ)، کافریش بەئەندازەی حەوت گەدە دەخواتەوە (واتە تەنگەی پڕ پڕ دەکات).

## ٧- حەڕامییەتی خواردنەوە لە دەفری زیو و نەهیکردن لە هەناسەدان و فووکردنە ناو خواردنەوە[2]

**٢٦٧٦-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ، إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ[3].

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە دەفری زیو دەخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخی کردۆتە سکی خۆی.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٥ في الجامع؛ وابن حنبل: ٨٨٦٦؛ ومسلم: الأشربة: ١٨٦؛ والترمذي: ١٨١٩ في الأطعمة؛ وابن حبان: ١٦٢، وفي: ٥٢٣٥؛ والقابسي: ٤٤٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ النَّهْيُ عَنِ الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ، وَالنَّفْخِ فِي الشَّرَابِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٧ في الجامع؛ والشيباني: ٨٨٢ في العتاق؛ والشافعي: ٢٢؛ والبخاري: ٥٦٣٤ في الأشربة؛ ومسلم: اللباس: ١؛ وابن حبان: ٥٣٤٢؛ والقابسي: ٢٦٢، كلهم عن مالك به.

**٢٦٧٧-** عَنْ أَبِي الْمُثَنَّى الْجُهَنِيِّ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ ﵀، فَدَخَلَ عَلَيْهِ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﵁، فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ ﵀: أَسَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنِ النَّفْخِ فِي الشَّرَابِ؟ فَقَالَ لَهُ أَبُو سَعِيدٍ ﵁: نَعَمْ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي لاَ أَرْوَى مِنْ نَفَسٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَأَبِنِ الْقَدَحَ عَنْ فِيكَ، ثُمَّ تَنَفَّسْ، قَالَ: فَإِنِّي أَرَى الْقَذَاةَ فِيهِ، قَالَ: فَأَهْرِقْهَا[١].

واتە: لە ئەبو موسەنای جوهەنییەوە ﵁ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: لەلای مەڕوانی کوڕی حەکەم ﵀ بووم، ئەبو سەعیدیش ﵁ هاتە ژوورەوە بۆ لای، جا مەڕوانی کوڕی حەکەم ﵀ پێی گوت: ئایا گوێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە نەهی کردبێت لە فووکردن لە خواردنەوەدا؟ ئەبو سەعیدیش ﵁ گوتی: بەڵێ، پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بە یەك نەفەس و (بە یەك جار ئاو بخۆمەوە) تینووەتیم ناشکێ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: کەواتە دەفر و جامەکە لە دەمت دوور بخەرەوە دواتر هەناسە بدە، گوتی: (وەسواسم ئەگەر دووری بخەمەوە سەیری ئاوەکە دەکەم) پیسی دەبینم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە بیڕێژە (ئەوەی دەمێنێتەوە بیڕێژە مادەم بێزت لێ دەبێتەوە).

## ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنەوە لە کاتێکدا کەسەکە وەستاوە[٢]

**٢٦٧٨-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَعُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﵃ كَانُوا يَشْرَبُونَ قِيَامًا[٣].

---

(١) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٨ في الجامع؛ والشيباني: ٩٤٠ في العتاق؛ وابن حنبل: ١١٢١٩، وفي: ١١٢٩٧، وفي: ١١٥٥٨؛ والترمذي: ١٨٨٧ في الأشربة؛ وابن حبان: ٥٣٢٧؛ والدارمي: ٢١٢١ في الأشربة، وفي: ٢١٣٣ في الأشربة؛ وأبو يعلى الموصلي: ١٣٠١؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٤١٦٨ في الأشربة؛ والقابسي: ١٣١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي شُرْبِ الرَّجُلِ وَهُوَ قَائِمٌ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣٩ في الجامع؛ والشيباني: ٨٨١ في العتاق، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب و عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بەڕاوەستان خواردنەوەیان دەخواردەوە.

**٢٦٧٩-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، وَسَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ كَانَا لاَ يَرَيَانِ بِشُرْبِ الإِنْسَانِ وَهُوَ قَائِمٌ بَأْسًا(١).

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عائیشەی دایکی باوەڕداران و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ پێیان وا نەبووە خواردنەوەی مرۆڤ لە کاتێکدا بەپێوەیە کێشەی هەبێت.

**٢٦٨٠-** عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الْقَارِئِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَشْرَبُ قَائِمًا(٢).

واتە: لە ئەبو جەعفەری قاریئەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ بینی بەڕاوەستان خواردنەوەی دەخواردەوە.

**٢٦٨١-** عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَشْرَبُ قَائِمًا(٣).

واتە: لە عامری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە کە بەڕاوەستانەوە خواردنەوەی خواردۆتەوە.

## ٩- سوننەت لە خواردنەوە و پێدان (بە خەڵکی) لای ڕاستە(٤)

**٢٦٨٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ مِنَ الْبِئْرِ، وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ، وَعَنْ يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ، فَشَرِبَ، ثُمَّ أَعْطَى الأَعْرَابِيَّ، وَقَالَ: الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ(٥).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٠ في الجامع؛ والشيباني: ٨٨٠ في العتاق، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٢ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤١ في الجامع، عن مالك به.

(٤) ـ السُّنَّةُ فِي الشُّرْبِ وَمُنَاوَلَتِهِ عَنِ الْيَمِينِ.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٥ في الجامع؛ والشيباني: ٨٨٤ في العتاق؛ والبخاري: ٥٦١٩ في الأشربة؛ ومسلم: الأشربة: ١٢٤؛ وأبو داود: ٣٧٢٦ في الأشربة؛ والترمذي: ١٨٩٣ في الأشربة؛ وابن ماجه: ٣٤٦٨





واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شیری بۆ هێنرا کە تێکەڵ کرابوو بە ئاوی بیر، جا لەلای ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی دەشتەکی هەبوو و لەلای چەپیشی ئەبو بەکری صدیق (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (هەندێك لە) شیرەکەی خواردەوە، دواتر دای بە دەشتەکییەکە و فەرمووی: لە ڕاستەوە بۆ ڕاستە (لێك وەربگرن و بخۆنەوە).

**٢٦٨٣-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلَامٌ، وَعَنْ يَسَارِهِ الأَشْيَاخُ، فَقَالَ لِلْغُلَامِ: أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هَؤُلَاءِ؟ فَقَالَ الْغُلَامُ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَدًا، قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي يَدِهِ[1].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنەوەیەکیان بۆ هێنا و لێی خواردەوە، جا هەرزەکارێك لەلای ڕاستەی بوو و بەتەمەن و ناودارەکانیش لەلای چەپەی بوون، جا بە هەرزەکارەکەی فەرموو: ئایا مۆڵەتم پێ دەدەی (سەرەتا شیرەکە) بدەم بەمانە؟ هەرزەکارەکە گوتی: نەخێر سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پشکی خۆم لە (بەرەکەتی) تۆ نادەم بە هیچ کەسێك (دەبێ ڕاستەوخۆ دەمم بەر شوێنی دەمی موبارەکی تۆ بکەوێت و ئەو فرسەتە دەقۆزمەوە)، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفرەکەی خستە دەستی.

---

في الأشربة؛ وابن حبان: ٥٣٣٣، وفي: ٥٣٣٤، وفي: ٥٣٣٧؛ والقابسي: ٣، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٦ في الجامع؛ والشيباني: ٨٨٥ في العتاق؛ وابن حنبل: ٢٢٨٧٥، وفي: ٢٢٩١٨؛ والبخاري: ٢٤٥١ في المظالم، وفي: ٢٦٠٢ في الهبة، وفي: ٢٦٠٥ في الهبة، وفي: ٥٦٢٠ في الأشربة؛ ومسلم: الأشربة: ١٢٧؛ وابن حبان: ٥٣٣٥؛ والقابسي: ٤١٣، كلهم عن مالك به.

## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردن و خواردنەوە بەگشتی[١]

**٢٦٨٤-** عَنْ أَنَس بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ أَبُو طَلْحَةَ لأُمِّ سُلَيْمٍ: لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ضَعِيفًا، أَعْرِفُ فِيهِ الْجُوعَ، فَهَلْ عِنْدَكِ مِنْ شَيْءٍ؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَأَخْرَجَتْ أَقْرَاصًا مِنْ شَعِيرٍ، ثُمَّ أَخَذَتْ خِمَارًا لَهَا، فَلَفَّتِ الْخُبْزَ بِبَعْضِهِ، ثُمَّ دَسَّتْهُ تَحْتَ يَدِي، وَرَدَّتْنِي بِبَعْضِهِ، ثُمَّ أَرْسَلَتْنِي إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: فَذَهَبْتُ بِهِ، فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ، وَمَعَهُ النَّاسُ، فَقُمْتُ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: آرْسَلَكَ أَبُو طَلْحَةَ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: لِلطَّعَامِ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِمَنْ مَعَهُ: قُومُوا، قَالَ: فَانْطَلَقَ، وَانْطَلَقْتُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ حَتَّى جِئْتُ أَبَا طَلْحَةَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، قَدْ جَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالنَّاسِ، وَلَيْسَ عِنْدَنَا مِنَ الطَّعَامِ مَا نُطْعِمُهُمْ، فَقَالَتِ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَانْطَلَقَ أَبُو طَلْحَةَ، حَتَّى لَقِيَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَبُو طَلْحَةَ مَعَهُ، حَتَّى دَخَلاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَلُمِّي يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا عِنْدَكِ؟ فَأَتَتْ بِذَلِكَ الْخُبْزِ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَفُتَّ، وَعَصَرَتْ عَلَيْهِ أُمُّ سُلَيْمٍ عُكَّةً لَهَا فَآدَمَتْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، حَتَّى أَكَلَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ وَشَبِعُوا، وَالْقَوْمُ سَبْعُونَ رَجُلاً أَوْ ثَمَانُونَ رَجُلاً[٢].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: ئەبو تەلحە (کە زڕباوکی ئەنەسی کوڕی مالیك)ـە بە دایکی سولەیمی گوت ـ کە دایکی حەقی ئەنەسی کوڕی مالیکە ـ: گوێم لێ بوو دەنگی پێغەمبەری خوا ﷺ لاواز بوو، دەزانم برسیەتی، جا ئایا خواردنێکت لایە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، جا چەند سەموونێکی جۆی دەرهێنا، دواتر چارۆگێکی خۆی هێنا و بەشێکی لە سەموونەکە ئاڵاند، دواتر لەبن باڵمەوە

---

(١) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٨ في الجامع؛ والشيباني: ٨٨٩ في العتاق؛ والبخاري: ٤٢٢ في الصلاة، وفي: ٣٥٧٨ في المناقب، وفي: ٥٣٨١ في الأطعمة، وفي: ٦٦٨٨ في الأيمان والنذور؛ ومسلم: الأشربة: ١٤٢؛ والترمذي: ٣٦٣٠ في المناقب؛ وابن حبان: ٦٥٣٤؛ والقابسي: ١١٩، كلهم عن مالك به.

هێنای و بەسەر پشتی دادام (واتە وەك بەرامپیل کردیە شانمەوە)، دواتر ناردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (تا بانگی بکەم بۆ لایێك و بەتەنها بیخوات)، منیش بردم، بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنی نوێژکردن دانیشتووە و خەڵکی دیکەشی لەگەڵە، منیش چووم بۆ لایان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەبو تەلحە تۆی ناردووە؟ دەڵێ: منیش گوتم: بەڵێ، فەرمووی: بۆ خواردن؟ دەڵێ منیش گوتم: بەڵێ، پێغەمبەری خواش ﷺ بەو کەسانەی فەرموو کە لەگەڵی بوون: هەڵسن، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت، منیش پێشی ئەوان ڕۆیشتم تا هاتم بۆ لای ئەبو تەلحە و هەواڵم پێ دا (بەوەی شەرمم کردووە و کارەکەم تێکداوە و ئێستا خەریکە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان دێن بۆ لای تۆ تا نان بخۆن)، جا ئەبو تەلحە گوتی: ئەی ئوم سولەیم پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی لەگەڵ خۆی هێناوە و ئێمەش خواردنمان نییە بیاندەینێ (چ بکەین)، ئەویش گوتی: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن (شەرمەزار نابین)، جا ئەبو تەلحە ڕۆیشت تا بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هات لە کاتێکدا ئەبو تەلحەشی لەگەڵ بوو، (هاتن) تا هاتنە ژوورەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئوم سولەیم ئەوەم بۆ بێنە کە لەلاتە؟ ئەویش سەمموونەکەی هێنا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد پارچە کرا، ئوم سولەیمیش دێمکەیەکی بەسەردا چۆڕاندەوە و کردی بە پێخۆر بۆ سەمموونەکە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی خوا ویستی لێ بوو بەسەریدا خوێند و دواتر فەرمووی: (ئەی ئەبو تەلحە) ئیزن بدە با دە کەس بێنە ژوورەوە (بۆ ژووری خواردن)، ئەبو تەلحەش ئیزنی پێ دان، جا خواردیان تا تێر بوون و چوونە دەرەوە، دواتر فەرمووی: ئیزن بدە با دە کەسی دیکە بێنە ژوورەوە، ئەبو تەلحەش ئیزنی پێ دان، جا خواردیان تا تێر بوون و چوونە دەرەوە، دواتر فەرمووی: ئیزن بدە با دە کەسی دیکە بێنە ژوورەوە، ئەبو تەلحەش ئیزنی پێ دان، جا خواردیان تا تێر بوون و چوونە دەرەوە، دواتر فەرمووی: ئیزن بدە با دە کەسی دیکە بێنە ژوورەوە، ئەبو تەلحەش ئیزنی پێ دان، جا خواردیان تا تێر بوون و چوونە دەرەوە، دواتر فەرمووی: ئیزن بدە با دە کەسی دیکە بێنە ژوورەوە، (جا هەر بەم شێوەیە بەردەوام بوو) تا گشت خەڵکەکە خواردیان و تێر بوون، لە کاتێکدا خەڵکەکە حەفتا ـ یان هەشتا ـ کەس بوون.

**٢٦٨٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: طَعَامُ الاِثْنَيْنِ كَافِي الثَّلاَثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلاَثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خواردنی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکات، وە خواردنی سێ کەس بەشی چوار کەس دەکات.

**٢٦٨٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَغْلِقُوا الْبَابَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، وَأَكْفِئُوا الإِنَاءَ، أَوْ خَمِّرُوا الإِنَاءَ، وَأَطْفِئُوا الْمِصْبَاحَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ غَلَقًا، وَلاَ يَحُلُّ وِكَاءً، وَلاَ يَكْشِفُ إِنَاءً، وَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ عَلَى النَّاسِ بَيْتَهُمْ[٢].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ، گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەرگاکان دابخەن و دەمی کوندەی شلەمەنییەکانتان ببەستن و مەنجەڵ و قاپەکانی خواردنەکانتان سەراونخوون بکەن - یان دایانپۆشن - و ڕووناکییەکان بکوژێننەوە، چونکە شەیتان شتی داخراو و گرێی کوندە و مەشکەکان ناکاتەوە و سەرقاپیش لانادات، بێگومان (زیندەوەر و باڵندە) لە سنووردەرچووەکان (واتە زیانبەخشەکان، وەك مشك و قەڵەڕەش و کۆلارە و ... هتد، بەهۆی چراکانەوە) ماڵ بەسەر خەڵکییەوە دەسوتێنن.

**٢٦٨٧-** عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْكَعْبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، جَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَضِيَافَتُهُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ، فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٩ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩٠ في العتاق؛ والبخاري: ٥٣٩٢ في الأطعمة؛ ومسلم: الأشربة: ١٧٨؛ والترمذي: ١٨٢٠ في الأطعمة؛ والقابسي: ٣٦٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٠ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥٧ في العتاق؛ وأبو داود: ٣٧٣٢ في الأشربة؛ والترمذي: ١٨١٢ في الأطعمة؛ وابن حبان: ١٢٧١؛ والقابسي: ١٠٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥١ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥٣ في العتاق؛ وابن حنبل: ٢٧٢٠٥؛ والبخاري: ٨٥ في الأدب؛ وأبو داود: ٣٧٤٨ في الأطعمة؛ وابن حبان: ٥٢٨٧؛ والقابسي: ٤١٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو شورەیحی کەعبییەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بکات یان بێدەنگ بێت، وە هەر کەسێك بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە دراوسێی بگرێت، وە هەر کەسێك بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێت، جا خۆپێوەماندووکردن و زیادەڕێزی میوانداری بریتییە لە شەو و ڕۆژێك، وە میوانداریکردن (ی ئاساییش) بریتییە لە سێ ڕۆژ، دوای ئەو ماوەیەش خێر و صەدەقەیە (ئەگەر زیاتر ڕایبگرێت چاکە)، وە بۆ میوانەکەش دروست و حەڵاڵ نییە ئەوەندە بمێنێتەوە تا خاوەن ماڵ بێزار و ئیحراج دەکات[١].

**٢٦٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، إِذِ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا، فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، وَخَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ، فَمَلأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، حَتَّى رَقِيَ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ لأَجْرًا؟ فَقَالَ: فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاتێکدا پیاوێك بە ڕێگەدا دەڕۆیشت تینوێتییەکی توند زۆری بۆ هێنا، جا بیرێکی دۆزییەوە و چووە ناویەوە و ئاوی خواردەوە، دواتر هاتە دەرەوە، لەو کاتەدا سەگێکی بینی زۆری تینوو بوو، خۆڵی دەخوارد لە تینووێتییان،

---

(١) ـ تێبینی: واتە لە ڕۆژی یەکەم هەرچی لە تواناتدا هەیە بۆ میوانی بکە و لە عادەتی ڕۆژانەی خۆت زیاتر شتی بۆ بکرە و ڕێزی لێ بنێ و مەچۆ بۆ کارەکەت ئەگەر گونجا، لە دوو ڕۆژی دواتر وەك ڕۆژەکەی پێشوو تەکلیف لە خۆت مەکە (جا ئەگەر هەبوون بوویت و وەك ڕۆژی یەکەم خزمەتت کرد ئەوە باشتر، بەڵام ئەگەر نەبوون بوویت ئەوە لەسەرت نییە)، بەڵکوو وەکوو ڕۆژانی ئاسایی چیت خوارد بەڕێز و حورمەتەوە پێشکەشی ئەویشی بکە، جا دوای ئەم سێ ڕۆژە لەسەرت نییە خۆت لە ئیشوکار بکەیت ئەگەر پێویستت بێت و بۆت نەگونجێت، بۆیە ئەگەر زیاتریش ڕایبگریت ئەوە خێرێکە و ئەنجامی دەدەیت، بۆ میوانیش وا باشە لە سێ ڕۆژ زیاتر نەمێنێتەوە ئەگەر پێویست و زەڕور نەبێت.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٢ في الجامع؛ والشيباني: ٩٣٤ في العتاق؛ وابن حنبل: ٨٨٦١، وفي: ١٠٧١٠؛ والبخاري: ٢٣٦٣ في المساقاة، وفي: ٢٤٦٦ في المظالم، وفي: ٦٠٠٩ في الأدب؛ ومسلم: السلام: ١٥٣؛ وأبو داود: ٢٥٥٠ في الجهاد؛ وابن حبان: ٥٤٤؛ والقابسي: ٤٣٤، كلهم عن مالك به.

جا پیاوەکە (لە دڵی خۆی) گوتی: ئەم سەگە ڕادەی تینوویتی گەیشتۆتە ڕادەی تینوویتی من، جا چووە ناو بیرەکە و پێڵاوەکانی پڕ ئاو کرد و بە دەمی گرتی (تا هاتە سەرەوە)، جا ئاوەکەی دا بە سەگەکە و خوا پاداشتی ئەو کارەی دایەوە پیاوەکە و لێی خۆشبوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە باش مامەڵەکردنمان لەگەڵ ئاژەڵەکانیش پاداشتمان بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ: لە هەموو خاوەن جەرگێکی تەڕ پاداشتتان بۆ هەیە (واتە ئەو شتەی چاکەی بەرانبەر دەکەن هەر ئەوەندەیە ڕووحی تیا بێ پاداشتتان بۆ هەیە لەسەر چاکەکردنتان بەرانبەری).

**٢٦٨٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعْثًا قِبَلَ السَّاحِلِ، فَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ ﷺ، وَهُمْ ثَلاَثُمِئَةٍ، قَالَ: وَأَنَا فِيهِمْ، قَالَ: فَخَرَجْنَا حَتَّى إِذَا كُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، فَنِيَ الزَّادُ، فَأَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِأَزْوَادِ ذَلِكَ الْجَيْشِ، فَجُمِعَ ذَلِكَ كُلُّهُ، فَكَانَ مِزْوَدَيْ تَمْرٍ، قَالَ: فَكَانَ يُقَوِّتُنَاهُ كُلَّ يَوْمٍ قَلِيلاً قَلِيلاً، حَتَّى فَنِيَ، وَلَمْ تُصِبْنَا إِلاَّ تَمْرَةٌ تَمْرَةٌ، فَقُلْتُ: وَمَا تُغْنِي تَمْرَةٌ، فَقَالَ: لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حَيْثُ فَنِيَتْ، قَالَ: ثُمَّ انْتَهَيْنَا إِلَى الْبَحْرِ، فَإِذَا حُوتٌ مِثْلُ الظَّرِبِ، فَأَكَلَ مِنْهُ ذَلِكَ الْجَيْشُ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ أَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِضِلْعَيْنِ مِنْ أَضْلاَعِهِ، فَنُصِبَا، ثُمَّ أَمَرَ بِرَاحِلَةٍ فَرُحِلَتْ، ثُمَّ مَرَّتْ تَحْتَهُمَا وَلَمْ تُصِبْهُمَا[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الظَّرِبُ الْجُبَيْلُ.

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (سوپاییێکی) نارد بۆ ناوچەکانی قەراغی دەریا و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحیشی ﷺ کرد بە گەورە بەسەریان، لە کاتێکدا ژمارەیان سێ سەت کەس بوو، جابر دەڵێ: منیش لەناویان بووم، دەڵێ: جا دەرچووین کاتێ لە یەکێك لە ڕێگایەکان بووین توێشوو و زەخیرەمان لێ بڕا، جا ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد زاد و زەخیرەی (گشتی) سوپاکە بهێنرێت، جا گشتی کۆ کرایەوە، یەك چارۆکە خورما بوو، دەڵێ: جا هەموو ڕۆژێك کەم کەمان لێ دەخوارد، تا تەواو بوو، (دواتر زەخیرە تایبەتییەکانیش کۆ کرایەوە) هەر یەکەمان لە یەك دەنکە خورما زیاتری بەرنەکەوت، منیش گوتم: جا

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٣ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٤٣٢٥؛ والبخاري: ٢٤٨٣ في الشركة، وفي: ٤٣٦٠ في المغازي؛ ومسلم: الصيد: ٢١؛ وابن حبان: ٥٢٦٢؛ والقابسي: ٤٨٦، كلهم عن مالك به.

یەك دەنکە خورما بەشی چی دەکا، (ئەبو عوبەیدەش) گوتی: کاتێ ئەوەش نامێنێت دەزانین هەبوونی ئەو دەنکە خورمایەش هەر باشە (خۆ هەر نەبێ زار و دەم تەڕ و شیرین دەکاتەوە و شتێك دەچێتە گەدە)، دواتر گەیشتینە قەراغی دەریا و بینیمان نەهەنگێکی لێیە (مردووە و کەوتۆتە قەراغی دەریا) وەك پارچە شاخ وابوو (هێندە گەورە بوو)، جا ئەو سوپایە دوازدە ڕۆژ لێیان خوارد، دواتر ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد دوو پەراسووی نەهەنگەکە بچەقێنرێن (تا بزانن چەند گەورەیە)، جا چەقێنران، دواتر فەرمانی بە سوارێك کرد (بە ژێریدا بڕوات)، جا (بەهەڵسانەوە لەسەر پشتی وڵاغ) بەژێریدا ڕۆیشت و دەستی پێیان نەگەیشت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: «الظَّرِبُ»: بریتییە لە شاخێکی بچووك.

**٢٦٩٠- عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ ﷺ، عَنْ جَدَّتِهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَا نِسَاءَ الْمُؤْمِنَاتِ، لاَ تَحْقِرَنَّ إِحْدَاكُنَّ لِجَارَتِهَا، وَلَوْ كُرَاعَ شَاةٍ مُحْرَقًا**[1].

واتە: لە عەمری کوڕی سەعدی کوڕی موعازەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە داپیریەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئافرەتانی بڕوادار، با هیچێك لە ئێوە شتی دراوسێکەی بە کەم نەزانێت ئەگەرچی پێچکێکی سوتاوی دواوەی قاچی ئاژەڵیش بێت (کاتێ بەخێر یان بەدیاری بۆتان دێت).

**٢٦٩١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ، نُهُوا عَنْ أَكْلِ الشَّحْمِ، فَبَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ**[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا جوولەکەکان لەناو ببات خواردنی بەزیان لەسەر حەڕام کرا، چوون فرۆشتیان و پارەکەیان خوارد (واتە بە جۆرێکی دیکە خواردیان، پێیان وا بووە دەتوانن فێڵ لە خوا بکەن).

---

(١) ـ حسن بشواهده. أخرجه القابسي: ١٨٠، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٥ في الجامع، عن مالك به.

**٢٦٩٢- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ كَانَ يَقُولُ: يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ، عَلَيْكُمْ بِالْمَاءِ الْقَرَاحِ، وَالْبَقْلِ الْبَرِّيِّ، وَخُبْزِ الشَّعِيرِ، وَإِيَّاكُمْ وَخُبْزَ الْبُرِّ، فَإِنَّكُمْ لَنْ تَقُومُوا بِشُكْرِهِ(١).**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عیسای کوڕی مەریەم ﷺ دەیفەرموو: ئەی نەوەی ئیسرائیل دەست بگرن بە ئاو (تەنها ئاو بخۆنەوە)، لەگەڵ سەوزەواتی دەشت و نانی جۆ، خۆتان دوور بگرن لە نانی گەنم، چونکە شوکرانەبژێری نانی گەنمتان پێ ناکرێت (ئەوەندە عیبادەتە ناکەن ببێتە شوکر و حەقی ئەو نیعمەتە بدەن).

**٢٦٩٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَوَجَدَ فِيهِ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ، وَعُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، فَسَأَلَهُمَا، فَقَالاَ: أَخْرَجَنَا الْجُوعُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَأَنَا أَخْرَجَنِي الْجُوعُ، فَذَهَبُوا إِلَى أَبِي الْهَيْثَمِ بْنِ التَّيِّهَانِ الأَنْصَارِيِّ، فَأَمَرَ لَهُمْ بِشَعِيرٍ عِنْدَهُ يُعْمَلُ، وَقَامَ يَذْبَحُ لَهُمْ شَاةً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَكِّبْ عَنْ ذَاتِ الدَّرِّ، فَذَبَحَ لَهُمْ شَاةً، وَاسْتَعْذَبَ لَهُمْ مَاءً، فَعُلِّقَ فِي نَخْلَةٍ، ثُمَّ أُتُوا بِذَلِكَ الطَّعَامِ، فَأَكَلُوا مِنْهُ، وَشَرِبُوا مِنْ ذَلِكَ الْمَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَتُسْأَلُنَّ عَنْ نَعِيمِ هَذَا الْيَوْمِ(٢).**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی (جارێکیان) : پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو مزگەوت و ئەبو بەکر و عومەری (خوا لێیان ڕازی بێ) بینی و پرسیاری لێ کردن (چی ئێوەی هێناوەتە مزگەوت)؟ ئەوانیش گوتیان: برسییەتی دەریپەڕاندووین، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: منیش برسییەتی دەریپەڕاندووم، جا ڕۆیشتن بۆ لای هەیسەمی کوڕی تەیهانی ئەنصاری، ئەویش فەرمانی کرد جۆیان بۆ بکرێت بە نان، وە هەڵسا بزنێك سەر ببڕێت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: واز لە بزنی بەشیر بێنە (بزنی بەشیر سەر نەبڕی)، جا کاریلەیەکی بۆ سەربڕین و ئاوی شیرینی بۆ هێنان (چونکە زۆربەی ئاوەکانی مەدینە سوێر بوون)، ئاوەکەی بە دارخورمایەکەوە هەڵواسی (تا با لێی بدات و فێنك بێت)، دواتر ئەو خواردنانەی هێنا و لە خواردنەکەیان خوارد و لە ئاوەکەشیان

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٦ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٧ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٠٤ في الجامع، عن مالك به.

خواردەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەدڵنیایی پرسیارتان لێ دەکرێت دەربارەی نیعمەتەکانی ئەمڕۆ (پرسیارکردنی منەت و فەزڵ، نەك پرسیارکردنی موحاسەبە).

**٢٦٩٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَأْكُلُ خُبْزًا بِسَمْنٍ، فَدَعَا رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ وَيَتَّبِعُ بِاللُّقْمَةِ وَضَرَ الصَّحْفَةِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: كَأَنَّكَ مُقْفِرٌ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أَكَلْتُ سَمْنًا، وَلاَ رَأَيْتُ أَكْلاً بِهِ مُنْذُ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: لاَ آكُلُ السَّمْنَ حَتَّى يَحْيَا النَّاسُ مِنْ أَوَّلِ مَا يَحْيَوْنَ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نانی بە ڕۆنەوە دەخوارد، جا بانگی پیاوێکی دەشتەکی کرد (تا لەگەڵی بخوات)، جا هەر دەیخوارد و بە پاروو بەدوای ڕۆنەکەوە بوو و سینییەکەی پیس و پۆخڵ کرد، ئیامی عومەریش ﷺ گوتی: دەڵێی ڕۆنت نەبینیوە؟ پیاوەکە گوتی: سوێند بە خوا ڕۆنم نەخواردووە، خواردنێکیشم نەخواردووە ڕۆنی تیا بێت ماوەی ئەوەندە و ئەوەندەیە، جا عومەر ﷺ گوتی: چیدی ڕۆن ناخۆم تا خەڵك سەرەتای بووژانەوەی دەست پێ دەکات و دەوڵەمەندی و هەبوونی ڕوویان تێ دەکات.

**٢٦٩٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ وَهُوَ يَوْمَئِذٍ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ، يُطْرَحُ لَهُ صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ، فَيَأْكُلُهُ حَتَّى يَأْكُلَ حَشَفَهَا[٢].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتابم ﷺ بینی ـ لە کاتێکدا گەورەی باوەڕداران بوو ـ صاعێك لە خورمای بۆ دادەنرا دەیخوارد هەتا وشك و خراپەکەشی دەخوارد.

**٢٦٩٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ عَنِ الْجَرَادِ؟ فَقَالَ: وَدِدْتُ أَنَّ عِنْدِي قَفْعَةً نَأْكُلُ مِنْهُ[٣].

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٩ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٠٦ في الجامع؛ والشيباني: ٩٢٩ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٠ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦١ في الجامع؛ والشيباني: ٦٥٣ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ پرسیاری لێ کرا دەربارەی کلۆ؟ گوتی: حەزم دەکرد سەبەتەیەکم لەلا بووایە و لێیان بخواردبایە.

**٢٦٩٧**- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ مَالِكِ بْنِ خُثَيْمٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ بِأَرْضِهِ بِالْعَقِيقِ، فَأَتَاهُ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ عَلَى دَوَابَّ فَنَزَلُوا عِنْدَهُ، قَالَ حُمَيْدٌ: فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁: اذْهَبْ إِلَى أُمِّي، فَقُلْ: إِنَّ ابْنَكِ يُقْرِئُكِ السَّلَامَ، وَيَقُولُ: أَطْعِمِينَا شَيْئًا، قَالَ: فَوَضَعَتْ ثَلَاثَةَ أَقْرَاصٍ فِي صَحْفَةٍ، وَشَيْئًا مِنْ زَيْتٍ وَمِلْحٍ، ثُمَّ وَضَعَتْهَا عَلَى رَأْسِي، وَحَمَلْتُهَا إِلَيْهِمْ، فَلَمَّا وَضَعْتُهَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ، كَبَّرَ أَبُو هُرَيْرَةَ، وَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَشْبَعَنَا مِنَ الْخُبْزِ، بَعْدَ أَنْ لَمْ يَكُنْ طَعَامُنَا إِلاَّ الأَسْوَدَيْنِ: الْمَاءَ وَالتَّمْرَ، فَلَمْ يُصِبِ الْقَوْمُ مِنَ الطَّعَامِ شَيْئًا، فَلَمَّا انْصَرَفُوا، قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، أَحْسِنْ إِلَى غَنَمِكَ، وَامْسَحِ الرُّعَامَ عَنْهَا، وَأَطِبْ مُرَاحَهَا، وَصَلِّ فِي نَاحِيَتِهَا، فَإِنَّهَا مِنْ دَوَابِّ الْجَنَّةِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ تَكُونُ الثُّلَّةُ مِنَ الْغَنَمِ، أَحَبَّ إِلَى صَاحِبِهَا مِنْ دَارِ مَرْوَانَ[1].

واتە: لە حومەیدی کوڕی مالیکی کوڕی خوسەیمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ ئەبو هورەیرە ﵁ لە زەوییەکەی ئەو لە عەقیق دانیشتبووم، جا خەڵکانێکی مەدینە بە وڵاغ هاتن بۆ لای و لەلای ئەو دایانکوتا، حومەید دەڵێ: جا ئەبو هورەیرە گوتی: بڕۆ بۆ لای دایکم و بڵێ: کوڕەکەت سەلامت لێ دەکات و دەڵێت: شتێك لە خواردنمان بداتێ، دەڵێ: ئەویش سێ سەموونی لەناو سینییەك دانا، لەگەڵ هەندێك لە زەیت و خوێ، دواتر لەسەر سەری منی دانا و منیش هەڵمگرت بۆ لای ئەوان، جا کاتێ لەبەردەمم دانان، ئەبو هورەیرە ﵁ «الله أكبر»ی کرد و گوتی: ستاییش بۆ ئەو خوایەی تێری کردین لە نان، دوای ئەوەی جگە لە دوو ڕەشەکان: «ئاو و خورما» هیچ خواردنێکمان نەبوو، خەڵکەکە هیچیان نەخوارد، جا کاتێ خەڵکەکە ڕۆیشتن گوتی: ئەی برازام لەگەڵ مەڕ و بزنەکانت چاك بە و تۆزیان لە لووت داماڵە و شوێنی حەوانەوە و مانەوەیان چاك و پاك بکە و نوێژ لە شوێنەکەیان بکە، ئەوان لە ئاژەڵەکانی بەهەشتن، سوێند بەو کەسەی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٥ في الجامع، عن مالك به.

گیانی منی بەدەستە نزیکە سەردەمێك بەسەر خەڵکیدا بێت کەمێك لە بزن و مەڕ چاکتر بن لەلای خاوەنەکەی لە ماڵ و سەروەتی مەڕوان (کە ئەو کات گەورەی مەدینە بوو).

**٢٦٩٨-** عَنْ أَبِي نُعَيْمٍ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ ﷺ، قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِطَعَامٍ، وَمَعَهُ رَبِيبُهُ عُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سَمِّ اللهَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ(١).

واتە: لە ئەبو نوعەیم وەهبی کوڕی کەیسانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: خواردنێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو نوعەیمیش زڕکوڕی خۆی لەگەڵ بوو (کە ناوی) عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە کوڕەکەی فەرموو: بسم الله بکە و لەبەردەمی خۆت بخۆ.

**٢٦٩٩-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّ لِي يَتِيمًا، وَلَهُ إِبِلٌ، أَفَأَشْرَبُ مِنْ لَبَنِ إِبِلِهِ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنْ كُنْتَ تَبْغِي ضَالَّةَ إِبِلِهِ، وَتَهْنَأُ جَرْبَاهَا، وَتَلُطُّ حَوْضَهَا، وَتَسْقِيهَا يَوْمَ وِرْدِهَا، فَاشْرَبْ غَيْرَ مُضِرٍّ بِنَسْلٍ، وَلاَ نَاهِكٍ فِي الْحَلْبِ(٢).

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ بوو دەیگوت: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ و پێی گوت: من یەتیمێکم هەیە و وشترێکی هەیە، جا ئایا لە شیری وشترەکەی بخۆمەوە؟ ئیبنو عەبباس ﷺ گوتی: ئەگەر بەدوای شتە ونبووەکانی وشترەکەوە بیت و چەوری بکەیت و حەوزەکەی سواق بدەیت و لە ڕۆژە نۆبەتی خۆی ئاوی بدەی، ئەوە شیرەکەی بخۆرەوە بەبێ زیانگەیاندن بە بێچووەکەی و بەبێ لەبنهێنانی شیرەکەی (واتە بەتەواویش مەیدۆشە).

**٢٧٠٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ لاَ يُؤْتَى أَبَدًا بِطَعَامٍ، وَلاَ شَرَابٍ، حَتَّى الدَّوَاءُ فَيَطْعَمَهُ أَوْ يَشْرَبَهُ، إِلاَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا، وَأَطْعَمَنَا وَسَقَانَا، وَنَعَّمَنَا، اللهُ أَكْبَرُ،

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٣ في الجامع؛ والبخاري: ٥٣٧٨ في الأطعمة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٦ في الجامع؛ والشيباني: ٩٣٨ في العتاق، عن مالك به.

اللهُمَّ أَلْفَتْنَا نِعْمَتُكَ بِكُلِّ شَرٍّ، فَأَصْبَحْنَا مِنْهَا وَأَمْسَيْنَا بِكُلِّ خَيْرٍ، نَسْأَلُكَ تَمَامَهَا، وَشُكْرَهَا لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ، إِلَهَ الصَّالِحِينَ، وَرَبَّ الْعَالَمِينَ، الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، مَا شَاءَ اللهُ، وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيمَا رَزَقْتَنَا، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە هەرگیز نەبووە خواردن یان خواردنەوەی بۆ بێت تەنانەت دەرمانیش، (کاتێ) دەیخوارد یان دەیخواردەوە حەتمەن دەیگوت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا، وَأَطْعَمَنَا وَسَقَانَا، وَنَعَّمَنَا، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُمَّ أَلْفَتْنَا نِعْمَتُكَ بِكُلِّ شَرٍّ، فَأَصْبَحْنَا مِنْهَا وَأَمْسَيْنَا بِكُلِّ خَيْرٍ، نَسْأَلُكَ تَمَامَهَا وَشُكْرَهَا، لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ، إِلَهَ الصَّالِحِينَ، وَرَبَّ الْعَالَمِينَ، الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، مَا شَاءَ اللهُ، وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيمَا رَزَقْتَنَا، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)، واتە: ستاییش بۆ ئەو خوایەی ڕێنموویی کردین و خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشین و نیعمەتی لەگەڵ کردین، پەروەردگار گەورەترینە، پەروەردگارا نیعمەتەکەت سەرەڕای هەموو خراپە و کەمتەرخەمییەکمان هەر پێمان دەگات، جا بەهۆی نیعمەتەکەوە بەیانی و ئێوارە بەخێر و بەرەکەت دەکەینەوە، داوای تەواویەتی نیعمەت و شوکری نیعمەتت لێ دەکەین، هیچ خێر و بەرەکەتێك نییە تەنها هی تۆ نەبێ، وە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ، پەروەردگاری چاکەکاران و پەروەردگاری جیهانیان، ستاییش بۆ خوای پەروەردگار، وە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله ﷻ، وە هیچ هێزێك نییە (بۆ لادان لە خراپە و بۆ ئەنجامدانی چاکە) تەنها بە (قودرەتی) پەروەردگارەوە بەندە، پەروەردگارا بەرەکەتمان بۆ تێ بخە لەوەی دەیکەیت بە ڕۆزی بۆمان و بمانپارێزە لە سزای ئاگر.

**٢٧٠١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ: هَلْ تَأْكُلُ الْمَرْأَةُ مَعَ غَيْرِ ذِي مَحْرَمٍ مِنْهَا، أَوْ مَعَ غُلاَمِهَا؟ فَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ بِذَلِكَ بَأْسٌ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ عَلَى وَجْهِ مَا يُعْرَفُ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَأْكُلَ مَعَهُ مِنَ الرِّجَالِ، قَالَ: وَقَدْ تَأْكُلُ الْمَرْأَةُ مَعَ زَوْجِهَا، وَمَعَ غَيْرِهِ مِمَّنْ يُؤَاكِلُهُ، أَوْ مَعَ أَخِيهَا عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ، وَيُكْرَهُ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَخْلُوَ مَعَ الرَّجُلِ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا حُرْمَةٌ[2].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٧ في الجامع؛ والحدثاني: ٧١٦ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٨ في الجامع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێ کرا: ئایا ئافرەت (بۆی دروستە) خواردن بخوات لەگەڵ مەحرەمێکی خۆی یان هەرزەکارێکی خزمەتکارێکی خۆی؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەوە کێشەی تیا نییە، ئەگەر بەشێوەیەکی عادەتی زانراوی ئافرەتان بێت پیاوانێکی مەحرەم لەگەڵی بخۆن، (جا عادەتەکە ئاوایە) ئافرەت نان دەخوات لەگەڵ مێردەکەی و ئەوانەی لەگەڵ مێردەکەی نان دەخۆن، یان لەگەڵ براکەی بەهەمان شێوە نان دەخوات، وە حەرامە بۆ ئافرەت بەتەنها لەگەڵ پیاوێك نان بخوات کە هیچ مەحرەمییەتێك لە نێوانیاندا نەبێت.

### ١١- ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنی گۆشت[1]

**٢٧٠٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَاللَّحْمَ، فَإِنَّ لَهُ ضَرَاوَةً كَضَرَاوَةِ الْخَمْرِ[2].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: خۆتان بپارێزن لە (زۆر خواردنی) گۆشت، چونکە خووپێوەگرتنی هەیە وەك خووگرتن بە مەشڕوب.

**٢٧٠٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَدْرَكَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ، وَمَعَهُ حِمَالُ لَحْمٍ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، قَرِمْنَا إِلَى اللَّحْمِ، فَاشْتَرَيْتُ بِدِرْهَمٍ لَحْمًا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَمَا يُرِيدُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَطْوِيَ بَطْنَهُ عَنْ جَارِهِ، أَوِ ابْنِ عَمِّهِ، أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا ﴿٢٠﴾﴾ الأحقاف؟[3].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گەیشت بە جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ لە کاتێکدا گۆشتی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي أَكْلِ اللَّحْمِ.

(٢) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٢ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٣ في الجامع، عن مالك به.

پێ بوو هەڵیگرتبوو، گوتی: ئەوە چییە؟ ئەویش گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران زۆر حەزمان چووە گۆشت و بە درهەمێك گۆشتم کڕی، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئایا یەکێك لە ئێوە نایەوێ لە ورگی بگرێتەوە لە پێناو دراوسێکەی یان کوڕەمامەکەی، ئەو ئایەتە بۆ کوێ چووە (بۆ بیرتان چووە کە خوای پەروەردگار بەسەرکۆنە باسی کافرەکان دەکات و) دەفەرمووێ: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا ﴿٢٠﴾﴾ الأحقاف، واتە: [هەرچی خۆشیتان بوو بەسەرتان برد لە ژیانی دونیاتاندا وە لەزەتتان لێ کرد!].

## ١٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی لە پەنجەکردنی گوستیلە[1]

**٢٧٠٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَلْبَسُ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَنَبَذَهُ، وَقَالَ: لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا، قَالَ: فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ گوستیلەی زێڕی لە پەنجە دەکرد، دواتر (دوای حەڕامبوونی) پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و فڕێیدا و فەرمووی: هەرگیز لە پەنجەی ناکەم، دەڵێ: خەڵکیش گوستیلەکانی خۆیان فڕێدا.

**٢٧٠٥-** عَنْ صَدَقَةَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الْخَاتَمِ، فَقَالَ: الْبَسْهُ، وَأَخْبِرِ النَّاسَ أَنِّي أَفْتَيْتُكَ بِذَلِكَ[3].

واتە: لە صەدەقەی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ کرد دەربارەی لەپەنجەکردنی گوستیلە، ئەویش گوتی: لەپەنجەی بکە، هەواڵیش بە خەڵکی بدە کە من بەو شێوە فەتوام بۆ داویت.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الْخَاتَمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦٩ في الجامع؛ والشيباني: ٨٧١ في العتاق؛ وابن حنبل: ٥٤٠٧؛ والبخاري: ٥٨٦٧ في اللباس؛ والقابسي: ٢٩١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٠ في الجامع، عن مالك به.

## ١٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی داماڵینی پەت و جەرەس لە ملی ئاژەڵ[1]

**٢٧٠٦**- أَنَّ أَبَا بَشِيرٍ الأَنْصَارِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، قَالَ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَسُولاً، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ ﷺ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ وَالنَّاسُ فِي مَقِيلِهِمْ: لاَ تَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلاَدَةٌ مِنْ وَتَرٍ، أَوْ قِلاَدَةٌ، إِلاَّ قُطِعَتْ[2].

قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مالكاً ﷺ يَقُولُ: أَرَى ذَلِكَ مِنَ الْعَيْنِ.

واتە: لە ئەبو بەشیری ئەنصارییەوە ﷺ گێردراوەتەوە هەواڵی داوە (گوتوویەتی): لە یەکێك لە سەفەرەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ نێردراوێکی نارد، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: پێم وایە گوتی: لە کاتێکدا خەڵك لە قەیلولەدا بوون، فەرمووی: لە ملی هیچ وشترێك ملوانکەی خوری ـ یان ملوانکە بەگشتی ـ نەمێنێتەوە، حەتمەن دەبێ بپچڕێت (دەبێ لێ بکرێتەوە).

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: پێم وایە بەهۆی چاوەزارەوە بووە (پێیان وا بوو بەو ملوانکەیە لە چاوپیسی دەپارێزرێت، بۆیە نەهی لێ کرا).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي نَزْعِ الْمَعَالِيقِ وَالْجَرَسِ مِنَ الْعُنُقِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧١ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢١٩٣٧؛ والبخاري: ٣٠٠٥ في الجهاد؛ ومسلم: اللباس: ١٠٥؛ وأبو داود: ٢٥٥٢ في الجهاد؛ وابن حبان: ٤٦٩٨؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣٣٤٨٦ في السير؛ والقابسي: ٣٠٧، كلهم عن مالك به.



# پەرتووکی

# چاوەزار و چاوپیسی[1]



---

١) ـ كِتابُ العَينْ.




## ١- دەستنوێژشۆردن بەهۆی چاوەزارەوە (چاوپیسیەوە)[١]

**٢٧٠٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ يَقُولُ: اغْتَسَلَ أَبِي سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ ﷺ بِالْخَرَّارِ، فَنَزَعَ جُبَّةً كَانَتْ عَلَيْهِ، وَعَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ يَنْظُرُ، قَالَ: وَكَانَ سَهْلٌ رَجُلاً أَبْيَضَ، حَسَنَ الْجِلْدِ، قَالَ: فَقَالَ لَهُ عَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ: مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ، وَلاَ جِلْدَ عَذْرَاءَ، قَالَ: فَوُعِكَ سَهْلٌ مَكَانَهُ، وَاشْتَدَّ وَعْكُهُ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأُخْبِرَ أَنَّ سَهْلاً وُعِكَ، وَأَنَّهُ غَيْرُ رَائِحٍ مَعَكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَتَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ سَهْلٌ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِ عَامِرٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَلاَمَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، أَلاَّ بَرَّكْتَ، إِنَّ الْعَيْنَ حَقٌّ، تَوَضَّأْ لَهُ، فَتَوَضَّأَ لَهُ عَامِرٌ، فَرَاحَ سَهْلٌ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە باوکی بووە دەیگوت: ئەبو سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ لە خەڕاڕ خۆی شۆرد و جوبەکەی داکەند، عامری کوڕی ڕەبیعەش سەیری دەکرد، جا سەهل پیاوێکی سپی بوو پێستی جوان بوو، دەڵێ: جا عامری کوڕی ڕەبیعە پێی گوت: وەکوو ئەمڕۆم نەبینیوە هەتا پێستی ئافرەتی گەنجیش ئاوا نییە، دەڵێ: جا سەهل لە شوێنی خۆی ژانی گرت و ژانەکەی زۆر بوو، جا چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی پێ درا بەوەی سەهل ژانی گرتووە و لەگەڵت ناڕوات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (لەبەر ئازاری زۆر ناتوانێ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای، سەهلیش هەواڵی پێ دا بەوەی بەسەری هاتووە لەگەڵ عامر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لەسەر چی یەکێك لە ئێوە براکەی دەکوژێت (بۆ چاوی لێ دەدات!)، بۆچی نەتدەگوت خوا بەرەکەت بخاتە جوانییەکەت؟ چاوپیسی حەق و ڕاستە، ئادەی دەستنوێژی بۆ بگرە، جا عامر دەستنوێژی بۆ گرت، (جا ئاوی دەستنوێژەکەیان کرد بەسەر سەهل) و سەهل لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و هیچ کێشەی نەبوو (چاك بۆیەوە).

---

(١) ـ الْوُضُوءُ مِنَ الْعَيْنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٢ في الجامع؛ وابن حبان: ٦١٠٥، عن مالك به.

**٢٧٠٨-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَى عَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ ﷺ يَغْتَسِلُ، فَقَالَ: مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ، وَلاَ جِلْدَ مُخْبَأَةٍ، فَلُبِطَ بِسَهْلٍ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ لَكَ فِي سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ؟ وَاللَّهِ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ، فَقَالَ: هَلْ تَتَّهِمُونَ لَهُ أَحَدًا؟ قَالُوا: نَتَّهِمُ عَامِرَ بْنَ رَبِيعَةَ، قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَامِرًا، فَتَغَيَّظَ عَلَيْهِ، وَقَالَ: عَلاَمَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، أَلاَّ بَرَّكْتَ، اغْتَسِلْ لَهُ، فَغَسَلَ عَامِرٌ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَمِرْفَقَيْهِ وَرُكْبَتَيْهِ، وَأَطْرَافَ رِجْلَيْهِ، وَدَاخِلَةَ إِزَارِهِ فِي قَدَحٍ، ثُمَّ صُبَّ عَلَيْهِ، فَرَاحَ سَهْلٌ مَعَ النَّاسِ لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ[١].

واتە: لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عامری کوڕی ڕەبیعە سەهلی کوڕی حونەیفی ﷺ بینی خۆی دەشۆرد، جا گوتی: چاوم وەکوو ئەمڕۆی نەبینیوە، وە هیچ پێستێکی داپۆشراوی وام نەبینیوە (هێندە جوان بێ)، جا سەهل صەرعی گرت (واتە ژانێکی توندی گرت وەك صەرعی لێ هات)، جا چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هیچ دەکەیت بۆ سەهلی کوڕی حونەیف؟ سوێند بەخوا ﷺ سەری بەرز ناکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا کەس دەربارەی تۆمەتبار دەکەن؟ گوتیان: عامری کوڕی ڕەبیعە تۆمەتبار دەکەین، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی عامری کرد و لێی توڕە بوو و فەرمووی: لەسەر چی یەکێك لە ئێوە براکەی دەکوژێت، بۆچی نزای بەرەکەتداریت بۆ نەکرد، دەستنوێژی بۆ بشۆرە، جا عامر ڕوخساری و هەردوو دەستەکانی و هەردوو ئانیشکەکانی و هەردوو ئەژنۆکانی و سەرە پەنجەکانی و ژێر شەرواڵەکەی (کەلاکەی) لە تەشتێکدا شۆرد، دواتر ئاوەکەی ڕشت بەسەر سەهلدا، جا سەهل لەگەڵ خەڵکەکە دەستی کرد بە ڕۆیشتن و هیچ عەیبی نەما.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٣ في الجامع، عن مالك به.




## ٢- نوشتە و دوعاخوێندن بۆ چاوپیسی (چاوەزار)[١]

**٢٧٠٩- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ قَيْسٍ الْمَكِّيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: دُخِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِابْنَيْ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، فَقَالَ لِحَاضِنَتِهِمَا: مَا لِي أَرَاهُمَا ضَارِعَيْنِ؟ فَقَالَتْ حَاضِنَتُهُمَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ تَسْرَعُ إِلَيْهِمَا الْعَيْنُ، وَلَمْ يَمْنَعْنَا أَنْ نَسْتَرْقِيَ لَهُمَا، إِلاَّ أَنَّا لاَ نَدْرِي مَا يُوَافِقُكَ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اسْتَرْقُوا لَهُمَا، فَإِنَّهُ لَوْ سَبَقَ شَيْءٌ الْقَدَرَ، لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ[٢].**

واتە: لە حومەیدی کوڕی قەیسی مەکییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: دوو کوڕەکانی جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ بردران بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش بە دایەنەکەیانی فەرموو: بۆچی دەیانبینم لاوازن؟ دایەنەکەشیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاو لێی داون، هیچ شتێکیش ڕێگری لێ نەکردووین لەوەی نوشتە و نزایان بۆ بکەین تەنها ئەوە نەبێت نازانین چ دوعا و نزایێك هاوڕات دەبێت (چ شێوازێك شەرعییە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نوشتە و دوعایان بۆ بخوێنن، چونکە ئەگەر شتێك پێش قەدەر بکەوێتەوە ئەوە چاو پێشی دەکەوێتەوە.

**٢٧١٠- أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ بَيْتَ أُمِّ سَلَمَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَفِي الْبَيْتِ صَبِيٌّ يَبْكِي، فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ بِهِ الْعَيْنَ، قَالَ عُرْوَةُ ﷺ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلاَ تَسْتَرْقُونَ لَهُ مِنَ الْعَيْنِ؟[٣].**

واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ژووری ئوم سەلەمەی خێزانی، لە کاتێکدا منالێك لە ژوورەکە بوو دەگریا، جا بۆیان باس کرد چاو لێی داوە، عوروە ﷺ دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی دوعای لەسەر ناکەن بۆ چاوپیسی؟

---

(١) ـ الرُّقْيَةُ مِنَ الْعَيْنِ.

(٢) ـ صحيح بشواهده. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٤ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٥ في الجامع؛ والشيباني: ٨٧٧ في العتاق، عن مالك به.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەجر و پاداشتی نەخۆش[١]

**٢٧١١-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ، بَعَثَ اللهُ تَعَالَى إِلَيْهِ مَلَكَيْنِ، فَقَالَ: انْظُرَا مَاذَا يَقُولُ لِعُوَّادِهِ، فَإِنْ هُوَ إِذَا جَاؤُوهُ، حَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، رَفَعَا ذَلِكَ إِلَى اللهِ ﷻ وَهُوَ أَعْلَمُ، فَيَقُولُ: لِعَبْدِي عَلَيَّ إِنْ تَوَفَّيْتُهُ، أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَإِنْ أَنَا شَفَيْتُهُ، أَنْ أُبْدِلَ لَهُ لَحْمًا خَيْرًا مِنْ لَحْمِهِ، وَدَمًا خَيْرًا مِنْ دَمِهِ، وَأَنْ أُكَفِّرَ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ[٢].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بەندە نەخۆش دەبێت، خوای پەروەردگار دوو فریشتە دەنێرێت بۆ لای و دەفەرموێت: سەیرکەن بزانن نەخۆشەکە چ بەو کەسانە دەڵێت کە سەردانی دەکەن، جا ئەگەر خەڵك بێن بۆ لای، ئەویش ستاییشی خوا بکات و بەجوانی باسی خوا بکات، دوو فریشتەکە ئەوە بەرز دەکەنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار لە کاتێکدا لەوان زاناترە بە بابەتەکە، جا پەروەردگار دەفەرمووێ: ئەگەر بەندەکەمم مراند لەسەر خۆم پێویست کردووە بیخەمە بەهەشتەوە، وە ئەگەر شیفاشم دا ئەوە گۆشتەکەی بۆ دەگۆڕم بە گۆشتێکی چاکتر لەوەی خۆی و خوێنەکەی بۆ دەگۆڕم بە خوێنێکی چاکتر لەوەی خۆی، وە تاوانەکانیشی دەسڕمەوە.

**٢٧١٢-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنْ مُصِيبَةٍ، حَتَّى الشَّوْكَةَ، إِلاَّ قُصَّ بِهَا، أَوْ كُفِّرَ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ، لاَ يَدْرِي يَزِيدُ، أَيُّهُمَا قَالَ عُرْوَةُ[٣].

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار تووشی هەر بەڵا و گرفتارییەك بێ، هەتا ئەگەر دڕکێکیش بێت، حەتمەن هەندێك لە تاوانەکانی کەم دەکرێنەوە و دەسڕێنەوە.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي أَجْرِ الْمَرِيضِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٦ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٧ في الجامع؛ ومسلم: البر والصلة: ٥٠؛ والقابسي: ٥٢٠، عن مالك به.





**٢٧١٣-** أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُصِبْ مِنْهُ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خوا بیەوێ چاکە و خێری پێ ببەخشێت تووشی بەڵا و ناخۆشی و نەهامەتی دەکات (تا ببێتە خۆشبەخت و دەوڵەمەندی دواڕۆژ).

**٢٧١٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَهُ الْمَوْتُ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: هَنِيئًا لَهُ، مَاتَ وَلَمْ يُبْتَلَ بِمَرَضٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَيْحَكَ، وَمَا يُدْرِيكَ، لَوْ أَنَّ اللهَ ابْتَلَاهُ بِمَرَضٍ يُكَفِّرُ بِهِ مِنْ سَيِّئَاتِهِ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ (لەناکاو) مردنی گەیشتێ و مرد، جا پیاوێك گوتی: خۆشبەختی بۆ ئەو، مرد لە کاتێکدا نەخۆش نەکەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ، تۆ چووزانی، ئەگەر خوا ﷻ تووشی نەخۆشی بکردایە لە تاوانەکانی دەبووری (چونکە نەخۆشی پاداشتی گەورەی هەیە).

## ٤- پەناگرتن و نوشتە و دوعاخوێندن بۆ نەخۆشی[٣]

**٢٧١٥-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ عُثْمَانُ: وَبِي وَجَعٌ قَدْ كَادَ يُهْلِكُنِي، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: امْسَحْهُ بِيَمِينِكَ سَبْعَ مَرَّاتٍ، وَقُلْ: أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ، مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ، قَالَ: فَقُلْتُ ذَلِكَ، فَأَذْهَبَ اللهُ مَا كَانَ بِي، فَلَمْ أَزَلْ آمُرُ بِهَا أَهْلِي وَغَيْرَهُمْ[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٨ في الجامع؛ والشيباني: ٩٦١ في العتاق؛ وابن حنبل: ٧٢٣٤؛ والبخاري: ٥٦٤٥ في المرضى؛ وابن حبان: ٢٩٠٧؛ والقابسي: ٩٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧٩ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ التَّعَوُّذُ وَالرُّقْيَةُ فِي الْمَرَضِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٠ في الجامع؛ والشيباني: ٨٧٨ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٦٣١٢، وفي: ١٦٣١٨؛ وأبو داود: ٣٨٩١ في الطب؛ والترمذي: ٢٠٨٠ في الطب؛ وابن حبان: ٢٩٦٥؛ والقابسي: ٥١٩، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عوسمانی کوڕی ئەبو عاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی هاتووە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عوسمان دەڵێ: لە کاتێکدا ئازارێکم هەبوو خەریك بوو لەناوم ببات و بمکوژێت، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەوت جار دەستی ڕاستت بێنە بەسەر شوێنی ئازارەکەت و بڵێ: (أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ، مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ)، واتە: (پەنا دەگرم بە عیزەت و باڵادەستی پەروەردگار لە ناخۆشی ئەوەی تووشم بووە)، دەڵێ: منیش وام گوت و خوای پەروەردگار ئەوەی لەسەر لادام کە تووشم ببوو، جا بەردەوام فەرمان بەوە دەکەم بە خانەوادەکەم و خەڵکی دیکەش.

**٢٧١٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا اشْتَكَى، يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفِثُ، قَالَتْ: فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ، كُنْتُ أَنَا أَقْرَأُ عَلَيْهِ، وَأَمْسَحُ عَلَيْهِ بِيَمِينِهِ، رَجَاءَ بَرَكَتِهَا[١].**

واتە: لە عائیشەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ئێش و ئازاری هەبووایە (بەهۆی نەخۆشی یان بەهۆی هەر شتێکەوە)، ئەوە سێ سوڕەتە پەنادەرەکانی دەخوێند و فووی دەکرد بە خۆیدا (کە بریتین لە: سوڕەتی ئیخلاس و فەلەق و ناس)، جا کاتێ ئێشەکەی زۆر بووایە من لەسەرم دەخوێند و بە دەستی ڕاستەی خۆی دەستم پێیدا دەهێنا، بەئومێدی بەرەکەتی دەستی خۆی (واتە دەستی پێغەمبەر ﷺ).

**٢٧١٧- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ، دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ وَهِيَ تَشْتَكِي وَيَهُودِيَّةٌ تَرْقِيهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: ارْقِيهَا بِكِتَابِ اللهِ[٢].**

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو بەکری صدیق ﷺ هاتە لای عائیشە ﷺ لە کاتێکدا ئازاری هەبوو و ئافرەتێکی جوولەکەش دوعای بەسەردا دەخوێند، جا ئەبو بەکر ﷺ گوتی: بە پەرتووکی خوا دوعای بەسەردا بخوێنە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨١ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢٥٥٢٢، وفي: ٢٦٣٠٦؛ والبخاري: ٥٠١٦ في فضائل القرآن؛ ومسلم: السلام: ٥١؛ وأبو داود: ٣٩٠٢ في الطب؛ وابن ماجه: ٣٥٧٥ في الطب؛ وابن حبان: ٢٩٦٣ في م٧؛ والقابسي: ٤٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٢ في الجامع؛ والشيباني: ٨٧٦ في العتاق، عن مالك به.

## ٥- چارەسەرووەرگرتنی نەخۆش[١]

**٢٧١٨-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَصَابَهُ جُرْحٌ، فَاحْتَقَنَ الْجُرْحُ الدَّمَ، وَأَنَّ الرَّجُلَ دَعَا رَجُلَيْنِ مِنْ بَنِي أَنْمَارٍ فَنَظَرَا إِلَيْهِ، فَزَعَمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لَهُمَا: أَيُّكُمَا أَطَبُّ؟ فَقَالاَ: أَوَ فِي الطِّبِّ خَيْرٌ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَزَعَمَ زَيْدٌ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَنْزَلَ الدَّوَاءَ الَّذِي أَنْزَلَ الأَدْوَاءَ[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ تووشی برینێك بوو و برینەکە خوێنی تێ قەتیس ببوو و خوێنی تێ زابوو، جا پیاوەکە بانگی دوو پیاوی بەنو ئەنماری کرد، ئەوانیش سەیریان کرد و دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون کامتان لە پزیشکیدا شارەزاترن؟ ئەوانیش گوتیان: ئایا پزیشکی چ خێر و سوودی هەیە؟ زەید دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەمان ئەو کەسەی نەخۆشییەکانی دابەزاندووە دەرمان و چارەسەریشی دابەزاندووە (چۆن پزیشکی سوودی نییە!).

**٢٧١٩-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ أَسْعَدَ بْنَ زُرَارَةَ ﷺ اكْتَوَى فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنَ الذُّبْحَةِ، فَمَاتَ[٣].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە ئەسعەدی کوڕی زوڕارە ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کەیی و داغکردنی بەکار هێنا بۆ چارەسەری ئازاری گەروو، جا (بەهۆیەوە) مرد.

**٢٧٢٠-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ اكْتَوَى مِنَ اللَّقْوَةِ، وَرُقِيَ مِنَ الْعَقْرَبِ[٤].

---

(١) ـ تَعَالُجُ الْمَرِيضِ.

(٢) ـ إسناده ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٣ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٤ في الجامع، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کەیی و داغکردنی بۆ جەڵتەی دەموچاو ئەنجام دەدا و دوعای دەخوێند بۆ پێوەدانی دووپشك.

## ٦- شۆردن بە ئاو لەبەر تا[١]

**٢٧٢١-** عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ كَانَتْ إِذَا أُتِيَتْ بِالْمَرْأَةِ وَقَدْ حُمَّتْ تَدْعُو لَهَا، أَخَذَتِ الْمَاءَ فَصَبَّتْهُ بَيْنَهَا وَبَيْنَ جَيْبِهَا، وَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُنَا أَنْ نُبْرِدَهَا بِالْمَاءِ[٢].

واتە: لە فاتیمەی کچی مونزیرەوە گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ ئەگەر ئافرەتێکیان بهێنایە بۆ لای لە کاتێکدا تای لێ بووایە نزای بۆ دەکرد و ئاوی دەهێنا دەیڕشت بەسەر سەریدا تا کۆتایی ملی و دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین حاڵەتی «تا» سارد بکەینەوە بە ئاو.

**٢٧٢٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ[٣].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: گەرمایی «تا» (بڵاوبوونەوەکەی) بەشێکە لە بڵاوبوونەوەی گەرمای دۆزەخ (واتە تا وەك گەرمای دۆزەخ خێرا بە جەستەدا بڵاو دەبێتەوە)، بۆیە ساردی بکەنەوە بە ئاو (واتە ئەگەر تایەکە بەهۆی گەرماوە بوو ئەوە بە ئاوخواردنەوە و تەڕکردنی ڕوخسار تایەکە دابەزێنن).

---

(١) ـ الْغَسْلِ بِالْمَاءِ مِنَ الْحُمَّى.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٦ في الجامع؛ والبخاري: ٥٧٢٤ في الطب؛ والقابسي: ٤٨٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٧ في الجامع، عن مالك به.

## ٧- دەربارەی سەردانی نەخۆش و شووم[١]

**٢٧٢٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا عَادَ الرَّجُلُ الْمَرِيضَ، خَاضَ الرَّحْمَةَ، حَتَّى إِذَا قَعَدَ عِنْدَهُ، قَرَّتْ فِيهِ أَوْ نَحْوَ هَذَا[٢].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك سەردانی نەخۆشی کرد، لە ڕەحمەت ڕۆدەچێت، تا لەلای دادەنیشێت، (ئەو کات) ڕەحمەت لە ناخی جێگیر دەبێت.

**٢٧٢٤-** عَنِ ابْنِ عَطِيَّةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ عَدْوَى، وَلاَ هَامَ، وَلاَ صَفَرَ، وَلاَ يَحُلَّ الْمُمْرِضُ عَلَى الْمُصِحِّ، وَلْيَحْلُلِ الْمُصِحُّ حَيْثُ شَاءَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا ذَاكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّهُ أَذًى[٣].

واتە: لە ئیبنو عەتییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گواستنەوەی نەخۆشی بونی نییە (بە ئەمر و فەرمانی نوێ نەخۆشی لە شت و کەسی دیکە پەیدا دەبێ نەك بە گواستنەوە)، وە شوومی کونەپەپوو بوونی نییە (خەڵك بڕوایان وا بوو شوومی دەهێنێ)، وە شوومی صەفەر بوونی نییە (صەفەر ناوی مانگێکە پێیان وا بوو لەو مانگەدا جانەوەر و شوومی پەیدا دەبن)، وە نەخۆش تێکەڵ مەکەن لەگەڵ ساغ، ساغیش لەکوێ دادەنێن دایبنێن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چۆنە (تێکەڵیان نەکەین و دروستیش بێ تێکەڵیان بکەین)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تەنها ناخۆشە (واتە لە ڕووی نەفسییەوە ناخۆشە ئەگینا دروستە).

---

(١) ـ عِيَادَةُ الْمَرِيضِ وَالطِّيَرَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٨ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٥٩ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف بهذا اللفظ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨٩ في الجامع، عن مالك به.

## ١- ڕێبازی ئیسلام دەربارەی موو[١]

**٢٧٢٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ بِإِحْفَاءِ الشَّوَارِبِ، وَإِعْفَاءِ اللِّحَى[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە کورتکردنەوەی سمێڵ و بەردانەوەی ڕیش.

**٢٧٢٦-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ عَامَ حَجَّ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَتَنَاوَلَ قُصَّةً مِنْ شَعَرٍ كَانَتْ فِي يَدِ حَرَسِيٍّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ، وَيَقُولُ: إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ[٣].

واتە: لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ بووە لە ساڵی حەجدا لە کاتێکدا لەسەر مینبەر بوو و تۆپە قژێکی لە دەستی پاسەوانێك وەرگرت و دەیگوت: ئەی خەڵکی مەدینە کوانێ زاناکانتان؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو شتی ئاوای قەدەغە و حەرام دەکرد و دەیفەرموو: بەنو ئیسرائیل ئەو کات لەناو چوون (خراپەیان کەوتە ناو) کاتێ ئافرەتەکانیان ئەو شتانەیان بەکار هێنا (قژی عەمەلی و تەزویرکردن و خۆڕازاندنەوەی حەرام بۆ فریودان و فەسادینانەوە).

**٢٧٢٧-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: سَدَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ نَاصِيَتَهُ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ فَرَقَ بَعْدَ ذَلِكَ[٤].

---

(١) ـ السُّنَّةُ فِي الشَّعَرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٠ في الجامع؛ ومسلم: الطهارة: ٥٣؛ وأبو داود: ٤١٩٩ في الترجل؛ والترمذي: ٢٧٦٤ في الاستئذان والآداب؛ وابن حبان: ٥٤٧؛ والقابسي: ٥٢٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩١ في الجامع؛ والشيباني: ٩٠٧ في العتاق؛ والبخاري: ٣٤٦٨ في الأنبياء، وفي: ٥٩٣٢ في اللباس؛ ومسلم: اللباس: ١٢٢؛ وأبو داود: ٤١٦٧ في الترجل؛ وابن حبان: ٥٥١٢؛ والقابسي: ٢٨، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٢ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٣٢٧٧، عن مالك به.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ (وەك ئەهلی کیتاب) قژی بەردایەوە (بەسەر ناوچەوانیدا) ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو (واتە ماوەیەك)، دواتر شەقی کرد (واتە دەیکرد بە دوو لەتەوە لەتێك بۆ لای ڕاست و لەتێك بۆ لای چەپی سەری موبارەکی).

**٢٧٢٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ عَلَى الرَّجُلِ يَنْظُرُ إِلَى شَعَرِ امْرَأَةِ ابْنِهِ، أَوْ شَعَرِ أُمِّ امْرَأَتِهِ بَأْسٌ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پیاو هیچ کێشەی نییە (تاوانی لەسەر نییە) لەسەر ئەوەی سەیری قژی خێزانی کوڕەکەی یان قژی خەسووی بکات.

**٢٧٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ الإِخْصَاءَ، وَيَقُولُ فِيهِ تَمَامُ الْخَلْقِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە خەساندنی پێ ناڕەوا بووە و دەیگوت: لە تەواویەتی خەلقە (نابێ لەناو ببرێت).

**٢٧٣٠-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ فِي الْجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ إِذَا اتَّقَى، وَأَشَارَ بِإِصْبُعَيْهِ الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ[٣].

واتە: لە صەفوانی کوڕی سولەیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من و سەرپەرشتیاری هەتیو جا هەتیوەکە هی خۆی بێ (خزمی خۆی بێ) یان بێگانە بێ لە بەهەشتدا ئاواین ئەگەر تەقوای خوا بکات، جا ئاماژەی بۆ دوو پەنجەکان کرد پەنجەی ناوەڕاست و ئەوەی لەدوای پەنجەی گەورەوە دێت (واتە پەنجەی شایەتمان).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٣ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٦٠ب في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩١٤ في الجامع، عن مالك به.

## ٢- ڕێکخستنی قژ[١]

**٢٧٣١-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ الأَنْصَارِيَّ ﷺ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: إِنَّ لِي جُمَّةً أَفَأُرَجِّلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ، وَأَكْرِمْهَا، فَكَانَ أَبُو قَتَادَةَ رُبَّمَا دَهَنَهَا فِي الْيَوْمِ مَرَّتَيْنِ، لِمَا قَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَأَكْرِمْهَا[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: من قژم تا ئاستی شانمە ئایا شانەی بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ڕێزیشی لێ بگرە (واتە خزمەتی بکە)، جا ئەبو قەتادە زۆر جار لە ڕۆژێکدا دوو جار چەوری دەکرد، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ڕێزی بگرە.

**٢٧٣٢-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ ثَائِرَ الرَّأْسِ وَاللِّحْيَةِ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ أَنِ اخْرُجْ، كَأَنَّهُ يَعْنِي، إِصْلَاحَ شَعَرِ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، فَفَعَلَ الرَّجُلُ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلَيْسَ هَذَا خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدُكُمْ ثَائِرَ الرَّأْسِ كَأَنَّهُ شَيْطَانٌ[٣].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەتائی کوڕی یەسار هەواڵی پێ داوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت بوو و پیاوێکی سەر و ڕیشئاڵۆز هاتە ژوورەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە دەستی موبارەکی ئاماژەی بۆ کرد بەوەی بچێتە دەرەوە، وەك ئەوەی مەبەستی بێت مووی سەر و ڕیشی ڕێك بخات، جا پیاوەکە ئەنجامی دا و دواتر گەڕایەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەگەر ئەوە باشتر نییە لەوەی کەسێك لە ئێوە بەقژئاڵۆزی بێت وەك بڵێی شەیتانە؟!

---

(١) ـ إِصْلَاحُ الشَّعَرِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٤ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف بهذا اللفظ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٥ في الجامع، عن مالك به.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی بۆیەکردنی قژ[١]

**٢٧٣٣-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الأَسْوَدِ بْنِ عَبْدِ يَغُوثَ قَالَ، وَكَانَ جَلِيسًا لَهُمْ، وَكَانَ أَبْيَضَ اللِّحْيَةِ وَالرَّأْسِ قَالَ: فَغَدَا عَلَيْهِمْ ذَاتَ يَوْمٍ وَقَدْ حَمَّرَهُمَا، قَالَ: فَقَالَ لَهُ الْقَوْمُ: هَذَا أَحْسَنُ، فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي عَائِشَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، أَرْسَلَتْ إِلَيَّ الْبَارِحَةَ جَارِيَتَهَا نُخَيْلَةَ، فَأَقْسَمَتْ عَلَيَّ لأَصْبُغَنَّ، وَأَخْبَرَتْنِي أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ كَانَ يَصْبُغُ[٢].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبد یەغوس کە بەردەوام هاوڕێی مەجلیسیان بوو و ڕیش و سەری سپی بوو، دەڵێ: ڕۆژێکیان چوو بۆ لایان لە کاتێکدا ڕیش و سەری سوور کردبوو، دەڵێ: جا خەڵکەکە پێیان گوت: ئەوە چاکترە، ئەویش گوتی: دایکم عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوێنێ شەو نوخەیلەی خزمەتکاری خۆی نارد و سوێندی لەسەر خواردم کە دەبێ بۆیە و ڕەنگ (بۆ ڕیش و سەرم) بەکار بێنم، وە هەواڵیشی پێ دام بەوەی ئەبو بەکری صدیق ﷺ بۆیەی دەکرد.

**٢٧٣٤-** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي صَبْغِ الشَّعَرِ بِالسَّوَادِ: لَمْ أَسْمَعْ فِي ذَلِكَ شَيْئًا مَعْلُومًا، وَغَيْرُ ذَلِكَ مِنَ الصَّبْغِ أَحَبُّ إِلَيَّ.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی بۆیەکردن بە ڕەنگی ڕەش دەیگوت: هیچی زانراو و یەقینیم نەبیستووە دەربارەی ئەوە (بەوەی حەڕام بێت)، بەڵام ڕەنگەکانی دیکەم لەلا خۆشەویستتر و چاکترە.

**٢٧٣٥-** قَالَ: وَتَرْكُ الصَّبْغِ كُلِّهِ وَاسِعٌ، إِنْ شَاءَ اللهُ، لَيْسَ عَلَى النَّاسِ فِيهِ ضِيقٌ[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وازهێنان لە گشت ڕەنگێك بەرفراوانی تیایە إن شاء الله، هیچ بەرتەسکییەك لەسەر خەڵکی نییە تیایدا (واتە ئەو کەسەی ڕەنگ و بۆیە بەکار ناهێنێ إن شاء الله تاوانبار نابێ و واجب نییە).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صُبْغِ الشَّعَرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٦ في الجامع؛ والشيباني: ٩٣٧ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٧ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٦٣ في الجامع، عن مالك به.

**٢٧٣٦-** قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: فِي هَذَا الْحَدِيثِ بَيَانُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمْ يَصْبُغْ، وَلَوْ صَبَغَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لأَرْسَلَتْ بِذَلِكَ عَائِشَةُ ﷺ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ[١].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەم فەرموودەیە ڕوونکردنەوەی تیایە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیەی نەکردووە، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیەی بکردایە، ئەوە عائیشە ﷺ هەواڵەکەی دەنارد بۆ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەد (کەچی تەنها باسی ئیمامی ئەبو بەکری کرد، کە لە فەرموودەی ژمارە (٢٧٣٣) باس کرا).

## ٤- ئەوەی فەرمانی پێ کراوە لە پەناگرتن[٢]

**٢٧٣٧-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: إِنِّي أُرَوَّعُ فِي مَنَامِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ، مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ، وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَنْ يَحْضُرُونِ[٣].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە خالیدی کوڕی وەلید ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوتووە: من لە خەودا دەترسێندرێم (خەونی ناخۆش دەبینم)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بڵێ: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ، مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ، وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَنْ يَحْضُرُونِ)، واتە: (پەنا دەگرم بە وتە تەواو و کامڵەکانی خوای پەروەردگار ﷻ، لە توڕەیی و سزاکەی، وە لە خراپەی بەندەکانی، وە لە خەتەرە و وەسوەسەکانی شەیتان، وە لەوەی لەگەڵم ئامادە بن ـ بۆ خراپە و زیانگەیاندن پێم ـ).

**٢٧٣٨-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَرَأَى عِفْرِيتًا مِنَ الْجِنِّ يَطْلُبُهُ بِشُعْلَةٍ مِنْ نَارٍ، كُلَّمَا الْتَفَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَآهُ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ: أَفَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ تَقُولُهُنَّ، إِذَا قُلْتَهُنَّ طَفِئَتْ شُعْلَتُهُ، وَخَرَّ لِفِيهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بَلَى، فَقَالَ جِبْرِيلُ: فَقُلْ:

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٧ في الجامع؛ والحدثاني: ٦٦٣ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ التَّعَوُّذِ.

(٣) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٩ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٥٠ في الجامع، عن مالك به.

أَعُوذُ بِوَجْهِ اللهِ الْكَرِيمِ، وَبِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ الَّتِي لاَ يُجَاوِزُهُنَّ بَرٌّ وَلاَ فَاجِرٌ، مِنْ شَرِّ مَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ، وَشَرِّ مَا يَعْرُجُ فِيهَا، وَمِنْ شَرِّ مَا ذَرَأَ فِي الأَرْضِ، وَشَرِّ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، وَمِنْ فِتَنِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَمِنْ طَوَارِقِ اللَّيْلِ، إِلاَّ طَارِقًا يَطْرُقُ بِخَيْرٍ يَا رَحْمَنُ»[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کە شەوڕەوی پێ کرا، عیفریتێکی لە جنەکان بینی بە بڵێسەئاگرێکەوە شوێنی کەوتبوو، جا هەر جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دەدایەوە دەیبینی، جا جبریل پێی فەرموو: ئایا چەند ڕستەیەکت فێر نەکەم بیانڵێیت، کاتێ وتت بڵێسەی ئاگرەکەی بکوژێتەوە و بکەوێتە سەر خۆی؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بۆنا، جبریل فەرمووی: بڵێ: (أَعُوذُ بِوَجْهِ اللهِ الْكَرِيمِ، وَبِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ الَّتِي لاَ يُجَاوِزُهُنَّ بَرٌّ وَلاَ فَاجِرٌ، مِنْ شَرِّ مَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ، وَشَرِّ مَا يَعْرُجُ فِيهَا، وَمِنْ شَرِّ مَا ذَرَأَ فِي الأَرْضِ، وَشَرِّ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، وَمِنْ فِتَنِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَمِنْ طَوَارِقِ اللَّيْلِ، إِلاَّ طَارِقًا يَطْرُقُ بِخَيْرٍ يَا رَحْمَنُ)، واتە: (پەنا بە خوای گەورە دەگرم، وە پەنا دەگرم بە وتە تەواو و کامڵەکانی خوا کە هیچ کەسێکی چاك و خراپ ناگات بە کامڵییەتی وتەکانی خوا، (پەنا دەگرم) لە خراپەی ئەوەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێت، وە خراپەی ئەوەی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان (لە کردار و گوفتار)، وە لە خراپەی ئەوەی دروستی کردووە لە زەوی و وە خراپەی ئەوەی لە زەوی دەردەچێت، وە لە فیتنەی شەو و ڕۆژ و لە فیتنەی ئەوانەی بەشەو لە دەرگات دەدەن (بەڵا و موصیبەتی خراپەکارانی شەو) تەنها لەدەرگادەرێك نەبێت کە بۆ چاکە لە دەرگا دەدات ئەی خوای بەبەزەیی).

**٢٧٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ قَالَ: مَا نِمْتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ؟ فَقَالَ: لَدَغَتْنِي عَقْرَبٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَمَا إِنَّكَ لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ تَضُرَّكَ[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم گوتی: ئەمشەو نەخەوتووم، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: لەبەر

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٠ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠١ في الجامع؛ وابن حنبل: ٨٨٦٧؛ وابن حبان: ١٠٢١؛ والقابسي: ٤٤٤، كلهم عن مالك به.

چی؟ گوتی: دووپشك پێوەی دام، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر تۆ كاتێ ئێوارەت دەكردەوە بتگوتایە: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)، واتە: (پەنا دەگرم بە وشە و وتەكانی خوای پەروەردگار ﷻ كە تەواون و كەموكوڕییان تیا نییە لە شەڕ و خراپەی ئەوەی خوا ﷻ دروستی كردووە)، ئەوە زیانی پێ نەدەگەیاندی.

**٢٧٤٠**- عَنِ الْقَعْقَاعِ بْنِ حَكِيمٍ ﷺ، أَنَّ كَعْبَ الأَحْبَارِ ﷺ قَالَ: لَوْلاَ كَلِمَاتٌ أَقُولُهُنَّ، لَجَعَلَتْنِي يَهُودُ حِمَارًا، فَقِيلَ لَهُ: وَمَا هُنَّ؟ فَقَالَ: أَعُوذُ بِوَجْهِ اللهِ الْعَظِيمِ، الَّذِي لَيْسَ شَيْءٌ أَعْظَمَ مِنْهُ، وَبِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ الَّتِي لاَ يُجَاوِزُهُنَّ بَرٌّ وَلاَ فَاجِرٌ، وَبِأَسْمَاءِ اللهِ الْحُسْنَى كُلِّهَا، مَا عَلِمْتُ مِنْهَا وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ وَبَرَأَ وَذَرَأَ[١].

واتە: لە قەعقاعی كوڕی حەكیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): كەعبی ئەحبار ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر لەبەر هەندێك لە زیكرەكان نەبێت كە دەیانڵێم، ئەوە جوولەكەكان (بە سیحر) دەیانكردم بە گوێدرێژ (واتە عەقڵ و هۆشیان لێ دەسەندمەوە)، جا پێی گوترا: نزاكان چین؟ گوتی (ئەو نزایانە): (أَعُوذُ بِوَجْهِ اللهِ الْعَظِيمِ، الَّذِي لَيْسَ شَيْءٌ أَعْظَمَ مِنْهُ، وَبِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ الَّتِي لاَ يُجَاوِزُهُنَّ بَرٌّ وَلاَ فَاجِرٌ، وَبِأَسْمَاءِ اللهِ الْحُسْنَى كُلِّهَا، مَا عَلِمْتُ مِنْهَا وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ وَبَرَأَ وَذَرَأَ)، واتە: (پەنا بە خوای گەورە دەگرم، كە هیچ شتێك لەو گەورەتر نییە، وە پەنا دەگرم بە وتە تەواو و كامڵەكانی خوا كە هیچ كەسێكی چاك و خراپ ناگات بە كامڵییەتی وتەكانی خوا، وە پەنا دەگرم بە گشت ناوە جوانەكانی خوا، لەوەی دەیزانم و لەوەی نایزانم، (پەنا بەو شتانە دەگرم) لە خراپەی ئەوەی دروستی كردووە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٢ في الجامع، عن مالك به.

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسانەی لە پێناوی خوا ﷻ یەکدییان خۆش دەوێ[١]

**٢٧٤١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ لِجَلاَلِي، الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ لە ڕۆژی دواییدا دەفەرمووێت: کوانێن ئەوانەی یەکدییان خۆش دەویست لە پێناوی گەورەیی من؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە بەر سێبەری خۆم (واتە سێبەری عەرش) ئەو ڕۆژەی هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری (عەرشی) من.

**٢٧٤٢**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَوْ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: إِمَامٌ عَادِلٌ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُتعَلِّقٌ بالْمَسْجِدِ إِذَا خَرَجَ مِنْهُ حَتَّى يَعُودَ إِلَيْهِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللهِ، اجْتَمَعَا عَلَى ذَلِكَ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ ذَاتُ حَسَبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ، فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریی یان ئەبو هورەیرەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەوت کەس هەن خوای پەروەردگار دەیانخاتە بەر سێبەری (عەرشی) خۆی، لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نییە تەنها سێبەری (عەرشی) ئەو نەبێت، (حەوت کەسەکان ئەمانەن): سەرکردەیەکی دادپەروەر، وە گەنجێك لەناو پەرستشی خوادا پێ گەیشتبێ، وە پیاوێك دڵی وابەستە بێت بە مزگەوتەوە کاتێ لێی دەردەچێت تا دەگەڕێتەوە بۆی (هەر دڵی لە مزگەوتە)، وە

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْمُتَحَابِّينَ فِي اللهِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٤ في الجامع؛ وابن حنبل: ٧٢٣٠، وفي: ١٠٩٢٣؛ ومسلم: البر والصلة: ٣٧؛ وابن حبان: ٥٧٤؛ والدارمي: ٢٧٥٧ في الرقاق؛ والقابسي: ٣٠٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٥ في الجامع؛ والترمذي: ٢٣٩١ في الزهد؛ وابن حبان: ٧٣٣٨؛ والقابسي: ١٥٥، كلهم عن مالك به.

دوو کەس کە یەکدییان لە پێناوی خوا ﷻ خۆش بووێ، لەسەر خۆشەویستی خوا یەکیان گرتبێت و لەسەر ئەوەش مردبن، وە پیاوێك خوای پەروەردگار بێنێتەوە یادی خۆی و چاوەکانی پڕفرمێسك بن، وە پیاوێك ئافرەتێکی خاوەن ناوبانگ و جوانی داوای کاری خراپی لێ بکات ئەویش بڵێت: من لە خوا دەترسم، وە کەسێك خێر و صەدەقەیەك بکات و بیشارێتەوە بەشێوەیەك دەستی چەپەی نەزانێت دەستی ڕاستەی چی بەخشیوە (واتە کەس بە خێرەکانی نەزانێت).

**٢٧٤٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا أَحَبَّ اللهُ الْعَبْدَ، قَالَ لِجِبْرِيلَ: قَدْ أَحْبَبْتُ فُلاَنًا، فَأَحِبَّهُ، فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللهَ قَدْ أَحَبَّ فُلاَنًا، فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الأَرْضِ، وَإِذَا أَبْغَضَ اللهُ الْعَبْدَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَحْسِبُهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ فِي الْبُغْضِ مِثْلَ ذَلِكَ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوای پەروەردگار ﷻ بەندەیەکی خۆش بووێ، بە جبریل دەفەرمووێ: من فڵانم خۆش ویستووە، تۆش خۆشت بووێ، جا جبریلیش خۆشی دەوێ، دواتر (جبریل) لەناو فریشتەکانی ئاسمان بانگ دەکات و دەڵێت: خوای پەروەردگار ﷻ فڵانی خۆش ویستووە، ئێوەش خۆشتان بووێ، جا فریشتەکانی ئاسمانیش خۆشیان دەوێ، دواتر لە زەویش قبووڵکردنی بۆ دادەنرێت (هەموو خەڵك خۆشیان دەوێت)، وە ئەگەر خوای پەروەردگار ڕقی لە بەندەیەك ببێتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وایە دەربارەی ڕقلێبوونەوەش هەمان شتی گوت.

**٢٧٤٤**- عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ مَسْجِدَ دِمَشْقَ، فَإِذَا فَتًى شَابٌّ بَرَّاقُ الثَّنَايَا، وَإِذَا النَّاسُ مَعَهُ، إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَسْنَدُوا إِلَيْهِ، وَصَدَرُوا عَنْ قَوْلِهِ، فَسَأَلْتُ عَنْهُ، فَقِيلَ: هَذَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ، هَجَّرْتُ، فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَبَقَنِي بِالتَّهْجِيرِ، وَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي، قَالَ: فَانْتَظَرْتُهُ حَتَّى قَضَى صَلاَتَهُ، ثُمَّ جِئْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ قُلْتُ: وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ لِلَّهِ، فَقَالَ: آللَّهِ؟ فَقُلْتُ: آللَّهِ، فَقَالَ: آللَّهِ؟ فَقُلْتُ: آللَّهِ، فَقَالَ: آللَّهِ؟ فَقُلْتُ: آللَّهِ، قَالَ:

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٦ في الجامع؛ وابن حبان: ٣٦٥؛ والقابسي: ٤٤٦، كلهم عن مالك به.



فَأَخَذَ بِحُبْوَةِ رِدَائِي، فَجَبَذَنِي إِلَيْهِ، وَقَالَ: أَبْشِرْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللهُ ﷻ: وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ، وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ، وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ»[1].

واتە: لە ئەبو ئیدریسی خەولانییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: چوومە مزگەوتی دیمەشق، گەنجێکی ددان بە بریسکەی دەمبەخەندە لەوێ بوو، خەڵك لەگەڵ ئەو بوون، ئەگەر ڕاجیاییان لەسەر شتێك لە نێوان پەیدا بووایە دەچوونە لای ئەو و لە ئاستی قسەی ئەو دەوەستان، منیش پرسیارم دەربارەی کرد (کە ئاخۆ کێیە)؟ گوترا: ئەوە موعازی کوڕی جەبەلە ﷺ، جا کە بەیانی داهات، زوو چووم بۆ نوێژ، بینیم پێشم کەوتووە لە زوو ئامادەبوون و بینیم نوێژ دەکات، دەڵێ: چاوەڕێم کرد تا لە نوێژەکەی بۆیەوە، دواتر بەرەو ڕوو بۆ لای چووم و سەلامم لێ کرد، دواتر گوتم: سوێند بە خوا من لە پێناوی خوا خۆشم دەوێی، ئەویش گوتی: سوێند بەخوا؟ منیش گوتم: سوێند بەخوا، گوتی: سوێند بەخوا؟ منیش گوتم: سوێند بەخوا، گوتی: سوێند بە خوا؟ منیش گوتم: سوێند بە خوا، دەڵێ: جا جوبەکەمی لە ئاستی چۆکمەوە گرت و بۆ لای خۆی ڕایکێشام و گوتی: موژدەت لێ بێ، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: خۆشەویستیم واجبە بۆ ئەو کەسانەی لە پێناوی من یەکدییان خۆش دەوێت و لە پێناوی من لەگەڵ یەکدی دادەنیشن و لە پێناوی من سەردانی یەکدی دەکەن و لە پێناوی من هەوڵ و پارە بۆ یەکدی سەرف دەکەن.

**٢٧٤٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: الْقَصْدُ، وَالتُّؤَدَةُ، وَحُسْنُ السَّمْتِ، جُزْءٌ مِنْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ناوەندگیری لە دینداری و ژیانکردندا، وە لەسەرخۆیی و نەرمونیانی، وە شێوە و پۆشاك و ڕەوشتجوانی، بەشێکن لە بیست و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتی.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٧ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢٢٠٨٣؛ وابن حبان: ٥٧٥؛ والقابسي: ٤١٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٨ في الجامع، عن مالك به.

## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی خەون[1]

**٢٧٤٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ الرَّجُلِ الصَّالِحِ، جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ[2].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەونی ڕاست و چاك لەلایەن کەسی چاك، بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

**٢٧٤٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، بِمِثْلِ ذَلِكَ[3].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ هەمان شت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

**٢٧٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَةِ الْغَدَاةِ يَقُولُ: هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمُ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا، وَيَقُولُ: لَيْسَ يَبْقَى بَعْدِي مِنَ النُّبُوَّةِ، إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ[4].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە نوێژی بەیانی تەواو دەبوو دەیفەرموو: ئایا کەس لە ئێوە ئەمشەو خەونی بینیوە؟ وە دەیفەرموو: لەدوای من هیچ بەشێك لە پێغەمبەرایەتی نامێنێت (واتە وەحی نامێنێت)، تەنها خەونی چاك نەبێت.

**٢٧٤٩-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَنْ يَبْقَى بَعْدِي مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الْمُبَشِّرَاتُ، فَقَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الرَّجُلُ الصَّالِحُ أَوْ تُرَى لَهُ، جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ[5].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الرُّؤْيَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري، ٢٠٠٩ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٢٢٩٤، وفي: ١٢٥٣٠؛ والبخاري: ٦٩٨٣ في التعبير؛ وابن ماجه: ٣٩٣٩ في تعبير الرؤيا؛ وابن حبان: ٦٠٤٣؛ والقابسي: ١٢١؛ وفي: ٣٧٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١١ في الجامع؛ وابن حنبل: ٨٢٩٦؛ وأبو داود: ٥٠١٧ في الأدب؛ وابن حبان: ٦٠٤٨؛ والقابسي: ١٢٧، كلهم عن مالك به.

(٥) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٢ في الجامع، عن مالك به.

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێکی پێغەمبەرایەتی نامێنێت لەدوای من تەنها موژدەکان نەبێت، (هاوەڵانیش) گوتیان: موژدەکان چین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ (فەرمووی): خەونی ڕاست و چاکە، کە کەسی چاك دەیبینێ یان پێوەی دەبینرێ، بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

**٢٧٥٠-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ بْنَ رِبْعِيٍّ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الشَّيْءَ يَكْرَهُهُ، فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ إِذَا اسْتَيْقَظَ، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ إِنْ شَاءَ اللهُ، قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: إِنْ كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا هِيَ أَثْقَلُ عَلَيَّ مِنَ الْجَبَلِ، فَلَمَّا سَمِعْتُ هَذَا الْحَدِيثَ فَمَا كُنْتُ أُبَالِيهَا[١].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە قەتادەی کوڕی ریبعی ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خەونی چاك و باش لە خواوەیە، خەونی ناخۆش و خراپیش لە شەیتانەوەیە، جا کاتێ کەسێك لە ئێوە خەونێکی ناخۆش و خراپی بینی، ئەوە با کاتێ لەخەو هەڵسا سێ جار خوزی (پڕوشکی بچووکی تف) بکات بە لای چەپی و پەنا بەخوا بگرێت لە خەونەکە، جا خەونەکە زیانی پێ ناگەیەنێ إن شاء الله، ئەبو سەلەمە ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر خەونێك ببینم لەسەرم وەك شاخ قورس بێت (زۆر ناخۆشیش بێت)، لەو کاتەوەی گوێم لەو فەرموودەیە بووە لێی بێمنەتم و گوێی پێ نادەم.

**٢٧٥١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴿٦٤﴾ ﴾ يونس، قَالَ: هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الرَّجُلُ الصَّالِحُ أَوْ تُرَى لَهُ[٢].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٣ في الجامع؛ والشيباني: ٩٢١ في العتاق؛ وابن حبان: ٦٠٥٩؛ والقابسي: ٥١٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٤ في الجامع، عن مالك به.




واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ ﴿٦٤﴾ ﴾ یونس، واتە: [بۆ ئەوان هەیە مزگێنی و موژدە لە ژیانی دونیا و لە دواڕۆژیشدا]، دەیگوت: بریتییە لە خەونی چاك و ڕاست کە پیاوی چاك خۆی دەیبینێت یان پێوەی دەبینرێت.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی زارومار[1]

**٢٧٥٢**- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدِ، فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ[2].

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یاری بە زارومار بکات (کە جۆرە یارییەکە و جۆرێك لە یانسیب دەگەیەنێ)، ئەوە سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە.

**٢٧٥٣**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهَا: أَنَّ أَهْلَ بَيْتٍ فِي دَارِهَا، كَانُوا سُكَّانًا فِيهَا، وَعِنْدَهُمْ نَرْدٌ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِمْ لَئِنْ لَمْ تُخْرِجُوهَا لَأُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ دَارِي، وَأَنْكَرَتْ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ[3].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە ڕایگەیاندووە و گوتوویەتی: خەڵکانێك لە خانووی ئەو کە لێی نیشتەجێ بوون یاری زاروماریان لەلا بوو، جا ناردی بەدوایاندا پێی گوتن: ئەگەر ئەو شتە نەبەنە دەرەوە ئەوە لە خانووی خۆم وەدەرتان دەنێم، جا ئینکاری لێ کردن لەسەر ئەوە.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي النَّرْدِ.

(٢) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٥ في الجامع؛ والشيباني: ٩٠٥ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٩٥٦٩؛ وأبو داود: ٤٩٣٨ في الأدب؛ وابن حبان: ٥٨٧٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٦ في الجامع، عن مالك به.





**٢٧٥٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا وَجَدَ أَحَدًا مِنْ أَهْلِهِ يَلْعَبُ بِالنَّرْدِ، ضَرَبَهُ وَكَسَرَهَا[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کاتێ کەسێکی لە خانەوادەکەی خۆی ببینیایە یاری بە زارومار دەکات لێی دەدا و زارومارەکەی دەشکاند.

**٢٧٥٥-** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: لاَ خَيْرَ فِي الشِّطْرَنْجِ، وَكَرِهَهَا، وَسَمِعْتُهُ يَكْرَهُ اللَّعِبَ بِهَا، وَبِغَيْرِهَا مِنَ الْبَاطِلِ، وَيَتْلُو هَذِهِ الآيَةَ:﴿ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ﴿٣٢﴾ ﴾ يونس.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: هیچ باشییەك لە شەترەنجدا نییە و پێی باش نەبوو، وە گوێم لێی بوو پێی باش نەبوو یاری بە شەترەنج و شتی دیکەی باتڵ بکرێت، وە ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ﴿٣٢﴾ ﴾ یونس، واتە: [دەی مەگەر لە پاش حەق و ڕاستی هیچ هەیە جگە لە گومڕایی]؟!

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٧ في الجامع، عن مالك به.



# پەرتووكی

# سڵاو و سەلام[1]



---

١) ـ كِتابُ السَّلامِ.




## ١- کرداری سەلامکردن[١]

**٢٧٥٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَإِذَا سَلَّمَ مِنَ الْقَوْمِ وَاحِدٌ أَجْزَأَ عَنْهُمْ[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی بەسواری سەلام دەکات لە کەسی بەپیادە، وە ئەگەر یەك کەس لەناو کۆمەڵێکدا سەلامی کرد ئەوە بەر گشتیان دەکەوێت (سوننەتەکە دێتە جێ).

**٢٧٥٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄، فَدَخَلَ عَلَيْهِ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، ثُمَّ زَادَ شَيْئًا مَعَ ذَلِكَ أَيْضًا، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ قَدْ ذَهَبَ بَصَرُهُ، مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا الْيَمَانِي الَّذِي يَغْشَاكَ، فَعَرَّفُوهُ إِيَّاهُ، قَالَ: فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄: إِنَّ السَّلَامَ انْتَهَى إِلَى الْبَرَكَةِ[٣].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتائەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەلای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ دانیشتبووم، پیاوێکی خەڵکی یەمەن هاتە ژوورەوە بۆ لای و گوتی: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، دواتر شتێکی دیکەشی لەگەڵ ئەوە زیاد کرد، جا ئیبنو عەبباس ﵄ لە کاتێکدا لەو ڕۆژگارەدا بینایی نەمابوو گوتی: ئەوە کێیە؟ گوتیان: ئەوە ئەو پیاوە یەمەنییەیە کە هەموو جار دێت بۆ لات، جا ناساندیان، دەڵێ: جا ئیبنو عەبباسیش ﵄ گوتی: سەلامکردن لە «بەرەکەت» کۆتایی پێ دێت (واتە ئەوپەڕی بریتییە لە: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، شتی دیکەی پێویست نییە).

**٢٧٥٨-** **[فتوى]** سُئِلَ مَالِكٌ ﵀، هَلْ يُسَلِّمُ عَلَى الْمَرْأَةِ؟ فَقَالَ: أَمَّا الْمُتَجَالَّةُ فَلاَ أَكْرَهُ ذَلِكَ، وَأَمَّا الشَّابَّةُ فَلاَ أُحِبُّ ذَلِكَ[٤].

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي السَّلَامِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٨ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١٩ في الجامع؛ والشيباني: ٩١٤ في العتاق، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٠ في الجامع، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷀ پرسیاری لێ کرا: ئایا سەلام لە ئافرەت دەکرێت (ئایا دروستە پیاو سەلام لە ئافرەت بکات)؟ ئەویش گوتی: هەرچی دەربارەی پیرەژنە بە ناپەسەندی دانانێم، بەڵام هەرچی دەربارەی ئافرەتی گەنجە ئەوە پێم باش نییە.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی سەلامکردن لە جوولەکە و گاور (دیان)[١]

**٢٧٥٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الْيَهُودَ إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدُهُمْ، فَإِنَّمَا يَقُولُ: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَقُلْ: عَلَيْكَ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جوولەکەکان کاتێ یەکێکیان سەلام لە ئێوە دەکات دەڵێت: (السام علیکم)، واتە: مردنتان تووش بێت و بمرن، تۆش بڵێ: لەسەر تۆش.

**٢٧٦٠**- وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷀ عَمَّنْ سَلَّمَ عَلَى الْيَهُودِيِّ أَوِ النَّصْرَانِيِّ هَلْ يَسْتَقِيلُهُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: لاَ[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷀ پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەو کەسەی (بەهەڵە) سەلام لە جوولەکە و گاور دەکات ئایا هەواڵی پێ دەدات و پێی دەڵێت هەڵەی کردووە و پەشیمانە لە سەلامەکە؟ گوتی: نەخێر (بەڵام نابێ بەئەنقەست بێ).

## ٣- باسی سەلام بەگشتی[٤]

**٢٧٦١**- عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ، وَالنَّاسُ مَعَهُ، إِذْ أَقْبَلَ نَفَرٌ ثَلاَثَةٌ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَذَهَبَ وَاحِدٌ، فَلَمَّا وَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللهِ

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي السَّلَامِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢١ في الجامع؛ والشيباني: ٩١٣ في العتاق؛ والبخاري: ٦٢٥٧ في الإستئذان؛ والدارمي: ٢٦٣٥ في الاستئذان؛ والقابسي: ٢٩٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٢ في الجامع، عن مالك به.

(٤) ـ جَامِعُ السَّلَامِ.




ﷺ سَلَّمَا، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا، فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاَثَةِ: أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللهِ، فَآوَاهُ اللهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَا، فَاسْتَحْيَا اللهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ، فَأَعْرَضَ اللهُ عَنْهُ[1].

واتە: لە ئەبو واقیدی لەیسییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت دانیشتبوو و خەڵکیشی لەگەڵ بوو، لەناکاو سێ کەس هاتن، دوویان بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتن و یەکێکیشیان ڕۆیشت، جا کاتێ دوو کەسەکە گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وەستان (سەیریان کرد لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ شوێن نییە)، یەکێکیان کەلێنێکی لە حەڵقەی مەجلیسەکە دۆزییەوە و تیایدا دانیشت، ئەوەی دیکەشیان لە دواوەیان دانیشت، سێیەمیشیان ڕۆیشت، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە قسەکانی بۆیەوە فەرمووی: ئایا هەواڵتان پێ نەدەم دەربارەی سێ کەسەکە: یەکێکیان پەنای بۆ خوا برد و خواش پەنای دا (لە حەلقەی مەجلیسەکەدا جێگەی بۆ کردەوە)، هەرچی ئەوەی دووەمیانە شەرمی کرد، خوای پەروەردگاریش جەزای شەرمەکەی دایەوە (شوێنی لە دواوە بۆ پەیدا کرد)، هەرچی ئەوەی سێیەمیانە پشتی هەڵکرد، خواش بە فەزڵی خۆی ڕووی تێ نەکرد (مەحرووم بوو لە مەجلیسی پێغەمبەرەکەی ﷺ).

**٢٧٦٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، وَسَلَّمَ عَلَيْهِ رَجُلٌ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ، ثُمَّ سَأَلَ عُمَرُ ﷺ الرَّجُلَ: كَيْفَ أَنْتَ؟ فَقَالَ: أَحْمَدُ اللهَ إِلَيْكَ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: ذَلِكَ الَّذِي أَرَدْتُ مِنْكَ[2].**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بووە لە کاتێکدا پیاوێك سەلامی لێ کرد، ئەویش سەلامەکەی وەڵام

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٣ في الجامع؛ والبخاري: ٦٦ في العلم، وفي: ٤٧٤ في الصلاة؛ ومسلم: السلام: ٢٦؛ والترمذي: ٢٧٢٤ في الاستئذان والآداب؛ وابن حبان: ٨٦؛ والقابسي: ١٢٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٤ في الجامع، عن مالك به.




دایەوە، دواتر ئیمامی عومەر ﷺ پرسیاری لێ کرد: چۆنی؟ ئەویش گوتی: ستاییشی خوا لەلای تۆ کۆتایی دێنم، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئەوەیە کە من لە تۆم دەویست (واتە مەبەستم بوو ستاییش بکەیت و ئەوەم تێڕادەدیتی).

**٢٧٦٣**- أَنَّ الطُّفَيْلَ بْنَ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ يَأْتِي عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، فَيَغْدُو مَعَهُ إِلَى السُّوقِ، قَالَ: فَإِذَا غَدَوْنَا إِلَى السُّوقِ، لَمْ يَمُرَّ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ عَلَى سَقَاطٍ، وَلاَ صَاحِبِ بِيعَةٍ، وَلاَ مِسْكِينٍ، وَلاَ أَحَدٍ، إِلاَّ سَلَّمَ عَلَيْهِ، قَالَ الطُّفَيْلُ: فَجِئْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَوْمًا، فَاسْتَتْبَعَنِي إِلَى السُّوقِ، فَقُلْتُ لَهُ: وَمَا تَصْنَعُ فِي السُّوقِ؟ وَأَنْتَ لاَ تَقِفُ عَلَى الْبَيِّعِ، وَلاَ تَسْأَلُ عَنِ السِّلَعِ، وَلاَ تَسُومُ بِهَا، وَلاَ تَجْلِسُ فِي مَجَالِسِ السُّوقِ؟ قَالَ: وَأَقُولُ: اجْلِسْ بِنَا هَاهُنَا نَتَحَدَّثُ، قَالَ: فَقَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: يَا أَبَا بَطْنٍ، وَكَانَ الطُّفَيْلُ ذَا بَطْنٍ، إِنَّمَا نَغْدُو مِنْ أَجْلِ السَّلاَمِ، نُسَلِّمُ عَلَى مَنْ لَقِينَا[1].

واتە: ئەبو توفەیلی کوڕی ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ هەواڵی داوە بەوەی هەموو جار دەچوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ و لەگەڵی دەچوو بۆ بازاڕ، دەڵێ: جا کاتێ دەچووین بۆ بازار عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بەلای هەر فرۆشیارێکی خاوەن کاڵای خراپ و خاوەن کاڵای باش و هەر هەژارێك و هەر کەسێکدا تێ پەڕ ببووایە حەتمەن سەلامی لێ دەکرد، توفەیل دەڵێ: جا ڕۆژێکیان هاتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ داوای لێ کردم لەدوای بچم بۆ بازاڕ، منیش پێم گوت: لە بازاڕ چی دەکەیت؟ تۆ نە لەلای فرۆشیارێك دەوەستیت و نە نرخی کاڵایێك دەپرسیت و نە مامەڵە دەکەیت و نە لە مەجلیسەکانی بازاڕ دادەنیشی؟ دەڵێ: پێم دەگوت: (مەچۆ) لێرە لەگەڵمان دانیشە با قسان بکەین، دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ پێی گوتم: ئەی ئەبو بەتن (واتە ئەی ورگگەورە) ـ جا توفەیل ورگی گەورە بوو ـ تەنها بۆ سەلامکردن دەچین بۆ بازاڕ، سەلام لەو کەسانە دەکەین کە پێمان دەگەن.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٥ في الجامع؛ والشيباني: ٩١٢ في العتاق، عن مالك به.




**٢٧٦٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَلَّمَ عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، وَالْغَادِيَاتُ وَالرَّائِحَاتُ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: وَعَلَيْكَ أَلْفًا، ثُمَّ كَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك سەلامی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد و گوتی: (السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، وَالْغَادِيَاتُ وَالرَّائِحَاتُ)، واتە: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکاتی خوات لێ بێ، لەگەڵ ئەوەی بەیانییان و ئێواران دێت (کە مەبەستی فریشتەکانە)، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ پێی گوت: هەزار جاریش لەسەر تۆ بێ، دواتر وەك بڵێی پێی ناخۆش بوو (چونکە وشەی دیکەی بۆ زیاد کردبوو).

**٢٧٦٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ إِذَا دُخِلَ الْبَيْتُ غَيْرُ الْمَسْكُونِ، يُقَالُ: السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە ئەگەر چوون بۆ خانووێکی چۆڵ (کەسی تیا نەبوو) دەگوترێت: (السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ)، واتە: سەلام لەسەر ئێمە و بەندە چاکەکانی خوا بێت.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٦ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٧ في الجامع، عن مالك به.



# پەرتووکی

# مۆڵەت وەرگرتن و شتی دیکە[1]



---

(١) ـ كِتابُ الاسْتِئْذان.




## ١- مۆڵەت وەرگرتن(١)

**٢٧٦٦**- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَسْتَأْذِنُ عَلَى أُمِّي؟ فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي مَعَهَا فِي الْبَيْتِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اسْتَأْذِنْ عَلَيْهَا، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي خَادِمُهَا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اسْتَأْذِنْ عَلَيْهَا، أَتُحِبُّ أَنْ تَرَاهَا عُرْيَانَةً؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَاسْتَأْذِنْ عَلَيْهَا(٢).

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا مۆڵەت وەربگرم بۆ چوونە لای دایکم؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە گوتی ئاخر من لە ماڵەوە لەگەڵ ئەوم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مۆڵەتی لێ وەرگرە، پیاوەکەش گوتی: ئاخر من خزمەتی دەکەم (دەبێ زۆر بچم بۆ لای)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: مۆڵەتی لێ وەرگرە، ئایا حەز دەکەیت بەڕووتی ببینی؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: دە کەواتە مۆڵەتی لێ وەربگرە.

**٢٧٦٧**- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الاِسْتِئْذَانُ ثَلاَثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ فَادْخُلْ، وَإِلاَّ فَارْجِعْ(٣).

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مۆڵەتوەرگرتن و لەدەرگادان سێ جارە، ئەگەر مۆڵەتت پێ درا (دەرگایان کردەوە) ئەوە برۆ ژوورەوە، ئەگەرنا بگەڕێوە.

**٢٧٦٨**- أَنَّ أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ ﷺ جَاءَ يَسْتَأْذِنُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَاسْتَأْذَنَ ثَلاَثًا ثُمَّ رَجَعَ، فَأَرْسَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ فِي أَثَرِهِ، فَقَالَ: مَا لَكَ لَمْ تَدْخُلْ؟ فَقَالَ أَبُو مُوسَى ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الاِسْتِئْذَانُ ثَلاَثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ فَادْخُلْ، وَإِلاَّ فَارْجِعْ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَمَنْ يَعْلَمُ هَذَا، لَئِنْ لَمْ تَأْتِنِي بِمَنْ يَعْلَمُ ذَلِكَ، لأَفْعَلَنَّ بِكَ كَذَا وَكَذَا، فَخَرَجَ أَبُو مُوسَى

---

(١) ـ الاِسْتِئْذَانُ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٨ في الجامع؛ والشيباني: ٩٠٢ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٩ في الجامع؛ والقابسي: ٥٢٧، عن مالك به.

حَتَّى جَاءَ مَجْلِسًا فِي الْمَسْجِدِ يُقَالُ لَهُ: مَجْلِسُ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: إِنِّي أَخْبَرْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الاِسْتِئْذَانُ ثَلاَثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ فَادْخُلْ، وَإِلاَّ فَارْجِعْ، فَقَالَ: لَئِنْ لَمْ تَأْتِنِي بِمَنْ يَعْلَمُ هَذَا، لأَفْعَلَنَّ بِكَ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كَانَ سَمِعَ ذَلِكَ أَحَدٌ مِنْكُمْ فَلْيَقُمْ مَعِي، فَقَالُوا لأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: قُمْ مَعَهُ، وَكَانَ أَبُو سَعِيدٍ أَصْغَرَهُمْ، فَقَامَ مَعَهُ، فَأَخْبَرَ بِذَلِكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لأَبِي مُوسَى ﷺ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَتَّهِمْكَ، وَلَكِنْ خَشِيتُ أَنْ يَتَقَوَّلَ النَّاسُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ[1].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ هات داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی کرد بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، جا سێ جار داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی کرد و دواتر گەڕایەوە، (جا دوای ئەوەی هەندێك دوور کەوتەوە عومەر ﷺ دەرگای کردەوە) و ناردی بەدوایدا و گوتی: بۆچی نەهاتیتە ژوورەوە؟ ئەبو موساش ﷺ گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: مۆڵەتوەرگرتن و لەدەرگادان سێ جارە، جا ئەگەر مۆڵەتیان پێ دای و (دەرگایان کردەوە) ئەوە بڕۆ ژوورەوە، ئەگەرنا بگەڕێوە، عومەریش ﷺ گوتی: کێی دیکە ئەوە دەزانێت، ئەگەر کەسێکی دیکەم بۆ نەهێنی ئەوە بزانێت ئەوە ئاوا و ئاوات لێ دەکەم (هەڕەشەی لێ کرد)، جا ئەبو موسا ﷺ دەرچوو تا هاتە مەجلیسێك لە مزگەوت کە پێی دەگوترا: مەجلیسی ئەنصارەکان، جا گوتی: من هەواڵم داوە بە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بەوەی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: مۆڵەتوەرگرتن و لە دەرگادان سێ جارە، جا ئەگەر مۆڵەتیان پێ دای و (دەرگایان کردەوە) ئەوە بڕۆ ژوورەوە، ئەگەرنا بگەڕێوە، عومەریش ﷺ گوتی: کێی دیکە ئەوە دەزانێت، ئەگەر کەسێکی دیکەم بۆ نەهێنی ئەوە بزانێت ئەوە ئاوا و ئاوات لێ دەکەم، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئەوەی گوێ لێ بووە با لەگەڵم هەڵسێ (بچین بۆ لای عومەر، جا بە ئەبو سەعیدی خودرییان گوت: تۆ هەڵسە لەگەڵی بڕۆ، لە کاتێکدا ئەبو سەعید ﷺ لە گشتیان بچووکتر بوو، جا لەگەڵی هەڵسا و ئەو هەواڵەی بە عومەری کوڕی خەتتاب دا (بەوەی ئەویش گوێی لێ بووە)، جا عومەری کوڕی خەتتاب بە ئەبو

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢٩ في الجامع؛ وفي: ٢٠٣٠ في الجامع؛ وأبو داود: ٥١٨٤ في الأدب، كلهم عن مالك به.




موسای ﷺ گوت: بزانە من تۆمەتم نەداویتەتە پاڵ (پێم وا نەبووە تۆ درۆ بکەیت)، بەڵام ترسام خەڵك قسە بە دەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵبەستن (ویستم لە ڕێگەی تۆوە خەڵك بترسێ و بزانێ بەئاسانی لێیان قبووڵ ناکرێ).

## ٢- وەڵامدانەوە (بە نزای: يرحمك الله) دەربارەی پژمین[1]

**٢٧٦٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنْ عَطَسَ فَشَمِّتْهُ، ثُمَّ إِنْ عَطَسَ فَشَمِّتْهُ، ثُمَّ إِنْ عَطَسَ فَشَمِّتْهُ، ثُمَّ إِنْ عَطَسَ فَقُلْ: إِنَّكَ مَضْنُوكٌ، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: لاَ أَدْرِي أَبَعْدَ الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك پژمی پێی بڵێ: يرحمك الله، دواتر ئەگەر پژمی پێی بڵێ: يرحمك الله، دواتر ئەگەر پژمی پێی بڵێ: يرحمك الله، دواتر ئەگەر پژمی پێی بڵێ: تۆ پەسیوت لێیە (چیدی پێویست ناکا بڵێی: يرحمك الله)، عەبدوڵڵای کوڕ ئەبو بەکر ﷺ گوتوویەتی: نازانم دوای سێیەم جار بوو یان چوارەم جار بوو (فەرمانی کرد چیدی وەڵام نەدرێتەوە و بە پەسیو حیساب بکرێت).

**٢٧٧٠-** عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا عَطَسَ، فَقِيلَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ؟ قَالَ: يَرْحَمُنَا اللهُ وَإِيَّاكُمْ، وَيَغْفِرُ لَنَا وَلَكُمْ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کاتێ دەپژمی و پێی دەگوترا: يرحمك الله، دەیگوت: (يَرْحَمُنَا اللهُ وَإِيَّاكُمْ، وَيَغْفِرُ لَنَا وَلَكُمْ)، واتە: خوای پەروەردگار ڕەحم بە ئێمە و ئێوە بکات و لە ئێمە و ئێوە خۆش بێت.

---

(١) ـ التَّشْمِيتُ فِي الْعُطَاسِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣١ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥٤ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٢ في الجامع، عن مالك به.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی وێنە و پەیکەر[١]

**٢٧٧١-** أَنَّ رَافِعَ بْنَ إِسْحَاقَ، مَوْلَى الشِّفَاءِ ﷺ، أَخْبَرَهُ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي طَلْحَةَ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ نَعُودُهُ، فَقَالَ لَنَا أَبُو سَعِيدٍ ﷺ: أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ تَمَاثِيلُ أَوْ تَصَاوِيرُ، شَكَّ إِسْحَاقُ، لاَ يَدْرِي أَيَّتَهُمَا قَالَ أَبُو سَعِيدٍ[٢].

واتە: ڕافیعی کوڕی ئیسحاقی خزمەتکاری شیفاء ﷺ هەواڵی داوە گوتوویەتی: من و عەبدوڵلای کوڕی ئەبو تەلحە چووین بۆ لای ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ بەهۆی نەخۆشییەوە سەردانمان کرد، جا ئەبو سەعید ﷺ پێی گوتین: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ داوین فەرموویەتی: فریشتەی ڕەحمەت ناچنە ژوورێکەوە پەیکەر ـ یان وێنەی ـ تیا بێت، ئیسحاق گومانی هەیە نەیزانیوە ئەبو سەعید کامیانی گوت (پەیکەر یان وێنە).

**٢٧٧٢-** عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ يَعُودُهُ، قَالَ: فَوَجَدَ عِنْدَهُ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ، فَدَعَا أَبُو طَلْحَةَ إِنْسَانًا، فَنَزَعَ نَمَطًا مِنْ تَحْتِهِ، فَقَالَ لَهُ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ ﷺ: لِمَ تَنْزِعُهُ؟ قَالَ: لأَنَّ فِيهِ تَصَاوِيرَ، وَقَدْ قَالَ فِيهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ مَا قَدْ عَلِمْتَ. فَقَالَ سَهْلٌ ﷺ: أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِلاَّ مَا كَانَ رَقْمًا فِي ثَوْبٍ، قَالَ: بَلَى، وَلَكِنَّهُ أَطْيَبُ لِنَفْسِي[٣].

واتە: لە عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە چۆتە ژوورەوە بۆ لای ئەبو تەلحەی ئەنصاری ﷺ بەهۆی نەخۆشییەوە سەردانی کردووە، دەڵێ: ئەبو تەلحە سەهلی کوڕی حونەیفی لەلای خۆی بینی، جا ئەبو تەلحە بانگی کەسێکی کرد و سەرچەفێکی لەژێر دەرهێنا،

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الصُّوَرِ وَالتَّمَاثِيلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٣ في الجامع؛ وابن حنبل: ١١٨٧٦؛ والترمذي: ٢٨٠٥ في الاستئذان والآداب؛ وابن حبان: ٥٨٤٩؛ وأبي يعلى الموصلي: ١٣٠٣؛ والقابسي: ١٢٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٤ في الجامع؛ والشيباني: ٩٠٤ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٦٠٢٢؛ والنسائي: ٥٣٤٩ في الزينة؛ والترمذي: ١٧٥٠ في اللباس؛ وابن حبان: ٥٨٥١؛ والقابسي: ٤٢٧، كلهم عن مالك به.

سەهلی کوڕی حونەیفیش ﷺ پێی گوت: بۆچی دەرتهێنا؟ گوتی: چونکە وێنەی تیایە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی دەربارە فەرمووە کە تۆ دەیزانی، جا سەهل ﷺ گوتی: ئەدی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو: تەنها وێنە و نەخشی سەر قوماش نەبێ (ئەویان کێشەی تیا نییە)؟ ئەبو تەلحە ﷺ گوتی: بۆنا، بەڵام ئاوام پێ خۆشترە (لە هەموو وێنەیەك دوور بم).

**٢٧٧٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا اشْتَرَتْ نُمْرُقَةً فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَامَ عَلَى الْبَابِ فَلَمْ يَدْخُلْ، فَعَرَفَتْ فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةَ، وَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتُوبُ إِلَى اللهِ، وَإِلَى رَسُولِهِ، فَمَاذَا أَذْنَبْتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا بَالُ هَذِهِ النُّمْرُقَةِ؟ قَالَتِ: اشْتَرَيْتُهَا لَكَ تَقْعُدُ عَلَيْهَا، وَتَوَسَّدُهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ الصُّوَرُ، لاَ تَدْخُلُهُ الْمَلاَئِكَةُ[1].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی لاکێشەیەکی کڕی کە وێنەی تیا بوو، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت لە دەرگاوە وەستا و نەهاتە ژوورەوە، عائیشەش ﷺ شوێنەواری پێناخۆشبوونی بە ڕوخساری پێغەمبەری خواوە ﷺ بینی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ چ تاوانێکم کردووە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو لاکێشەیە چیە؟ ئەویش گوتی: بۆ تۆم کڕیوە تا لەسەری دانیشیت و پاڵی پێوە بدەیت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خاوەنی ئەو وێنانە سزا دەدرێن لە ڕۆژی دوایی و پێیان دەگوترێت: ئەوەی دروستتان کردووە زیندووی بکەنەوە، دواتر فەرمووی: ئەو ژوورەی وێنەی تیا بێت فریشتەی ڕەحمەت ناچنە ناویەوە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٥ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢٦١٣٢؛ والبخاري: ٢١٠٥ في البيوع، وفي: ٥١٨١ في النكاح، وفي: ٥٩٦١ في اللباس؛ ومسلم: اللباس: ٩٦؛ وابن حبان: ٥٨٤٥؛ والقابسي: ٢٦٠، كلهم عن مالك به.

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنی بزنمژە[١]

**٢٧٧٤-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْتَ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ، فَإِذَا ضِبَابٌ فِيهَا بَيْضٌ، وَمَعَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ، وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ لَكُمْ هَذَا؟ فَقَالَتْ: أَهْدَتْهُ إِلَيَّ أُخْتِي هُزَيْلَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ، فَقَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَخَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ: كُلاَ، فَقَالاَ: وَلاَ تَأْكُلُ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: إِنِّي تَحْضُرُنِي مِنَ اللهِ حَاضِرَةٌ، قَالَتْ مَيْمُونَةُ: أَنَسْقِيكَ يَا رَسُولَ اللهِ مِنْ لَبَنٍ عِنْدَنَا؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَلَمَّا شَرِبَ، قَالَ: مِنْ أَيْنَ لَكُمْ هَذَا؟ فَقَالَتْ: أَهْدَتْهُ إِلَيَّ أُخْتِي هُزَيْلَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَرَأَيْتِكِ جَارِيَتَكِ الَّتِي كُنْتِ اسْتَأْمَرْتِينِي فِي عِتْقِهَا، أَعْطِيهَا أُخْتَكِ، وَصِلِي بِهَا رَحِمَكِ، تَرْعَى عَلَيْهَا، فَإِنَّهُ خَيْرٌ لَكِ[٢].

واتە: لە سولەیمانی كوڕی یەسارەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ژوورەوە بۆ لای مەیمونەی كچی حاریس (واتە خێزانی)، جا چەند بزنمژەیەكی بینی هێلكەشی لەگەڵ بوو، لە كاتێكدا (پێغەمبەری خوا ﷺ كە چوو) عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس و خالیدی كوڕی وەلیدیشی لەگەڵ بوو، جا فەرمووی: ئەوەتان لەكوێ هێناوە؟ مەیمونەش ﵂ گوتی: خوشكم هوزەیلەی كچی حاریس بەدیاری بۆی هێناوم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس و خالیدی كوڕی وەلیدی فەرموو: بخۆن، ئەوانیش گوتیان: تۆ نایخۆیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەویش فەرمووی: كەسێك ـ واتە فریشتەیەك ـ لەلایەن خواوە لەلام ئامادە دەبێت (حەز ناكەم بۆنی ئەو هێلكە و شتانە ئازاری بدات)، مەیمونەش ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شیرەی لای خۆمانت پێ نەدەین بیخۆیتەوە؟ ئەویش گوتی: باشە، جا كاتێ خواردیەوە فەرمووی: ئەوەتان لەكوێ هێناوە؟ مەیمونەش ﵂ گوتی: هوزەیلەی خوشكم بۆی كردووم بەدیاری، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پێت وا نییە ئەو جارییەیەی كە داوای مۆڵەتت لێ كردم دەربارەی ئازادكردنەكەی (لەجیاتی ئازادكردنی) بیدەیت بە خوشكەكەت

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي أَكْلِ الضَّبِّ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٦ في الجامع؛ والجامع لابن زياد: ١٠١ في أكل السباع والطير، عن مالك به.

و پەیوەندی خزمایەتیت بەجێ بگەیەنی و جارییەكە شوانەتی و چاودێری ئاژەڵەكانی خوشكەكەت بكات چاكتر بێت بۆت.

**٢٧٧٥-** عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ بَيْتَ مَيْمُونَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأُتِيَ بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ، فَقَالَ بَعْضُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ: أَخْبِرُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ بِمَا يُرِيدُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ؟ فَقِيلَ: هُوَ ضَبٌّ يَا رَسُولَ اللهِ، فَرَفَعَ يَدَهُ، فَقُلْتُ: أَحَرَامٌ هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: لاَ، وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ، قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ، فَأَكَلْتُهُ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يَنْظُرُ[١].

واتە: لە خالیدی كوڕی وەلیدی كوڕی موغیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، چۆتە لای مەیمونەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ (كە خارەت و پلكی ئەو و ئیبنو عەبباس ﷺ بوو) جا لەلای مەیمونە بزنمژەیەكی سوورەوەكراوی بینی، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی نەوی كرد بۆ بزنمژەكە (تا بیخوات)، ئافرەتێكیش لە ئافرەتانی ئامادەبوو گوتی: بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕابگەیەنن ئەوەی دەیەوێ بیخوات چییە، جا گوترا: ئەوە بزنمژەیە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی كێشایەوە، خالیدی كوڕی وەلیدیش ﷺ دەڵێ گوتم: ئایا بزنمژە حەڕامە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام لە ناوچەی قەومەكەی من نییە (خواردنی لەلام نەبۆتە عادەت)، دەزانم پێم خۆش نییە و قێزم لێ دەبێتەوە، خالید ﷺ دەڵێ: منیش ڕامكێشا و خواردم، لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری دەكرد.

**٢٧٧٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَجُلاً نَادَى رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا تَرَى فِي الضَّبِّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَسْتُ بِآكِلِهِ، وَلاَ بِمُحَرِّمِهِ[٢].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٧ في الجامع؛ والشيباني: ٦٤٥ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٨١٧؛ وابن حنبل: ١٦٨٥٩؛ والبخاري: ٥٥٣٧ في الذبائح؛ ومسلم: الصيد: ٤٣؛ وأبو داود: ٣٧٩٤ في الأطعمة؛ وابن حبان: ٥٢٦٣، وفي: ٥٢٦٧؛ والقابسي: ٧٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٨ في الجامع؛ والشيباني: ٦٤٦ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والنسائي: ٤٣١٥ في الصيد؛ وشرح معاني الآثار: ٦٣٥٠؛ والقابسي: ٢٩٧، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پیاوێك بانگی کرد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرمووی دەربارەی بزنمژە (ئاخۆ دەخورێت یان نا)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: من نایخۆم و حەڕامیشی ناکەم.

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی سەگ[١]

**٢٧٧٧-** أَنَّ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ سُفْيَانَ بْنَ أَبِي زُهَيْرٍ ﷺ، وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ، مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَهُوَ يُحَدِّثُ نَاسًا مَعَهُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا لاَ يُغْنِي عَنْهُ زَرْعًا، وَلاَ ضَرْعًا، نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ، قَالَ: أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَ: إِي وَرَبِّ هَذَا الْمَسْجِدِ[٢].

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر ﷺ بووە کە پیاوێك بوو لە ئەزدی شەنوئە، یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ جا قسەی بۆ خەڵکانێك دەکرد کە لەگەڵی بوون لەلای دەرگای مزگەوت، دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك سەگێك ڕابگرێت و خزمەتی بکات کە سوودی پێ نەگەیەنێت لە ڕووی کشتوکاڵ و پاسەوانی ئاژەڵ، ئەوە هەموو ڕۆژێك یەك قیراط چاکە لە کردەوەکانی کەم دەکات، گوتیان: تۆ ئەوەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە؟ گوتی: بەڵێ سوێند بە پەروەردگاری ئەم مزگەوتە.

**٢٧٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا إِلاَّ كَلْبًا ضَارِيًا أَوْ كَلْبَ مَاشِيَةٍ، نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي أَمْرِ الْكِلَابِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٣٩ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩٢ في العتاق؛ والشافعي: ٦٨٤؛ وابن حنبل: ٢١٩٦٣، وفي: ٢١٩٦٨؛ والبخاري: ٢٣٢٣ في المزارعة؛ ومسلم: المساقاة: ٦١؛ وابن ماجه: ٣٢٤٥ في الصيد؛ والدارمي: ٢٠٠٥ في الصيد؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٩٩٣٨ في الصيد، وفي: ٣٦٢٥٠ في الرد على أبي حنيفة؛ والقابسي: ٥١٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٠ في الجامع؛ والشافعي: ٦٨٣؛ وابن حنبل: ٥٩٢٥؛ والبخاري: ٥٤٨٢ في الذبائح؛ ومسلم: المساقاة: ٥٠؛ والقابسي: ٢٥٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ, گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سەگێك ڕابگرێت جگە لە سەگی ڕاوکردن یان سەگی پاسەوانیی مەڕومالات، ئەوە هەموو ڕۆژێك دوو قیراط لە کردەوە چاکەکانی کەم دەکات (واتە بەقەد دوو چیای گەورە).

**٢٧٧٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ, گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگ (ئەو کاتەی سەگ مزگەوت و هەموو کوچ و کۆڵانێکی تەنیبوو).

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی مەڕ و بزن[٢]

**٢٧٨٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: رَأْسُ الْكُفْرِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلَاءُ فِي أَهْلِ الْخَيْلِ وَالإِبِلِ الْفَدَّادِينَ أَهْلِ الْوَبَرِ، وَالسَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەری بێبڕوایی لە لای خۆرهەڵاتەوەیە، شانازی و فیز و خۆبەزلزانیش لە لای ئەو کەسانەوە دروست دەبێ کە خاوەنی ئەسپ و حوشترن، ئەوانەی لە دوو سەد بۆ هەزار حوشتر یان ئەسپیان هەیە، وە ئارامی و لەسەرخۆیی و سەکینەت لە لای ئەو کەسانەیە کە خاوەنی مەڕ و بزنن.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤١ في الجامع؛ والشافعي: ٦٨٥؛ والبخاري: ٣٣٢٣ في بدء الخلق؛ ومسلم: المساقاة: ٤٣؛ والنسائي: ٤٢٧٧ في الصيد؛ وابن ماجه: ٣٢٤١ في الصيد؛ والدارمي: ٢٠٠٧ في الصيد، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي أَمْرِ الْغَنَمِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٢ في الجامع؛ والبخاري: ٣٣٠١ في بدء الخلق؛ ومسلم: الإيمان: ٨٥؛ والقابسي: ٣٦٣، كلهم عن مالك به.

**٢٧٨١-** **عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرُ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمًا، يَتْبَعُ بِهَا شُعُبَ الْجِبَالِ، وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ**(١).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نزیکە (ئەو کاتە بێت کە) چاکترین ماڵ و سەروەتی مسوڵمان بریتیبێت لە مەڕومالاتێك لەگەڵ خۆی بیانبات بۆ سەر چیاکان و دۆڵەکان (بەم شێوازە) بە دینەکەیەوە ڕابکات لە فیتنە و ئاشوب و خراپەکاری.

**٢٧٨٢-** **عَنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَحْتَلِبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ، فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ، فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ، وَإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَاتِهِمْ، فَلاَ يَحْتَلِبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ**(٢).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با کەس ئاژەڵی کەس بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی نەدۆشێت، ئایا کەسێك لە ئێوە حەز دەکات خەڵك بچن بۆ عەمبار و شوێنی شیر و شتهەڵگرتنی ئەوان و دەرگای ژووری عەمبارەکە بشکێنێت و خواردنی لێ بگوازێتەوە و بەکاری بهێنێت (بەدڵنیایی نەخێر)، بە هەمان شێوە گوانی ئاژەڵی خەڵکیش شوێنی هەڵگرتن و عەمبارکردنی خواردنە بۆیان، کەواتە با کەس ئاژەڵی کەس بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی نەدۆشێت.

**٢٧٨٣-** **وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ قَدْ رَعَى غَنَمًا، قِيلَ: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَأَنَا**(٣).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٣ في الجامع؛ وابن حنبل: ١١٥٥٩؛ والبخاري: ١٩ في الإيمان، وفي: ٣٣٠٠ في بدء الخلق، وفي: ٧٠٨٨ في الفتن؛ والنسائي: ٥٠٣٦ في الإيمان؛ وأبو داود: ٤٢٦٧ في الفتن؛ وابن حبان: ٥٩٥٨؛ والقابسي: ٣٩٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٤ في الجامع؛ والشيباني: ٨٧٢ في العتاق؛ والبخاري: ٢٤٣٥ في اللقطة؛ ومسلم: اللقطة: ١٣؛ وأبو داود: ٢٦٢٣ في الجهاد؛ وابن حبان: ٥٢٨٢؛ وشرح معاني الآثار: ٦٦٢٩؛ والقابسي: ٢٥١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٥ في الجامع، عن مالك به.




واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس کردم پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە حەتمەن شوانەتی مەڕومالاتی کردووە، گوترا: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: منیش.

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی مشك کاتێ دەکەوێتە ناو ڕۆنەوە، هەروەها دەربارەی دەستپێکردنی خواردن پێشی نوێژ[1]

**٢٧٨٤-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُقَرَّبُ إِلَيْهِ عَشَاؤُهُ، فَيَسْمَعُ قِرَاءَةَ الإِمَامِ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَلاَ يَعْجَلُ عَنْ طَعَامِهِ، حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ[2].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئیبنو عومەر ﷺ ـ جاری وا هەبوو ـ خواردنی دەهێنرایە پێش، جا گوێی لە خوێندنی ئیمام دەبوو (لە ناو نوێژ) لە کاتێکدا ئەو لەماڵەکەیدا بوو، هیچ پەلەی لە خواردنەکەی نەدەکرد تاوەکوو تەواو دەبوو و پێویستی نەدەما (چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە فەرمانی کردووە ئەگەر مرۆڤ برسی بوو خواردن لەپێشترە لە جەماعەت، تا ئاگای لە نوێژەکەی بێت).

**٢٧٨٥-** عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْفَأْرَةِ تَقَعُ فِي السَّمْنِ؟ فَقَالَ: انْزِعُوهَا وَمَا حَوْلَهَا، فَاطْرَحُوهُ[3].

واتە: لە مەیمونەی خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی مشك کە دەکەوێتە ناو ڕۆن (و دەمرێت، ئایا حوکمی چۆنە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مشکەکە و چواردەورەکەی هەڵگرن و فڕێی بدەن.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْفَأْرَةِ تَقَعُ فِي السَّمْنِ، وَالْبَدْءِ بِالأَكْلِ قَبْلَ الصَّلاَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤٤ في الجامع؛ والشيباني: ٢٢٠ في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٤ في البيوع؛ والشيباني: ٩٨٤ في العتاق؛ وابن حنبل: ٢٦٨٩٠؛ والبخاري: ٢٣٥ في الوضوء، وفي: ٢٣٦ في الوضوء، وفي: ٥٥٤٠ في الذبائح؛ والدارمي: ٢٠٨٥ في الأطعمة؛ والجامع لابن زياد: ١٠٦ في ما تموت فيه الفأرة، كلهم عن مالك به.

## ٨- ئەوەی خۆی لێ دەپارێزرێت لە شوومی[1]

**٢٧٨٦-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنْ كَانَ، فَفِي الْفَرَسِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالْمَسْكَنِ، يَعْنِي الشُّؤْمَ[2].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شوومی لە شتێکدا هەبێت ئەوە لە ژن و ئەسپ و خانوودا هەیە (واتە کارەسات و تاقیکردنەوەی قورس کە تووشی مرۆڤ دەبێت لە یەکێك لەو شتانەی مرۆڤ دەبێت).

**٢٧٨٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الشُّؤْمُ: فِي الدَّارِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شوومی (واتە تاقیکردنەوە و ڕووداوی ناخۆش) لە ماڵ و ژن و ئەسپدایە (کارەساتی سەخت تووشی یەکێك لەو شتانەی مرۆڤ دەبێت).

**٢٧٨٨-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، دَارٌ سَكَنَّاهَا، وَالْعَدَدُ كَثِيرٌ، وَالْمَالُ وَافِرٌ، فَقَلَّ الْعَدَدُ، وَذَهَبَ الْمَالُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دَعُوهَا ذَمِيمَةً[4].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر لە خانووێك

---

(١) ـ مَا يُتَّقَى مِنَ الشُّؤْمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٦ في الجامع؛ وابن حنبل: ٢٢٨٨٧، وفي: ٢٢٩١٧؛ والبخاري: ٢٨٥٩ في الجهاد، وفي: ٥٠٩٥ في النكاح؛ ومسلم: السلام: ١١٩؛ وابن ماجه: ٢٠٠٣ في النكاح؛ والقابسي: ٤١٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ شاذ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٧ في الجامع؛ والشيباني: ٩٦٢ في العتاق؛ وابن حنبل: ٦٠٩٥؛ والبخاري: ٥٠٩٣ في النكاح؛ ومسلم: السلام: ١١٥؛ والنسائي: ٣٥٦٩ في الخيل؛ وأبو داود: ٣٩٢٢ في الطب؛ والقابسي: ٦١، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٨ في الجامع، عن مالك به.




نیشتەجێ بووین لە کاتێکدا ژمارەمان زۆر بوو و سەروەت و سامانیش زۆر بوو، جا (لەو خانووەی ئێستا) ژمارەمان کەم بۆیەوە و سەروەت و سامانەکەش نەما، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: واز لەو خانووە بێنن زەمکراوە (واتە مادەم ئێوە وا گومان دەبەن خانووەکە خێر ناداتەوە بۆتان، ئەوە کەڵکی نییە گومانەکەتان لاناچێ وازی لێ بێنن).

## ٩- ئەو ناوانەی کەڕاهەتیان هەیە و چاك نین[١]

**٢٧٨٩**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِلَقْحَةٍ تُحْلَبُ: مَنْ يَحْلُبُ هَذِهِ؟ فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا اسْمُكَ؟ فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: مُرَّةُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اجْلِسْ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ يَحْلُبُ هَذِهِ؟ فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا اسْمُكَ؟، فَقَالَ حَرْبٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اجْلِسْ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ يَحْلُبُ هَذِهِ؟ فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا اسْمُكَ؟، فَقَالَ: يَعِيشُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: احْلُبْ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی وشترێکی مێ بۆئەوەی بدۆشرێت فەرمووی: کێ ئەوە دەدۆشێت؟ پیاوێك هەڵسایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ناوت چییە؟ پیاوەکەش پێ گوت: موڕە (واتە تاڵ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: دانیشە، دواتر فەرمووی: کێ ئەوە دەدۆشێت؟ پیاوێك هەڵسایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ناوت چییە؟ پیاوەکەش گوتی: حەڕب (واتە جەنگ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: دانیشە، دواتر فەرمووی: کێ ئەوە دەدۆشێت؟ پیاوێك هەڵسایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ناوت چییە؟ پیاوەکەش گوتی: یەعیش (واتە دەژیێت)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بدۆشە (واتە تەنها بە ناوی ئەو ڕازی بوو، بۆیە کارەکەی بەو ئەنجام دا).

---

(١) ـ مَا يُكْرَهُ مِنَ الْأَسْمَاءِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤٩ في الجامع؛ والشيباني: ٨٧٩ في العتاق، عن مالك به.

**٢٧٩٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: مَا اسْمُكَ؟ فَقَالَ جَمْرَةُ، فَقَالَ: ابْنُ مَنْ؟ فَقَالَ: ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: قَالَ: مِمَّنْ؟ قَالَ: مِنَ الْحُرَقَةِ، قَالَ: أَيْنَ مَسْكَنُكَ؟ قَالَ: بِحَرَّةِ النَّارِ، قَالَ: بِأَيِّهَا؟ قَالَ: بِذَاتِ لَظًى، قَالَ عُمَرُ ﷺ: أَدْرِكْ أَهْلَكَ فَقَدِ احْتَرَقُوا، قَالَ: فَكَانَ كَمَا قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە پیاوێکی گوت: ناوت چییە؟ گوتی: (جَمْرَةُ) پشکۆ، عومەر ﷺ گوتی: کوڕی کێی؟ گوتی: (ابْنُ شِهَابٍ) کوڕی شوعلە، عومەر ﷺ گوتی: خەڵکی کوێی؟ گوتی: (الْحُرَقَةِ) سوتاوی، عومەر ﷺ گوتی:ماڵت لە کوێیە؟ گوتی: (بِحَرَّةِ النَّارِ) لە گەرمایی ئاگر، عومەر ﷺ گوتی: لە کامیان؟ گوتی: (بِذَاتِ لَظًى) خاوەن بڵێسە، ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: بگە بە خانەوادەکەت سوتان، دەڵێ: جا بەو شێوەیە دەرچوو کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی (ئاگریان گرتبوو، قەدەرەکە لەگەڵ قسەکە تێکی کردەوە).

## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڵەشاخ و کرێی کەڵەشاخکار[٢]

**٢٧٩١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، وَأَمَرَ أَهْلَهُ أَنْ يُخَفِّفُوا عَنْهُ مِنْ خَرَاجِهِ[٣].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی کرد، ئەبو تەیبە (کە کۆیلەیەك بوو) کەڵەشاخەکەی بۆ کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد صاعێك لە خورمای پێ بدرێت (وەك پاداشتی کارەکەی)، وە فەرمانی بە گەورەکەی کرد بەشێك لە تەکلیفەکەی لەسەر سووك بکات.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٠ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْحِجَامَةِ وَأُجْرَةِ الْحَجَّامِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥١ في الجامع؛ والشيباني: ٩٨٨ في العتاق؛ والشافعي: ٩٣٤؛ والبخاري: ٢١٠٢ في البيوع، وفي: ٢٢١٠ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٤٢٤ في البيوع؛ والقابسي: ١٥٢، كلهم عن مالك به.

**٢٧٩٢**- وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنْ كَانَ دَوَاءٌ يَبْلُغُ الدَّاءَ، فَإِنَّ الْحِجَامَةَ تَبْلُغُهُ[١].

واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ بۆی باس کردم پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر دەرمانێك ببێتە چارەسەر بۆ دەردێك، ئەوە کەڵەشاخیش دەبێتە چارەسەر بۆی.

**٢٧٩٣**- عَنِ ابْنِ مُحَيِّصَةَ الأَنْصَارِيِّ ﵁، أَحَدِ بَنِي حَارِثَةَ، أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي إِجَارَةِ الْحَجَّامِ، فَنَهَاهُ عَنْهَا، فَلَمْ يَزَلْ يَسْأَلُهُ وَيَسْتَأْذِنُهُ، حَتَّى قَالَ لَهُ: اعْلِفْهُ نُضَّاحَكَ، يَعْنِي رَقِيقَكَ[٢].

واتە: لە ئیبنو موحەیصەی ئەنصارییەوە ﵁ کە یەکێکە لە نەوەی حاریسە گێڕدراوەتەوە کە داوای مۆڵەتی کردووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی وەرگرتنی کرێی کەڵەشاخکردن، پێغەمبەری خواش ﷺ نەهی لێ کرد (بەوەی وەرینەگرێت باشترە)، ئەویش بەردەوام داوای لێ دەکرد و داوای مۆڵەتی دەکرد تا پێی فەرموو: بیدە بە کۆیلەکەت (واتە قەیناکە وەریبگرە و بەڵام بیکە مەسرەفی کۆیلەکەت).

## ١١- ئەوەی هاتووە دەربارەی ناوچەی خۆرهەڵات[٣]

**٢٧٩٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُشِيرُ إِلَى الْمَشْرِقِ وَيَقُولُ: هَا، إِنَّ الْفِتْنَةَ هَاهُنَا، إِنَّ الْفِتْنَةَ هَاهُنَا، مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات دەکرد و دەیفەرموو: فیتنە لێرەوەیە، فیتنە لێرەوەیە، لەو شوێنەی لایەنگرانی شەیتانی لێ دەردەکەون.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٢ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٣ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٤٥أفي الجامع؛ والشافعي: ٩٣٣؛ وابن حنبل: ٢٣٧٤٠؛ وأبو داود: ٣٤٢٢ في البيوع؛ والترمذي: ١٢٧٧ في البيوع، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي الْمَشْرِقِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٤ في الجامع؛ والبخاري: ٣٢٧٩ في بدء الخلق؛ وابن حبان: ٦٦٤٨؛ والقابسي: ٢٩٣، كلهم عن مالك به.

**٢٧٩٥-** وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَرَادَ الْخُرُوجَ إِلَى الْعِرَاقِ، فَقَالَ لَهُ كَعْبُ الأَحْبَارِ ﷺ: لاَ تَخْرُجْ إِلَيْهَا يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَإِنَّ بِهَا تِسْعَةَ أَعْشَارِ السِّحْرِ، وَبِهَا فَسَقَةُ الْجِنِّ، وَبِهَا الدَّاءُ الْعُضَالُ[١].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ویستی دەربچێت بۆ عێراق، جا کەعبی ئەحبار ﷺ پێی گوت: ئەی گەورەی باوەڕداران مەچۆ بۆ ئەوێ، چونکە لە دە بەش نۆ بەشی سیحر لە عێراقە و جنۆکە خراپەکانیش لەوێن و نەخۆشی بێ چارەسەریش لەوێیە.

## ١٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی کوشتنی مار و ئەوەی دەگوترێت دەربارەی ئەوە[٢]

**٢٧٩٦-** عَنْ أَبِي لُبَابَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ قَتْلِ الْحَيَّاتِ الَّتِي فِي الْبُيُوتِ[٣].

واتە: لە ئەبو لوبابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە کوشتنی ئەو مارانەی لە ماڵەکاندان (واتە نەهی کردووە لە کوشتنیان بەبێ ئینزار و ئاگادارکردنەوە، چونکە جاری وا هەیە مار نییە جنۆکەیە خۆی خستۆتە سەر شێوەی مار، نابێ بەبێ ئینزار بکوژرێ).

**٢٧٩٧-** عَنْ سَائِبَةَ، مَوْلاَةٍ لِعَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ قَتْلِ الْجِنَّانِ الَّتِي فِي الْبُيُوتِ، إِلاَّ ذَا الطُّفْيَتَيْنِ، وَالأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَخْطِفَانِ الْبَصَرَ، وَيَطْرَحَانِ مَا فِي بُطُونِ النِّسَاءِ[٤].

واتە: لە سائیبەی خزمەتکاری عائیشەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە کوشتنی ئەو مارە بچووکانەی لە ماڵەکاندان (بەبێ ئینزار)، تەنها ئەو مارانە نەبێت کە دوو خەتیان لەسەر پشتە وە ئەوانەشی

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٥ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٤٦ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي قَتْلِ الْحَيَّاتِ وَمَا يُقَالُ فِي ذَلِكَ.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٢٥٣ في الأدب؛ وشرح معاني الآثار: ٥١٥٩، عن مالك به.




کە کلکیان کورتە و کوتمەن، (ئەو دوو جۆرە بەبێ ئینزار دەکوژرێن) چونکە بینایی لەناو دەبەن (مرۆڤ کوێر دەکەن) و کۆرپەلەی ناو زگی ئافرەت لەبار دەبەن (یان لە ترسانە کاتێ ئافرەت دەیانبینێت، یانیش خاسییەتێکی تایبەتیان هەیە بەهۆیەوە ئەوە ڕوو دەدات).

**٢٧٩٨**- عَنْ أَبِي السَّائِبِ، مَوْلَى هِشَامِ بْنِ زُهْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي، فَجَلَسْتُ أَنْتَظِرُهُ حَتَّى قَضَى صَلاَتَهُ، فَسَمِعْتُ تَحْرِيكًا تَحْتَ سَرِيرٍ فِي بَيْتِهِ، فَإِذَا حَيَّةٌ، فَقُمْتُ لأَقْتُلَهَا، فَأَشَارَ إِلَيَّ أَبُو سَعِيدٍ أَنِ اجْلِسْ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَشَارَ إِلَى بَيْتٍ فِي الدَّارِ، فَقَالَ: أَتَرَى هَذَا الْبَيْتَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ كَانَ فِيهِ فَتًى حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ، فَخَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى الْخَنْدَقِ، فَبَيْنَا هُوَ بِهِ، إِذْ أَتَاهُ الْفَتَى يَسْتَأْذِنُهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ائْذَنْ لِي أُحْدِثُ بِأَهْلِي عَهْدًا، فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَقَالَ: خُذْ عَلَيْكَ سِلاَحَكَ، فَإِنِّي أَخْشَى عَلَيْكَ بَنِي قُرَيْظَةَ، فَانْطَلَقَ الْفَتَى إِلَى أَهْلِهِ، فَوَجَدَ امْرَأَتَهُ قَائِمَةً بَيْنَ الْبَابَيْنِ، فَأَهْوَى إِلَيْهَا بِالرُّمْحِ لِيَطْعُنَهَا، وَأَدْرَكَتْهُ غَيْرَةٌ، فَقَالَتْ: لاَ تَعْجَلْ حَتَّى تَدْخُلَ وَتَنْظُرَ مَا فِي بَيْتِكَ، فَدَخَلَ، فَإِذَا هُوَ بِحَيَّةٍ مُنْطَوِيَةٍ عَلَى فِرَاشِهِ، فَرَكَزَ فِيهَا رُمْحَهُ، ثُمَّ خَرَجَ بِهَا، فَنَصَبَهُ فِي الدَّارِ، فَاضْطَرَبَتِ الْحَيَّةُ فِي رَأْسِ الرُّمْحِ، وَخَرَّ الْفَتَى مَيِّتًا، فَمَا يُدْرَى أَيُّهُمَا كَانَ أَسْرَعَ مَوْتًا، الْفَتَى أَمِ الْحَيَّةُ؟ فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ بِالْمَدِينَةِ جِنًّا قَدْ أَسْلَمُوا، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُمْ شَيْئًا، فَآذِنُوهُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ بَدَا لَكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ، فَاقْتُلُوهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ[1].

واتە: لە ئەبو سائیبی خزمەتکاری هیشامی کوڕی زوهرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: چومە لای ئەبو سەعیدی خودریی و بینیم نوێژ دەکات، جا دانیشتم تا نوێژەکەی تەواو بکات، جا گوێم لە جوڵانەوەیەك بوو لەژێر پێخەفەکەی لە ژوورەکەیدا، بینیم مارە، جا هەڵسام تا بیکوژم، ئەبو سەعیدیش (ﷺ ـ لەناو نوێژەکەی) ئاماژەی بۆ کردم دابنیشم، جا کاتێ تەواو بوو ئاماژەی بۆ ژوورێك کرد و گوتی: ئایا ئەو ژوورە دەبینی؟ منیش گوتم: بەڵێ، گوتی: ئەو ژوورە گەنجێکی تیا بوو تازە ژنی هێنابوو، جا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ (لە شەڕی ئەحزاب)

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٦ في الجامع؛ ومسلم: السلام: ١٣٩؛ وأبو داود: ٥٢٥٩ في الأدب؛ وابن حبان: ٥٦٣٧؛ والقابسي: ٢٧٥، كلهم عن مالك به.

دەرچوو بۆ خەندەق، لە كاتێكدا گەنجەكە لە خەندەق بوو لەناكاو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای مۆڵەتی لێ كرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتم پێ بدە كەمێك بچمەوە لای خێزانم، پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتی پێ دا و فەرمووی: چەكەكەت لەگەڵ خۆت ببە (چەكەكەی ڕمێك بوو)، (چونكە) من لە بەنو قوڕەیزە لێت دەترسم (بەوەی هێرش بكەنە سەرت)، جا گەنجەكە ڕۆیشت بۆ لای خێزانەكەی و بینی خێزانەكەی لە نێوان دوو دەرگاكانەوە وەستاوە (گومانی خراپی بە خێزانی برد كە ئاخۆ بۆچی هاتۆتە دەرەوە و لە چی دەگەڕێ؟) بە ڕمەكەیەوە بۆ لای چوو تا لێی بدات، جا ئافرەتەكە توڕە بوو و گوتی: پەلە مەكە تا دەچیتە ژوورەوە و سەیر دەكەیت چی لە ماڵەكەتدایە، جا بینی مارێك خۆی لوول داوە لەسەر پێخەفەكەی، ئەویش ڕمەكەی لە مارەكە چەقاند و مارەكەی لەگەڵ خۆی هێنایە دەرەوە و ڕمەكەی لەناو ماڵەكە چەقاند، جا مارەكە بە سەری ڕمەكەوە جوڵایەوە و گەنجەكە مرد و كەوت، نەزاندرا كامیان زووتر مرد، گەنجەكە یان مارەكە؟ جا ئەوەمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كرد، ئەویش فەرمووی: لە مەدینە هەندێك جنۆكە بوون بە مسوڵمان، جا ئەگەر شتێكتان لەوان بینی (وەك مار و سەگ و پشیلە كە دەكرێ جنۆكە بن شێوەی خۆیان گۆڕیبێ)، سێ ڕۆژ ئینزاریان بدەنێ، جا دوای ئەوە هەر لێتان دەركەوتن، ئەوە بیكوژن، چونكە ئەوە شەیتانە[١].

## ١٣- ئەو زیكر و وتەیەی فەرمانی پێ كراوە بگوترێت لە سەفەردا[٢]

**٢٧٩٩-** حَدَّثَنِي مَالِكٌ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الْغَرْزِ، وَهُوَ يُرِيدُ السَّفَرَ يَقُولُ: بِاسْمِ اللهِ، اللهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ، اللهُمَّ ازْوِ لَنَا الأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ، اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَمِنْ كَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَمِنْ سُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْمَالِ وَالأَهْلِ[٣].

---

(١) ـ تێبینی: لە شەرحی فەرموودەكەدا گوتراوە: دەكرێ جنۆكە كافرەكانی خزمی مارەكە كە جنۆكەیەكی مسوڵمان بووە گەنجەكەیان كوشتبێت لە تۆڵەی جنۆكە خزمەكەیان.

(٢) ـ مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ الْكَلَامِ فِي السَّفَرِ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٧ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٥٤ في الجامع، عن مالك به.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ قاچی دەخستە ناو ئاوزەنگی سواربوونی وشتر لە کاتێکدا بەتەمای سەفەر بوو دەیفەرموو: (بِاسْمِ الله، اللهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ، اللهُمَّ ازْوِ لَنَا الأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَمِن كَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الأَهْلِ وَالْمَالِ)، واتە: (بە ناوی خوا، پەروەردگارا تۆ خاوەنی لە سەفەردا و جێنشینی لەناو خانەوادەدا، پەروەردگارا زەویمان بۆ بپێچەرەوە (واتە مەسافەمان لەبەرچاو کورت بکەرەوە) و سەفەرەکەمان لەسەر ئاسان بکە، پەروەردگارا من پەنات پێ دەگرم لە زەحمەت و ناخۆشی سەفەر و (وە پەنات پێ دەگرم لە) دڵتەنگی بەهۆی گۆڕانی چاکە بۆ خراپە بە هۆی ڕووداوێك و بینینی مەشهەد و دیمەنی ناخۆش و خراپ لە خانەوادە و سەروەت و ساماندا.

**٢٨٠٠**- عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ حَكِيمٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ نَزَلَ مَنْزِلاً، فَلْيَقُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، فَإِنَّهُ لَنْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ[1].

واتە: لە خەولەی کچی حەکیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە کاتێ لە شوێنێك دابەزی با بڵێ: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ الله التَّامَّات مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)، واتە: (پەنا دەگرم بە وشە و وتەکانی خوای پەروەردگار ﷻ کە تەواون و کەموکوڕییان تیا نییە، لە شەڕ و خراپەی ئەوەی خوا ﷻ دروستی کردووە)، جا هیچ شتێك زەرەر و زیانی پێ ناگەیەنێ لەو شوێنە تاوەکوو لەوێ دەڕوات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩٨ في الجامع؛ وفي: ٢٠٥٨ في الجامع، عن مالك به.

## ١٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی تەنیایی لە سەفەردا بۆ پیاو و بۆ ئافرەت[(١)]

**٢٨٠١**- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﵀، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الرَّاكِبُ شَيْطَانٌ، وَالرَّاكِبَانِ شَيْطَانَانِ، وَالثَّلاَثَةُ رَكْبٌ[(٢)].

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ﵀ ئەویش لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەك سوار شەیتانە، دوو سواریش شەیتانە (واتە شەیتان زەفەریان پێ دەبات)، سێ سوار هاوەڵن (شەیتان نین، شەیتان زەفەریان پێ نابات).

**٢٨٠٢**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﵀، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الشَّيْطَانُ يَهُمُّ بِالْوَاحِدِ وَالاثْنَيْنِ، فَإِذَا كَانُوا ثَلاَثَةً لَمْ يَهُمَّ بِهِمْ[(٣)].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﵀ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان زەفەر بە یەك کەس و دوو کەس دەبات، جا کاتێ سێ کەس بن زەفەریان پێ نابات.

**٢٨٠٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، تُسَافِرُ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ مِنْهَا[(٤)].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ ئافرەتێك کە باوەڕی بە خوا ﷻ و ڕۆژی دوایی هەبێت حەڵاڵ

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْوَحْدَةِ فِي السَّفَرِ لِلرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ.

(٢) ـ حسن صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥٩ في الجامع؛ وأبو داود: ٢٦٠٧ في الجهاد؛ والترمذي: ١٦٧٤ في الجهاد، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٠ في الجامع، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦١ في الجامع؛ والشافعي: ٨٢٦؛ وابن حنبل: ٧٢٢١؛ ومسلم: المناسك: ٤٢١؛ وأبو داود: ١٧٢٤ في المناسك؛ والترمذي: ١١٧٠ في الرضاع؛ وابن حبان: ٢٧٢٥؛ والقابسي: ٤١٥، كلهم عن مالك به.

نییە ئەندازەی شەو و ڕۆژێك دوور بکەوێتەوە و سەفەر بکات، تەنها لەگەڵ مەحرەمێکی نەبێت.

## ١٥- ئەو کردارانەی فەرمانیان پێ کراوە لە سەفەردا[١]

**٢٨٠٤-** عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ، مَوْلَى سُلَيْمَانَ بْنِ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ ﷺ يَرْفَعُهُ قَالَ: إِنَّ اللهَ ﷻ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيَرْضَى بِهِ، وَيُعِينُ عَلَيْهِ مَا لاَ يُعِينُ عَلَى الْعُنْفِ، فَإِذَا رَكِبْتُمْ هَذِهِ الدَّوَابَّ الْعُجْمَ، فَأَنْزِلُوهَا مَنَازِلَهَا، فَإِنْ كَانَتِ الأَرْضُ جَدْبَةً، فَانْجُوا عَلَيْهَا بِنِقْيِهَا، وَعَلَيْكُمْ بِسَيْرِ اللَّيْلِ، فَإِنَّ الأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ، مَا لاَ تُطْوَى بِالنَّهَارِ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّعْرِيسَ عَلَى الطَّرِيقِ، فَإِنَّهَا طُرُقُ الدَّوَابِّ، وَمَأْوَى الْحَيَّاتِ[٢].

واتە: لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە ﷺ گێردراوەتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزی دەکاتەوە کە فەرموودەی ئەو بێت و فەرموویێتی: خوای پەروەردگار ﷻ نەرمونیانە و نەرمونیانیشی خۆش دەوێت، وە ئەو یارمەتییەی لەسەر نەرمونیانی دەیدات لەسەر توندوتیژی نایدات، جا ئەگەر سواری پشتی ئاژەڵی بەستەزمان بوون لەو شوێنە دابنێن و بارگەکەی بخەن کە شوێنی گونجاوە بۆ ئەو، جا ئەگەر شوێنەکە وشك و برینگ بوو (کە پێیدا دەڕۆن لە کاتی سەفەر) ئەوە ڕزگاری بکەن بە بەزەکەی خۆی (قەڵەوی و بەهێزییەکەی بقۆزنەوە بۆ زووتر تێپەڕبوون لەو شوێنە، با دواتر لەوێ لاواز و ماندوو نەبێت بەهۆی زۆرمانەوە)، وە دەست بگرن بە ڕۆیشتنی شەو، چونکە شەو باش دەپێچرێتەوە، بە شەو (زوو مەسافەکە کۆتایی دێت) بەشێوەیەك کە ناپێچرێتەوە و کۆتایی نایێت بە ڕۆژ، وە خۆتان بپارێزن لە بە شەو مانەوە لەسەر ڕێگا، چونکە ڕێگەکانی ئاژەڵان و شوێنی مارەکانە (زیانتان پێ دەگەیەنن).

---

(١) ـ مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ الْعَمَلِ فِي السَّفَرِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٢ في الجامع، عن مالك به.

**٢٨٠٥**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ وَطَعَامَهُ وَشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ وَجْهِهِ، فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەفەر پارچەیەكە لە عەزاب و ناخۆشی، هەر یەكێك لە ئێوە خۆی لە خەوتن و خواردن و خواردنەوەكەی خۆی دەگرێتەوە و (شتەكان وەك ماڵەوە نابێت)، بۆیە كاتێ هەر یەكێك لە ئێوە پێویستی و كارەكەی خۆی تەواو كرد لەو شوێنەی ڕوی تێ كردووە، ئەوە با پەلە بكات لە گەڕانەوە بۆ لای خانەوادەكەی.

## ١٦- فەرمانكردن بە نەرمونیانی لەگەڵ كۆیلەدا[٢]

**٢٨٠٦**- أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ بِالْمَعْرُوفِ، وَلاَ يُكَلَّفُ مِنَ الْعَمَلِ إِلاَّ مَا يُطِيقُ[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كۆیلە خواردن و پۆشاكی خۆی بۆ هەیە بەشێوەیەكی چاك (و بەپێی عادەت)، ناشبێ كاری پێ بسپێردرێت تەنها ئەو كارانە نەبێت كە لە توانایدایە.

**٢٨٠٧**- وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ: أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَذْهَبُ إِلَى الْعَوَالِي كُلَّ يَوْمِ سَبْتٍ، فَإِذَا وَجَدَ عَبْدًا فِي عَمَلٍ لاَ يُطِيقُهُ وَضَعَ عَنْهُ مِنْهُ[٤].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گشت ڕۆژانی شەممە دەچوو بۆ گوندەكانی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٣ في الجامع؛ والشيباني: ٩٧٧ في العتاق؛ وابن حنبل: ٧٢٢٤، وفي: ٩٧٣٨؛ والبخاري: ١٨٠٤ في العمرة، وفي: ٣٠٠١ في الجهاد، وفي: ٥٤٢٩ في الأطعمة؛ ومسلم: الإمارة: ١٧٩؛ وابن ماجه: ٢٩١٢ في المناسك؛ وابن حبان: ٢٧٠٨؛ والدارمي: ٢٦٧٠ في الاستئذان؛ والقابسي: ٤٣٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْأَمْرُ بِالرِّفْقِ بِالْمَمْلُوكِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٤ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٧٩ في الجامع، عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٥ في الجامع، عن مالك به.

دەوروبەری مەدینە، جا ئەگەر کۆیلەیەکی ببینیایە کارێك دەکات لەسەری زۆر زەحمەت و سەختە ئەوە لەسەری سووك دەکرد.

**٢٨٠٨-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، عَنْ عَمِّهِ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سَمِعَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ وَهُوَ يَقُولُ: لاَ تُكَلِّفُوا الأَمَةَ غَيْرَ ذَاتِ الصَّنْعَةِ، الْكَسْبَ، فَإِنَّكُمْ مَتَى كَلَّفْتُمُوهَا ذَلِكَ، كَسَبَتْ بِفَرْجِهَا، وَلاَ تُكَلِّفُوا الصَّغِيرَ الْكَسْبَ، فَإِنَّهُ إِذَا لَمْ يَجِدْ سَرَقَ، وَعِفُّوا إِذْ أَعَفَّكُمُ اللهُ، وَعَلَيْكُمْ مِنَ الْمَطَاعِمِ بِمَا طَابَ مِنْهَا[١].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە، ئەویش لە ئەبو سوهەیلی کوڕی مالیکی مامیەوە بۆی گێڕامەوە، ئەویش لە باوکیەوە بۆی گێڕاوەتەوە: گوێی لە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بووە لە کاتێکدا وتاری دەدا دەیگوت: داوای پارە و کەسابەت لە ئافرەتی کۆیلەی جگە لە ئافرەتی خاوەن پیشە مەکەن، چونکە ئێوە کاتێ داوای ئەوەی لێ دەکەن (پێی پەیدا نابێت و ناچارە) پارەکە بە لەشفرۆشی پەیدا دەکات (تا ئازار نەدرێت و لۆمە نەکرێت)، وە داوای پارە و کەسابەت لە منداڵ مەکەن، چونکە ئەگەر دەستی نەکەوێت دزی دەکات، وە خۆتان پاك بگرن (داوا لەمانە مەکەن) ئەگەر خوا ﷻ پاکی گرتوون (بەوەی بای ڕۆزانە و ژیانکردن بژێویتان هەبێ)، وە لە خواردن دەست بگرن بەوەی حەڵاڵە (تەنها حەڵاڵ بەدەست بێنن).

## ١٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆیلە و دیارییەکەی[٢]

**٢٨٠٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْعَبْدُ إِذَا نَصَحَ لِسَيِّدِهِ، وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ اللهِ، فَلَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٦ في الجامع؛ وفي: ٣٠١٩ في الوصايا؛ والحدثاني: ٣١٢ في القضاء، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْمَمْلُوكِ وَهِبَتِهِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٧ في الجامع؛ والبخاري: ٢٥٤٦ في العتق؛ ومسلم: الأيمان: ٤٣؛ وأبو داود: ٥١٦٩ في الأدب؛ والقابسي: ٢٥٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆیلە بەچاکی و دڵسۆزی کاری بۆ گەورەکەی کرد و بەچاکیش عیبادەتی خوای کرد، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە.

**٢٨١٠- وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أَمَةً كَانَتْ لِعُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، رَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ وَقَدْ تَهَيَّأَتْ بِهَيْئَةِ الْحَرَائِرِ، فَدَخَلَ عَلَى ابْنَتِهِ حَفْصَةَ، فَقَالَ: أَلَمْ أَرَ جَارِيَةَ أَخِيكِ تَجُوسُ النَّاسَ، وَقَدْ تَهَيَّأَتْ بِهَيْئَةِ الْحَرَائِرِ، وَأَنْكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ ﷺ [1].**

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە ئافرەتێکی کۆیلەی عوبەیدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێیان ڕازی بێ)، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئافرەتەکەی ئەوی بینی لە کاتێکدا شێوازی خۆی وەك شێوازی ئافرەتە ئازادەکان لێ کردبوو، جا ئیمامی عومەر ﷺ چووە لای حەفصەی کچی و گوتی: ئەوە بۆ جارییەی براکەت دەبینم لەناو خەڵکی دێت و دەچێت لە کاتێکدا شێوازی خۆی وەك شێوازی ئافرەتی ئازاد لێ کردووە، ئیمامی عومەر ﷺ ئینکاری ئەوەی کرد (پێی باش نەبوو، چونکە فێڵ و تێکەڵی ڕوو دەدات لە ئەحکامدا، هەر یەکەیان ئەحکامی جیاوازی خۆی هەیە).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٨ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٨١ في الجامع، عن مالك به.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەیعەتدان[1]

**٢٨١١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا بَايَعْنَا رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، يَقُولُ لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ[2].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی دینارەوە ﷺ هاتووە (گوتوویەتی): عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: ئێمە کاتێ بەیعەتمان دەدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەری، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرمووین: لەوەی لەتواناتاندایە (واتە پەیمانی گوێڕایەڵی لێ وەردەگرتین لەوەی پێیان دەکرێت و لە تاقەتی مرۆڤدایە).

**٢٨١٢-** عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي نِسْوَةٍ يُبَايِعْنَهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَقُلْنَ: يَا رَسُولَ اللهِ، نُبَايِعُكَ عَلَى أَنْ لاَ نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ نَسْرِقَ، وَلاَ نَزْنِيَ، وَلاَ نَقْتُلَ أَوْلاَدَنَا، وَلاَ نَأْتِيَ بِبُهْتَانٍ نَفْتَرِيهِ بَيْنَ أَيْدِينَا وَأَرْجُلِنَا، وَلاَ نَعْصِيَكَ فِي مَعْرُوفٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ، قَالَتْ: فَقُلْنَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا مِنْ أَنْفُسِنَا، هَلُمَّ نُبَايِعْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنِّي لاَ أُصَافِحُ النِّسَاءَ، إِنَّمَا قَوْلِي لِمِئَةِ امْرَأَةٍ، كَقَوْلِي لاِمْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ، أَوْ مِثْلِ قَوْلِي لاِمْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ[3].

واتە: لە ئومەیمەی کچی ڕوقەیقەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من لەناو ئەو ئافرەتانە بووم کە چوون بۆ بەیعەتدان بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیسلام، جا گوتیان: پەیمانت پێ دەدەین لەسەر ئەوەی هیچ هاوەڵێك بۆ خوا ﷻ بڕیار نەدەین و دزی نەکەین و زینا نەکەین و مناڵەکانمان نەکوژین و بوختان بە نێوان دەست و قاچمان نەکەین (واتە بوختانی ناموس بە یەکدی نەکەین) و لە چاکە سەرپێچیت نەکەین، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لەوەی پێتان دەکرێت و لەتواناتاندایە،

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْبَيْعَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٥ في الجهاد؛ والشيباني: ٩٦٦ في العتاق؛ والبخاري: ٧٢٠٢ في الأحكام؛ وابن حبان: ٤٥٤٨، وفي: ٤٥٥٧، وفي: ٤٥٦١؛ والقابسي: ٢٩٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٧ في الجهاد؛ والشيباني: ٩٤٢ في العتاق؛ وابن حنبل: ٢٧٠٥٣؛

دەڵێ: ئافرەتەکانیش گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ ئێمە بەبەزەییترن لە خۆمان، وەرە با بەیعەتت پێ بدەین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم، قسەم بۆ سەت ئافرەت وەك قسەکردنم وایە بۆ یەك ئافرەت (واتە بەیعەتم لە هەمووتان وەرگرت بەبێ تەوقە).

**٢٨١٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَتَبَ إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ يُبَايِعُهُ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، أَمَّا بَعْدُ: لِعَبْدِ اللهِ عَبْدِ الْمَلِكِ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، سَلاَمٌ عَلَيْكَ، فَإِنِّي أَحْمَدُ إِلَيْكَ اللهَ، الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، وَأُقِرُّ لَكَ بِالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ عَلَى سُنَّةِ اللهِ، وَسُنَّةِ رَسُولِهِ، فِيمَا اسْتَطَعْتُ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نووسراوێکی بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان نووسی بەیعەتی پێ دا و بۆی نووسی: بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، پاشان: بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولمەلیکی گەورەی باوەڕداران، سەلامی خوات لێ بێ، من ستاییشی خوا لەلای تۆ کۆتایی پێ دەهێنم کە زاتێکە هیچ پەروەردگارێکی بەحەق نییە تەنها خۆی نەبێ، وە دان دەنێم بۆ تۆ بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەری لەسەر ڕێبازی خوا ﷻ و پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەی دەتوانم.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٨ في الجهاد؛ والشيباني: ٩٠٠ في العتاق؛ والبخاري: ٧٢٠٢ في الأحكام، وفي: ٧٢٧٢ في الاعتصام، كلهم عن مالك به.




## ١- ئەوەی ناڕەوایە لە قسەدا[١]

**٢٨١٤- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَالَ لأَخِيهِ كَافِرٌ، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا[٢].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﭭ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە برای مسوڵمانی بڵێت: کافر، ئەوە بەدڵنیاییی دەکەوێتە سەر یەکێکیان (ئەگەر کەسەکە کافر بووبێتەوە ئەوە تەواوە کافرە، خۆ ئەگەر کافر نەبێ ئەوە قسەکەرەکە خۆی کافر دەبێ چونکە دیارە خەسڵەتی ئیمان بە کوفر دادەنێت، یانیش تەنها مەبەست ترساندن و خەتەرناکی وشەکەیە).

**٢٨١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَقُولُ: هَلَكَ النَّاسُ، فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ[٣].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گوێت لە پیاوێك بوو دەیگوت: خەڵك هەمووی لەناو چوو (هەمووی نوقمی تاوانن، هەموویان خراپن، هەموویان بێدینن)، ئەوە بزانە لە هەموویان لەناوچووترە (لە هەموویان تاوانبارترە، چونکە لە خۆی ڕازییە و خەڵکی پێ خراپەکارە).

**٢٨١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنَّ اللهَ هُوَ الدَّهْرُ[٤].**

---

(١) ـ مَا يُكْرَهُ مِنَ الْكَلَامِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦٩ في الجامع؛ والشيباني: ٩١٩ في العتاق؛ وابن حنبل: ٥٩٣٣؛ والبخاري: ٦١٠٤ في الأدب؛ والترمذي: ٢٦٣٧ في الإيمان؛ وابن حبان: ٢٤٩؛ والقابسي: ٢٩٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٠ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٠٠٠٦، وفي: ١٠٧٠٨؛ وابن حبان: ٥٧٦٢؛ والقابسي: ٤٤٢، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧١ في الجامع؛ وابن حبان: ٥٧١٣؛ والقابسي: ٣٦٤، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با کەسێك لە ئێوە نەڵێت: ئەی خراپە و بێوەفایی زەمانە، چونکە خوای پەروەردگار بەڕێوەبەری زەمانەیە.

٢٨١٧- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ لَقِيَ خِنْزِيرًا بِالطَّرِيقِ، فَقَالَ لَهُ: انْفُذْ بِسَلاَمٍ، فَقِيلَ لَهُ: تَقُولُ هَذَا لِخِنْزِيرٍ؟ فَقَالَ عِيسَى: إِنِّي أَخَافُ أَنْ أُعَوِّدَ لِسَانِي النُّطْقَ بِالسُّوءِ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عیسای کوڕی مەریەم ﷺ لە ڕێگادا گەیشت بە بەرازێك و پێی فەرموو: بڕۆ بەسەلامەتی و دڵنیایی، جا پێی گوترا: ئەو قسەیە بە بەراز دەڵێی (بەراز قسەی جوانی بۆ چییە)؟ عیساش ﷺ فەرمووی: من دەترسم زمانم ڕابێت لەسەر دەربڕینی قسەی خراپ (بۆیە ناڵێم: لاچۆ دەی، لێرە نەمێنی، وەحە، ... هتد).

## ٢- ئەوەی فەرمانی پێ کراوە لە هەڵوێستەکردن و بەئاگایی لە قسەکردندا[٢]

٢٨١٨- عَنْ بِلاَلِ بْنِ الْحَارِثِ الْمُزَنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللهِ، مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، يَكْتُبُ اللهُ لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللهِ، مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، يَكْتُبُ اللهُ لَهُ بِهَا سَخَطَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ[٣].

واتە: لە بیلالی کوڕی حاریسی موزەنییەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی وا هەیە قسەیەك دەکات لە ڕەزامەندی خوا ﷻ، گومان نابات بگات بەو ئاستە، خوای پەروەردگار ﷻ بەهۆیەوە ڕەزامەندی خۆی پێ دەبەخشێت تا ئەو ڕۆژەی پێی دەگات، وە کەسی وا هەیە قسەیەك

---

(١) ـ مقطوع صحيح.

(٢) ـ مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ التَّحَفُّظِ فِي الْكَلَامِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٢ في الجامع؛ والقابسي: ١٠٣، عن مالك به.




دەکات لە ناڕەزایی خوا ﷻ، گومان نابات بگات بەو ئاستە، خوای پەروەردگار ﷻ بەهۆیەوە ناڕەزایی خۆی دەدات بەسەریدا تا ئەو ڕۆژەی پێی دەگات.

**٢٨١٩-** أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مَا يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَهْوِي بِهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مَا يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَرْفَعُهُ اللهُ بِهَا فِي الْجَنَّةِ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ گوتوویەتی: پیاو هەیە قسەیەك دەکات و هیچ گوێی پێ نادات (پێی شتێکی سادەیە)، بەهۆیەوە دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، وە پیاو هەیە قسەیەك دەکات و هیچ گوێی پێ نادات (پێی شتێکی سادەیە)، خوای پەروەردگار بەهۆیەوە لە بەهەشت پلەی بەرز دەکاتەوە.

## ٣- ئەوەی بە خراپ دانراوە لە قسەکردن بەبێ یادی خوا ﷻ[٢]

**٢٨٢٠-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ رَجُلاَنِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا، أَوْ: إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ[٣].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: دوو پیاو لەلای خۆرهەڵاتەوە هاتن (بۆ مەدینە) و وتاریان دا و خەڵکی زۆر سەرسام بوون بە ڕەوانبێژییەکەیان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەندێك لە ڕەوانبێژی سیحرە (واتە کاریگەری گەورە لەسەر بەرانبەرەکەی دروست دەکات و ناحەق دەکات بە حەق و دەیڕازێنێتەوە بەهۆی وشەکارییەوە).

**٢٨٢١-** وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ كَانَ يَقُولُ: لاَ تُكْثِرُوا الْكَلاَمَ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ، فَتَقْسُوَ قُلُوبُكُمْ، فَإِنَّ الْقَلْبَ الْقَاسِيَ بَعِيدٌ مِنَ اللهِ، وَلَكِنْ لاَ تَعْلَمُونَ،

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٣ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُكْرَهُ مِنَ الْكَلَامِ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٤ في الجامع؛ وابن حنبل: ٤٦٥١، وفي: ٥٢٩١؛ والبخاري: ٥٧٦٧ في الطب؛ وأبو داود: ٥٠٠٧ في الأدب؛ وابن حبان: ٥٧٩٥؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٦٣٩؛ والقابسي: ١٦٤، كلهم عن مالك به.




وَلاَ تَنْظُرُوا فِي ذُنُوبِ النَّاسِ كَأَنَّكُمْ أَرْبَابٌ، وَانْظُرُوا فِي ذُنُوبِكُمْ كَأَنَّكُمْ عَبِيدٌ، فَإِنَّمَا النَّاسُ مُبْتَلًى، وَمُعَافًى، فَارْحَمُوا أَهْلَ الْبَلاَءِ، وَاحْمَدُوا اللهَ عَلَى الْعَافِيَةِ[١].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە عیسای کوڕی مەریەم ﷺ دەیفەرموو: قسە زۆر مەکەن بەبێ یادی خوا ﷻ، نەوەك دڵتان ڕەق بێت، چونکە دڵی ڕەق دوورە لە ڕەحمەتی خوا ﷻ، بەڵام نازانن، وە سەیری تاوانی خەڵك مەکەن وەك ئەوەی ئێوە خوا بن، بەڵکوو سەیری تاوانی خۆتان بکەن ئێوە بەندەن، جا خەڵکی (دوو جۆرە) هەیانە موبتەلا بووە (بە تاوان)، هەشیانە سەلامەتە (تووشی تاوانی زۆر نەبووە)، جا بەزەیی و سۆزتان بێتەوە بەوانەی موبتەلابوون بە تاوان (دوعایان بۆ بکەن و یارمەتییان بدەن بەرەو چاکە بچن)، وە ستاییشی خواش بکەن لەسەر سەلامەتی (لە تاوان).

٢٨٢٢- وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تُرْسِلُ إِلَى بَعْضِ أَهْلِهَا بَعْدَ الْعَتَمَةِ فَتَقُولُ: أَلاَ تُرِيحُونَ الْكُتَّابَ[٢].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دوای عیشا کەسێکی دەنارد بۆ لای هەندێ لە خانەوادەکەی دەیگوت: بۆچی فریشتەکان ئەرخەیان ناکەن (واتە بۆچی هەر دەبێ فریشتەی سەر شانی چەپەتان هەر خراپەتان بۆ بنووسێت و نەحەسێتەوە، بخەون قسەی زیاد مەکەن).

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٥ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٦٢ في الجامع؛ والشيباني: ٩٧٦ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٦ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٦٣ في الجامع، عن مالك به.

## ٤- ئەوەی دەربارەی غەیبەت هاتووە[١]

٢٨٢٣- عَنِ الْوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَيَّادٍ ﵀، أَنَّ الْمُطَّلِبَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُوَيْطِبَ الْمَخْزُومِيَّ ﵁ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: مَا الْغِيبَةُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنْ تَذْكُرَ مِنَ الْمَرْءِ مَا يَكْرَهُ أَنْ يَسْمَعَ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَإِنْ كَانَ حَقًّا؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا قُلْتَ بَاطِلاً فَذَلِكَ الْبُهْتَانُ[٢].

واتە: لە وەلیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی صەیادەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): موتەلیبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حوەیتیبی مەخزومی ﵁ هەواڵی پێ داوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد گوتی: غەیبەت چییە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوەیە شتێکی کەسێك باس بکەیت پێی ناخۆش بێت گوێبیستی ببێت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەگەر شتەکە ڕاست بوو؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ناڕاست بڵێیت، ئەوە بوختانە (واتە بەدڵنیایی دەبێ شتەکە ڕاست بێت ئینجا غەیبەتە، ئەگینا ئەوە بوختانە و زۆر لە غەیبەت گەورەترە).

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی ترسان لە زمان[٣]

٢٨٢٤- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ وَقَاهُ اللهُ شَرَّ اثْنَيْنِ، وَلَجَ الْجَنَّةَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ تُخْبِرْنَا، فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ عَادَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقَالَ مِثْلَ مَقَالَتِهِ الأُولَى، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: لاَ تُخْبِرْنَا، يَا رَسُولَ اللهِ، فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِثْلَ ذَلِكَ أَيْضًا، فَقَالَ الرَّجُلُ: لاَ تُخْبِرْنَا، يَا رَسُولَ اللهِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِثْلَ ذَلِكَ أَيْضًا، ثُمَّ ذَهَبَ الرَّجُلُ يَقُولُ مِثْلَ مَقَالَتِهِ الأُولَى، فَأَسْكَتَهُ رَجُلٌ إِلَى جَنْبِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ وَقَاهُ اللهُ شَرَّ اثْنَيْنِ، وَلَجَ الْجَنَّةَ، مَا بَيْنَ لَحيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ[٤].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْغِيبَةِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٣ في الجامع؛ والشيباني: ٩٥٦ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِيماَ يُخَافُ مِنَ اللِّسَانِ.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٧ في الجامع؛ والشيباني: ٩٧٥ في العتاق، عن مالك به.




واتە: لە عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خوای پەروەردگار ﷻ لە شەڕی دوو شت بیپارێزێت دەچێتە بەهەشت، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان مەڵێ (لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتووە دەڵێ: ئایا پێمان ناڵێی؟)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان شتی فەرموو، پیاوەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان مەڵێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان شتی فەرموو، دواتر پیاوەکە هەمان قسەی پێشووی دووبارە کردەوە، جا پیاوێك کە لە تەنیشتیەوە بوو بێدەنگی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك خوای پەروەردگار ﷻ لە شەڕی دوو شت بیپارێزێت دەچێتە بەهەشت، (دوو شتە شەڕەکان بریتین لە): نێوانی ڕیش و سمێڵ و نێوانی دوو قاچەکان، نێوانی ڕیش و سمێڵ و نێوانی دوو قاچەکان، نێوانی ڕیش و سمێڵ و نێوانی دوو قاچەکان (واتە دەم و داوێن).

**٢٨٢٥**- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ دَخَلَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ وَهُوَ يَجْبِذُ لِسَانَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: مَهْ غَفَرَ اللهُ لَكَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: إِنَّ هَذَا أَوْرَدَنِي الْمَوَارِدَ[١].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ چوو بۆ لای ئەبو بەکری صدیق ﷺ لە کاتێکدا زمانی خۆی ڕادەکێشا، جا ئیمامی عومەر ﷺ پێی گوت: بەسە وا مەکە خوا لێت خۆش بێت (بۆ ئازاری زمانت دەدەیت)، ئیمامی ئەبو بەکریش ﷺ گوتی: ئەو زمانە دەمباتە سەر زۆر ڕێگای ترسناك (واتە هۆکاری زۆر تاوانانە، کە عاقیبەتی خراپیان هەیە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧٨ في الجامع، عن مالك به.




## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی چپەکردنی دوو کەس بەبێ کەسەکەی دیکە (بەبێ کەسی سێیەم)[١]

**٢٨٢٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷬، قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷻ عِنْدَ دَارِ خَالِدِ بْنِ عُقْبَةَ الَّتِي بِالسُّوقِ، فَجَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يُنَاجِيَهُ، وَلَيْسَ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷻ أَحَدٌ غَيْرِي، وَغَيْرُ الرَّجُلِ الَّذِي يُرِيدُ أَنْ يُنَاجِيَهُ، فَدَعَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷻ رَجُلاً آخَرَ، حَتَّى كُنَّا أَرْبَعَةً، فَقَالَ لِي وَلِلرَّجُلِ الَّذِي دَعَا: اسْتَأْخِرَا شَيْئًا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ وَاحِدٍ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﷬ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷻ لەلای ئەو ماڵەی خالیدی کوڕی عوقبە بووین کە لە بازاڕ بوو، جا پیاوێك هات ویستی بەچپە و ئەسپایی قسەی لەگەڵ بکات، لە کاتێکدا جگە لە من و ئەو کەسەی دەیەویست بەئەسپایی قسەی لەگەڵ بکات کەسی دیکە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷻ نەبوو، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷻ بانگی کەسێکی دیکەی کرد تا بووین بە چوار کەس، جا بە من و ئەو پیاوەی گوت کە بانگی کردبوو: تۆزێك بکشێنە دواوە (تا گوێتان لە قسەکانمان نەبێت)، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: با دوو کەس بەچپەچپ و بەئەسپایی قسە لەگەڵ یەکدی نەکەن بەبێ کەسەکەی دیکە (ئەگەر سێ کەس بوون).

**٢٨٢٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷻ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا كَانَ ثَلاَثَةٌ، فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ وَاحِدٍ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷻ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ سێ کەس بوون، ئەوە با دوو کەس قسەی نهێنی و

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي مُنَاجَاةِ اثْنَيْنِ دُونَ وَاحِدٍ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨١ في الجامع؛ والشيباني: ٩٦٣ في العتاق؛ وابن حبان: ٥٨٢؛ والقابسي: ٢٩٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٢ في الجامع؛ والبخاري: ٦٢٨٨ في الاستئذان؛ ومسلم: السلام: ٣٦؛ والقابسي: ٢٥٨، كلهم عن مالك به.

چپە چپ نەکەن بەبێ هاوڕێکەیان (بەبێ کەسی سێیەم)، چونکە ئەوە غەمباری دەکات (لەبەر ئەوەی لە دڵی خۆی دەڵێت: دیارە خەریکی پیلانێکن دژی من، یان دەڵێت: دیارە متمانەیان بە من نیە و شایستەی قسە لەلاکردن نیم).

## ٧- ئەوەی دەربارەی ڕاستگۆیی و درۆ هاتووە[١]

**٢٨٢٨-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: أَكْذِبُ امْرَأَتِي يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ خَيْرَ فِي الْكَذِبِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَعِدُهَا، وَأَقُولُ لَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ جُنَاحَ عَلَيْكَ[٢].

واتە: لە صەفوانی کوڕی سولەیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: درۆ لەگەڵ خێزانەکەم دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئایا دەبێت)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خێر و چاکە و (سەرەنجامباشی) لە درۆدا نییە، پیاوەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەواتە بەڵێنی پێ دەدەم و قسەی بۆ دەکەم (دەڵێم لە ئاییندەدا ئاوا و ئاوات بۆ دەکەم)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تاوانت لەسەر نییە (ئاوا باشە).

**٢٨٢٩-** وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَالْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَالْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، أَلاَ تَرَى أَنَّهُ يُقَالُ: صَدَقَ وَبَرَّ، وَكَذَبَ وَفَجَرَ[٣].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەیگوت: دەست بگرن بە ڕاستگۆییەوە، چونکە ڕاستگۆیی ڕێنیشاندەرە بۆ چاکە، چاکەش ڕێنیشاندەرە بۆ بەهەشت، وە خۆتان بپارێزن لە درۆ، چونکە درۆ پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ خراپەکاری، خراپەش دەبێتە

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الصِّدْقِ وَالْكَذِبِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٤ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩٥ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف موقوفا، صحيح مرفوعا. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٥ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٧٠ في الجامع، عن مالك به.




هۆکار بۆ ئاگر و چوونە دۆزەخ، جا ئایا نابینی (بە کەسی ڕاستگۆ) دەگوترێت: ڕاستی کرد و چاکەی کرد، وە (بە کەسی درۆزنیش) دەگوترێت: درۆی کرد و خراپەی کرد.

**٢٨٣٠-** وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّهُ قِيلَ لِلُقْمَانَ الْحَكِيمِ: مَا بَلَغَ بِكَ مَا نَرَى؟ يُرِيدُونَ الْفَضْلَ، فَقَالَ لُقْمَانُ ﷺ: صِدْقُ الْحَدِيثِ، وَأَدَاءُ الأَمَانَةِ، وَتَرْكُ مَا لاَ يَعْنِينِي[1].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە بە لوقمانی حەکیم ﷺ گوتراوە: چی تۆی گەیاندە ئەو ئاستەی کە دەیبینین؟ مەبەستیان ئەو فەزڵە زۆرە بوو (کە خوا پێی بەخشیبوو)، لوقمانی حەکیم ﷺ گوتی: بە ڕاستگۆیی لە قسەکردن و بەجێگەیاندنی ئەمانەت و وازهێنان لەو شتەی پەیوەندی بە منەوە نییە.

**٢٨٣١-** وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَزَالُ الْعَبْدُ يَكْذِبُ، وَتُنْكَتُ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، حَتَّى يَسْوَدَّ قَلْبُهُ، فَيُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ مِنَ الْكَاذِبِينَ[2].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە پێی گەیشتووە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەیگوت: کەسی وا هەیە بەردەوام درۆ دەکات و خاڵێکی ڕەش لە دڵی دەدرێت، تاوەکوو دڵی ڕەش دەبێت و لەلای خوای پەروەردگار لە درۆزنان دادەنرێت.

**٢٨٣٢-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: أَيَكُونُ الْمُؤْمِنُ جَبَانًا؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَقِيلَ لَهُ: أَيَكُونُ الْمُؤْمِنُ بَخِيلاً؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَقِيلَ لَهُ: أَيَكُونُ الْمُؤْمِنُ كَذَّابًا؟ فَقَالَ: لاَ[3].

واتە: لە صەفوانی کوڕی سولەیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: ئایا بڕوادار ترسنۆك دەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ، وە پێی

---

(١) ـ مقطوع صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٧ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٧١ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٦ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٨ في الجامع، عن مالك به.




گوترا: ئایا بڕوادار ڕەزیل دەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ، وە پێی گوترا: ئایا بڕوادار درۆزن دەبێت؟ فەرمووی: نەخێر (بڕواداری چاك هەرگیز درۆزن نابێت).

## ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەفیڕۆدانی ماڵ و سەروەت و دەربارەی دووڕوو[١]

**٢٨٣٣-** عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاَثًا، وَيَسْخَطُ لَكُمْ ثَلاَثًا: يَرْضَى لَكُمْ أَنْ تَعْبُدُوهُ، وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعًا، وَأَنْ تَنَاصَحُوا مَنْ وَلاَّهُ اللهُ أَمْرَكُمْ، وَيَسْخَطُ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ[٢].

واتە: لە سوهەیلی کوڕی ئەبو صالحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار ﷻ لە سێ شتدا لە ئێوە ڕازی دەبێت و لە سێ شتیشدا لە ئێوە توڕە دەبێت: لێتان ڕازی دەبێت بەوەی: بیپەرستن هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن، وە گشتتان دەست بە ڕێبازی خواوە بگرن، وە ئامۆژگاری ئەو کەسانە بکەن کە خوای پەروەردگار ﷻ کاروباری ئێوەی داونەتە دەست، وە لێتان توڕە دەبێت بە: قیل و قال (واتە بڵێی ئاوا گوترا و فڵان ئاوای گوت و ئاوا بوو و ئاوا چوو)، وە بە فیڕۆدانی سەروەت و سامان، وە زۆر پرسیارکردن و داواکردن.

**٢٨٣٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مِنْ شَرِّ النَّاسِ ذُو الْوَجْهَيْنِ: الَّذِي يَأْتِي هَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ، وَهَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە خراپترینی خەڵکی بریتییە لە کەسی دووڕوو: ئەوەی بە ڕووێك دەچێتە لای ئەو کۆمەڵە خەڵکە و بە ڕووێکی دیکە دەچێتە لای ئەوانی دیکە.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي إِضَاعَةِ الْمَالِ، وَذِي الْوَجْهَيْنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٨٩ في الجامع؛ وابن حبان: ٣٣٨٨، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٠ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩٧ في العتاق؛ وابن حنبل: ٩٩٩٨، وفي: ١٠٧١١؛ ومسلم: البر والصلة: ٩٨؛ وابن حبان: ٥٧٥٥؛ والقابسي: ٣٦٥، كلهم عن مالك به.




## ٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی سزای گشتی بەهۆی کردەوەی خەڵکانێك[١]

**٢٨٣٥-** أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَهْلِكُ، وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ[٢].

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (بە پێغەمبەری خوای ﷺ) گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لەناو دەچین لە کاتێکدا کەسانی چاکمان لەناودایە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، کاتێ پیسی و خراپە زۆر بوو.

**٢٨٣٦-** عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَكِيمٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ يَقُولُ: كَانَ يُقَالُ: إِنَّ اللهَ ﷻ لاَ يُعَذِّبُ الْعَامَّةَ بِذَنْبِ الْخَاصَّةِ، وَلَكِنْ إِذَا عُمِلَ الْمُنْكَرُ جِهَارًا، اسْتَحَقُّوا الْعُقُوبَةَ كُلُّهُمْ[٣].

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو حەکیمەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوێی لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﵀ بووە دەیگوت: خوای پەروەردگار ﷻ خەڵکی بەگشتی سزا نادات بەهۆی تاوانی خەڵکانێك، بەڵام کاتێ کردەوەی خراپ بەئاشکرا ئەنجام درا، ئەو کات گشتیان شایستەی سزا دەبن.

## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی تەقوا[٤]

**٢٨٣٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁، وَخَرَجْتُ مَعَهُ، حَتَّى دَخَلَ حَائِطًا، فَسَمِعْتُهُ وَهُوَ يَقُولُ: وَبَيْنِي وَبَيْنَهُ جِدَارٌ وَهُوَ فِي جَوْفِ الْحَائِطِ: عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ، بَخٍ بَخٍ، وَاللَّهِ يَابْنَ الْخَطَّابِ، لَتَتَّقِيَنَّ اللهَ أَوْ لَيُعَذِّبَنَّكَ[٥].

------------------------------

(١) ـ مَا جَاءَ فِي عَذَابِ الْعَامَّةِ بِعَمَلِ الْخَاصَّةِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩١ في الجامع؛ والحدثاني: ٧٧٤ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٣ في الجامع، عن مالك به.

(٤) ـ مَا جَاءَ فِي التُّقَى.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٢ في الجامع، عن مالك به.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بوو لە کاتێکدا منیش لەگەڵی دەرچووم (ڕۆیشت) تا چووە ناو بێستانێك لە کاتێکدا دیوارێك لە نێوان من و ئەودا بوو و ئەو لەناو شوورەی بێستانەکە بوو، جا (لەو حاڵەتە) گوێم لێی بوو (قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد) دەیگوت: عومەری کوڕی خەتتاب گەورەی باوەڕداران بەخ بەخ (واتە مەنازە) سوێند بە خوا ئەی کوڕی خەتتاب یان تەقوای خوا دەکەیت یان سزات دەدەن.

**٢٨٣٨-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَلَغَنِي أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ وَمَا يَعْجَبُونَ بِالْقَوْلِ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُرِيدُ بِذَلِكَ الْعَمَلَ، إِنَّمَا يُنْظَرُ إِلَى عَمَلِهِ، وَلاَ يُنْظَرُ إِلَى قَوْلِهِ[٢].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم گەیشتووە قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ دەیگوت: گەیشتووم بە هاوەڵان بە قسە سەرسام نەدەبوون.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مەبەستی بەوە کردەوەیە (واتە کردەوەیان لەلا گرنگ بوو)، چونکە سەیری کردەوەی مرۆڤ دەکرێت، سەیری قسەکەی ناکرێت.

## ١١- زیکر و وتەی ئەو کاتەی گوێت لە هەورەبروسکە دەبێت[٣]

**٢٨٣٩-** عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَمِعَ الرَّعْدَ تَرَكَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: سُبْحَانَ الَّذِي يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ، وَالْمَلاَئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَوَعِيدٌ لأَهْلِ الأَرْضِ شَدِيدٌ[٤].

---

(١) ـ مقطوع حسن.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٥ في الجامع، عن مالك به.

(٣) ـ الْقَوْلُ إِذَا سَمِعْتَ الرَّعْدَ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٤ في الجامع؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٩٢٠٥ في الدعاء عن طريق معن، عن مالك به.

واتە: لە عامری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەموو جار کاتێ گوێی لە هەورەبروسکە (چەخماخە) دەبوو وازی لە قسە دەهێنا و دەیگوت: (سُبْحَانَ الَّذِي يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ، وَالْمَلاَئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ)، واتە: (پاك و بێگەردی و ستاییش بۆ ئەو کەسەی چەخماخە ستاییشی دەکات و فریشتەکانیش ستاییشی دەکەن بەترسان لێی)، دواتر دەیگوت: ئەوە هەڕەشەیەکی توندە لە خەڵکی سەر زەوی (واتە ئەگەر خوا بیەوێ بەو دەسەڵاتە بەزەبرە لەناویان دەبات ـ والله أعلم ـ).

## ١٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی پێغەمبەری خوا ﷺ[1]

**٢٨٤٠**- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَرَدْنَ أَنْ يَبْعَثْنَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﵁ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﵁ الصِّدِّيقِ فَيَسْأَلْنَهُ مِيرَاثَهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ لَهُنَّ عَائِشَةُ ﵂: أَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا فَهُوَ صَدَقَةٌ[2].

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ویستیان عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ بنێرن بۆ لای ئەبو بەکری صددیق ﵁ و داوای لێ بکەن پشکە میراتی خۆیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پێ بدات، جا عائیشە ﵂ پێی گوتن: مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو: ئێمە میراتمان لێ ناگیرێت، ئەوەی جێی دەهێڵین دەبێتە صەدەقە و خێر.

**٢٨٤١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تُقْسِمُ وَرَثَتِي دَنَانِيرَ، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي، وَمَؤُونَةِ عَامِلِي، فَهُوَ صَدَقَةٌ[3].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي تَرِكَةِ النَّبِيِّ ﷺ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٦ في الجامع؛ والشيباني: ٧٢٧ في الفرائض؛ وابن حنبل: ٢٦٣٠٣؛ والبخاري: ٦٧٣٠ في الفرائض؛ ومسلم: الجهاد: ٥١؛ وأبو داود: ٢٩٧٦ في الخراج؛ وابن حبان: ٦٦١١؛ والقابسي: ٤٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٧ في الجامع؛ والشيباني: ٧٢٦ في الفرائض؛ والشافعي: ١٥٠٦؛

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با میراتگرانم پارە دابەش نەکەن (لە نێوانی خۆیان)، ئەوەی جێی دەهێڵم دەبێتە صەدەقە و خێر (نابێتە میرات) دوای (دەرهێنانی) نەفەقەی خێزانەکانم و مەسرەفی فەرمانبەرەکانم.

والبخاري: ٢٧٧٦ في الوصايا، وفي: ٣٠٩٦ في فرض الخمس، وفي: ٦٧٢٩ في الفرائض؛ ومسلم: الجهاد: ٥٥؛ وأبو داود: ٢٩٧٤ في الخراج؛ وابن حبان: ٦٦١٠؛ والقابسي: ٣٧٢، كلهم عن مالك به.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سیفەتی دۆزەخ[١]

**٢٨٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: نَارُ بَنِي آدَمَ الَّتِي يُوقِدُونَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً، قَالَ: إِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگری مرۆڤەکان کە هەڵیدەکەن بەشێکە لە حەفتا بەش لە ئاگری دۆزەخ، جا گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەر ئەو ئاگرەی مرۆڤەکانیش بووایە هەر بەس بوو (ئاگری دونیا خۆی سەختییەکەی بەسە)، فەرمووی: (دەنا بزانن هەر ئەوەندە نییە) شەست و نۆ بەشی بۆ زیاد کراوە.

**٢٨٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: أَتُرَوْنَهَا حَمْرَاءَ كَنَارِكُمْ هَذِهِ، لَهِيَ أَسْوَدُ مِنَ الْقَارِ، وَالْقَارُ الزِّفْتُ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ئایا پێتان وایە ئاگری دۆزەخ سوورە وەك ئەو ئاگرەتان، (نەخێر) بەدڵنیایی ڕەشترە لە قیر.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ جَهَنَّمَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩٨ في الجامع؛ والبخاري: ٣٢٦٥ في بدء الخلق؛ وابن حبان: ٧٤٦٢، والقابسي: ٣٧٤، كلهم عن مالك به.




## ١- هاندان بۆ بەخشین و صەدەقە[١]

٢٨٤٤- عَنْ أَبِي الْحُبَابِ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلاَ يَقْبَلُ اللهُ إِلاَّ طَيِّبًا، كَانَ إِنَّمَا يَضَعُهَا فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ، يُرَبِّيهَا كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ أَوْ فَصِيلَهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ[٢].

واتە: لە ئەبو حوباب سەعیدی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك هەر خێر و صەدەقەیەك بکات لە پارەی کەسابەت و ڕەنجی حەڵاڵ و پاکی خۆی، لە کاتێکدا خوای پەروەردگار ﷻ هیچ شتێك وەرناگرێت و قبووڵی ناکات حەتمەن دەبێ حەڵاڵ و پاك بێت، (جا کەسێك کە صەدەقەیەکی بە کەسابەتی حەڵاڵی خۆی کرد) حەتمەن ئەو کاتەی خێرەکە دەکات دەیخاتە دەستی فەزڵی خوای پەروەردگارەوە ﷻ (واتە دەچێتە لای خوای پەروەردگار ﷻ و قبووڵ دەبێت)، جا خوای پەروەردگار ﷻ زیادی دەکات بۆ هەر یەکێك لە ئێوە، هەروەك چۆن یەکێك لە ئێوە بەچکەی ئاژەڵێك گەورە دەکەن (بەرهەم و نرخی زیاد دەکات لەگەڵ گەورەکردن، ئاواش خوا بەرهەم و پاداشتی صەدەقە زیاد دەکات) هەتاکوو وەکوو چیای لێ دێت.

٢٨٤٥- عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ ﷺ أَكْثَرَ أَنْصَارِيٍّ بِالْمَدِينَةِ مَالاً مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرُحَاءَ، وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدْخُلُهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ، قَالَ أَنَسٌ ﷺ: فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران، قَامَ أَبُو طَلْحَةَ ﷺ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران، وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرُحَاءَ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ أَرْجُو بِرَّهَا، وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللهِ حَيْثُ شِئْتَ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ:

بَخْ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ فِيهِ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ ﷺ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ، وَبَنِي عَمِّهِ[1].

واتە: لە ئیسحاقی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی ئەبو تەلحەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوێی لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ بووە دەیگوت: ئەبو تەلحە ﷺ لە مەدینەدا لە هەموو ئەنصارییەكان سەروەتی خورمای زیاتر بوو، وە خۆشەویسترینی ماڵەكەی لەلای ئەو (باغێك بوو بە ناوی) بەیڕوحاء، لە بەرانبەر مزگەوت بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دەچووە ناویەوە و لە ئاوە خۆشەكەی ناوی دەخواردەوە، ئەنەس ﷺ دەڵێ: جا كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی:﴿ لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾ ﴾ آل عمران، واتە: [ناگەن بە پلەی چاكی و چاكەكاری تەواو (وە پاداشت و جەزای ڕاستەقینە و هەرەچاكتان دەست ناكەوێت) هەتا لەو شتەی كە خۆشتان دەوێت نەیبەخشن، هەر شتێكیش ببەخشن ئەوە خوا ئاگادار و زانایە پێی].

جا ئەبو تەلحە ﷺ هەڵسا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ آل عمران، وە خۆشەویسترین موڵك و ماڵی من لەلای من بەیڕوحائە، جا ئەوە بوو بە صەدەقە و كردم بە خێر ئومێدەواری چاكترین زاد و پاداشتی صەدەقەم لەلای خوای پەروەردگار ﷻ، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنی دەتەوێ و پێت باشە بەكاری بێنە (من كردم بە صەدەقە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەك پیرۆزت بێ، ئەوە ماڵێكی بە قازانجە (بۆ دواڕۆژت) وە گوێم لێ بووە ئەوەی گوتووتە دەربارەی (كە گوتبووی خۆشەویسترین ماڵە لەلام)، وە من پێم باشە بیدەی بە خزمە نزیكەكانت، ئەبو تەلحەش ﷺ گوتی: وا دەكەم ئەی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٠١ في الجامع؛ وابن حنبل: ١٢٤٦١؛ والبخاري: ١٤٦١ في الزكاة، وفي: ٢٣١٨ في الوكالة، وفي: ٢٧٥٢ في الوصايا، وفي: ٢٧٦٩ في الوصايا، وفي: ٤٥٥٤ في التفسير، وفي: ٥٦١١ في الأشربة؛ ومسلم: الزكاة: ٤٢؛ وابن حبان: ٣٣٤٠، وفي: ٧١٨٢؛ والدارمي: ١٦٥٥ في الزكاة؛ والقابسي: ١١٦، كلهم عن مالك به.

پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەبو تەلحە ﷺ باغەکەی دابەش کرد لە نێوان خزمەکانی و منالەکانی مامی.

**٢٨٤٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَعْطُوا السَّائِلَ، وَإِنْ جَاءَ عَلَى فَرَسٍ[1].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی داوای خێر دەکات پێی ببەخشن، هەرچەندە بە ئەسپیش هاتبێت (واتە هەرچەندە نیشانەیەکی دەوڵەمەندیشی پێوە دیار بێت، چونکە ڕەنگە ئەسپەکە هی خۆی نەبێت، یان ڕەنگە بۆ شتێکی زۆر پێویست پێویستی بە پارە بێت و نەکرێت ئەسپەکەی بفرۆشێت یان ... هتد).

**٢٨٤٧-** عَنْ عَمْرِو بْنِ مُعَاذٍ الأَشْهَلِيِّ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنْ جَدَّتِهِ، أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا نِسَاءَ الْمُؤْمِنَاتِ، لاَ تَحْقِرَنَّ إِحْدَاكُنَّ لِجَارَتِهَا، وَلَوْ كُرَاعَ شَاةٍ مُحْرَقًا[2].

واتە: لە عەمری کوڕی موعازی ئەشهەلی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە داپیریەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئافرەتانی مسوڵمان، با هیچێك لە ئێوە شتی دراوسێکەی بە کەم نەزانێت ئەگەرچی پێچکێکی سوتاوی دواوەی قاچی ئاژەڵیش بێت (کە بەخێر یان بەدیاری بۆتان دێت).

**٢٨٤٨-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ مِسْكِينًا سَأَلَهَا، وَهِيَ صَائِمَةٌ، وَلَيْسَ فِي بَيْتِهَا إِلاَّ رَغِيفٌ، فَقَالَتْ لِمَوْلاَةٍ لَهَا: أَعْطِيهِ إِيَّاهُ، فَقَالَتْ: لَيْسَ لَكِ مَا تُفْطِرِينَ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: أَعْطِيهِ إِيَّاهُ، قَالَتْ: فَفَعَلْتُ، قَالَتْ: فَلَمَّا أَمْسَيْنَا، أَهْدَى لَنَا أَهْلُ بَيْتٍ أَوْ إِنْسَانٌ مَا كَانَ يُهْدِي لَنَا شَاةً وَكَفَنَهَا، فَدَعَتْنِي عَائِشَةُ ﷺ، فَقَالَتْ: كُلِي مِنْ هَذَا، هَذَا خَيْرٌ مِنْ قُرْصِكِ[3].

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥٤ في الجامع؛ وفي: ٢١٠٣ في الجامع؛ والشيباني: ٩٣٢ في العتاق؛ وابن حنبل: ١٦٦٦٢، وفي: ٢٣٢٤٨، وفي: ٢٧٤٨٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٠٥ في الجامع؛ والحدثاني: ٨٠٤ في الجامع، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ پێی گەیشتووە (گوتوویەتی): هەژارێك داوای خواردنی لێ کرد، لە کاتێکدا عائیشە ﷺ بەڕۆژوو بوو و هیچی لە ماڵدا نەبوو تەنها کولێرەیەك نەبێ، جا بە ئافرەتە خزمەتکارەکەی گوت: کولێرەکەی پێ بدە، خزمەتکارەکەش گوتی: هیچت نییە بەربانگی پێ بکەیتەوە و ئێوارە بیخۆیت، عائیشەش ﷺ گوتی: پێی بدە، خزمەتکارەکە دەڵێ: منیش ئەنجامم دا، دەڵێ: جا کاتێ ئێوارەمان کردەوە ماڵێك ـ یان کەسێك ـ کە پێشتر هەرگیز دیاری بۆ نەهێنابووین بزنێکی بەبرژاوی بۆ کردین بە دیاری، جا عائیشە ﷺ بانگی خزمەتکارەکەی کرد و گوتی: لەوە بخۆ، ئەوە چاکترە لە سەموونەکەت (واتە چاکترە لە سەموونەکەمان، بەڵام بۆیە دەڵێ: چاکترە لە کولێرەکەت، چونکە بەزۆر پێی کرد بە خێر).

**٢٨٤٩- عَنْ مالِكٍ ﷺ، قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ مِسْكِينًا اسْتَطْعَمَ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ وَبَيْنَ يَدَيْهَا عِنَبٌ، فَقَالَتْ لإِنْسَانٍ: خُذْ حَبَّةً، فَأَعْطِهِ إِيَّاهَا، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَيَعْجَبُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: أَتَعْجَبُ كَمْ تَرَى فِي هَذِهِ الْحَبَّةِ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ**[1].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە هەژارێك داوای خواردنی لە عائیشەی دایکی باوەڕداران کرد لە کاتێکدا ترێی لەپێش بوو، عائیشەش ﷺ بە کەسێکی گوت: دەنکەترێیەك ببە و پێی بدە، کەسەکەش هەر سەیری دەنکەترێکەی دەکرد و سەری سوڕمابوو، عائیشەش ﷺ گوتی: ئایا سەرت سوڕ دەمێنێ؟ ئەو دەنکە چەند مسقاڵە زەڕەی تێدایە؟ (واتە: خوای پەروەردگار بەڵێنی داوە پاداشتی مسقاڵە زەڕە بداتەوە، جا ئەوە زۆر لەوە زیاترە).

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆپاکگرتن لە داواکردن[2]

**٢٨٥٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، ثُمَّ قَالَ: مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ**

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٠٦ في الجامع؛ والحدثاني: ٨٠٥ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي التَّعَفُّفِ عَنِ الْمَسْأَلَةِ.

يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً هُوَ خَيْرٌ وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: خەڵکانێك لە ئەنصارییەکان داوای بەخشینیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش پێی بەخشین، دواتر داوایان لێ کردەوە، ئەویش پێی بەخشین، تاوەکوو ئەوەی لەلای بوو نەما و کۆتایی هات و فەرمووی: ئەوەی لەلام بێت لە ماڵ و سامان ئەوە لێتانی ناشارمەوە (پێتان دەبەخشم)، هەر کەسێکیش خۆی پاك بگرێت لە داواکردن ئەوە خوا ﷻ بەپاکی دەیهێڵێتەوە و (یارمەتی دەدات بەبێ داواکردن)، وە هەر کەسێکیش خۆی بێنیاز بکات ئەوە خوا ﷻ بێنیازی دەکات و (دەوڵەمەندی دەکات)، وە هەر کەسێکیش تەحەممول و ئارامگری پەیدا بکات (لە کاتی هەژاری و ناخۆشی و نەخۆشیدا) ئەوە خوا ئارامگری پێ دەبەخشێت، وە هیچ کەسێك بەخشینێکی پێ نەبەخشراوە چاکتر و فراوانتر بێت لە صەبر و ئارامگری.

**٢٨٥١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَهُوَ يَذْكُرُ الصَّدَقَةَ وَالتَّعَفُّفَ عَنِ الْمَسْأَلَةِ: الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا هِيَ الْمُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى هِيَ السَّائِلَةُ[٢].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا لەسەر مینبەر بوو و باسی بەخشین و خۆپاکگرتنی دەکرد لە داواکردن فەرمووی: دەستی بەرز زۆر چاکترە لە دەستی نزم، دەستی بەرز دەستی کەسی بەخشەرە (ئەو کەسەی دەبەخشێت)، وە دەستی نزم دەستی داواکارە (ئەو کەسەی بۆ پارە و پوڵ دەست پان دەکاتەوە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٠٧ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩٨ في العتاق؛ والبخاري: ١٤٦٩ في الزكاة؛ ومسلم: الزكاة: ١٢٤؛ والنسائي: ٢٥٨٨ في الزكاة؛ وأبو داود: ١٦٤٤ في الزكاة؛ والترمذي: ٢٠٢٤ في البر والصلة؛ وابن حبان،: ٣٤٠٠؛ والدارمي: ١٦٤٦ في الزكاة؛ والقابسي: ٧٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٠٨ في الجامع؛ والبخاري: ١٤٢٩ في الزكاة؛ ومسلم: الزكاة: ٩٤؛ والنسائي: ٢٥٣٣ في الزكاة؛ وأبو داود: ١٦٤٨ في الزكاة؛ والقابسي: ٢٥٥، كلهم عن مالك به.

**٢٨٥٢-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَرْسَلَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ بِعَطَاءٍ، فَرَدَّهُ عُمَرُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لِمَ رَدَدْتَهُ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلَيْسَ أَخْبَرْتَنَا أَنَّ خَيْرًا لأَحَدِنَا أَنْ لاَ يَأْخُذَ مِنْ أَحَدٍ شَيْئًا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا ذَلِكَ عَنِ الْمَسْأَلَةِ، فَأَمَّا مَا كَانَ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ، فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ يَرْزُقُكَهُ اللهُ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ أَسْأَلُ أَحَدًا شَيْئًا، وَلاَ يَأْتِينِي شَيْءٌ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ إِلاَّ أَخَذْتُهُ[1].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بەخششێکی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نارد، عومەریش ﷺ ڕەتی کردەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بۆچی ڕەتت کردەوە؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر هەواڵت پێ نەداوین بەوەی چاك وایە بۆ هەر یەکێك لە ئێمە هیچ شتێك لە کەس وەرنەگرێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە دەربارەی داواکردنە، بەڵام هەرچی ئەوەیە کە بە هۆی داواکردنەوە نییە، ئەوە ڕۆزییەکە خوای پەروەردگار پێی داوی، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: دە کەواتە سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ شتێك لە کەس داوا ناکەم، هیچ شتێکیش نییە بۆم بێت بەبێ داواکردن حەتمەن وەریدەگرم.

**٢٨٥٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ، فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ رَجُلاً أَعْطَاهُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ، فَيَسْأَلَهُ أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، یەکێك لە ئێوە گوریس و پەتەکەی هەڵگرێت و دار بکات و بە پشت بیهێنێتەوە، چاکترە بۆی لەوەی بچێتە لای کەسێك کە خوا لە فەزڵی خۆی پێی داوە و هەبوونە، جا داوای لێ بکات جا ئاخۆ پێی بدات یان پێی نەدات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٠٩ في الجامع؛ والحدثاني: ٨٠٨ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١٠ في الجامع؛ والبخاري: ١٤٧٠ في الزكاة؛ والنسائي: ٢٥٨٩ في الزكاة؛ والقابسي: ٣٧١، كلهم عن مالك به.




**٢٨٥٤-** عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي أَسَدٍ، أَنَّهُ قَالَ: نَزَلْتُ أَنَا وَأَهْلِي بِبَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَقَالَ لِي أَهْلِي: اذْهَبْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَاسْأَلْهُ لَنَا شَيْئًا نَأْكُلُهُ، وَجَعَلُوا يَذْكُرُونَ مِنْ حَاجَتِهِمْ، فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَوَجَدْتُ عِنْدَهُ رَجُلاً يَسْأَلُهُ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ أَجِدُ مَا أُعْطِيكَ، فَتَوَلَّى الرَّجُلُ عَنْهُ وَهُوَ مُغْضَبٌ، وَهُوَ يَقُولُ: لَعَمْرِي إِنَّكَ لَتُعْطِي مَنْ شِئْتَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّهُ لَيَغْضَبُ عَلَيَّ أَنْ لاَ أَجِدَ مَا أُعْطِيهِ، مَنْ سَأَلَ مِنْكُمْ وَلَهُ أُوقِيَّةٌ أَوْ عَدْلُهَا، فَقَدْ سَأَلَ إِلْحَافًا، قَالَ الأَسَدِيُّ: فَقُلْتُ: لَلَقْحَةٌ لَنَا خَيْرٌ مِنْ أُوقِيَّةٍ.

قَالَ مَالِكٌ ؒ: وَالأُوقِيَّةُ: أَرْبَعُونَ دِرْهَمًا، قَالَ: فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَسْأَلْهُ، فَقُدِمَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ بِشَعِيرٍ وَزَبِيبٍ، فَقَسَمَ لَنَا مِنْهُ، حَتَّى أَغْنَانَا اللهُ[1].

واتە: لە پیاوێکی بەنو ئەسەدەوە گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من و خانەوادەکەم لە بەقیعی غەرقەد گیرساینەوە، خێزانەکەشم پێی گوتم: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای شتێکی لێ بکە بیخۆین، جا باسی پێویستییەکانیان دەکرد (دەیانگوت ئەوە و ئەوە و ئەوە بێنە)، دەڵێ: منیش ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و لەلای ئەو پیاوێکم بینی داوای شتی لێ دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ دەیفەرموو: هیچم نییە پێت بدەم، جا پیاوەکە ڕۆیشت لە کاتێکدا توڕە ببوو و دەیگوت: سوێند بە تەمەنی خۆم تۆ تەنها بەو کەسانە دەبەخشیت کە خۆت دەتەوێت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە لە من توڕە بوو لەسەر ئەوەی هیچم نەبوو پێی بدەم، هەر کەسێك لە ئێوە داوا بکات و ئۆقیەیەك یان بەقەد ئۆقیەیەکی هەبێت ئەوە منجڕی و ئیلحاحی کردووە لە داواکردن (لە کاتێکدا پێویستی نییە)، جا پیاوە ئەسەدییەکە دەڵێ (لە دڵی خۆم گوتم): وشترەکەی ئێمە زۆر لە ئۆقیە زیاترە.

ئیمامی مالیك ؒ گوتوویەتی: ئۆقیە: چل درهەمە، جا پیاوە ئەسەدییەکە دەڵێ: گەڕامەوە و داوام لێ نەکرد، دواتر جۆ و مێوژ هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لە نێوان ئێمە دابەشی کرد و خوای پەروەردگار ﷻ بێنیازی کردین لە داواکردن (هەم خواردنمان بوو و هەم لە داواکردن ڕزگارمان بوو).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١١ في الجامع؛ والحدثاني: ٨١٠ في الجامع؛ والنسائي: ٢٥٩٦ في الزكاة؛ وأبو داود: ١٦٢٧ في الزكاة؛ والمنتقى لابن الجارود: ٣٦٦؛ والقابسي: ١٧٤، كلهم عن مالك به.

**٢٨٥٥-** وَعَنْ مَالِكٍ ﵀، عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ عَبْدٌ إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ أَدْرِي أَيُرْفَعُ هَذَا الْحَدِيثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَمْ لاَ[1].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەلائی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێڕاویەتەوە و گوێی لێ بووە دەیگوت: هیچ صەدەقە و خێرێك لە ماڵ و سامان کەم ناکات، وە خوای پەروەردگار ﷻ بەهۆی عەفو و لێبووردنەوە هیچ زیاد ناکات بۆ هیچ بەندەیەك تەنها عیززەت و گەورەیی نەبێت، وە هەر کەسێك لە پێناوی خوا ﷻ خۆبەکەمزانین و ملکەچی بنوێنێ (بۆ حەق و مسوڵمانان)، ئەوە حەتمەن خوای پەروەردگار ﷻ بەرزی دەکاتەوە.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: نازانم ئەم فەرموودەیە دەگاتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ یان نا (واتە نازانم فەرموودەی ئەوە یان نا).

### ٣- ئەوەی دروست نییە لە زەکاتدا[2]

**٢٨٥٦-** حَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لآلِ مُحَمَّدٍ، إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ[3].

واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات بۆ ئالی موحەممەد حەڵاڵ نییە، چونکە زەکات پیساتی خەڵکە (خەڵك ماڵ و سەروەتی خۆیانی پێ پاك دەکەنەوە).

**٢٨٥٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﵁، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ اسْتَعْمَلَ رَجُلاً مِنْ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا قَدِمَ سَأَلَهُ إِبِلاً مِنَ الصَّدَقَةِ، فَغَضِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَتَّى عُرِفَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، وَكَانَ مِمَّا يُعْرَفُ بِهِ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، أَنْ تَحْمَرَّ عَيْنَاهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١٢ في الجامع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُكْرَهُ مِنَ الصَّدَقَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١٤ في الجامع، عن مالك به.




لَيَسْأَلُنِي مَا لاَ يَصْلُحُ لِي، وَلاَ لَهُ، فَإِنْ مَنَعْتُهُ كَرِهْتُ الْمَنْعَ، وَإِنْ أَعْطَيْتُهُ أَعْطَيْتُهُ مَا لاَ يَصْلُحُ لِي وَلاَ لَهُ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ أَسْأَلُكَ مِنْهَا شَيْئًا أَبَدًا[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بەنو عەبدولئەشهەلی کردە فەرمانبەر بەسەر کۆکردنەوەی زەکات، جا کاتێ گەڕایەوە داوای وشترێکی کرد لە زەکاتەکەدا، پێغەمبەری خواش ﷺ توڕە بوو تاوەکوو توڕەییەکەی بە ڕوخساریەوە دەرکەوت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوانە بوو کە توڕەبوونەکەی دەزانرا لە ڕوخساری، بەوەی چاوەکانی سوور هەڵدەگەڕا، دواتر فەرمووی: پیاو هەیە داوای شتێکم لێ دەکات نە بۆ من و نە بۆ ئەویش ناگونجێت و دروست نییە، جا ئەگەر پێی نەدەم پێم ناخۆشە پێی نەدەم، ئەگەر پێشی بدەم ئەوە شتێکم پێ داوە کە نە بۆ من و نە بۆ ئەو ناگونجێت و دروست نییە، جا پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (تێگەیشتم) هەرگیز هیچ شتێکت لێ داوا ناکەم لە زەکات.

٢٨٥٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الأَرْقَمِ ﷺ: ادْلُلْنِي عَلَى بَعِيرٍ مِنَ الْمَطَايَا أَسْتَحْمِلُ عَلَيْهِ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَقُلْتُ: نَعَمْ جَمَلاً مِنَ الصَّدَقَةِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الأَرْقَمِ ﷺ: أَتُحِبُّ أَنَّ رَجُلاً بَادِنًا فِي يَوْمٍ حَارٍّ غَسَلَ لَكَ مَا تَحْتَ إِزَارِهِ وَرُفْغَيْهِ، ثُمَّ أَعْطَاكَهُ فَشَرِبْتَهُ؟ قَالَ: فَغَضِبْتُ، وَقُلْتُ: يَغْفِرُ اللهُ لَكَ، أَتَقُولُ لِي مِثْلَ هَذَا؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الأَرْقَمِ ﷺ: إِنَّمَا الصَّدَقَةُ أَوْسَاخُ النَّاسِ يَغْسِلُونَهَا عَنْهُمْ[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم ﷺ گوتی: وشترێکم پێ نیشان بدە لە وشترەکانی بار تاوەکوو داوا لە گەورەی باوەڕداران (عومەر ﷺ) بکەم پێم بدات تا سواری ببم، دەڵێ: منیش گوتم: باشە، وشترێك لە وشترەکانی زەکات، جا عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم ﷺ گوتی: ئایا پێت خۆشە پیاوێکی قەڵەوی چڵکن لە ڕۆژێکی زۆر گەرم ژێر شەرواڵەکەی و دەوروبەری ڕانی (واتە عەوڕەت و شوێنە

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١٥ في الجامع؛ والشيباني: ٨٩٩ في العتاق، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١٦ في الجامع، عن مالك به.

بەچڵکەکانی ژێرەوەی بشوات) دواتر ئەو چڵکاوە بدات بە تۆ و بیخۆیتەوە؟ دەڵێ: منیش توڕەبووم و گوتم: خوا لێت خۆش بێت توخوا ئەو قسەیە بە منی دەڵێی؟! عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەم ﷺ گوتی: زەکات چڵك و پیسایەتی خەڵکە لە خۆیان دەیشۆرن (بۆ ئەو کەسەی شایستە نەبێت وەریبگرێت وەك ئەوە وایە، کەواتە باسی ماڵی زەکات بۆ من مەکە، بۆ من ناشێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پەیداکردن و بەدواگەڕانی زانست[١]

٢٨٥٩- حَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ لُقْمَانَ الْحَكِيمَ أَوْصَى ابْنَهُ فَقَالَ: يَا بُنَيَّ جَالِسِ الْعُلَمَاءَ، وَزَاحِمْهُمْ بِرُكْبَتَيْكَ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى يُحْيِي الْقُلُوبَ بِنُورِ الْحِكْمَةِ، كَمَا يُحْيِي اللهُ الأَرْضَ الْمَيْتَةَ بِوَابِلِ السَّمَاءِ[٢].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە لوقمانی حەکیم وەسییەت و ئامۆژگاری کوڕەکەی کرد و گوتی: ڕۆڵەکەم لەلای زانایان دابنیشە و لەسەر چۆك لێیان نزیك بەرەوە، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ دڵەکان بە ڕووناکی زانستی کرداری دەژیێنێتەوە و دەبووژێنێتەوە، وەك چۆن خوای پەروەردگار زەوی مردوو و (بێسەوزایی) بەهۆی بارانی بەخوڕ دەژیێنێتەوە.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١٧ في الجامع؛ والحدثاني: ٨١٥ في الجامع، عن مالك به.



# پەرتووکی

# نزای ستەملێکراو[1]



---

١) ـ كِتابُ دَعوَةِ الَمظْلُومِ.

## ئەوەی خۆی لێ دەپارێزرێت
## لە نزا و دوعای کەسی ستەملێ کراو[١]

٢٨٦٠- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ اسْتَعْمَلَ مَوْلًى لَهُ يُدْعَى هُنَيًّا عَلَى الْحِمَى، فَقَالَ: يَا هُنَيُّ، اضْمُمْ جَنَاحَكَ عَنِ النَّاسِ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ مُجَابَةٌ، وَأَدْخِلْ رَبَّ الصُّرَيْمَةِ وَالْغُنَيْمَةِ، وَإِيَّايَ وَنَعَمَ ابْنِ عَفَّانَ، وَابْنِ عَوْفٍ ﷺ، فَإِنَّهُمَا إِنْ تَهْلِكْ مَاشِيَتُهُمَا يَرْجِعَانِ إلى الْمَدِينَةِ، إِلَى نَخْلٍ وَزَرْعٍ، وَإِنَّ رَبَّ الصُّرَيْمَةِ الْغُنَيْمَةِ إِنْ تَهْلِكْ مَاشِيَتُهُ يَأْتِنِي بِبَنِيهِ، فَيَقُولُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَفَتَارِكُهُمْ أَنَا لاَ أَبَا لَكَ، فَالْمَاءُ وَالْكَلأُ أَيْسَرُ عَلَيَّ مِنَ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَايْمُ اللهِ، إِنَّهُمْ لَيَرَوْنَ أَنِّي قَدْ ظَلَمْتُهُمْ، إِنَّهَا لَبِلاَدُهُمْ وَمِيَاهُهُمْ، قَاتَلُوا عَلَيْهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَأَسْلَمُوا عَلَيْهَا فِي الإِسْلاَمِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلاَ الْمَالُ الَّذِي أَحْمِلُ عَلَيْهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، مَا حَمَيْتُ عَلَيْهِمْ مِنْ بِلاَدِهِمْ شِبْرًا[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کۆیلەیەکی لەسەر تخوبی لەوەڕی ئاژەڵی زەکات دامەزراند پێی دەگوترا: هونەی، جا گوتی: ئەی هونەی باڵەکانت وێك بێنەوە (واتە بەبەزەیی بە و خراپەت دوور بخەرەوە و بەهۆی پێگەت لەلای من ستەم نەکەیت) لە خەڵکی و خۆت بپارێزە لە نزای ستەملێکراو، چونکە نزای ستەملێکراو قبووڵە، وە خاوەنی وشتری کەم و بزن و مەڕی کەم، بخەرە ناو تخوبی لەوەڕەکە (بهێڵە با لەگەڵ ئاژەڵی زەکات ئاژەڵەکانیان لەوەڕ بخۆن)، وە لە ئاژەڵەکانی عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ بمپارێزە (بهێڵە با لەوەڕ بخۆن)، چونکە ئەگەر ئاژەڵەکانی ئەو دووانە لەناو بچن دەگەڕێنەوە بۆ مەدینە بۆ باخداری خورما و کشتوکاڵ (بەرهەمی ئاژەڵ نامێنێت)، وە خاوەنی وشترە کەمەکان و بزن و مەڕە کەمەکانیش (کە بریتین لە خەڵکی مەدینە) ئەگەر ئاژەڵەکانیان لەناو بچن مناڵەکانیان دێنن بۆ لام و دەڵێن: ئەی گەورەی باوەڕداران،

---

(١) ـ مَا يُتَّقَى مِنْ دَعْوَةِ الْمَظْلُومِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٠٣ في الجامع؛ والبخاري: ٣٠٥٩ في الجهاد، عن مالك به.

ئەی گەورەی باوەڕداران (واتە داوای یارمەتی و پێداویستی و بژێویم لێ دەکەن بۆ منداڵەکانیان)، جا ئایا من وازیان لێ دەهێنم (چۆن یارمەتییان نادەم) هەی ماڵت وێران بێ؟! جا ئاو و لەوەڕ لەسەرم سووکتر و ئاسانترە لە زێڕ و زیو (واتە ئەگەر نەهێڵم ئاژەڵەکانیان لەوەڕ بخۆن لە شوێنی ئاژەڵی زەکات ئەوە لەناو دەچن و دواتر داوای یارمەتیم لێ دەکەن دەبێ بە زێڕ و زیو یارمەتییان بدەم، ئەوەش بۆ دەوڵەت قورسترە)، وە سوێند بە خوا (ئەگەر نەهێڵین لەو لەوەڕە بخۆن) ئەو کات وا دەزانن من ستەمم لێ کردوون، ئەوە مەملەکەت و ئاوی خۆیانە (مەدینەیە، شاری خۆیانە)، لە سەردەمی نەفامی شەڕیان لەسەر کردووە و لە سەردەمی ئیسلامەتیش سازشیان لەسەر کردووە، جا سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئەو وشترانە نەبووان کە دەبێ ئامادەیان بکەم و موجاهیدانیان لەسەر سوار بکەم بۆ جیهاد، ئەوە یەك بست لە خاکەکەیانم بەسەردا تخوب نەدەکردن.



# پەرتووكی

# ناوەكانی پێغەمبەر ﷺ (١)



---

١) ـ كِتابُ أسْماءِ النَّبِيِّ.

## ناوەکانی پێغەمبەری خوا[١] ﷺ

**٢٨٦١-** عنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لِي خَمْسَةُ أَسْمَاءٍ: أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي، الَّذِي يَمْحُو اللهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ، الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج ناوم هەیە: من موحەممەدم، وە من ئەحمەدم، وە من ماحیم ئەوەی خوا ﷻ بەهۆیەوە کوفری پێ دەسڕێتەوە، وە من حاشیرم ئەوەی خەڵك حەشر دەکرێت لەسەر ڕێگە و ڕێبازی من، وە من عاقیبم (ئەوەی کەس لەدوای ئەو نییە، واتە کۆتا پێغەمبەرم).

---

(١) ـ أَسْماَءُ النَّبِيِّ ﷺ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٣٢ في المناقب، عن مالك به.

# ناوەڕۆك

**پەرتووکی دادوەرییەکان**

